• ویلیام گای کار •

وەرگێڕانی: سەلاح سەعدی



FARHAN KURDI

# جیهان

## گەمەی دەستی ئیسرائیلە

پێڕەوکردنی کرداریی پرۆتۆکۆڵەکانی سەرانی زایۆنیزم

# جیهان ... گەمەی دەستی ئیسرائیلە

## جێبەجێبوونی کرداریی پرۆتۆکۆڵی سەرانی زایۆنیزم

ویلیام گای کار

وەرگێڕانی

سەلاح سەعدی

چاپی یەکەم

٢٠١٩

AWER ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# جیهان ... گەمەی دەستی ئیسرائیلە


- ✓ نوسینی: ویلیام گای کار
- ✓ وەرگێرانی : سەلاح سەعدی
- ✓ نەخشەسازی ناوەوە: محمدحسێن خەتی
- ✓ بەرگ: ئیراهیم صالح
- ✓ تیراژ: ۱۰۰۰ دانە
- ✓ چاپ: کوردستان/ هەولێر
- ✓ ساڵی چاپ: ۲۰۱۹
- ✓ چاپخانە: مێڤی۲
- ✓ نرخ: (۸,۰۰۰) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٤٦)ی ساڵی ۲۰۱۹ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆك


| لاپەرە | سەرەباس |
|---|---|
| ٧ | پێشەکی |
| ١١ | **بەشی یەکەم:** جیهان.. گەمەی دەستی ئیسرائیله<br>سەبارەت بەم پەڕتووکە و نووسەرەکەی |
| ١٣ | ( ١ ) گرنگترین پەڕتووکێکە سەرەداوەکانی پیلانگێڕییەکە ئاشکرا دەکات |
| ٢٧ | ( ٢ ) جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیله پێڕەوکردنی کردارییانەی پرۆتۆکۆلەکان |
| ٤٣ | ( ٣) ویلیام گای کار سەرەتا و کۆتایی!! |
| ٥٥ | ( ٤) پیلان و کودەتای جوولەکە و قووچەك و دۆلاری ئەمریکی |
| ٦٧ | ( ٥) قەیرانی دارایی جیهانی.. و ڕاستگەڕانی پێشبینییەکانی ویلیام گای کار |
| ٧٧ | **بەشی دووەم:** جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیله |
| ٧٩ | پێشەکی |
| ٨١ | کودەتا و پیلانگێڕییەکی نێودەوڵەتی |
| ١٠٤ | بارەگە و مەڵبەندی سەرکردایەتیکردنی پیلانگێڕی و کودەتایەکە |
| ١٠٧ | **بەشی یەکەم :** بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی |

| | |
|---|---|
| بەشی دووەم : شۆڕشی ئینگلیزی (١٦٤٠– ١٦٦٠ زلینی) | ١٢٥ |
| بەشی سێیەم: ڕێبەرانی شۆڕشی فەرەنسی | ١٤٩ |
| بەشی چوارەم: کەوتنی ناپلیۆن | ١٦٩ |
| بەشی پێنجەم: شۆڕشی ئەمریکی | ١٨٩ |
| بەشی شەشەم: مانۆڕە دراوییەکان | ٢١١ |
| بەشی حەوتەم: ڕووداوەکانی پێش شۆڕشی ڕووسی | ٢٢٢ |
| بەشی هەشتەم: شۆڕشی ڕووسیا لە ساڵی (١٩١٧) | ٢٤٣ |
| بەشی نۆیەم: وروژاندن و دنەدانی سیاسییانە | ٢٥٦ |
| بەشی دەیەم: پەیماننامەی فرسای | ٢٨٢ |
| بەشی یانزەیەم: ستالین | ٣٠٤ |
| بەشی دوانزەیەم: شۆڕشی ئیسپانی | ٣١٢ |
| بەشی سێزدەیەم : جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا | ٣٢١ |
| بەشی چواردەیەم: فرانکۆ | ٣٥١ |
| بەشی پانزەیەم: حوکمڕانییە تۆقێنەر و تیرۆرستییەکەی شۆڕش | ٣٦٥ |
| بەشی شانزەیەم: ئەو ڕووداوانەی بوونە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی | ٣٧٥ |
| بەشی حەڤدەیەم: هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی | ٤٠٠ |
| بەشی هەژدەیەم: مەترسییە هەنووکەییەکان | ٤١٥ |

# پێشەکی

لەوانەیە پەرتووکێکی دیکە لە مێژوودا نەبێت بارتەقای ئەم پەرتووکە هەرا و زەنای نابێتەوە. چونکە بۆ گشت ئەو کەسانە وەك سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوە کە دەیانەوێ بزانن نهێنییەکانی پشت پەردەی ئەم جیهانە تێبگەن، بەو واتایەی چەند لێکدانەوەیەکی لە هەنبەر ڕووداوە گەورە و تۆقێنەرەکانی جیهان کردووە، وەك شۆڕشە مەزنەکان و هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی، بەبێ ئەوەی دەستە شاراوە و بزوێنەرەکان و پاڵنەری ئەو ڕووداوانە بزانێ. لێکدانەوەکانیشی بەچەند بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری سیاسی و مێژوویی دەوڵەمەند کردووە و هیچ گومانێکیش لە ڕاستیی بەڵگەکان ناکرێ.

لێرەوە بەجیهانیبوونی ئەم پەرتووکە هاتووەتەدی، بەو واتایەی نەك تەنیا بۆ گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراو، بەڵکو بۆ هەموو کەسێکی سەر هەسارەی گۆی زەوی گرنگە، جگە لەمانەیش کردەی دوای دەرچوونی پەرتووکەکە خوێندنەوە و هەڵێنجانی هەنبەر ڕووداوەکانی جیهان گۆڕانیان بەسەردا هات و لە ڕوانگەیەکی دیکەوە لێك دەدرانەوە، هەر ئەمەیشە پەرتووکەکەی بە زیندوویی هێشتووەتەوە و لەگەڵ ئەوەی چەندان دەیە بەسەر دەرچوونی تێپەڕیون، بەڵام بە باشترین بەڵگەی مێژوویی و سەرچاوەیەکی هەرە نایابی لێکدانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو و داهاتوو هەژمار دەکرێ، خودی خاوەنەکەشی

بە ئەمری هێشتووەتەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی پێشبینییەکانی ڕاست دەرچوون و ڕووداوەکانی دواتری جیهان دروستیی پێشبینییەکانی نووسەرەکەیان سەلماند.

نووسەری بەناوبانگ ((ولیام گای کار)) لەم پەرتووکەدا جوولەکەی وەك هێزێکی بەدخوازی نهێنی و پشت پەردە ناساندووە و ڕوونی کردووەتەوە بەنهێنی و لە تاریکیدا خەریکی کار و پیلانڕێژییە و زۆربەی کەسە پلە باڵا و مەزنەکانی جیهانی بەرزەفتکردووە، هیچ گومانێکیش لەوەدا ناهێڵێتەوە و دەیسەلمێنێ چۆن زایۆنیزمی جیهانی ڕق و کینەی نێوان گەلان دەوروژێنێ، ئاشووب و پلانگێڕی پەخش دەکات و هەوڵی هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانی دەخاتە گەڕ کە ئەگەر هەڵبگیرسێت شوێنەوار و وێرانکارییەکەی لە هەردوو جەنگەکەی پێشوو - بەیەکەوە- مەترسیدارترە، لە کۆتایشدا ئامانجی وێرانکردنی جیهان و ڕۆنانی ئیمپراتۆریایەکی تایبەت بەخۆیەتی لەسەر دار و پەردووی جیهانی وێرانکراودا.

هەروەها نووسەر لە پەرتووکە مەزنەکەی خۆیدا ڕوونی دەکاتەوە چۆن ئەو جەنگ و شۆڕشانەی ژیانمان دەکەنە پووشی بەردەم ڕەشەبا و ئەو بێسەروبەرییەی باڵی بەسەر جیهانەکەماندا کێشاوە: تەنیا دەرئەنجامی پیلانگێڕییەکی بەردەوامی ئەهریمەنییانەیە، لە چەند شوێنێکی دیکەشدا ڕوونی دەکاتەوە چۆن زایۆنییەکان بەهۆی ئەو ململانێیەی جوولەکەکان لەنێوان زایۆنیزمی سیاسی و جیهانی ئیسلامیدا دەیوروژێنن، پیلان بۆ جەنگی سێیەمی جیهانیی نێوان جوولەکە و موسڵماناندا دادەڕێژن، پیلانە نەخشە بۆ کێشراوەکەش

بە جۆرێـك جەنگەكـە بـەڕێوە دەبـات وڵاتـانی عـەرەبی و دواتـریش ئیسلامی بەتەواوی خاپوور ببن.

نووسەر زرینگە لە زەنگی هۆشداری هەڵدەستێنێت و پێی وایە ئەگەر سەرتاپای جیهان بۆ وەستاندنی ئەم پیلانگێڕییە زایۆنییە غـەمیان لەبـەر نـەبێت و مشـووری وەسـتاندنی نـەخۆن، ئـەوا مەرگەساتێكی جیهانی وەكات[1] بە ڕێگەوەیە.

ئەم پەڕتووكە گرنگە بە بەهێزترین بەڵگەی شەرمەزاركردن و سـەركۆنەكردن دادەنـدرێ و پیلانگێڕییـە زایۆنییەكـەی تایبـەت بـە كۆنترۆڵكردن و ملپێكەچـكردنی جیهـان بـۆ ژێـر هـەژموونی جوولەكـە دەخاتـە ڕوو، لەوانەشـە هـەر ئەمـە وای لـە جووەكـان كردبـێ هـەوڵی بێوچان بخەنەگەڕ ئـەم پەڕتووكە لـە سەرانسـەری جیهـان بشـارنەوە، دەبـێ ئـەوەش بـزانین خـودی نووسەرەكەشـی لـە هەلومـەرجێكی پـڕ لەتەمومـژ تـیرۆر كـراوە، تۆبـاڵی تیرۆركردنەكەشـی خراوەتـە ئەسـتۆی جووەكان.

ئەم پەڕتووكە – زۆر بە سـادەیی– پـەردە لـە ڕووی ئـەو هێزانـە ڕادەمـاڵێ كـە دەسـتیان لـە تراژیـدیا و ئـێش و ئازارەكـانی ڕابـردوو و ئێستەی مرۆڤایەتیدا هـەبووە، ئـەویش زایـۆنیزمی جیهانییـە، هـەروەها ئازایەتییەكی بێهاوتای نووسەرێكی مەزن دەردەخات، چونكە بڕیاری دا خـۆی بـەنێو شـەپۆلی مەترسـیاندا دابـدات و پـەردە لـە ڕووی پیلانـە زایۆنییەكە هەڵماڵێت!

**مەجدی كامل**

---

١) وەكات: واتا بەدڵنیاییەوە، پان بە تەنكید، بۆنموونە ڕێكەجار لە كوردەواریدا دەگوترێ: " سبەی ئەچم، دووسبەی وەكاتە دەچم".

# (١)

# گرنگترین پەڕتووکێکە سەرەداوەکانی پیلانگێڕییەکە ئاشکرا دەکات



((جیهان گەمەی دەستی ئیسرائیلە))[٢] یەکێکە لە بەناوبانگترین پەرتووکەکانی جیهان، لە هەموویشیان کاریگەرترە. سەرتاپای جیهان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم پەرتووکە لە ڕیزی سەت پەرتووکە هەرە گرنگەکەی سەت ساڵی دواییە.

هەرچەندە پێنج دەیە بەسەر دەرچوونی ئەم پەرتووکەدا تێپەڕیون، بەڵام ئێستەیشی لەگەڵ دابێت زۆر پرس دەوروژێنێ، بەتایبەت ئەو ڕووداوانەی دوای دەرچوونی هاتنە پێشێ بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە ڕاستیی بۆچوون و دروستیی پێشبینییەکانی دەسەلمێنێ.

ئەم پەرتووکە شرۆڤەی ڕەگوڕیشەی بزووتنەوەی زایۆنیزمی جیهانی و ئامانج و شێوازەکانی دەکات. هەروەها چۆنییەتیی بەکێشکردنی سەرکردایەتییەکانی وڵاتانی گەورە و بەرزەفتکردنی چارەنووسی ئەم دەوڵەتانە تاوتوێ دەکات کە زایۆنیزمەکان نەوە دوای نەوە بەپێی چەند پیلانێکی ئەهریمەنی هەوڵی جێبەجێکردنی دەخەنە گەڕ. هەروەها گلۆبالیزم و چۆنییەتیی دروستبوونی و بیردۆزە ئابوورییەکانی وەك سەرمایەداری و ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیزم و

---

٢) ناونیشانی ئەم پەرتووکە بە عەرەبی ( الاحجار على رقعة الشطرنج)، کە بە کوردییەکەی دەبێتە ( مۆرەکانی شەترەنج) بەڵام هەستمان کرد ئەم ناونیشانەی ئێستەی واتا (جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیلە) باشترە و زیاتر گوزارشت لە نێوەڕۆکەکەی دەکات.

سۆسیالیزم  له جیهانی هاوچەرخدا شرۆڤه دەکات. تیشکیش دەخاته سەر نانەوەی ئاشووب و هەڵگیرساندنی شۆڕشەکانی جیهان.

(ویلیام کار)ی ئەفسەری هەواڵگریی بریتانی و نووسەری پەرتووکی (جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیله) سەرەداوەکانی پیلانی جوولەکەی زایۆنیزمی جیهانی کەوتووەته دەست کە بەر لە هەموو شتێك ئامانجی هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانییە، پیلانەکەشی وەهایە بەهۆی ململانێی نێوان خۆرئاوای مەسیحی و جیهانی ئیسلامی هەڵی گیرسێنێ، داینەمۆی ململانێیەکەش زایۆنیزمی سیاسی بەنهێنی لە خۆرئاواوە دەیبزوێنێ.

ئەو پەرتووکەی بەر لە هێرشەکانی یانزەی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠١ دەرچووە، ئاماژە بەوە دەکات زایۆنیزمەکان کار بۆ دنەدانی جیهانی ئیسلامی و خۆرئاوای مەسیحی دەکەن بۆ ئەوەی ململانێ و بەریککەوتنێکی توندوتیژ لەنێوانیاندا سەرهەڵبدات، ڕاستییەکەشی ئەم هێرشانە لە ڕەوتی ئەم پیلانەوە سەرچاوەیان گرت و بۆ پێکهێنانی بەرەی جەنگی دژ بە تیرۆر لە جیهاندا– بە سەرکردایەتیی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا– هاتەکایەوە، بۆ ئەوەی گۆڕەپانی جەنگەکە ببێتە زەمینە و پێشینەی هەڵگیرسانی جەنگی سێیەمی جیهانی کە ئێستە لە چەندان شوێنی جیهاندا لێکەوتەکەی دەبینین و بە پاساوای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر بەڕێوە دەبرێ. پیلانی ئەم جەنگە لە ڕێگەی دزەکردن بۆ نێو کۆمەڵەیەکی (ئیسلامی) مەیسەر بوو کە بەوپەڕی کاڵفامی و بەبێ درککردن بە دەرئەنجامەکانی کۆتایی، خەریکی جێبەجێکردنی پیلانە زایۆنیزمییەکە بوو.

جەنگی ئەمریکا دژ بە ئەفغانستان کە خۆرئاوای مەسیحی و چەند ولاّتێکی دیکەی هاوپەیمانی خۆرئاوایی لەپێناویدا پڕ چەك و تەیار کران، وەك پاکستان بە نموونە، دواتریش دووبارەکردنەوەی بە داگیرکردنی عێراق، بەڵگەی سەلمێنەری کردنەوەی بەرەیەکی جەنگیی بێ ئابڕووانەی دژ بە تیرۆر بوو، بێگومان ئەمەیش بەپێی پیلانە زایۆنییەکە بوو کەوا نووسەری ئەم پەرتووکە ( ویلیام کار) ئاماژەی بۆ کردووە.

( حیکمەت فاکە)ی لێکۆڵەر لە توێژینەوەیەکی گرنگدا بەناونیشانی (احجار علی رقعه الشترنج) ... پەردە لە ڕووی پیلانگێڕی بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانی هەڵدەماڵێ و دەڵێ:" زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین چەند لایەنێکی بیانی کە بەڕووکەش وا دەنوێنن بوونەتە موسڵمان، دزەیان کردووەتە نێو ڕێکخراو و کۆمەڵە ئیسلامییە توندڕۆیەکان و هەر ئەو لایەنانەش دنەی کوشتنی هەڕەمەکی دەدەن، ڕفاندن و سەربڕینی وەحشیگەرانەشیان بەناوی ئیسلامەوە تەنیا پیلانێکی داڕێژراوی وردە بۆ شێواندن و لەکەدارکردنی وێنە و ناوبانگی ئیسلام لەبەردەم جیهاندا بەڕێوە دەبرێ، باشترین نموونەش بۆ ئەمە دۆزینەوە و ئاشکراکردنی سەرۆکی شانەیەکی تیرۆرستییە لە مەغریب، چونکە ڕوونبوویەوە سەرۆکی شانەکە کەسێکی بە ڕەچەڵەك فەرەنسی بوو و باوەڕی بە ئیسلام هێنابوو و بانگەشەی ئەوەشی کردبوو کار بۆ هەواڵگریی فەرەنسی دەکات، بەلاّم هەواڵگریی فەرەنسی گوتەکانی بە درۆ خستبوویەوە و بوونی گشت جۆرە پێوەندییەکیشی لەگەڵیدا ڕەت کردبوویەوە، ئەمەیش لەپێناو

شاردنەوەی پێوەندی لەگەڵ کەسانی سەر بە مۆساد و بەکرێگیراوەکانی دیکە بوو.

گومان لەوەدا نییە ئیسرائیل بۆ جێبەجێکردنی پیلانە بەرفراوانە زایۆنییەکەی کە ئێستە پەردەی لەسەر لادراوە و لە زۆرێک لە راپۆرتەکان و بەرنامەکاندا قسەیان لەسەر کراوە، بە خراپ سوود لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەردەگرێ، ئەم پەرتووکەی (ولیام کار)ی ئەفسەری هەواڵگریی بریتانی، پیلانی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەم و دووەم و سێیەمی جیهانی ڕوون دەکاتەوە، ڕوونکردنەوەکەش نووسینێکی پەخشانیی بێ بەڵگە نییە، بەڵکو لەمیانی چەند بەڵگەنامەیەکی هەردوو سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا هاتووەتە کایەوە و بە زمانی عەرەبی لە سێزدە چاپی جیاجیادایە و لە سەرەتای حەفتاکانەوە کەوتوونەتە بەردەست.

هۆیە ڕاستینەکانی جەنگی دژ بە عێراق ڕوون و ئاشکرایە، سەرەتا ئەمریکا بانگەشەی دەکرد گوایە جەنگی دژ بە دکتاتۆرێکی ملهوڕە و ڕۆڵ و ئەرکی سەرشانیشی کۆتایی هاتووە، هەر وەک چۆن ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٤ دا تیشکی خستووەتە سەر، ڕۆژنامەکە نووسیبووی: " C.I.A ئەندازیاری یەکەمی کودەتایەکەی سەدام حوسێن بووە لە ساڵی ١٩٧٨ دا.

جەنگەکەی دژ بە عێراق کە ناونیشانی (ڕزگارکردن)ی بۆ داتاشرابوو، وێرانکارییەکی گەورەی نایەوە و بووە هۆی لەنێوبردنی شارستانییەت و دەستگرتن بەسەر نەوت و هەڵوەشاندنەوەی جڤاکی عێراقی و بڵاوکردنەوەی ئاشووب و بێسەروبەری و توندوتیژی لەمیانی تێکەڵاوکردنی بەرگرییەکی ڕەوا لەگەڵ چالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوە

نەناسراوە تیرۆرستییانەی ناونیشانی (ئیسلامییانە)یان هەڵگرتبوو، هەروەها بەڕێوەبردنی کردەکانی کوشتن و لەنێوبردنی خەڵکی سڤیلی وەك پیر و منداڵ لەگەڵ ڕفاندن و داواکردنی فدییە و لکاندنی کۆی ئەم کردارانە بە بەرگرییەکی ڕەوا، بۆ شێواندن و لەکەدارکردنی وێنە و ناوبانگی بەرگرییەکە بوو لەبەردەم ڕای گشتیی جیهانیدا.

ئەم بێسەروبەری و ئاشووب و دۆزەخە تۆقێنەرە هەروەك سەرۆکی فەرەنسی -جاك شیراك- گوتی، بە ڕێکەوت سەری هەڵنەدابوو، بەڵکو بەپێی پیلانێکی پتەو و قووڵی زایۆنی و لەپێناو زەمینەسازیی هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانی بوو کە ئیسرائیل هیواخوازە بەهۆی داگیرکردنی نێوان نیل و فوراتەوە سوودێکی زۆری لێ ببینێ.

بەڵگەنامەکانی نێو پەڕتووکی ( جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیله) لەو بەڵگە ڕەسمییانەی زایۆنیدا نەهاتووە کە چەندان نووسەر پەردەیان بەڕوودا هەڵماڵیوە و توانیویانە بەرنامە نهێنییەکانی زایۆنیزم بنکۆڵ بکەن، بەڵکو یەکێکە لەو بەڵگەنامە نهێنییانەی کە لە سەدەی حەفدەیەمەوە نووسراون و نووسەری ناوبراو دەستی پێیان ڕاگەیشتووە.

لە عێراقدا شارستانییەتێکی کۆن و نوێ و وزەیەکی زەبەلاحی مادی هەیە، لەبەرئەوە سیاسەتی ئەمریکا بەچەند قۆناغێك کاری بۆ تێکدانی کردووە، هەر لە جەنگی دروستکراوی هەشت ساڵەی عێراق-ئێرانەوە بگرە تا دەگاتە جەنگی سیناریۆیی کوێت کە بەهۆی ئەم جەنگەوە نیوەی نەوتی عەرەبان کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ئەمریکاوە.

جا له ترسی ئەوەی نەوەك ژیانی ئاسایی بۆ عێراقی خاوەن هێز و وزه بگەڕێتەوە، پیلان بۆ بەرەیەکی جەنگی فراوان و دژ بە تیرۆر کێشرا، ئەمەیش وایکرد گشت ئاشتییەکی چاوەڕوانکراو پەکی بکەوێت، هەمووشمان دەزانین هێزە ئیستعمارییە- ئەمریکی و ئیسرائیلییەکە- لەسەر مێزدا بانگەشەی ئاشتی بەگوێی خەلکیدا دەدەن و له ژێرەوەش ڕێگە لە وەدیهاتنی دەگرن و بە سووربوونێکی بەردەوامەوە پەکی دەخەن.

ئەو پیلانە زایۆنییەی کە سیاسەتی ئەمریکی ملکەچیەتی و جێبەجێی دەکات، هەر تەنیا بە دەستگرتن بەسەر نەوتی عەرەبان ناوەستێ بۆ بەکارهێنانی لە ملپێکەچکردنی جیهان، شێرەی نەوت لە دەستی خۆیەتی و بە ئارەزووی خۆی بۆ چەند ولاتێکی بەردەداتەوە و هەندێکیشیان بێبەش دەکات و خۆی بەرزەفتی نرخەکان دەکات، بەلکو لە هەمان کاتیشدا ئامانجی دابەشکردنێکی نوێی جوگرافیی ناوچەی خۆرهەلاتی نێوەڕاست و دروستکردنی چەند وردە دەولەتێکی جۆراوجۆرە کە بە دابەشکردنی عێراق دەستپێدەکات و بە لەباریەکهەلوەشاندنەوەی عێراق و ولاتانی دیکەی عەرەبی کۆتایی دێت، لە نێوەڕاستی ئەم دەولەتانەشدا - ئیسرائیلی گەورە- هەیە کە وەك چەقی هەژموونی تەواوی ناوچەکەیە.

سەرگرتنی ئەم پیلانەش بەندە بەو وەرچەرخانە سیاسیيانەی ناوچەی عەرەبی کە لە ماوەی دەیەی ئێستەدا هاتوونەتە پێشێ، لەمانەیش گرنگتر، سەرگرتنی ئەم پیلانەش دوای ئەوەی هەموو لایەك پێی زانیوە، بەندە بە (سەرلەبەری) هەلوێستی ولاتانی عەرەب، چونکه

لەسەر ئەو وڵاتانە پێویستە هاودەنگ و یەکڕیز بن بۆ ئەوەی بە هەر نرخ و هۆکارێك بێت نەیەڵن سەربگرێ.

لێرەوە دەتوانین ئەم پەڕتووکە بە یەکێك لە گرنگترینی ئەو نووسراوە مێژووییانە دابنێین کە بە بەڵگە و پاساوی جێگەی باوەڕ جەخت لەوە دەکاتەوە ئیسرائیل تۆوی هەزرە ئیستعمارییە دەمارگیرییەکانی لە خاکی ئەورووپا و ئەمریکادا چاندووە، چونکە لە ( رووی ئایینی و ڕووحی و کەلتووری و جڤاکییەوە) خاکی گونجاوی گەشەکردنی ئەم هزرانەن لە ماوەی زیاتر لە چوار سەدە و پێش کۆنگرەی یەکەمی خۆی لە شاری بازلی سویسرا و ڕێك لە ساڵی ١٨٩٧، مورید و شوێنکەوتوو و خزمەتکارانی ژێر ئاڵای ئەم ئایدۆلۆژییە داگیرکەرانەیە زۆرن و ژمارەیان سەدان کەسە و هەرهەمووشیان کەسایەتیی سیاسی و ئایینی و سەربازی و ئەدەبی و هزرین و لە خۆرئاوادا شوێن و پێگە و دەستهەڵات و ئەرکەکانیان زۆر گەورە و گرنگ و کاریگەرە .

لە چوارچێوەی ئاخاوتن سەبارەت بە نووسراو و پەڕتووکە پێشەنگەکانی ئاشکراکردنی ئایدۆلۆژیا و شێوازە ئاڵۆزەکانی زایۆنی لە وێرانکردنی دەوڵەتان و جڤاکەکاندا، یان دزەکردنە نێو پێکهاتە سەرەکییەکانیاندا و دواتریش کۆنترۆڵکردن و ئاراستەکردنیان بەپێی چەند مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراو، یان تەنانەت وێرانکردن و هەڵوەشاندنەوەیان بۆ چەند هەرێم و قەوارەیەکی بچووکی دژ بەیەك، بەردەوام جیهان پەنا دەباتە بەر ئەم پەڕتووکە گرنگە (جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیلە) کە نووسەرەکەی ویلیام گای کاری بریتانییە و ماوەی چوار دەیە خەریکی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و

شوێنپێ هەڵگرتن و شیکردنەوە بووە، واتا زادەی هەوڵ و کۆششی چەندان ساڵەی نێوان ١٩١١- ١٩٥٠ بووە ، یەکەمجاریش لە ساڵی ١٩٥٨ دا لە چاپ دراوە.

ئەم پەڕتووکە چەندان زانیاریی گرنگ و مەترسیدار و سەرسوڕهێنەری تیادایە، هەر هەمووشیان تایبەتن بە کردار و چالاکییەکانی چەند زایۆنیزمێکی جوولەکە و نا جوولەکە لە چەند ماوە و قۆناغێکی جۆر بە جۆری مێژووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاینیی ئینگلترا و فەرەنسا و ئیسپانیا و ئەڵمانیا و ڕووسیا و ئەورووپای خۆرهەڵات و ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا.

نووسەر سەبارەت بە گەمە و پیلانگێڕی و کودەتایەکانیان وردەکاری زۆر گرنگ و تۆقێنەر بڵاو دەکاتەوە، بەتایبەت ئەوانەی هاوکات لەگەڵ شۆڕشی ئینگلیزی (١٦٤٠-١٦٦٠) ڕەوتی خۆیان گرتووە، لەمەشدا پشتی بە پەڕتووکە زەبەلاحەکەی ( ژیانی پاشا چارڵیی دووەم) بەستووە، کە نووسەرەکەی ئیسحاق دزرائیلیی( ١٧٦٦-١٨٤٨) گەورە جوولەکەی ئینگلیز و باوکی (بنیامین دزرائیلی) بووە (دواتر چەندان جار بووەتە سەرۆکوەزیران). دزرائیلی لە پەڕتووکەکەی خۆیدا تیشک دەخاتە سەر وێکچوونێکی سەیر و هاوشێوەیی لە جۆرەکانی پلان و نەخشەکێشان بۆ ئەو کردانەی پێش هەردوو شۆڕشی ئینگلیزی و فەرەنسی بەڕێوەچوون.

ویلیام گای کار زۆر بە دوورودرێژی تیشک دەخاتە سەر ئەوەی کاتێک بنەماڵەی ڕۆچیڵد سەنتەرە گرنگ و مەزنەکانی ئابووری و بازرگانیی ئەو کاتی فەرەنسایان گرتووەتە دەست، چۆن پشتگیریی مادییانەی پێشکێشی شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ی فەرەنسا کردووە، هەر لە

درێـژەی باسەکەشـیدا پوختەیـەك لـە پلانـی کـاری ڕۆچـیلدییەکانی خستووەتە ڕوو کە بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوەندەکانی بڕیاری نێـو شۆڕشی فڕەنسی دایڕشتووە ، جێبەجێکردنی پیلانەکەش بەهۆی ( دەستهەڵاتی زێڕ) و ئەو فەلسەفە پراگماتیکییە بووە: (بـۆ سـەرکەوتنی پلانەکـەمان هەرگیز گرنگ نییە ئەو حکوومەتەی ئێستە لەناوەوە یـان لـە دەرەوەڕا دەڕووخێنـدرێ، چـونکە لایـەن و کەسـی سـەرکەوتوو هـەرکێ بێـت، پێویستی بە سەرمایەیە، سەرمایەش بەتەواوی لە دەستی ئێمەدایە).

بەڵگەش بۆ ئەم باسەی سەرەوە ئەوەیە دوای ئەوەی ناپلیۆن بە سـوپایەکەی خـۆی ئـەورووپای داگیرکـرد و لـە سـاڵی ( ١٩٠٤)دا وەك ئیمپراتۆرێـك خـۆی ڕاگەیانـد و جـۆزیفی بـرای وەك پاشـای نـاپۆلی دەستنیشـان کـرد و لویسـی کـردە پاشـای هۆڵەنـدا و جیرۆمیشـی وەك پاشـای وسـتفالیا دیـاری کـرد، بـۆ وەدەسـتهێنان و دەسـتەبەرکردنی پارەی پێویسـت، پـەنای بـردە بـەر ناتـان ڕۆچـیلد، ناتـان ڕۆچـیلدیش بەخراپ سوودی لەو داواکارییـە وەرگـرت و برایـەکانی کـردە پاشایانی دارایـی و پـارە لـە ئـەورووپا، دواتـریش بوونـە (دەسـت و دەسـتهەڵاتی شاراوە)ی پشت ئەو پاشایەتییانەی ناپلیۆن ڕایگەیاندبوون.

شتە سەرنجڕاکێشەکە لەوەدایە پیاوە نهێنییە دەستهەڵاتدارەکان لـەو کاتییـەوە بڕیاریـان دا سویسـرا بکەنـە مەڵبەنـد و ناوەنـدی سـەرکردایەتی و دەسـتهەڵاتەکانیان، ئـەم وڵاتـەیان کـردە دەوڵـەتێکی بێلایـەن و نەیانهێشـت بچـێتە نێـو هـیچ ململانێیـەك، ئەمـەیش بـۆ سەلامەتیی خۆیان و داراییەکانیان بوو.

ئەم پەڕتووکە چەندان بەڵگەی دیکە لەخۆ دەگرێ، لە بەڵگەکاندا ڕوونبووەتەوە زایۆنیزم لـە ڕێگـەی دارایـی و پـارە و پـووڵ زەبەلاحی

خۆیەوە بەچ شێوەیەك بانكەكانی خۆرئاوایان كۆنترۆڵكردووە و لەپێناو بڵاوكردنەوەی ئایدۆلۆژیایە زایۆنیزمییەكەیان و كڕینی خەڵك و پۆستی هەستیار و زەمینەسازی بۆ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی تایبەتی جوولەكە لە كاتی گونجاودا- هەر ئەمەیش بوو لە شەوی ١٤/١٥ی ئایاری ساڵی ١٩٤٨دا ڕووی دا- سوودیان لێ وەرگرتووە.

نووسەر دەڵێ لە ڕووی مێژووییەوە شتێكی سەلمێندراوە دوای ئەوەی زایۆنیزم ( لە ساڵی ١٩١٧) كاری بۆ دەرچوواندنی بەڵێنی بەلفۆری بریتانی كرد و هەر یەكە لە فەرەنسا و ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پشتگیرییان لێ كرد، چەند فەرمانێك بۆ لۆرد لنبی دەرچوو بۆ ئەوەی توركەكان لە ئاسیای بچووكدا وەدەرنێ و دەست بەسەر فەڵەستیندا بگرن. ڕاستیی نیاز و مەبەستی ڕادەستكردنی فەڵەستین بە جووەكان تەنیا دوای ئەوە ئاشكرا بوو كە عەرەبەكان یارمەتیی لۆرد لنبییان دا ئەركە مێژووییەكەی خۆی بەتەواوی بەجێ بهێنێ). هەركە فەڵەستینیش دەستی بەسەردا گیرا و خرایە بەر سەرپەرشتیی ( وصایا) بریتانی، جوولەكەكان خێرا داوایان لە حكومەتی بریتانی و هاوپەیمانان كرد لە فەڵەستین لیژنەیەكی زایۆنی پێكبهێنن و نوێنەرە سیاسییەكانی خۆیان وەك ئەندام تیایدا دابمەزرێن، بەو مەرجەی ئەركی ئەو نێردەیەش ئەوە بێت ئامۆژگاری پێشكێشی جەنەڕاڵ كلایتۆنی حاكمی سەربازیی فەڵەستین بكات و وەك گرووپێكی پێوەندی لەنێوان جوولەكە و سەركردایەتیی سەربازی دەستبەكار بێت.

ئەو لیژنەیە لە ئاداری ساڵی ١٩١٨دا دەست بەكاربوو، بەڵام ئەندامەكانی سەربردەیەكیان هەیە هی ئەوەیە بگێڕدرێتەوە، چونكە ویلیام گای كار دەڵی لیژنەی ناوبراو ڕێك لە ئاداری ساڵی ١٩١٨دا

دەستبەکاربوو ( واتا تەنیا دوای پێنج مانگ لە بەڵێنی بەلفۆر) ئەندامەکانیشیان ئەمانە بوون:

– کۆلۆنێل ئۆمسبای گۆر ( دواتر بووە لۆردی هارلیک)، بەڕێوەبەری بانکی میدلاند و بانکی ستانداری باشووری ئەفریقیا بوو. هەر ئەو بانکەش بوو پارەی بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی بویر خەرجکرد بۆ ئەوەی لە ئەفریقیادا ئەڵماس و زێڕی دەستکەوێ.

– کۆلۆنێل جیمس دی رۆچیڵد، کوڕی سەرۆکی لقی فرەنسای خانەوادەی رۆچیلد و دامەزرێنەری ژمارەیەکی زۆر لە موستەعمەراتی جوولەکە لە فەڵەستین. لە نێوان سالآنی ١٩٢٩–١٩٤٥ بووە ئەندامی ئەنجوومەنی گشتی بریتانی، دواتریش چەرچل وەك وەزیری کاروباری پارلەمانی لە حکوومەتی بریتانیا دایمەزراند.

– جێدار (ملازم) ئەدوین سامۆئیل کە لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا وەك بەڕێوەبەری چاودێریی حکوومەتی بریتانیا دامەزرا، کاتێکیش ( ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨) دامەزرا، بووە بەڕێوەبەری ئێستگەی ئیسرائیلی.

– ئیسرائیل سیف بەڕێوەبەری کۆمپانیایە زەبەلاحەکانی (مارکس و سپێنسەر)ی بریتانی، خاوەنی پێوەندیی پتەو بە سووخۆرە نێودەوڵەتییەکان، هەروەها ئەندامێکی بەرجەستەی دەستگەی ( براین ترۆست) بوو کە ئامۆژگاری و ڕاوێژی پێشکێشی حکوومەتە یەك لەدوای یەکەکانی بریتانی دەکرد.

– لیۆن سیمۆن، کە دواتر پلەی ( سوارچاك)ی بەدەستهێنا و بووە بەڕێوەبەری بەرپرسی نووسینگەکانی پۆستەی گشتی لە بریتانیا، بەتەواوی کۆنترۆڵی ئامێرەکانی تەلەفۆن و گشت جۆرە پێوەندییە

بێتەلەکانی دەکرد. ئەندامەکانی دیکەی لیژنەکەش بریتی بوون لە: دکتۆر نیلدەر و جۆزیف کلوین و حاییم وایزمانی ڕابەری بەناوبانگی جوولەکە)، هەر هەمووشیان نزیکی زایۆنیزم بوون یان کەسانی چالاکی نێو چوارچێوەکەی بوون.

نووسەری پەرتووکی ( جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیله) بە قسەیەکی سێر ستۆرز بەڵگەکانی پشتڕاست دەکاتەوە کە دەڵێ: ئەم لیژنەیە بەر لە بەڕێوەچوونی ( کۆنگرەی ئاشتی لە فرسای) و پێش هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی، بە ئامانجی ڕەخساندنی کەشێکی گونجاو لەپێناو (دامەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکەکان و جوولاندنی یارمەتیدەر و هەوادارانیان بۆ ئەوەی یارمەتیی مادییان بدەن) ڕەوانەی فەڵەستین کران.

نووسەر ئاماژە بە چەند ناوێکی دیاریکراوی زایۆنی دەکات کە لە لایەک نوێنەری پارەدەران و سووخۆرانی جیهانی بوون، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی توانای زەبەلاحی مادییانەوە توانییان کار لە ( کۆنگرەی فرسای بۆ ئاشتی) بکەن، تاکوو خزمەتگوزاری بۆ بەرنامە نەخشەبۆ کێشراوەکەی بڕەخسێنێ.

جا ئەگەر بڕیاری ڕاسپێریی (انتداب) بریتانیا لەسەر فەڵەستین ئەو کات لە (کۆمەڵەی گەلانی یەککگرتوو) دەرچوو، بەڵام نووسەر ڕوونی دەکاتەوە نووسەری ڕەشنووسی ڕاسپێریی بریتانی بۆسەر فەڵەستین پرۆفیسۆر فیلکس فرانکفۆرتزی بەناوبانگ بووە کە زایۆنییەکی ئەمریکی بووە، دواتریش لە سەردەمی سەرۆك ڕۆزفڵت دا بووەتە ڕاوێژکاری یەکەمی کۆشکی سپی.

یەکێك لەو ڕووداوانەی ویلیام گای کار دەیگێڕێتەوە ئەوەیە کاتێك لە ساڵی ١٩١٩ گفتوگۆیە سەرەتاییەکانی (کۆنگرەی ئاشتی) لە فرسای/

فرەنسا دەستیان پێکرد، ڕاوێژکاری تایبەتی بەڕێز کلیمنسۆی سەرۆکوەزیرانی فرەنسا مسیۆ ماندیل بووە، ئەمەش تەنیا ناوێکی خوازراوی یەکێك لە ئەندامەکانی ئال ڕۆچیلد بووە. هەروەها مۆرگنزاویش لە کۆنگرەکەدا وەك ئەندامی شاندی ئەمریکی ئامادەبووە و ڕاوێژکارێکی گەورە بوو، باوکی ئەو پیاوە بووە کە دواتر بووەتە سکرتێری دارایی سەرۆك ڕۆزفلت. هەروەها لەم گفتوگۆیانەدا مستەر ئۆسکار ستراوس هەبووە، ناوبراو بە پێڕەوکارێکی توندڕۆی پلانی پارەدەرانی زایۆنی ناسرا بوو، ڕۆڵێکی بەرجەستەشی لە پێکهێنانی کۆمەڵەی گەلان و داڕشتنی سیاسەتەکانیدا هەبووە.

نووسەر نووسینێکی لۆسیان وۆلفی نووسەری پەرتووکی ( دراسات عن تاریخ الیهود) دێنێتە نێو باسەکەی: کۆمەڵەیەکی دیکەی بچکۆڵەی جوولەکەی (زایۆنیزمی) بەرجەستە هەن کە وازۆیەکانیان لەسەر ( پەیماننامەی ئاشتی لە فرسای) دەرکەوتووە- ئەمەیش پێویستی بە زۆرێك لە توێژینەوە و شیکردنەوە و بەستنەوەی ڕووداوەکان هەیە بەیەکتری- لەوانە: لویز کلۆتز لە فرەنساوە( دواتر لە پرسێکی دارایی تێوەگلاوە و لەبەرچاوان خۆی بزرکردووە) هەروەها بارۆن سۆمینۆ لە ئیتاڵیاوە و مستەر ئیدوین مۆنتاگ لە هیندستانەوە.

ویلیام گای کار بەقووڵی دەچێتە نێو پێوەندییە نهێنییە ( دارایی و سیاسی و ئاینییەکانی) نێوان زایۆنییەکان و کەسایەتییە مەزنەکانی جیهانی، وەك: ویلسۆن، ڕۆزفلت، لوید جۆرج، چەرچل، کلیمنسۆ و چەندان کەسی دیکە، بەڕای نووسەر ئەو کەسانە پێچەوانەی ئەو پاڵەوانییەتی و سەربەخۆیی و مەزنایەتییەی دراوەتە پاڵیان (مۆرەی سەر تەختەی شەترەنج بوون).

## (٢)

## جیهان... کەمەی دەستی ئیسرائیلە

## پێڕەوکردنی کرداریانەی پرۆتۆکۆلەکان



پەرتووكی((جیهان... گەمەی ئیسرائیلە)) بەوە بەناوبانگە لەمیانی ڕوونكردنەوەی مەترسیدارترین و گرنگترینی ئەو ڕووداوانەی جیهان پیایایندا تێپەڕیوە و دەستی شاراوەی جوولەكان جولێنەری سەرەكیی ئەو ڕووداوانە بووە، ئەو پێڕەوكردنە كرداریبە ڕوون دەكاتەوە كە لە گەورەترین بەڵگەنامەی جوولەكە لە مێژوودا هاتووە و زۆر بە وردی پەردە لە ڕووی ڕەهەندەكانی كودەتا و پیلانی جوولەكە بە دژی جیهان ڕادەماڵێ، ئەم بەڵگەنامانە بەناوبانگن و بە پرۆتۆكۆلەكانی سەرانی زایۆنیزم ناسراون، جیهانیش یەكەمجار بەهۆی پەرتووكێكی دیكەوە پێیان ئاشنابووە كە هەمان ناوی هەبووە، هەرچەندە هەوڵی بێوچانی جوولەكان خرایە گەڕ بۆ ئەوەی ئەو پرۆتۆكۆلانە بە نهێنی بمێننەوە، بەڵام هەوڵەكانیان شكستیان خوارد و پرۆتۆكۆلەكان بڵاوبوونەوە، كاتێكیش پەردە لەسەر نهێنییەكانی ڕامالدرا جیهان بەتەواوی حەپەسا.

ڕاستییەكەی جیهان ئاشنای هیچ پەرتووكێكی دیكە نەبووە بەقەد پەرتووكی پرۆتۆكۆڵەكانی سەرانی زایۆنیزم ورووژاندبێتی.

ئەم پرۆتۆكۆلانە لە تەلمود وەرگیراون كە پیاوانی بواری دارایی و ئابووریی جوولەكە بۆ سڕینەوە و وێرانكردنی مەسیحییەت و بابەوی و دواتریش ئیسلام دایانناوە. ئەو وێرانكارییەش كە خاوەنانی پرتۆكۆلەكان بڕیاریان لەسەر داوە دەبێ لە ماوەی سەت ساڵدا بگاتە ئەنجام. جوولەكان پێیان وایە ئەوان پاشایەتی و وڵاتێكی جوولەكیی داودی ئەتۆ دادەمەزرێنن هێندە فێڵ و ئامرازی لەبەردەستدا دەبێت - كە كەمینەیەكی زۆر كەمیشن- بتوانن بەتەواوی و بەشێوەیەكی

تۆتۆکراتی جڵەوی حوکمڕانیی جیهان بگرنە دەست، هیچ ئاینێکی دیکەش -بە مەسیحییەت و ئیسلامیشەوە- نییە هاوسێ و هاوشانی ئاینی جوولەکەیی تەلموودی بێت، هەروەها ئەم شارستانییەتەی ئێستە بە تەواوی هەڵدەوەشێنێتەوە و ئاتاری لەسەر پاتاری ناهێڵێ. ئیسرائیلی بونیادنراویش لە خاکی فەڵەستیندا تەنیا دەست و ئامرازێکی جوولەکەی جیهانییە.

بەڵام دەبێ بپرسین واتای پرۆتۆکۆل چییە؟ لە زماندا واتا ڕەشنووسی ڕێککەوتن یان پەیماننامە یان بەڵگەنامەی ڕەسمیی حکوومەتەکان دەگەیەنێ. هەروەها واتای بنەمایەکانی ڕەفتار و نەریت و زاراوەکانی دبلۆماسی و داڕشتن و شێوازی بەڵگەنامە دبلۆماسییەکانیش دەگەیەنێ.

بەڵام مەبەست لە پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی زایۆنی بریتییە لە شێواز و نۆرمێکی تایبەت و نێوەڕۆکەکەی بڕیار و ڕاسپاردەکانی ئەو کۆمەڵە کەسەی لەخۆگرتووە کە بە سەروەرانی جوولەکە ناسراون.

سەران و سەروەرانیش پێرگەلێکی هەژموونداری بواری دەستوورن و لەڕووی ئاینیی جوولەکەشەوە سەرکردە و ڕێبەرە ئاینییەکانن، بەڵام لێرەدا لە واتا ئاینییە داماڵراوەکەی خۆی لایداوە، چونکە مەسەلەکانیان لەنێوان دیار و نادیاردا ئاڵۆزکاندووە، بۆ ئەوەی واتایەکەی لە مرۆڤگارەدا کەسانی هەژموونداری بواری سیاسی و ئابووری و پیشەسازی و پارتە نهێنییەکان و بزووتنەوە وێرانکارە تێکدەرەکانیش بگرێتەوە و پاشا و دەستەڵاتداران و سەروەران لە دەستەڵات دابماڵێت و پەیماننامەکان ژێرپێ بخات و پیلانگێڕی و کوشتن و تیرۆر بڵاو بکەنەوە.

سەرەوەران و دەستهەڵاتدارانیش لەو حاخامانه یان خاوەندانه ( الـرب یـان الربـوبی) خواوەنـدی وەرگـیراون، نووسـەرێکی پسـپۆڕی جوولەکه دەڵێ: بە واتای مامۆستا یان زانا دێت.

بەڵام واتای پرۆتۆکوڵـەکانی سـەرانی زایـۆنیزم دەسـتەی نهێنیی جوولەکـە مەزنـەکانن کـە بـەردەوام بـوون و قـەوارە شـاراوەکەی لـە سـەردەمی شۆڕشـی فرەنسـیدا نوێبوویـەوە و لەسـەر ڕەوتـی خۆیشـی بەردەوام بوو، لەسەدەی نۆزدەمیشدا لەنێو ڕووسیای سزاری و ڕێك لـە ڕۆژگاری کارل مارکسدا هەر بەردەوام بوو، لە چاریەکی کۆتـایی هـەمان سەدەشدا زۆر کارابوو.

دواتریش لە دەیەی کۆتایی واتا لە ساڵی ١٨٩٧ لە بـازلی سویسـرا یەکـەمین کـۆنگرە زایۆنییـە جیهانییەکـەی خـۆی بـە سـەرۆکایەتیی د. تیۆدۆر هرتزل بەڕێوەبرد، لەو کۆنگرە نهێنییەدا پرۆتۆکوڵەکان دانـران، چـەند بیروڕایـەکیش هەیـە گوایـە پـێش ئـەم کۆنگرەیـە بـەهۆی ئاشـر گنزبرگی جوولەکەی ئۆدێسا لە (ئۆکرانیـا) ئامـادە کـراوە، نـاوبراو وەك کەسێکی ئاسایی یان تاکێکی گەل نووسیویەتی، دوای جەنگی یەکـەمی جیهانی و شۆڕشی بەلشەفیی ڕووسیا، بەرەو فەلەستین کۆچی کـردووە و لە ساڵی ١٩٢٧ و دوای ئەوەی ٦٠ ساڵ خزمەتی زایـۆنیزمی کـردووە، مردووە.

ئەم بڕیارانە (پرۆتۆکوڵەکان) بۆ ئەوە ئامادە کرابوون لـە هـەردوو کۆنگرەی بازلـدا بخرێنـە ڕوو، بـۆ ئـەوەی تـاوتوێ بکـرێن و پـاکنووس بکرێنەوە و لەمیانی ئەو کۆنگرەیەدا کە چەندان دانیشتن بەردەوام بوو، بڕیاری لەسەر بدرێ، هەر وەك چۆن لـە دەقەکانیشـیدا هـاتووە. بـەڵام پۆلیسـی نهێنیـی سـزاری ڕووسـی لـە کردەیـەکی زۆر خێـرا و لـە کـاتی

بەڕێوەچوونی کۆنگرەکەدا هەڵی کوتایە سەریان بۆ ئەوەی دەست بەسەر ڕاپۆرت و نووسینەکانی کۆنگرەکەدا بگرێ، ئەو پرۆتۆکۆلانەش یەکێك بوون لەو نووسراوانەی بە سەرکەوتوویی دەستیان بەسەردا گیرا.

صەهیون لە بنەڕەتدا ناوی گردێك یان بانێکە لە ئورسالم-ئۆرشەلیمی سەردەمی یەبووسییەکان (عەرەب)دا، هەروەها کەنعانییە ( عەرەبەکانیش بەر لە هەزاران ساڵ پێش جووەکان لە کۆندا لێی نیشتەجێ بوون، کاتێکیش جوولەکەکان لە زیندان و دیلیی ژێردەستی بابلییەکان گەڕانەوە، بینییان یەبووسییەکان لە دۆخی ئاسایی خۆیان لە فەڵەستین ماونەتەوە، بەمشێوەیە واژەی سەهیۆن بەو گردەی قودس دەگوترێ، بۆخۆیان وەری دەگرن و بەکاری دەهێنن، هەروەك چۆن پێشتریش ئەستێرەی شەشینەی کەنعانیان بۆ خۆیان بەکارهێنا و چەندان شتی دیکەشیان وەك خوازە وەرگرتووە و خستوویانەتە پاڵ خۆیان.

لەسەر گردی سەهیۆندا داودی پێغەمبەر کۆشك و تەلارەکەی خۆی بنیاد نابوو، لەگەڵ گوزەرکردنی کاتیشدا وشەی سەهیۆن بووە هێما و ئاماژەیەك بۆ حکوومەتی ئایینییانەی جوولەکە، عاشقان (خۆشەویستانی) سەهیۆن ڕێکخراوێکی ئاشکرا-نهێنیی زۆر بەدناو بووە و جوولەکەکان لە ڕووسیای سزاریدا دوای نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دایانمەزراند، ئەو ڕێکخراوە دەیویست لە ڕێگەی نانەوەی ئاشووب و فیتنەچییەتی و تیرۆرەوە ( واتا بەشێوازی سەهیۆنی) سزاریزمی ڕووسی بڕوخێنێ.

ئـەو ڕێکخـراوە بەچـەند دەیەیـەك بـەر لـە هێرتـزل گرنگـی بـە فەڵەستین داوە، زۆربەی کەسانی دیار و بەناوبانگی ئـەوکاتی جوولەکە تەفلی ئەو ڕێکخراوە بوون، لەوانـە: بـاوکی حـاییم وایزمـان و کیش بن گۆریۆن و بنتویش و سۆلۆکۆفی خاوەنی پەرتووکی مێـژووی سـەهیۆنی و هتد. ئەو ڕێکخراوە توندوتیژە یەکەمین لایـەن بـووە لـە کۆتاییـەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا کۆمەڵە جوولەکەکانی ناردووەتە فەڵەستین.

# THE PROTOCOLS

## OF THE MEETINGS OF THE LEARNED ELDERS OF ZION

TRANSLATED BY VICTOR E. MARSDEN



دەقە ئینگلیزییەکەی پرۆتۆکۆڵەکان

کە جوولەکەکان توانیان بیشارنەوە و نەیانهێشتووە جارێکی

دیکە لە چاپ بدرێتەوە !

تیرۆرستان لە ١٣ی مارسی ساڵی دا١٨٨١ قەیسەری ڕووسیا ئەسکەندەری دووەمیان تیرۆر کرد، موسا سمیلانسکی دەڵێ حکوومەتی ڕووسیا ددانی بە ڕێکخراوی عاشقانی سەهیۆن ناوە، ئەم سمیلانسکییە لەلای عەرەبەکانی فەلەستیندا زۆر ناسراوە و لەو کاتیدا هاتووەتە فەلەستین و سەر بە ڕێکخراوی عاشقانی سەهیۆن بووە.

ئەمەی خوارەوە پوختەیەکی پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی سەهیۆنە:

**پرۆتۆکۆلی یەکەم:**

نابێ سیاسەت لە هیچ شوێنێك و بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەخلاقدا یەکانگیر بێت و بگونجێ – جەختکردنەوە لەسەر بڵاوکردنەوەی عەرەق و شێتی و داوێنپیسیی زوو – زۆر پێویستە خراپەکاری بڵاوبکرێتەوە بۆ ئەوەی سوودی دەستەهەڵاتێکی یەکلاکەرەوە دەرکەوێ و سیستم بگەڕێنێتەوە بۆ ژیانی سرووشتی.

**پرۆتۆکۆلی دووەم:**

ڕوونەدانی گۆڕانکاریی هەرێمایەتیی دوای جەنگەکان، بۆ ئەوەی جوولەکە بتوانێ یارمەتیی مادی پێشکێش بکات و هەر دوو بەرەی جەنگ لەژێر ڕەحمەتیدا بن، ئەمەیش توانا بە جوولەکە دەبەخشێ ئەو سەرکردە و ڕابەرانە هەڵبژێرێ کە بتوانن بەرزەفتیان بکەن.

**پرۆتۆکۆلی سێیەم:**

بڵاوکردنەوەی هەژاری و بێدەرەتانی لەنێو کەسانی نێونەتەوەیی (الاممی) چونکە ئازادیی ڕادەربڕین و مافەکانی مرۆڤ لەبەر چاوی ئەو کرێکارەدڵ هیچ مانایەکی نییە کەوا کار پشتی چەماندووەتەوە.

**پرۆتۆکۆلی چوارەم:**

دەبێ کۆمارەکان لەسەر ئەم بنەمایانە دابمەزرێن و پێکبهێندرێن:

١-شۆڕشی کوێرانی پڕ لە بێسەروبەری و هەراوزەنا.

٢-داپلۆسین و تاکڕەیی.

٣- برەودان و ڕەواجدان بە بیرۆکەی یەکسانی و ئازادی، گەرچی دژ بە سرووشتی ڕەمەکییانەی مرۆییە.

٤- برەودان و بلاوکردنەوەی کێبڕکێی مادی و وەرچەرخاندنی جڤاك بەرەو جڤاکێکی خۆپەرستی دلڕەقی بێ ئەخلاق، بۆئەوەی تەنیا لەپێناو زێڕ و چێژ و خۆشییەکان هەوڵ بدات.

**پرۆتۆکۆلی پێنجەم:**

بلاوکردنەوەی دەمارگیریی ئایینیانە و عەشیرەتییانە- دەستوەردان لەگشت پەیماننامەییەك جا ئەگەر بەشێوەیەکی نهێنیش بێت- داماڵینی گەلان لە چەك- بەرزەفتکردنی ڕای گشتی.

**پرۆتۆکۆلی شەشەم:**

باوەڕهێنان بە کەسە نێونەتەوەییە (الاممی) تا جوولەکەکان بۆ بەفیڕۆدانی سامانی زەوی و بەرهەمی کشتوکاڵی بەرەو ئەو پیشەسازییەی دەڕژێتە دەستی جوولەکە و هاندانی کرێکاران بۆ حەزکردن بە سەرگەرمی و ڕابواردن و بێسەروبەری و زۆر داواکردنی زیادکردنی کرێ، بەردەوامیش کار بۆ بەرزکردنەوەی نرخی مادە سەرەکییەکان بکرێ بەشێوەیەك کرێکاران و خاوەنکارەکانیان شەکەت بکات- تێبینیکردنی گشت زیرەکییەکی نێونەتەوەیی و ڕاوەدوونانی یان لەنێوبردنی.

### پرۆتۆکۆلی حەوتەم:

شەکەتکردنی کۆی ئەو دەوڵەتانەی دەبنە تەگەرەی بەردەم پلانەکانیان، ئەویش بە هەڵگیرساندنی جەنگ لەنێوان ئەو دەوڵەتانە و هاوسێیەکانیان، ئەگەر ئەمەیش سەری نەگرت، دەبێ ئاگری جەنگێکی جیهانی خۆش بکرێ.

### پرۆتۆکۆلی هەشتەم:

زانستی ئابووری، بابەتی سەرەکیی زانستەکانی زایۆنییەکانە- پێگە و پۆستە گرنگەکان دەخرێتە ئەستۆی ئەو میللەت و نەتەوەیەی ئەخلاق و سرووشتیان تێکچووە، بۆ ئەوەی سەرشۆڕییەکانیان ببێتە ناوبڕی نێوان نەتەوە و ئەوان، بۆ ئەوەی ئەگەر لە فەرمانەکانی جوولەکە یاخی بوون پێشبینیی دادگەییکردن یان دەستگیرکردن و بەندکران بکەن.

### پرۆتۆکۆلی نۆیەم:

دووبارە پەروەردەکردن و فێرکردنی گەل و نەتەوەیەك پێش ئەوەی بیر و باوەڕی زایۆنیزمیی تیادا بڵاو بکرێتەوە.

### پرۆتۆکۆلی دەیەم:

سەهیۆنییەکان (زایۆنییەکان) باوەڕیان وەهایە گەلان گرنگی بە لایەنە پڕ لە باقوبریق و تەنتەنەکان دەدەن و ناچنە قووڵایی مەسەلەکانەوە، لێرەوە دەتواندرێ ئەو نوێنەرانەی گەلان بخرێننە نێو کایەی سیاسییەوە کە تەنیا بیریان لەلای چێژ و کەیف و سەفایە، بۆ ئەوەی نەتوانن گفتوگۆ لەسەر ئەو یاسایانە بکەن کە پێویستە وردەکارییەکانیان ئاشکرا نەکرێن، ئەمەیش ئازادیی کارکردن- دەنگدان

بەبێ لەیەکتری جیاکردنەوە و ناسینەوەی چینەکان ئاسان دەکات، ئەمەیش بۆ ڕێگەگرتنە لە توێژی ڕۆشنبیر بۆ نێو ئەو کایەیە- وێرانکردنی خانەوادەکان بە چاندنی تاکگەرایی و خۆپەرستی بۆ ئەوەی ئەقڵە بەهادار و پڕ لە شارەزاییەکان پێنەگەن و نەگەنە هیچ شوێنێك.

پرۆتۆکۆلی پانزەیەم:

پاراستنی ئەو بووکەشووشانەی لە پۆست و شوێنی گرنگ و هەستیار دادەندرێن هەروەها دروستکردنی شەرعییەت بۆ هەموو ئەو شت و فەرمانانەی لە دەوڵەتەکانیان وەك بڕیار دەخرێتە بەردەمیان.

پرۆتۆکۆلی دوانزەیەم:

کۆنترۆڵکردنی خانەکانی چاپ و پەخش و دەستگرتن بەسەر بڵاوکراوەی ئۆپۆزسیۆن و کەسانی بەرهەڵستکار، بە بیانووی ئەوەی بەبێ هیچ بنەما و پرەنسیپێك ڕای گشتی دەورووژێنن، بەڵام بڵاوکراوەی ڕێگەپێدراوی بەرهەڵستکاران تەنیا دژی ئەو خاڵانە دەوەستێتەوە کە نیازی گۆڕینیان ئاراستە کراوە، ڕاستییەکەی ئەو لە ناوەوە پەیوەست و لایەنگرە و ئەو بەرهەڵستکارانە ئاشکرا دەکات کە پێی لە خشتە براون.

پرۆتۆکۆلی سێزدەیەم:

تێپەڕاندنی یاسایە دژوارەکان، دواتریش ڕاکێشان و خستنە تەڵەی ڕای گشتی بە گرفتێکی نوێ بۆ ئەوەی سەرنجیان لەسەر یاسای تێپەڕێندراو لابچێت ، هەروەها ئاڵۆزکردنی پرسە سیاسییەکان- لەخشتەبردن و خافڵاندنی جەماوەری مێگەل و ڕەشۆکی بەجۆرەها سەرگەرمی و ڕابواردن و گەمە و کۆنترۆڵکردنی ئەنجامەکانی بەشێوەیەك خزمەتی وروژاندنی ڕای گشتی بکات و گوێوتاوی بوروژێنێ

و چاو و سەرنج و ئاگاییەکانی لەهەنبەر ئەو شتانەدا دوور بخرێنەوە کە بەدژی دەهۆندرێنەوە.

**پرۆتۆکۆلی چواردەیەم:**

گۆڕینی وێنە و وێنای چەمکە گشتییەکانی وەك ئازادی، لە ڕێگەی خستنەبەر باس و پێشنیازکردنیان و کارکردن بە دژی ئەو چەمکانە بۆ ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ.

**پرۆتۆکۆلی پانزەیەم:**

وێرانکردنی تاکایەتیی مرۆڤ و تەواو خاپوورکردنی بە چەند هزرێکی هێمایی تایبەت بە بنەما و ڕێبازی کۆمەڵە.

**پرۆتۆکۆلی شانزەیەم:**

پرۆگرامی زانکۆیەکان: ڕاگران و مامۆستایانی زانکۆیەکان بەپێی بەرنامەیەکی نهێنیی چاکداڕێژراو و تۆکمە ئامادە دەکرێن- دەرچووانی زانکۆیەکان لە ڕووی هزرییەوە لە پرسە سیاسییەکان دوور دەخرێنەوە- دەبێ بیلمەتییەکان لە ڕێگەی بەکێشکردن یان تەنانەت دژایەتیکردنیان لەنێو ببرێن بۆ ئەوەی نەگەنە پۆست و شوێنە گرنگەکان.

**پرۆتۆکۆلی حەڤدەیەم:**

شارەزایی و پسپۆڕی لە یاسا وەها لە خەڵك دەکات بەشێوەیەکی سارد و سڕ و توندوتیژ و کەللەڕەقانە پەروەردە بن و لە گشت ڕێباز و بیروباوەڕ و هەڵوێستێکیشیان دایان دەماڵێ، بە چاوێکی نامرۆڤانە و تەواو یاساییانە دەنواڕنە ژیان.

### پرۆتۆکۆڵی هەژدەیەم:

دەبێ گوتاربێژان بۆ وروژاندنی مانگرتنەکانی نێو جەماوەر و گەل ئامادە بکرێن، ئەمەیش دەرفەتی ناسین و ئاشکراکردنی کەسانی دژ و بەرهەڵستکار سانا دەکات.

### پرۆتۆکۆڵی نۆزدەیەم:

دەبێ تاجی ئازایەتی لەسەر سەری تاوانکاری سیاسی لاببرێ، ئەمەیش بە دانانی لە ریزی دز و پیاوکوژە بێزراوەکان، بۆ ئەوەی جڤاك چۆن بەچاوی بێزراندن و سووکورپیسوایی دەنوارێتە تاوانی ئاسایی، بەهەمانشێوەش لە تاوانە سیاسییەکان بنوارێ.

### پرۆتۆکۆڵی بیستەم:

سەهیۆن (زایۆنیزم) حوکمی جیهان دەکات، دەبێ حوکم و دەستهەڵاتەکەیان تەواو پێچەوانەی ئەو خراپەکاری و گەندەڵییە بێت کە لەنێو سیستمە نێودەوڵەتییەکاندا باوە، خودی ئەمەیش لە دروستکراوی دەستی زایۆنیزمە بۆ ئەوەی جیهان هەست بە جیاوازیی نێوان هەردوو سیستم بکات- لە دەوڵەتی جوولەکە و نیشتماندا دراو پشت بە هێزی بەرهەم و هێزی کار دەبەستێ، ئەمەیش ئەگەر و چانسی ئەودەست نەودەستکردنی بۆ دەرەخسێنێ جا ئەگەر کاغەز بێت یانیش تەنانەت لە دار دروست کرابێت.

### پرۆتۆکۆڵی بیست و یەکەم:

سامانی زایۆنییەکان بەهۆی قەرزە دەرەکییەکانەوە چەند هێندە دەبێتەوە، دواتریش بە دەرکردنی چەند (چەك و کۆمپیالەیەکی کەم

بەهای پارە)[٣] کە گشت مرۆڤێك دەتوانێ تیایدا بەشدار بێت، پشت بە قەرزە ناوخۆییەکان دەبەستن، ئەمەیش دەبێتە هۆی هەڵلووشینی سامان و پارەیەکی زیاد.

**پرۆتۆکۆلی بیست و دووەم:**

کاتێك سیستمی زایۆنی سەقامگیر دەبێت، بۆ گشت مرۆڤێك روون دەبێتەوە ئازادی لەسەر بنەمای هەڵوەشانەوە و خراپەکاری و گەندەڵی و کردنی گشت کارێکی دڵخۆشکەرانە و چێژبەخش و هەوەسبازی بنیاد نانرێ.

**پرۆتۆکۆلی بیست و سێیەم:**

لە دەوڵەتی زایۆنیدا (سەهیۆن) ئەخلاق دەسەپێندرێ و خواردنەوەی عەرەق و مەشرووب بە تاوانێکی گەورە دادەندرێ، چونکە عەرەق و مەشرووب مرۆڤ و ئاژەڵ دەهێنێتە یەك ئاست، کۆی ئەو هزرانەش لەنێو دەبرێن کە پاڵنەرەکەیان رەمەکە نەك ئەقڵ، بنەمای ئاژەڵییە نەك مرۆیی.

**پرۆتۆکۆلی بیست و چوارەم:**

گەورە بیرمەند و دەستەڵاتداری پرۆتۆکۆلەکان بە وەسفکردنی کاری پاشای دەوڵەتی زایۆنی کۆتایی بە پرۆتۆکۆلەکان دێنێت و

---

٣) بەڵگەنامەیەکە و بەهایەکی دیاریکراوی هەیە، ئەو لایەنەی دەری دەکات بەڵێن دەدات ماوەماوە سوودێك بداتە هەڵگرەکەی، ئەویش بەپێی رێکەوتێکی دیارکرلو دەبێت. واتا وەرەقەیەکی داراییە و بریتییە لە قەرزێك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، خاوەنی قەرزەکە شایستەی ئەوەیە سووی پێ بدرێ. دەشتواندرێ دەستاودەستی پێ بکرێ و حکوومەت و کۆمپانیا دامودەستگەیەکان دەری دەچوێنن

دەنووسیٚ: دەبیٚ حوکمێکی یەکلاکەرەوە بێت جا ئەگەر توندوتیژیش بێت، پلانە هەنووکەیی و خێرا و ئایندەییەکانی پاشا تەنیا پاشا و سیٚ لەو کەسانە دەیزانن کە فێریان کردووە. دەبیٚ پاشا لەلای هاوولاتیانی خۆشەویست و لەبەردلان و شکۆدار بێت، هەروەها دەبیٚ چەندان جاری بێشومار لەگەڵیان بئاخڤیٚ، ئەمجۆرە ڕێکارانە وادەکەن هێزی گەل و هێزی دەستەهەڵاتدار– کە لە ولاتانی نێونەتەوەییدا لە یەکتری جیاکراونەتەوە– لەوپەڕی هارمۆنیا و سازانێکی تەواودا بن.

کاتێکیش ئەم پرۆتۆکۆلانە بلاوکرانەوە، جووەکەکان زارەترەك بوون، ئەمەیش وای لە مرتزلی ڕابەریان کرد چەندان بلاوکراوە دەربکات و تیایاندا ڕایبگەیەنیٚ: لە قودسی ئەقداسدا[٤] هەندێك بەلگەنامەی نهێنی دزراون ئەمەیش بۆ ئەوە بووە نەکەوێتە دەستی ناکەسان و ئەوانەی ناتوانن بیپارێزن، جا ئەگەر گەورەی سەرۆەرانی جوولەکەش بێت، چونکە بلاوبوونەوەیان بەشێوەیەکی پێشوەخت و لەکاتی نەگونجاودا، جوولەکەکان لە جیهاندا دەخاتە نێو خراپترین بەلا و مەرگەسات و نەهامەتی.

---

٤) شوێنێکە و دەکەوێتە بەشی ناوەوەی خێمەی مووسا و هەیکەل ئۆرشەلیم بەو ناوە ناسراوە، پیرۆزترین شوێنیەتی. قودسی ئەقداس لەسەر شێوەی شەشپالو دروستکراوە. تەنیا تابووتی عەهدی تیادا بوو، هێمای پێوەندیی تایبەتی بەنی ئیسرائیلە لەگەل خودا. تەنیا سەرۆکی کاهینەکانی ئیسرائیل دەیتوانی سالی جارێك لە ڕۆژی جەژنی کەفارەتدا بەمەبەستی داگیرساندنی بخوور و ڕشاندنی خوێنی قوربانی بەسەر عەرشی سەر تابووتی ڕەحمەت بچێتە نێو قودسی ئەقداس. بەمشێوەیە سەرۆکی کاهینەکان ڕێکاری لێخۆشبوون لە گوناهی خۆی و گەلەکەی دەگرتە بەر. قودسی ئەقداس لە بەشەکانی دیکەی خێمەی کۆبوونەوە/ هەیکەل بە ناوبڕێك جیاکرابوویەوە، ناوبڕەکەش زۆر قەبە و ئەستوور بوو لە کەتانی بێگەرد و هێلی شین و مۆر و پەمەیی دروستکرابوو و شارۆبیمی زێڕینی لەسەر چنرابوو. ( سەلاح سەعدی).

دەکرێ بەراوردێکی نێوان نێوەڕۆکی پرۆتۆکۆلەکان و ئەو ڕووداوە سیاسییانە بکەین کە دوای چەند ساڵێك لە پرۆتۆکۆلەکان هاتنە پێشێ، وەك:

*پێشبینیکردنی ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامیی عوسمانی لەسەر دەستی جووەکان و پێش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل.

* پێشبینیکردنی خۆشکردنی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی کە تیایدا دۆڕاو براوە بەیەکەوە دۆڕان و تەنیا جوولەکەکان سوودیان لە غەنیمەت و دەستکەوتەکانی ئەو جەنگە وەرگرت.

* پێشبینیکردنی کەوتن و ڕووخانی سیستمی پاشایەتییەکانی ئەورووپا، ڕوون و ئاشکرایە ڕژێمی پاشایەتی لە ئەڵمانیا و نەمسا و ڕۆمانیا و ئیسپانیا و ئیتاڵیادا ڕووخان.

* پێشبینیکردنی بڵاوکردنەوەی ئاشووب و فیتنە و قەیرانێکی جیهانی و نێو دەوڵەتی و بونیادنانی ئابووری لەسەر بنەمای زێڕ، زێڕیش جوولەکە قۆرغیان کردووە.

چەندان پێشبینیی دیکەش هەن و ڕووداوە جۆراوجۆرەکانی بەدرێژایی چەندان ساڵی دوای سەردەمی زانای ڕووسی سێرجی نیلۆس هاتنە کایەوە، وەك کەوتنی ڕووسیای قەیسەری و بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم تیایدا کەوا بەشێوەیەکی زۆر ملهوڕانە و تاکڕەوانە حوکمی ڕووسیایان کرد و ئەو وڵاتە بووە چەق و مەڵبەندی بڵاوکردنەوەی کودەتا و پیلان لە جیهاندا.

## (٢)

## ويليام گای كار

## سەرەتا و كۆتايى!!



ویلیام گای کار دەڵێ لە ساڵی ۱۹۱۱ تا ساڵی ۱۹۵۰ گەڕان و پشکنینی کردووە تاکوو زانیویەتی ئەو جەنگ و شۆڕشانەی بەسەر جیهانەکەماندا زاڵن تەنیا دەرئەنجامی کودەتا و پیلانێکی بەردەوامی ئەهریمەنانەیە.

دواتر درێژە بە قسەکانی دەدات و ڕەگ و قۆناغەکانی کودەتا و پیلانەکە ئاشکرا دەکات و تیشک دەخاتە سەر ئەو بەشانەی جێبەجێکراون تا دەگاتە قۆناغی نووسین و بڵاوکردنەوەی پەڕتووکەکەی، بەچڕیش تاوتوێی جێبەجێکردنی چەند لایەنێکی دیکەی تەواوکەری هەمان پیلانی ئەهریمەنانە دەکات. بابزانین ویلیام گای کار کێیە؟

ویلیام گای کاری جەنەڕاڵی دەریایی لە حوزەیرانی ساڵی ۱۸۹۵دا لە لانکشایری ئینگلترا لەدایکبووە، خوێندنی لە ئیسکۆتلەندا تەواو کردووە، دواتر لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی وەك ئەفسەری دەریاوانی لە سوپای دەریاوانیی ژێرئاوکەڕەکان (الغواصات) دەستبەکاربووە، دواتر لە وەزارتی ڕاگەیاندن و نووسینگەی ڕاگەیاندنی زایۆنی و پاشانیش لە هەواڵگری ئەمریکی و کەنەدیدا کاری کردووە.

لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا... ژیانی سەرکێشانەی نێو دەریای دەستپێکردووە و بە ڕێگەی ئاوی بەرەو خۆرهەلات چووە ، لەوێدا چاوی بە بانگەشەکارانی کۆمۆنیستی کەوتووە و هەوڵیان داوە کاریگەری لەسەر هزرە پێنەگەیشتووەکانی بکەن، بەڵام زیرەك بووە و وای پێ باش بووە کەمێك بسەنگرێتەوە، بۆ ئەوەی بواری شرۆڤەکردنی ئەم بابەتەی بەتەواوی بۆ بڕەخسێ.

نووسـەر هـەوڵی باوەڕپێهێنانەکـەی بەسـەردا تێنەپـەڕیوە و نەچـووەتە ژێربـاری هـێزی کۆمۆنیسـتییەوە... دواتـر بـۆی ڕوون بووەتەوە کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی تـەنیا بەشێکی کودەتـا و پیلانێکی زەبـەلاحی نێودەوڵەتییـە، بانگەشەکارەکانیشـی جـەنگاوەران و داردەستی ئەهریمەنن و ئامانجیان لەنێوبردنی ئاین و نموونە باڵایەکانە بۆ ئەوەی دەرفـەتی گونجاو بـۆ سـەرکردەکانیان بڕەخسـێ بەتـەواوی جیهان بخەنە ژێر دەستانی خۆیانەوە.

لە سـاڵی ١٩٣١دا ، دەسـتی بـە بـەڕێوەبردنی چـەند کۆنگرەیـەك کردووە و لە چەند یانەیەکی جۆراوجۆری کەنەدیدا سەبارەت بە کودەتا و پیلانـە نێودەوڵەتییەکـە وانـەی گوتووەتـەوە ، بابـەتی وانـە و کۆنگرەکانیشی دوو پرسی سەرەکی بـوون: کۆمـۆنیزمی نێودەوڵـەتی و جیهانگـەرایی سـەرمایەداری. دواتـر لـە سـەردەمی جـەنگی دووەمـی جیهانیدا کاری بۆ هەواڵگریی کەنەدی کردووە.

هـەر لـە سـاڵی (١٩٥٠) وە و دوای خانەنشـین بـوونی لـە هێـزی دەریایی، بووەتە یـەکێك لـە گـەورەترین کەسـانی ئاوتوێکـاری کودەتـا هەرە گەورە و بەناوبانگەکەی دوای جەنگ.

لـەو کاتـەوەی وەسـەر پلیکانـەکانی پەیـژەی پۆسـتەکاندا سـەر دەکەوت... بەردەوامیش توێژینەوەی لەمەڕ سەرە داوەکانی کودەتـا و پیلانە هەرە گەورەکەی جووڵەکەکان دەکرد: بچوویایەتە هەر شوێنێکی جیهـان بەڵگەنامـەی کـۆ دەکـردەوە، دەیپشـکنین و لێیـان ورد دەبوویەوە، کاتێکیش بۆی بلوابایە بەرپەرچی بەدخوازیی دەدایەوە.

کاتێك ویلیام لە دوای جەنگی دووەمی جیهـانی پلـەی کۆمنـدۆری پـێ بەخشـرا، حـەوت پـەرتووکی لەچـاپ دابـوو، هـەر حـەوت

پەڕتووکەکەش وەرگێڕدرانە سەر چەندان زمان.. پەڕتووکەکانی ئەمانەن:

١) بۆ خاتری میوان.. بۆ خاتری خوا.
٢) فریشتەکانی قوولایی دۆزەخ.
٣) بەرز و وشك.
٤) ڕاوێكی بە نرخ.
٥) لە دەرەوەی تەمتومان.
٦) شكستێك لە باكوور.
٧) كلاوە مسیبیەكان و پانتۆلە فشەكان.

دواتر و لە نیوەی پەنجایەکانی سەدەی ڕابردوو (بیستەم) پەڕتووکی ( جیهان.. گەمەی دەستی ئیسرائیلە)ی لە چاپ دا، مەبەستیشی لە بلاوکردنەوەی ئەم پەڕتووکەدا ئاشکراکردنی هۆیەکانی تێکچوون و داڕووخان و شەڕ و ململانێی نێوان نەتەوەکان و بەرپابوونی جەنگ و شۆڕشەکان بوو.. ناوبراو لەم پەڕتووکەدا ئەم وێرانی و تێکچوون و نزمبوونەوەیەی داوەتە پاڵ ئەو کەسانەی کە بە (دەستە شاراوەکان) ناویان دەبات و سەرکردە و گەلان وەك گەمەی دەستی خۆیان و مۆرەی شەترەنج هەڵدەسووڕێنن! ئەو هێزە شاراوانەی لە پەڕتووکەکەدا ناوی بردوون مەبەستی حاخام و ئیمپراتۆرە ئابوورییەکانی جوولەکەیە و بەو (نوورانییانە ناوی بردوون کە سیستمی نوێی جیهانییان هێناوەتە ئاراوە).

ناوبراو پێی وایە ململانێ لەسەر گۆی زەویدا ململانێیەکی هەتاهەتاییی نێوان خێر و شەڕ و باشە و خراپە و باوەڕ و بێ باوەڕییە، پێشی وایە ئەو بێ باوەڕی و خوانەناسییەی (الحاد) نوورانییەکان لەنێو

توێژی گەنجاندا برەوی پێ دەدەن و تێکچوونی ئەخلاق بەسن بۆ هەڵوەشاندنەوە و لاوازکردنی ئەوگەل و نەتەوانە بۆ ئەوەی نوورانییەکان پیلانە بەدخواز و نەگریسەکانیان جێبەجی بکەن. ئەوجا ویلیام لە پەرتووکەکەی خۆیدا چاوی بە مێژوو و بنەچەی جوولەکەکاندا گێڕاوەتەوە و بە بنەچە و ڕەگ و ڕیشەی جوولەکەکان و بنەمای ڕەچەڵەکیان و دابەشبوونیان لە ئەورووپادا جێگەی بایەخپێدانی بووە.

دواتریش دەچێتە سەر باسکردنی ڕۆڵی مەترسیداری جوولەکە لە شۆڕشە جیهانییەکان، ئەو ڕۆڵ و کاریگەرییەش هەر لە نیوەی سەدەی هەژدەیەمەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە کاتی تەواوکردنی پەرتووکەکەی لە نێوەڕاستی پەنجایەکانی سەدەی ڕابردوو... لە شۆڕشی ئینگلیزییەوە دەستپێدەکات و دواتریش بە فەرەنسی و ڕووسی و لە کۆتاییشدا جەنگی یەکەمی جیهانی دەگرێتەوە.

نووسەر لە پەرتووکەکەی خۆیدا باسی نەگریسی و چەپەڵی و پیلانە دوورمەودایەکانی جوولەکە دەکات بۆ بڵاوکردنەوەی شەڕخوازی و بێدینی و تێکچوونی ئەخلاق، بەگشت چەك و ئامرازێکەوە کە لە پۆست و پێگە بەرزەکانی بەکرێگیراوی جوولەکە لە وڵاتاندا دەستپێدەکات، یانیش بەهۆی ساختەکاری و بەرتیل و هەڕەشەکردن لە کەسانی پلە باڵا و وەزارەتەکانەوە دەگەنە ئەم مەرامەی خۆیان.!

هەندێکجاریش بەهۆی دروستکردنی قەیرانی داراییەوە ئەو نیازە گڵاوەیان دەهێننەدی ، هەروەك چۆن لە ئەمریکا و بریتانیادا بردیانە سەر. وڵاتانیان بە قەرز شەکەت کرد و بوونە هۆی هەژارکردن و برسییەتیی گەلانی ستەملێکراو!

ویلیام پێی وایە کۆمۆنیزم دوژمنی یەکەم و سەرسەختی مرۆڤایەتییە[٥] و جوولەکەکان بۆ هێنانەدیی مەرامی تێکوپێکدانی جیهان بەخراپ سوودیان لە کۆمۆنیزم وەرگرتووە. نەك هەر ئەمە، بەڵکو پێی وایە چەرچل و ڕۆزفلت و ستالین مۆرەی شەترەنج و گەمەی دیکەی دەستی جوولەکەن. ڕاشی گەیاندووە هێتلەر لە گشت سەرکردەکانی دیکە باشتر درکی بە مەترسیی جوولەکە کردووە لەسەر جیهاندا.. ڕاستە نووسەر دەستخۆشی لە هێتلەر ناکات لەپای ئەو قەسابخانە و خوێنڕێژییەی دەرهەق بە جوولەکەکان بەڕێوەی برد... بەڵام بەلای کەمەوە پاساوی بۆ هێناوەتەوە... ویلیام لە زانیارییەکانی خۆیدا پشتی بە زۆرێك پەرتووکی پێشوو و گوتاری نێو گردبوونەوەی نوورانییەکان و دەستنووسی پارێزراوی نێو پەرتووکخانە گشتییەکان بەستووە... وەك دەستنووسی ئەو نامەبەرەی لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا کەوتە دەستی حکوومەتی باڤاری.

نووسەر هۆشداریی لەهەنبەر پەرتووکی بەناوبانگی ( پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی جوولەکە) دەدات و پێی وایە لە ئایندەدا مەترسیی گەورە دروست دەکەن، هەروەها چەند چارەسەرێکی

٥) نووسەر لە زۆر شوێندا هێرشی توند دەکاتە سەر ڕێبازی کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم، بەڵام مەرج نییە من وەك وەرگێڕێك لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی نووسەر تەبا و کۆك بم، وەڵێ وەك ئەخلاقیاتی کاری وەرگێڕان دەبێ دێڕ بە دێڕی نێو پەرتووکەکە وەربگێڕم و بەهیچ شێوەیەك نە دەستکاری بکەم و نە هیچ بڕگە و پەرەگرافێکی لێ لابدەم. ئەوە کاری کەسانی سەر بە ڕێبازی کۆمۆنیزم و سۆسیالیزمە پەرتووکەکە بخوێننەوە و ڕای خۆیانی لەسەر دەرببڕن و ئەگەر نووسەرەکە کەوتبێتە هەڵەوە یان هێرشی ناڕەوای کردبێ، بۆ خۆیان بە نووسین وەڵامی بدەنەوە. (سەلاح سەعدی).

کردارپش بۆ پەرچدانەوەی ئەو مەترسییانە دەخاتە ڕوو.. لێتان ناشارمەوە کۆی ئەو هۆشدارییانە چەند پێشبینییەك بوون بەدرێژایی پەنجا ساڵی ڕابردوو وەڕاست گەڕان... دوا هۆشداریی ناوبراویش لەمبارییەوە ئەو قەیرانە دەستکردە داراییەیە کە هەنووکە جیهان بەدەستییەوە دەناڵێنێ!

نووسەر پێش مردنە پڕ لە نهێنی و تەمومژاوییەکەی هەردوو پەڕتووکی (ئەهریمەن میری جیهان) و (تەمی سووری سەر ئەمریکا)ی چاپ و بڵاوکردەوە، بەردەوامیش بە سەرانسەری جیهاندا دەگەڕا و گوتار و وانەی پێشکێش دەکرد و چەندان نامەی دەنووسی و لە کۆبوونەوەکاندا بەشداری دەکرد و هۆشداریی دەدا و دەیگوت ئەگەر ڕێبەر و سەرکردە و دایبابان و پیاوانی ئایینی و مامۆستایانی ئایینی و خوێندکاران و کرێکاران و گشت مرۆڤێك بەو پیلان و کودەتایە ئەهریمەنییەی جوولەکە نەزانن کەوا جیهانی کردووەتە گەمەی دەستی خۆی، ئەوا چارەنووسی مرۆڤایەتی لەسەر دەستی سەربازانی ئەهریمەنەوە بەرەو کۆیلەبوونێکی تەواو دەچێت.

ویلیام گای کار لە تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٥٩دا لە هەلومەرجێکی پڕ لە ڕەمز و ڕاز و تەمومژاویدا مرد، ڕۆژنامەکان هیچ شتێکیان سەبارەت بە مردنەکەی باس نەکرد، ئەمەیش نیشانەی ئەوەیە ویلیام کار بە لەنێوبردنی فیزیکییەوە پاکتاوکراوە... چونکە ببووە تەگەرەی بەردەم نەخشە و پیلانی کودەتایە ئەهریمەنییەکە.

ئەم پەڕتووکەی ناوبراو " جیهان... گەمەی دەستی ئیسرائیلە" بیرمەندان بە دەنگی ئاگادارکردنەوەی ئاقڵانی جیهانیان داناوە بۆ

ئەوەی گەلان لە پێناو بەرپەرچدانەوە و تێکشکاندنی هێزی دڵڕەشی شەڕخوازی یەکبگرن.

زۆر کەس هەن جەخت لەوە دەکەنەوە ویلیام کار زەنگ مرۆڤێك باجی ڕاستگۆیی داوە و هەموو ژیانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزە شەڕخوازەکان تەرخان کردووە، هەر بۆیێ پەرتووکەکەی دوای چەند ڕۆژێکی زۆر کەم لە بڵاوبوونەوەی بەشێوەیەکی نائاسایی دیار نەما، نەك هەر ئەمە... خودی نووسەریش دوای ماوەیەکی کەم لە دیار نەمانی پەرتووکەکەی لە هەلومەرجێکی لێڵ و شاراوە لەگەڵ منداڵەکان و ژنەکەیدا دیار نەمان، دەستە شاراوەکە هەر بەمەش نەوەستا، بەڵکو دەستدرێژیی کرایە سەر دەستگەی چاپ و پەخشەکەش و ئەو دەستگەیانە بەشێوەیەکی کتوپڕ مایەپووچ بوون و دەرگەکانیان داخران و بەڕێوەبەرانی بزربوون. ئەمەیش مەسەلەیەکە و زیاتر لە چەندان نیشانەی پرسیاری بێ وەڵام دەورووژێنێ، تەنیا یەك وەڵامیشی هەیە ئەویش ڕقوکینەی هێزە شەڕخوازەکان لەپشت ئەو مەسەلانەوە بووە و تاکە ئامانجی دەمکوتکردنی گشت ئەو کەسانەیە بخوازن ڕووبەڕووی بوەستنەوە.

**ئەم پەرتووکە لە بازاڕەکاندا بە چەند ناوێك ناسراوە و بریتین لە:**

١) جیهان ... گەمەی دەستی ئیسرائیلە، ئەمە دەقە ڕەسەنەکەیە (الاصلی).

٢) مۆرەکانی سەر داشی شەترەنج.

٣) جوولەکە... لەپشت گشت تاوانێکەوەیە.

زۆر کەس پێیان وایە مردنی تەمومژاویی ویلیام کار دەستی زایۆنیزمەکانی لەپشتە، چوونکە نووسەر بەهۆی پەرتووکی ((مۆرەکانی

سەر داشی شەترەنج یان جیهان گەمەی دەستی ئیسرائیلە)) هەروەها دەستڕاگەیشتنی بە بەڵگەنامەیەکی مەترسیدار پەردە لەسەر ڕاستینەی جووەکان هەڵماڵیوە، هەموو ئەو شتانە دەسەلمێنێ کە ویلیام گای کار لەبارەیانەوە درکاندوویەتی، پیلانەکانیانی خستووەتە بەرچاو، بەڵگەنامە مەترسیدارەکەش بریتییە لە گوتارێکی نهێنیی گەورەترین حاخام بەناوی ئیمانۆئیل ڕابینۆڤیچ کە لە ڕۆژی ١٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٢ لە کۆنگرەیەکی نائاسایی لیژنەی لەناکاوی حاخامەکانی ئەورووپا لە بۆدابێست خوێندبوویەوە، بەڕێوەبەرایەتیی هەواڵگریی کەنەدیش دەقێکی گوتارەکەی دەستکەوتبوو، ویلیام گای کاری کۆماندۆریش دانەیەکی ئەو بەڵگەنامە گرنگ و مەترسیدارەی وەگیرکەوتبوو. ویلیام کار لە هەلومەرجێکی زۆر لێڵ و تەماویدا مرد، زۆر کەس جوولەکەکانیان بە کوشتنی ناوبراو تۆمەتبار کرد.

**ئەمەیش دەقی گوتارە نهێنییەکەیە کە ویلیام کار دەستی کەوتبوو دواتریش بڵاوی کردبوویەوە:**

سڵاوتان لێبێ ئەی ڕۆڵەکانم، بانگی ئەم کۆبوونەوەیە تایبەتەم کردوون، بۆ ئەوەی بە هێڵە سەرەکییەکانی ڕێبازە نوێیەکەمان ئاشناتان بکەم، ئەویش ڕێباز و بەرنامەیەکی تایبەتە بە جەنگی داهاتوو. وەك دەزانن، پێویستبوو پلانە بنەڕەتییەکەمان بۆ ماوەی بیست ساڵ دوا بخەین، بۆ ئەوەی بتوانین لەو ماوەیەدا ئەو دەستکەوتانە پتەو بکەین کە بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانییەوە وەدەستمان هێناون، بەڵام چەند ڕێکار و ڕێنماییەکی نوێ دەرچوون و

بۆ ئێمە ناردراون و داوا دەکەن پێنج ساڵی ئەم مۆڵەتە بیست ساڵییە کەم بکرێتەوە..

دەبێ پێتان ڕابگەیەنم ئەو ئامانجەی ماوەی سێ هەزار ساڵە و تا ئێستە کاری لەسەر دەکەین، ئێستە کەوتووەتە دەستمان، بۆیێ لەسەرمان پێویستە لە کۆتاییدا بەروبوومەکەی بڕنینەوە و هەوڵەکانمان چڕتر بکەینەوە و ئەوپەڕی بلیمەتی و شارەزایی بۆ کۆ بکەینەوە. ئێستە دەتوانم دڵنیاتان بکەمەوە چەند ساڵێکی کەمی ماوە گەلەکەمان پێگەی یەکەمینی خۆی لە جیهاندا وەرگرێتەوە کە مافێکی سرووشتی خۆیەتی و ماوەی چەندان نەوەی دووردرێژە لێی زەوت کراوە، بەمەیش کاروبار و پرسەکان دەچنە سەر ڕەوتی سرووشتیی خۆیان و جوولەکە دووبارە دەبێتەوە سەرۆك و سەروەر. ( چەپڵە ڕێزانێکی بە گوڕ).

ئێستە سەبارەت بە ڕێنماییەکانی تایبەت بە جەنگی داهاتوو بیرۆکەیەکتان پێدەبەخشم: ئێوە ئەو بەرنامە و ڕێبازە سەرکەوتووەتان لەبیرە کە ساڵی ١٩٣٠ پێڕەومان کرد و بە تەواوی سەرکەوتنی وەدەستهێنا، هەڵمەتی سەرانسەریی پڕوپاگەندە توانی لە ئەڵمانیا ڕقوکینە دژ بە خۆرئاوا و دژی سامییەکان بوروژێنێ، دواتریش وروژاندنی ڕقوکینە لە خۆرئاوا دژ بە گەلی ئەڵمانی بەهۆی دوژمنایەتیی ئەڵمانی لە هەنبەر سامییەکان سەرکەوتنی وەدەستهێنا.

ئەمە هێڵی سەرەکیی بەرنامە و ڕێبازی هەنووکەییمانە کە ئێستە پێڕەوی دەکەین، ئێمە لە خۆرهەڵاتدا هەڵمەتێك دژ بە خۆرئاوا و لە خۆرئاواش دژ بە خۆرهەڵات بەڕێوە دەبەین، دژایەتیی ئەو گەل و نەتەوانەش دەکەین کە بەبێلایەنی دەوەستن و ناچاریان دەکەین

خۆیان بەلای بلۆك و سەربازگەیەكدا بدەن، ڕێگەش نادەین هیچ كەسێك ڕووبەڕوومان بوەستێتەوە، بەتایبەت ئەگەر ویستی ئاستی توندیی ململانێیەكە دابەزێنێتە خوارەوە و هێوری بكاتەوە.

بێگومان دوا ئامانجیشمان لەم پلانەدا جەنگی سێیەمی جیهانییە كە شوێنەوار و وێرانكارییەكانی لە گشت جەنگەكانی پێشوو زۆرتر و بەرفراوانترە، هەوڵیش دەخەینە گەڕ ئیسرائیل لەم جەنگەدا بێلایەن بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لە شوێنەوار و كاریگەرییەكانی بە دوور بێت و لە هەمان كاتیشدا ببێتە بارەگەیەكی لیژنەكانی نێوبژیوانی و ڕاوێژكاری و چاودێری و ... هتد كە ئەوكات ئەركی سەرپەرشتیكردنی پرسی گەلانی دەخرێتە سەرشان، ئەم جەنگە دوا جەنگەمان دەبێت لە ململانێی مێژوویی دژ بە جوییم، ئەوسا شوناسی ڕاستینی خۆمان ئاشكرا دەكەین و ڕووی شاراوەی خۆمان بۆ جیهان وەدەر دەخەین.

لە دوای جەنگی سێیەمی جیهانی هیچ ئایینێك نامێنێ، هەروەها پیاوانی ئایینیش لە گۆڕێدا نامێنن، چونكە بوونی ئایینەكان و پیاوانی ئایینی بۆسەر ئێمە مەترسین و دەتوانن سەروەرییوونی داهاتوومان بەسەر جیهاندا لەنێو ببەن، چونكە ئەو هێزە ڕووحییەی ئایین لە دەروونی باوەڕداراندا زیندووی دەكاتەوە، دواتر بوێریی ئەوەشیان لە دەرووندا دەژێنێتەوە دژمان بوەستنەوە، ئێمە ڕێوڕەسم و نەریتە ڕووكەشەكانی ئایینی جوولەكە دەپارێزین، ئەمەیش تەنیا بۆ یەك مەبەست ئەویش پاراستنی ئەو بەستەرەی تاكەكانی گەلەكەمان بەیەكەوە دەبەستێتەوە و لێناگەڕێین هیچ بیانییەك بەهۆی ژن و ژنخوازی و هتد بێتە نێو ئایینەكەمانەوە.

لەوانەشە لەپێناو دوا ئامانجماندا هەمان کردە دووبارە بکەینەوە کە لە ڕۆژگاری هێتلەردا بەڕێوەمان برد، واتا ئێمە خۆمان چەند ڕووداوێکی چەوساندنەوە و ستەمکاری دژ بە چەند کۆمەڵە و تاکەکانی گەلەکەمان ڕێکدەخەین، بە واتایەکی دیکە لە ڕووداوگەلێکدا چەند ڕۆڵەیەکی گەلەکەمان دەکەینە قوربانی، خودی ئەو ڕووداوانەش خۆمان دەیانورووژێنین و لە پشت پەردەوە ئاراستەیان دەکەین، بۆ ئەوەی لە لایەك پاساوی ڕاکێشانی سەرنج و پاڵپشتیی گەلانی ئەورووپا و ئەمریکا و تەواوی جیهانمان بکەوێتە دەست، لەلایەکی دیکەشەوە پاساوی دادگەییکردنەکانی دوای جەنگیش فەراهەم بکەین، ئەمەیش لەپێناو دادگەییکردن و دواتریش دەرکردنی فەرمانی کوشتن و لە سێدارەدانی ئەو سەرکردە و ڕێبەرە سەربازییانەی دژ بەیەك دەجەنگن، هەروەك چۆن لە دادگەییەکانی نۆرمبرگ بەڕێوەمان برد.

لەوانەیە قوربانیدان بە چەند هەزار کەسێك لە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان زۆر گەورە و تراژیدی بێت، بەتایبەت کاتێك خۆمان کار بۆ لەنێوبردنیان بکەین بۆ ئەوەی تۆمەتەکە بخەینە پاڵ خەڵکی دیکەوە، لەوانەیە قوربانییەکە زۆر گەورە بێت، بەلام لەپێناو دوا ئامانجمان: سەرکردایەتیکردن و سەروەریوون بەسەر جیهاندا، نابێ سڵ لە هیچ قوربانییەکی گەورە و بچووك بکەینەوە.

***

## (٤)

# پیلان و کودەتای جوولەکە و
# قووچەك و دۆلاری ئەمریکی






ڕوون و ئاشکرایە حاخامەکانی جوولەکە لە لێکدانەوەی مانایە نهێنییەکانی کتێبە پیرۆزەکاندا بانگەشەی دەستهەلاتی ڕەها دەکەن، پێشیان وایە ئەو دەستهەلاتە ڕەهایە بەهۆی سرووشێکی خواوەندییانەی تایبەتەوەیە... بەلام بانگەشەیەکی لەمجۆرە هیچ گرنگییەکی نییە، ئەگەر کۆی ئەو کەسانە ئامرازێکیان لەبەردەستدا نەبێت سرووشەکانیان بخەنە واری کرداری و جێبەجێکردنەوە... لەبەرئەوە ژمارەیەك سووخۆر و گەورە حاخامەکان و بەڕێوەبەران و دانایان کۆبوونەوە و بڕیاریان دا جڤاتێکی نهێنی دامەزرێنن کار بۆ وەدیهێنانی مەبەستەکانیان بکات، ناویشیان لێنا کۆمەلگەی نوورانی (The Illuminati..)

وشەی نوورانی لە وشەی لوسفیر (Lucifer) وەرگیراوە و مانای هەلگری تیشك و ڕۆشنایی یان بوونەوەرێکی زۆر ڕۆشن دەگەیەنێ... بەمشێوەیە، مەجمەعی نوورانی بۆ جێبەجێکردنی سرووتە تایبەتەکانیان دامەزراوە.. لەمەوە دروستیی ( کەنیشتی ئەهریمەن) مان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کاتی خۆی مەسیح لە هەنبەریاندا بەکاری هێناوە و بەم زاراوەیە وەسفی کردوون.

سەرانی ئەنجوومەنی بالای جڤاتی نوورانیی جوولەکە سەبارەت بە کاروبارەکانی ئایین و بیروباوەڕەکان و ئاهەنگ و بۆنە ئایینییەکان و سرووتەکان بانگەشەی هەبوونی زانیارییەکی بەرز دەکەن.. هەر ئەو کەسانەش باوەڕی خوانەناسیی مادییان دارشت کە لە سالی ١٨٤٨دا لە مانیفێستی کۆمۆنیستی بلاوکرایەوە و لەلایەن کارل مارکسەوە نووسرا بوو.

مامی کارڵ مارکس حاخامێکی جووله‌که بوو، به‌ڵام به‌شێوه‌یه‌کی ڕه‌سمی له‌ بواری که‌هنووتیی باڵا دابڕا.. به‌مشێوه‌یه‌ ده‌بینین جووله‌که‌کان جارێکی دیکه‌ ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ سه‌ر بنه‌مای هاوبه‌شیی شاراوه‌. دروشمی نوورانییه‌کان قووچه‌که‌ و سینبوڵی کوده‌تا و پیلانێکی ئامانجداره‌ بۆ ڕووخاندنی که‌نیسه‌ی کاسۆلیکی – وه‌ك نوێنه‌ری مه‌سیحییه‌تی جیهانی– و دامه‌زراندنی ده‌سته‌ڵاتێکی دکتاتۆری که‌ حکوومه‌تێکی جیهانی له‌سه‌ر شێوازی نه‌ته‌وه‌ یه‌ککگرتووه‌کان به‌ڕێوه‌ی ببات.

ئه‌و چاوه‌ی له‌سه‌ره‌وه‌ی قووچه‌که‌که‌یه‌ تیشك بۆ گشت لایه‌ك ده‌نێری:

ئه‌مه‌ سینبوڵی ئاژانسی سیخوڕیکردن و تیرۆر و تۆقاندنه‌.. له‌سه‌ر شێوازی گوستابۆ (هه‌واڵگریی ئه‌ڵمانیی سه‌رده‌می هیتله‌ر). وایز هاوپت له‌ژێر دروشمی برایه‌تیدا دایمه‌زراند، ئه‌مه‌یش بۆ پاراستنی نهێنییه‌کانی ڕێکخراوه‌که‌ و ناچارکردنی خه‌ڵك بوو بۆ ئه‌وه‌ی به‌ تۆقاندن خه‌ڵك له‌هه‌نبه‌ر یاسایه‌کانی ملکه‌چ بکه‌ن.

ئه‌م ئاژانسه‌ ڕۆڵێکی گه‌وره‌ی له‌ ده‌سته‌ڵاتی تیرۆرستیی دوای شۆڕشی فه‌ره‌نسیدا هه‌بوو.

ئه‌و دوو وشه‌یه‌ی له‌سه‌ر هه‌ردوو دروشمه‌که‌دا هه‌ڵکۆڵراون، مه‌به‌ست Annuit Coeptis واتا : ئه‌رکه‌که‌مان ( کوده‌تا و پیلانه‌که‌مان) سه‌رکه‌وتنی وه‌ده‌ستهێنا.

به‌ڵام وشه‌کانی ژێر دروشمه‌که‌ که‌ بریتین له‌: Novus Ordo Seclorum سرووشتی ئه‌رکه‌که‌ ڕوون ده‌که‌نه‌وه‌، ماناکه‌شی سیستمی نوێی جیهانییه‌.

ئەوەی جێگەی سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە ئەم دروشمە تەنیا لەکاتی یەکگرتنی سیستمی ماسۆنییەت و ئۆرگانەکانی نوورانییەت لە سەروبەندی کۆنگرەی فیلمسباد ماسۆنییەکان لە ساڵی ١٧٨٢ وەك دروشمی خۆیان هەڵیانبژارد.




لە دەقە ئینگلیزییەکەی ڤیکتۆر مارسدنی ڕۆژنامەنووسی ئینگلیزی، بەڵگەنامەیەك بڵاوکراوەتەوە وێنەی مارێکی تیادایە کە خۆی لە گۆی زەوی ئاڵاندووە، کلك و سەری مارەکە لە کردەی خۆئاڵاندنەکەدا بەیەك دەگەنەوە، ئەمەیش مانای ئەوەیە پیلانەکە تەواوە و هیچ کەلێن و کەموکورتییەکی تیادا نییە.

مارەکە هێمای هەژموونی جوولەکەیە، هەروەها دروشمی هێزی پاشایە بەهێزەکەیانە، ئەم دروشمە لە فیرعەونییەکان دزراوە. چونکە مار لە لای فیرعەونییەکاندا هێمای دانایی و هێز و زۆرزانی بووە، فیرعەونییەکان پەیکەری زێڕیان بۆ داتاشیوە و تەنانەت لەسەر تاجی پاشایەکانیشیاندا هەبووە.

مارسدن دەڵێ: پێدەچێ ئەم دروشمە مۆری پرۆتۆکۆلی سەرانی زایۆنیزم بێت، وێنەی قووچەکە بریسکەدارەکەی خوارەوەی دروشمەکەش واتای پێوەندییەکی کۆن بە فیرعەونەکانی میسر دەگەیەنێ. هەروەها گەورە جەمسەرەکانی ماسۆنییەتی جیهانیش ددانیان پێیدا ناوە، بەوەی کە باوەڕ و سینبوڵ و ئاماژەکانیان فیرعەونیی میسرییە و بەهۆی بەنی ئیسرائیلەوە بۆیان گوازراوەتەوە کە لە میسردا ژیاون و پاشانیش ئەوێیان جێهێشتووە.

لە پەند و حیکمەتی کۆنی چینیی کۆنیشدا ئەوە دۆزراوەتەوە کە: سێگۆشەی سەر ئاو، واتا بەدی و خراپە، بازنەش گوزارشت لە کوشتن و خوێنرێژی دەکات، ئەمەیش هێزێکە و سێگۆشەی سینبولی خراپەکاری دەپارێزێ.

ئەگەر لە مۆری سنبولی ماسۆنییەتیش رابمێنین –لەسەر سەت دۆلاری ئەمریکیدا– مەسەلەکە مۆرکێکی مکوڕانەتر بەخۆیەوە دەگرێ. قووچەکەکەی سەر ئەم جۆرەیان هێمای هەبوونی دەستەڵاتێکی دکتاتۆرییە کە دەمامکی دیموکراسیزمی پۆشیوە– حکوومەتێکی یەککگرتووی جیهانی لەژێر سیستمی نوێی جیهانیدا بەڕێوەی دەبات. ( باوەڕی ئەمریکی لەسەر دۆلار– فائیز ئەلبەرازی).

ڕێبەری پرۆتستانتیەتی توندڕۆ باوکە بات ڕۆبرتسۆن جەخت لەوە دەکاتەوە ئەم دروشمەی سەر دۆلار هیچ پێوەندییەکی بە ڕزگارکردنی ئەمریکاوە نییە، بەڵکو خاوەنەکەی: ئادەم وایز هاوبتی دامەزرێنەری ڕێکخراوی ئەهریمەنیی: (ئەنویرە) و دزەی کردووەتە نێو ماسۆنییەت و پارتی کۆمۆنیستی رووسیا و مێزی خەپی ئینگلترا و ئەنجوومەنی پێوەندییەکانی ئەمریکا و ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی یەدەگی فیدراڵی،

کۆڕبەندی پیشەسازییە سەربازییەکان، بە شێوەیەکی گشتی دزەی کردووەتە نێو زۆر شتی ئەمریکا.

ناوبراو بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێی وایە: ئەوەی ئەم مۆرەی لەسەر دۆلار دیزاین کردووە، پیاوێك بووە بە ناوی چارلز تۆمبسۆنی ئەندامی ڕێکخستنی کۆنگرێس کە ماسۆنییەکی دڵسۆز بووە. بەڵام ئەو دەستەواژەیەی لە خوارەوەی مۆرەکەدا بە لاتینی نووسراوە ئەگەر وەربگێڕدرێتە سەر هەر زمانێك واتای: (سیستمی نوێی جیهان) دەگەیەنێ. چاوە بریسکەدارەکەی سەرەوەی قووچەکەکەش بە لێکدانەوەی بات ڕۆبێرتسۆن، چاوی ئۆزیریسی خواوەندی میسری کۆنە و ماسۆنییەکان لە کاتی ئاهەنگە نهێنییە گرنگەکان بۆی دەگەڕێنەوە.

بەڵام شیکردنەوەی ویلیام گای کاری جەنەراڵی ئەمریکی سەبارەت بە مۆرەکە بەمجۆرەیە: چاوی سەرووی قووچەکەکە تیشك بۆ گشت لایەك دەنێرێت و هێمای ئاژانسی هەواڵگری و شۆفاری و تیرۆر و تۆقاندنە و وایز هاوبت لەژێر دروشمی برایەتی و بۆ پاراستنی نهێنییەکانی ڕێکخراوەکە و ناچارکردنی خەڵك لە ڕێگەی تۆقاندنەوە بۆ ملکەچیکردنیان لەهەنبەر یاسایەکانیان دایمەزراندووە. هەر دوو وشە هەڵکنراوەکەی سەرەوەی دروشمەکەش (Annuit Coeptis) واتا ئەرکەکەمان سەرکەوتنی وەدەستهێنا. بەڵام وشە هەڵکەنراوەکانی خوارەوەی دروشمەکە (Novus Ordo Seclorum) سرووشتی ئەرکەکە لێکدەداتەوە و مانایەکەشی: ( سیستمی نوێی کۆمەڵایەتییە). ئەوەی جێگەی تێبینیکردنە ئەوەیە ئەم دروشمە تەنیا لە کاتی تێکەڵبوون و یەککرتنی سیستمە ماسۆنییەکان و ئۆرگانە نوورانییەکان

له سەرویەندی کۆنگرەی فیلمسبادی ساڵی١٧٨٢ لەلایەن ماسۆنییەکان وەك دروشم هەڵبژێردراوە.

بیار هیپیس پەڕتووکێکی بەناونیشانی: ( لەپێناو دکتاتۆریەتی جیهانیی جوولەکەدا) نووسیوە و تیایدا نووسیویەتی: دۆلار دراوێکی تەواو زایۆنییە، لەمیانیەوە سیستمی نوێی جیهانی ڕاگەیەندراوە.

پێشتریش.. جیریمیۆی وەزیری دادی حکوومەتی فەرەنسی کە بەبنەچە جوولەکەیە و ماسۆنییەکی پلە (٣٣)یە واتا پلە بەرزە و یەکێکە لە ڕێبەرانی بزووتنەوەی نەژادپەرستی جوولەکەی جیهانی لە ساڵی ١٨٤٨دا گوتوویەتی:

( ئەو ڕۆژە نزیکبووەتەوە ئۆرشەلیم ببێتە ماڵی نوێژ و ئاڵای خواوەندی لەسەر بشەکێتەوە، تاکە ئاڵای ئیسرائیل، لەسەر دوورترین کەناراوەکان دەشەکێتەوە، هەرگیز نابێ جوولەکە ببێتە هاوڕێی مەسیحی و موسڵمان، پێش ئەوەی نووری باوەڕ هەڵبێت، ئاینی تاکە ئەقڵ، کە وادەی هەڵاتنی بۆ هەموو جیهان هاتووە، ئەمەتا ئاماژەکەی لەسەر دۆلاری ئەمریکیدا ڕۆشنایی دەبەخشێتە هەموو ئەو کەسانەی لەچاپی دەدەن، بۆ ئەوەی مژدەی سیستمێکی نوێی جیهانیی پێبدەن کە تیایدا مەسیح دووبارە دەگەڕێتەوە).

با بگەڕێینەوە سەر شیکردنەوەی ئاماژەکانی سەر دۆلار... لە خوارەوەی دەستەواژەکەی پێشوو: سیستمی نوێی جیهاندا دەستەواژەیەکی ئینگلیزی بەمجۆرە نووسراوە (the Greatseal) واتا مۆری مەزن، وشەکانی سەرەوەی دروشمەکەش بە واتای سەرکەوتن بۆ ئێمە یان ئەرکەکە سەرکەوتنی وەدەستهێنا وەرگێڕدراون، هەروەها مانای مەزنی سەرکەوتوو یان پاشای تاکانەی

هەمووان یان مۆری میسری یان میسری مەزن دەگەیەنن، لەبەرئەوە دەکرێ بەمشێوەیە لە مانایەکانی سەر دۆلار تێبگەین:

( ئەنگوستیلە یان مۆری مەزنی پاشای پاشایان)، بنەڕەت و هۆکارەکانی پێکهێنانی کەسییەتییەکەش بۆ میسر دەگەڕێتەوە.

لە لێکۆڵینەوە و شەنوکەوکردنی بەردەوامیشدا ڕوونبووەتەوە ئەو دوو وشەیە بە فڕەنسی واتا ( قیبتیی مەزن) قیبتیش میسرییە نەك مەسیحی هەر وەك باوە.

ڕێکەوت و مێژووی ژمارە هەڵکەندراوەکانی سەر بنکەکە بە پیتی لاتینی نووسراون واتا وشەی Mocclxxvi ئەو مێژوو و ڕێکەوتە دەگەیەنێ کە تیایدا بە ڕەسمی (ڕێکخراوی نوورانی) یەکەمین بەردی بناغەی کردارییانەی بۆ دانرا و بۆ داگیرکردنی مێشك و دواتریش خاك و سامانی سەر گۆی زەوی کەوتە کار، نەك مێژووی سەربەخۆیی ئەمریکا.

هەڵۆیەکەی سەر دۆلاریش ئەستێرەیەکی شەشگۆشەی جوولەکەی لەسەر سەرە، دوو قووچەکی دژ بەیەکن و سیمبولی جوولەکە و زایۆنیزم و گۆی ئەو شتانەیە کە پێوەندییان بە کەلتووری عیبری و قەوارەی جوولەکەوە هەیە.












ژمارەی ئەو ئەستێرانەی ئەستێرە شەشگۆشەکە پێکدەهێنن لەسەر دۆلاردا ١٣ ئەستێرەن نەك زیاتر. هەروەها پێنووسە لوولەییەکانیش لەسەر کلکی هەڵۆیەکەدا ژمارەیان تەنیا ١٣یە. ژمارەی ئەو ڕم و حەربەیەی لەنێو دەستانی هەڵۆیەکەدایە ١٣ حەربەیە. هەروەها

ژمارەی گەڵای سەر چڵی زەیتوونەکەی نێو دەستی هەڵۆیەکەش سێزدە گەڵایە. هەروەها ژمارەی چینە پێکهێنەرەکانی قووچەکەش واتا ئەوەی چاوە پاسەوانەکەی لەسەرە سێزدە چینن و سێگۆشەیەکی دیکەی تیشکدەری لەسەرە.




**بزاوتەکە واتای نوێژی ماسۆنییە شەیتانپەرستەکان دەگەیەنێ**

واتایەکەشی ئەوەیە کە ئەسباتەکان ڕۆڵەی یەعقووبن، ١٢ سەبت، بە ئەسباتی ئیسحاق و ئیبراهیم ناودێرکراون. ئەسباتەکان لقێکی بەنی ئیسرائیل - یەهوودن- وەك ئەو تیرە و هۆزە عەرەبانەی ڕۆڵەی ئیسماعیل بوون. لە سوورەتی ئەعرافیشدا لە قورئاندا هاتووە: ( وقطعناهم اثنتی عشرة اسباطا امما) واتا: کۆمەڵە و تیپ. هەروەها خاوەنی ئەلکولیان لە موعجەمی موحیتولموحیتدا نووسیویەتی: ( هەر یەکێك لە کوڕانی ئیسماعیل قەبیلەیە، هەر یەکێك لە کوڕانی یەعقووب سەبتە). پرسیارەکەش ئەوەیە: ئەدی ئەوەکەی دیکە لە کوێوە هاتووە، بۆ ئەوەی ژمارەکەیان لەسەر دۆلاردا ببێتە ١٣؟

یەکەکە لە گشت دوانزەکانی پێشوو گرنگترە. بەقەدەر هەموویانە. ڕاستییەکەی ئەو یەکە خۆی بۆ ئەوان زیاد کردووە، بوونەتە ۱۳سەبت جا ئەگەر بە ساختەییش بێت. ئەوان ( جوولەکەی الخزرن). کە نووسەرێکی جوولەکە و زانای ئینسکلۆپیدی لە ساڵی ۱۹۸۳دا بە مردنێکی گوماناوی مردووە و ناوی ئارسەر کیستلەر بووە لە پەڕتووکەکەی خۆیدا بەناوی (هۆزی سێزدەیەم) یەهودییەکانی بە ئەلخزر ناوبردووە، واتا تیرەی سێزدەیەم کە جوولەکەکانی ئەمڕۆژگارەن.

کاتێکیش ویلیام گای کار لە پەڕتووکەکەی خۆیدا باسی دۆلاری ئەمریکی و چۆنییەتیی پێوەندییەکەی بە ئەستێرەی ڕەش و چاوەکە دەکات و ناوی لێناوە چاوی هەڵو و وەك چاوێکی هەمیشە کراوە و بێدار وەسفی کردووە، هەروەها پێوەندیی قووچەکە سێیینەکە بە ڕەهەندەکانی وێنەکە و ئەو ئاسمانەی لێکداوەتەوە کە ئەگەر لە دۆلارەکە سەراوژێری بکەیتەوە وێنەی کەشتییەکی نێو دەریات دەکەوێتە بەرچاو، هەر ئەمەیشە موحەمەد عیسا داوود تیشکی خستووەتە سەر کاتێك باسی نهێنیی شتە شاراوە و داپۆشراوەکان و زۆر مەسەلەی دیکەی ئاژانسی ناسا و هەواڵگریی فیدراڵیی ئەمریکی و هەوڵەکانی زۆریەی مەڵبەندەکانی ئاسمانی و وشکایی و دەریاییش دێنێتە گۆڕێ کە سەبارەت بە بزربوونەکانی سێگۆشەی بەرمۆدا هەنگاویان بۆ هەڵێنراوە، کۆی ئەو مەسەلانەش پێوەندییەکی پتەویان بەو دەستە شاراوەیە هەیە کە ڕۆبێرت ویزهاوت لە کۆنگرەیەکی ئەمریکی و لە ڕاگەیاندنێکی ڕوون و ڕەواندا تیشکی خستووەتە سەر، کۆنگرەکەش لەپێناو وەدیهێنانی قەوارەیەکی ئایینیی جیاواز بەسترا

کە پشتگیری لە گشت جۆرەکانی خوانەناسی بکات، سەرۆکی ئەو ڕێکخراوەش بە پلەی یەکەم ویزهاوتە و دواتریش چەندان ڕێکخراوی نهێنی بەدواداهات ، بەڵام ئێستە لە گشت بەرەیەکدا بووەتە خاوەنی نیشتمان و پارێزیەندی و ئاسایش.

***

## (٥)

## قەیرانی دارایی جیهانی..

## و ڕاستگەڕانی پێشبینییەکانی ویلیام کای کار



هەموومان بەو قەیرانە گەورەیەی بێبازاڕی (الکساد) دەزانین کەوا لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا سەرانسەری جیهانی گرتەوە، بەلام کەس باوەڕی بەوە نەدەکرد دووبارە بێتەوە، خەلك پێی وابوو ئەستەمە سەرهەلبداتەوە، هەروەها پێمان وابوو جیهان وانە و پەندێکی تالی لێ فێربووە و هەرگیز ڕێگە بە دووبارەبوونەوەی نادات.

بەلام قەیرانی دارایی جیهانی بەهۆی قەیرانی بارمتەی زەویوزارەوە لە ئەمریکادا سەری هەلدا و قەیرانێکی ڕاستین بوو پێشتر کەس پێشبینیی نەکردبوو، بەتایبەت لە ولاتێکی وەك ئەمریکای خاوەن گەورەترین و زەبەلاحترین ئابووریی لەسەر گۆی زەویدا، ڕاستە ئەو ولاتە پەندی لە سەدەی ڕابردووش وەرگرتبوو و ئازار و تالیی بێبازاڕییە گەورەکەی چەشتبوو، زیانەکانیشی گەیشتبوونە چەند ژمارەیەکی هێندە مەزنی گەردوونی هیچ ئەقلێك نەیدەتوانی لێکی بداتەوە، زیانەکانی قەیرانەکە نەك هەر تەنیا بۆ ئابووریی ئەمریکا، بەلکو زیانی بە ئابووریی گشت ئەو ولاتانە گەیاند کە بە ئەمریکاوە پابەند بوون و لە خولگەی ئەودا دەخولانەوە.

گەمەکردن بە بازاڕ بەردەوامە، چونکە هێزی پالنەری پشت داڕووخانەکە چەند سەوداگەرییەکی ( (مضاربات) بازرگانییە، چونکە سیستمی ڕێکخستنی تایبەت خزمەتی بەرژەوەندییەکانی سەوداگەرکەان دەکات کە ڕاستییەکەی داڕووخانی بازاڕەکان دەکاتە پڕۆژەیەکی قازانجبەخش بۆ هەندێك کەس و لایەنی دیکە.

بەم دەستەواژە ورووژێنەرانە مایکل چۆسۆدۆفسکیی نووسەری ئەمریکی دەست بە گوتارەکەی دەکات کە لەژێر ناونیشانی " کێ

لەپشت دوا داڕووخانی ئابوورییەوەیە"، ئەمە پرسیارێکی فراوانە و بواری لێکۆڵینەوە لەهەنبەر ئەو کەسانەدا خۆش دەکات کە لەپشت داڕووخانی بانك و بۆرسە و بازاڕەکانی ئەمریکاوە بوون، بەو شێوەیەی لە دوا هەفتەکاندا بینیمان.

ڕاستییەکەی ئەگەر مرۆڤ لەهەنبەر دوا لێدوانەکانی هێنری بۆڵسۆنی وەزیری خەزێنەی ئەمریکی هەڵوەستەیەك بکات و بە وردی لە مەسەلەکە بنواڕێ، ورووژان و گومانەکانی پتر دەبن، بابزانین بۆڵسۆن چی گوتووە؟

ئەم پیاوە جەخت لەوە دەکاتەوە پەنجەی تۆمەتبارکردن ئاماژە بە چەند کەس و پارتێکی نێو ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاوە دەکات کە لە چەند ساڵی ڕابردوودا هەڵەی وەهایان کردووە بەشێوەیەکی زۆر گەورە ڕۆڵی لە هەڵگیرسانی قەیرانە داراییە جیهانییەکەدا هەبووە و ئابووریی ئەمریکا و جیهانی کردووەتە پۆشی بەردەم ڕەشەبا، بەشێوەیەکی تەواو دڵنیا و ڕەهاش وڵاتەکەی خۆی بەرپرسیار دەزانێ، بۆڵسۆن لە قسە و لێدوانەکانی بۆ تۆڕی فۆکس بیزنس دەڵێ:" ئێمە بەداخین لەهەنبەر ئەو هەڵانەی کران و بوونە هۆی بەرپابوونی گەورەترین لەرزە و داڕووخانی دارایی جیهانی کەوا جیهان ماوەی حەوت دەیە بەدەستیەوە دەناڵێنێ"، لەمەیشدا ئاماژەی بە تاوانێکی گەورە کردووە، تاوانەکەش شکستهێنانە لە کۆنترۆڵکردنی بازاڕ و شکستی سیستمە داراییەکان.

ئایا جوولەکانی ئەمریکا لەپشت دروستکردنی ئەم قەیرانەوە بوون؟.. ئەو گوتانەی مایکل چۆسۆدۆفسکی وەك تۆمەتبارکردنێکی شاراوەی ئەوانە و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەنجەی تاوانیان بۆ درێژ

دەکات و جۆرە پێوەندییەکیشی بە ڕاستییەکی مێژووییەوە هەیە، ئەویش ڕۆڵی جوولەکە سەوداگەرەکانی نێو ئەمریکایە کە بەهیچ شێوەیەك بەرژەوەندیی ولاتەکەیان بەلاوە گرنگ نییە، چونکە ئەوان وەك ئامانج دەنوارنە پارە نەك وەك ئامراز، ئەمەیش جۆرە بەهایەکە بە درێـژایی دوو هـەزار سـاڵ لـە سەرانسـەری جیهانـدا لـە مێشکیاندا چەسپاوە. ( سەبارەت بە ڕۆڵی گریمانـەیی جوولەکە لـە قەیرانەکەی ئێسـتەدا دوور لـە بـیردۆزی کودەتـا-ئـەمیل ئـەمین- ڕۆژنامـەی ئەلخەلیج).

لـە کـاتی جـەنگی سـەربەخۆیی ئـەمریکا ( ١٧٧٥-١٧٨١) سووخۆرە سەوداگەرە جیهانییەکان، زۆربەیان جوولەکەی ئەورووپی بوون لە ململانێی توندوتیژی نێو خاکی نوێدا دەرفەتێکی نایابیان بۆ زیـاترکردنی قازانجـەکانیان وەدەسـتهێنا، لەبەرئـەوە خـەریکی هەلگیرساندنی جەنگ و بەردەوامیدان بەو جەنگە بوون.

لێرەدا بۆ یەکەمین جار ڕۆڵی کۆمەڵـەی ئـابووریی ڕۆچیلدییەکان خۆی بەدیاردەخات، ئەو کۆمەڵەیە لە هەرێمی هیسی ئەڵمانی گەنجانی بەکرێگیراویان بۆ حکوومەتی ئینگلیزی ئامادەکرد بۆ ئـەوەی لەژێر ئاڵای بریتانیدا بەشداری شەڕ بکەن، هەروەها بۆ بەرپەرچدانەوە و سەنگەرگرتن دژ بە سەربازانی جۆرج واشنتۆن پارەی پێویستیان وەك قەرز دایە حکوومەت.

لەنێو بەڵگەنامە مێژووییەکاندا دەبینین قازانجە ئابوورییەکانی ڕۆچیلدییەکان بەهۆی ئەمەوە چەندە زیادی کردووە و چۆنیش بازرگانییان بە چەکەوە کردووە و شۆفارییان بۆ هەریەکە لە ئینگلیز و ئەمریکییەکان کردووە و هەوڵی لەخشتەبردن و سەرنجڕاکێشانی

هەردوو لایەنیان داوە بۆ ئەوەی پانتایی جوگرافیی جەنگەکە فراوانتر بکەن، ئایا ڕۆڵی داراییانەی جوولەکە هەر لە سنووری جەنگی نێوەخۆیی ئەمریکیدا مایەوە تەنانەت دوای ئاشکرابوونی ئەم ڕۆڵەشیان؟ سەبارەت بە بازاڕەکانی وۆڵ ستریت و بۆرسەشەوە ٤٠٪ جوولەکەکانی ئەمریکا کە ژمارەیان ٦ ملیۆن کەسە و لە نیویۆرکدا دەژیەن، بۆ کەسێکی وردبینی ڕووداوەکە بەسە دەرئەنجامی لێ هەڵێنجێ.

ئەم زانیارییانەی پێشوو ئەو پرسیارە لە مێشکماندا دەوروژێنن: ئاخۆ ئەگەری نەخشە و پیلانگێڕییەکی شاراوە لە پشت ڕووداوەکانی نێو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەبووە؟ ئەدی ڕۆڵی بەشدار یان سەریەخۆی جوولەکە لەو ڕووداوانەدا چی بووە؟ لە سەرەتادا هەموو لایەك دەزانن کە بانکی لیمان برازەرس بە بنەچە و ڕەچەڵەك جوولەکەیە و یەکێکە لە گرنگترین ئەو بانکانەی لە بواری زەویوزار و خانووبەرەوە وەبەرهێنانی کردووە و بەهۆی هەرزانیی زەویوزار و دواتریش فرۆشتنی بە نرخێکی زۆر گرانەوە قازانجی خەیاڵیی وەدەستهێناوە، بەڵام لە کاتی دابەزینی نرخی زەویوزار و خانووبەرەوە پشکی عەقارییانەی بانکەکان لە بۆرسەدا هێندە دابەزی گەیشتە ئاستی داڕووخان. لەبەرئەوە بانکی لیمان مایەپووچی و قەللۆش بوونی خۆی ڕاگەیاند، بە واتای پابەندنەبوونی بە دانەوەی پارەی ئەو کەسانەی پارەیان لە بانك دانابوو، بەمەیش چەند بانکێکی هاوشێوە مایەپووچ بوون و خوێندنەوەکانی بنجامین فرانکلین ڕاست دەرچوون دوای ئەوەی پارەی پاشەکەوتکراوی ئەمریکی بەهەوادا چوو

و سەرلەنوێ لە کێلگە و کارخانەکانی سەوداگەر و سووخۆرەکاندا دووبارە کەوتەوە نێو دۆخی کرێگرتەیی.

لە دۆخێکی وەهادا دوو وەڵام دەکەونە بەردەممان، هەردووکیشیان ڕۆڵی جوولەکە بە دوور نازانن، یەکەمیان پێوەندی بە بارودۆخ و پێگە و پلە ئابوورییەکانی جوولەکە و ئاستی پەسندکردن و ڕەتکردنەوەی جوولەکەکانەوە هەیە لەلایەن جڤاکی ئەمریکییەوە، دووەمیش تایبەتە بە چوارچێوەی چۆنییەتیی بەکارهێنانی دەستگە جیهانییە داراییەکانی جوولەکەوە لەلایەن ئەمریکاوە بۆ ڕێگەگرتن لە جەمسەری داهاتوو-چین- و ڕووسیای سزاری کە ئێستە لەخەو متبوونی قووڵی خۆی بێداربووەتەوە، بۆ ئەوەی هیچ کامێکیان نەگەنە پێگەی هاوبەش و بەشدار لە حوکمکردنی جیهان و ئایدۆلۆژیای پارێزگەرانی نوێ تا کۆتایی سەدەی بیست و یەکی ئەمریکی بڕ بکات. سەبارەت بە ڕەهەندی یەکەم دوو لقی لێ دەبێتەوە، یەکەم پێویستی بە خستنەڕووی ڕاپۆرتی چوارەمی ساڵانەی پەیمانگەی پلاندانی سیاسیی گەلی جوولەکەوە هەیە لە جیهان کە سەر بە ئاژانسی جوولەکەیە و دینیس ڕۆسی وەزیری پێشووی ئەمریکا سەرۆکایەتیی دەکات و گەیشتووەتە ئەو دەرئەنجامەی کە بڵێ:" کردەی پێشکەوتنی ئابووری لەلای زۆربەی جوولەکەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان گەیشتووەتە ترۆپك و ئەوە نابیندرێ بەرتەمایی هەوڵدان بۆ گەیشتن بەم ترۆپکە هەبێت، ئەمەیش مەسەلەیەکی سەرنجڕاکێشە و پێویستی بە ئاگایی و سەرنجی زۆر ورد و پرسیارێکی کاریگەر هەیە: ئایا ئەو کاتە هاتووە جوولەکان- بەو سەرمایە زەبەلاحەی بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان وەدەستیان هێناوە- وەك خۆ ئامادەکردنێك بۆ جەنگە هەرە

مەزنە ڕووحییەکەی مێژووی هاوچەرخی بەنی ئیسرائیل لە سەرانسەری جیهانەوە بگەڕێنەوە ئیسرائیل؛ ئەو جەنگەی بریتییە لە یەکگرداچوونەوەی نەتەوە و گەلانی چواردەوریان و لەپێناو بیرۆکەی بنیادنانی هەیکەل و سەرێرگە و گەڕاندنەوەی پاشایەتی و مولکی سولەیمان و گشت ئۆرگانێکی دیکەی تەوراتی بەڕێوە دەبرێ؟ بە تایبەت لە کاتێکدا ڕوخسار و نیشانەکانی وەدیهیاتنی کۆی ئەو مەسەلانە خەریکە لەمیانی چەند کۆمەڵەیەکی توندڕۆی تەوراتیدا لە ئاسۆدا دەردەکەون و ماوەماوە هەڵدەکوتنە سەر گۆڕەپانەکانی مەسجیدولئەقسا؟

چوارچێوەی لقی دووەمیش بریتییە لەو ترس و نیگەرانییەی ڕووچاری لووبیی جوولەکە بووەتە و تایبەتە بە ئایندە و چارەنووسیان لە سایەی ئەو دابەشبوون و کەرتبوونە نێوەخۆییانەی دووچاریان دەبێتەوە، هەروەك چۆن بەسەر کۆمەڵەی گی ستریتدا هات و لە ئەیپاك جیابوونەوە، هەروەها لە سایەی ئەو ڕەتکردنەوە گەشەسەندووەی لە بواری پراگماتیکی دارایی و سیخوڕیی بواری ئاسایش هاتەپێش (ئەگەر گوزارشتەکە پڕ بە پێستی خۆی بێت).

لێرەدا مافمان هەیە ئەو شتە بیر بێنینەوە کەوا بەمدوواییانە ئالان شویتزی پرۆفیسۆری جوولەکەی ئەمریکی و مامۆستای بەناوبانگی قوتابخانەی یاسا لە زانکۆی هارفارد ئاماژەی پێ کردووە" بەردەوامبوونی هەژموونداترین کەمینەی جوولەکە لە مێژووی جوولەکەی ئەمریکادا مەترسی ڕووی تێدەکات، ئەگەر هەر ئێستە کارێکی دەگمەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم مەترسییە نەکەین.

ئەم لێدوانە ئەو زانیارییانە پشتڕاستی دەکەنەوە کەوا ئاژانسی هەواڵی جوولەکە JTA بەمدواییانە پەردەی لەسەر لادا و ڕایگەیاند: جۆرە هەست و مەزەندەیەك لە بازنە و خولگەی سەرکردایەتیی هەندێك ڕێکخراوی ئەمریکیی لایەنگری ئیسرائیل بڵاو بووەتەوە و پێیان وایە ئیسرائیل جەنگی کاریگەری دروستکردن لەسەر ئەقڵ و دڵی ئەمریکییەکان دەدۆڕێنی. ئاژانسەکە دەڵێ: ئەو ئیسرائیلەی لە پاراستنی لایەنگری و پشتگیریی دەستەبژێری سیاسی ئەمریکی بۆ پاڵپشتیکردن لە سیاسەتەکانی خۆی سەرکەوتنی وەدەستهێنا، ئێستە لەگەڵ گەلی ئەمریکیدا ڕووبەڕووی گرفتی پێوەندی بووەتەوە کەوا خودی بەرپرسە ئیسرائیلییەکان ددانیان پیایدا ناوە و بووەتە شتێکی حەتمی و دەبێ بەوپەڕی مکوڕبوونەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن.

کەواتە ئایا کاتی ئەوە هاتووە ئەم بوون و قەوارەیە لەنێو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا پەردەی لە ڕوودا دابماڵدرێ؟ لەبەرئەوە ڕەوتێکی پێچەوانە لە واشنتۆن و نیویۆرکەوە بەرەو تەلئەبیب دەستی پێکردووە؟ ئایا سەرەتایەکانی گەڕانەوە دەستی بە قاچاغچییەتی و بردنی نارەوای دارایی کردووە، واتا ئەو مەسەلەیەی لە گشت ولاتێك و شوێنێکی پێشووی ژیانیاندا زۆر لێی شارەزا بوون؟

وەڵامەکە بۆ خوێنەری ئەقڵمەند جێدەهێڵین و دەچینە سەر پرسیارێکی دیکە: ئایا جوولەکەکان لە کودەتایە هەرە مەزنەکەی دژ بە ولاتی چین بەتایبەت و ڕووسیا بە شێوەیەکی گشتی، ئامرازی دەستی ئەمریکا بوون ؟

سنۆک هۆنگنبیگی نووسەر و لێکۆڵەری ئەمریکیی بە ڕەچەڵەك چینی لە پەرتووکەکەی خۆیدا بەناوی (جەنگی دراوەکان) باس لە

کودەتایـەکی هاوبەشـی جوولەکـە- ئـەمریکی- ئـەورووپی دەکـات بـۆ تێکـدانی ئـابووریی چـینی -پـەرجوو- لـەمیانی دەسـتەوەردان و هەڵبەزاندن و دابەزاندنی دۆلار و پاشەکشەکردنی بەشێوەیەکی جیهانی و بەرزکردنەوەی نرخی نەوت لە جیهانـدا و پترکردنـی بـەهای ڕاسـتینی زێڕ لەلایـەن خانـەوادەی ڕۆچیلد و دارودەسـتە نهێنییـەکانی لـە گشـت جیهانـدا، خـودی ئـەم مەسـەلانە بەسـن بـۆ هێدمەگەیانـدن و گـوزر وەشاندنی چاوەڕوانکراو لە ئابووریی چینی.

ئەوانـەی باسمـانکردن پـەردە لەسـەر ئـەو ڕووداوانـەی ئـەمریکا لادەدەن کە ڕوویان دا و بەردەوامیش ڕوو دەدەن؟

بێگومـان، چـونکە ئـەو حکوومەتـە شـاراوەیەی وۆڵ سـتریتی کـۆنترۆڵ کـردووە و تـەنیا لقێکـی حکوومـەتی جوولەکـەیی مـەغۆلیی جیهانییـە و خانـەوادەی ڕۆچـیلد لـە ئینـگلترا دایمەزرانـدووە. شـریب سبرینۆفینیشی نووسەری بەرەچەڵەك ڕووسی و خەڵکی ئەسکەندنافیا نەخشەی چەندان پیلان و نهێنی و کودەتـا بـڵاو دەکاتـەوە کـە نـاکرێ لێرەدا لێیـان بـدوێین و هـەر هـەموویان بنووسـین، لەوانەشـە قـەیرانی دارایی جیهانی سەرەتای ژانی لەدایکبوونی جیهانێکی نوێ بێت توانـا و ویستی مرۆڤ بکاتە گاڵتـەجاڕ، هـەر ئـەم مەسـەلەیەش بـوو ولیـام گـای کاری ئەدمیرال لە پەڕتووکە گرنگەکەی خۆی (بـەردەکانی سـەر داشـی شەترەنج) پێی گەیشتووە، بەتایبەت کاتێك چاوێك بە هەردوو وشەکەی سـەر دۆلاری ئەمریکیـدا دەگێڕینـەوە یەکـەمیان ANNUIT COEPTIS کـە واتـای " کودەتایەکـەمان سـەری گـرت و سـەرکەوتوو بـوو، دووەمـیش NOVUS ORDO SECLORUM کـە واتـای " سیستمی نوێی کۆمەڵایەتیی جیهانی " دەگەیەنێ.

# پێشەکی

## کودەتا و پیلانگێڕییەکی نێودەولەتی

ئەگەر ئەو شتەی من لەم پەڕتووکەدا خەریکم پەردەی لە ڕوودا هەڵماڵم، بۆ خوێنەر دەبێتە هێدمەیەك، هیوادارم هێدمەکە نەیخاتە نێو سەرگەردانی و شپرزەبوون و ئەو هەستەی لەلا دروست نەبێت پێی وابێت لە حوکمدان لەسەر مەسەلەکان بەهەڵەدا چووە، بەڵکو لە خوێنەر دەخوازم لەمیانی ئەم نووسراوەدا کە لە ساڵی ١٩١١ەوە خەریکی ئامادەکردن و نووسینیم، درك بە ڕووداوەکانی چوار دەوری خۆی و ئەم جیهانە بکات.

پرسیارێك بەردەوام لە مێشکمدا دەخولایەوە و بەدوای وەڵامەکەی هەڵوەدا بووم؛ بۆچی ڕەچەڵەکی مرۆڤ لە ئاشتیدا ناژیەت و لەبەرچی دانیشتووانی گۆی زەوی لە خێر و خۆشی و نیعمەتە زۆروزەوەندەکانی خودا بێبەشە، هەندێك خەنییە و هەندێکیش گەنی؟

من تا ساڵی ١٩٥٠ نەمتوانی ڕۆچمە نێو ڕاستییەکەوە. چونکە لەم ساڵەدا زانیم ئەو جەنگ و شۆڕشانەی ژیانمانیان کردووەتە پووشی بەردەم ڕەشەبا و ئەو هەراوزەنا و بێسەروبەرییەی جیهانەکەمانی بەرزەفت کردووە، هەر هەموویان دەرئەنجامی کودەتا و پیلانگێڕییەکی بەردەوامی ئەهریمەنییانەن.

لەمیانی کارە بەردەوامەکەشم بۆ دەرکەوت هێزێکی ئەگریسی ئەهریمەنی هەیە هەندێکجار بە ئاشکرا و زۆربەی جاریش لەپشت پەردەوە، ڕووداوەکان دەخولقێنێ.

ئـەم هێـزە ئەهریمەنییـە ئەنجوومـەن و دانیشـتنە بـەدخوازەکانی جوولەکەیـە و لـەمیانی چـەند نەخشـە و پـیلان و کودەتایـەکی بـێ هەدادانەوە دەست لە بارودۆخی جیهان وەردەدات و بە ئارەزووی خۆی دەستکارییان دەکات، هیچ هێڵێکی سووریشی نییە، خەڵکانێکی مێندە بـەدخواز بـەڕێوەی دەبـەن تۆزقاڵێـك سـۆز و بـەزەییان نییـە، هـیچ پێوەندییەکیشیان بەو مرۆڤایەتییەوە نییە کە ئێمەی مرۆڤ بە یەکەوە کۆدەکاتـەوە، چـونکە مرۆڤایـەتییان لێ دامـاڵیون، بـە ئامـانجی جێبەجێکردنی کودەتایەکانیان لەپێناو چنگ گیرکردن لە جیهان و دواتریش خـاپوورکردنی، گاڵتـە و گەمـە بـە گشـت پـیرۆزی و جوانی و چاکییەك دەکەن.

من بەدیار وەدەستهێنانی ئـەو وەڵامانـە زۆر چاوەنوار بووم کە ڕووداوەکانی ئەم جیهانە لێك دەدەنـەوە، تـاوەکو سـاڵی ١٩٥٠ داهـات، ئـەوکات تـوانیم خـۆم بخزێنمـە جیهانـە ژێرزەمینییـەکان و کـون و حەشـارگەی پیلانگێـڕە جوولەکـەکان و پاسـەوان و پارێزەرانیـان، دەستیشم بەو دۆسـییە زۆر نهێنـی و پارێزراوانـە ڕاگەیشـت کـە مێنـدە بەلایانەوە گرنگە تەنانەت ئاو لە کوشتنی هەموو ئەو کەسانە ناخۆنەوە ئەگـەر تـەنیا بیانـەوێ لێـی نزیـك ببنـەوە، چ جـای ئـەوەی بەتـەواوی دەستیان پێی ڕابگات!

ئەم کودەتایە لەو بەشەی گەردووندا دەستیپێکرد کە ئێمـە بـە – فیردەوس– ناوی دەبەین کاتێك ئەهریمەن بەرەنگاریی مافی خواوەندی بوویەوە و پێی خۆش نەبوو تەنیا وشە و فەرمانەکانی ئەو –خودا– لـە هەموو شتێ بەرزتر بێت. پەڕتووکە پیرۆزەکـان بۆمانیـان باسـکردووە چـۆن کودەتـای ئەهریمـەنی لـە جـەنانتو عەدەنـەوە گواسـتراوەتەوە

جیهانی زەمینیمانەوە. ئەو ڕاستی و شتە ئاسابیە پەرشوبلاوانەی لە گشت شوێنێکی ئەم جیهانەدا وەگیرم کەوتن ئەلقەکانیان بزربوون و بەشێوەیەکی زنجیرەدار نەکەوتبوونە دەستم و نەمدەتوانی ڕێکیان و بخەم سەرەدەرییان لێ دەربکەم، ئەم دۆخەم بەردەوام بوو تا گەیشتمە ڕاستی و زانیم جەنگەکەمان لەگەڵ کەسانی ئاسایی خاوەن گۆشت و خوێن نییە.. بەڵکو لەگەڵ چەند هێزێکی ڕووحی و هزریی نێو ژێر زەمینە تاریکەکانە و زۆریەی بەرپرس و کەسانی باڵای سەرانسەری جیهانیان بەرزەفتکردووە. لێرەدا شەرمیش ناکەم ددان بەوەدا بنێم ئینجیل بوو ئەو کلیلەی خستە مشتم تا بتوانم بکەمە وەڵامی گشت پرسیارەکانی پێشووم.

هۆی ململانێی سەرزەوی چەند هێزێکی شاراوەن وەك ئێمە لە گۆشت و خوێن نین و جەنگە هەتاهەتاییەکەش هەر لەو کاتەوە هەڵگیرسا کە ئیبلیس لەهەنبەر مەزنیی خواوەندی ئافرێنەری مەزندا یاخی بوو، من ماوەی ٣٩ ساڵ بەدوای ئەم نهێنییەدا عەوداڵ بووم.

## قۆناغەکانی پیلانگێڕی و کودەتایەکە

لە ساڵی ١٧٨٤دا قەدەر وای ویست بەڵگەی تەواو و بێ ئەملاوئەولا سەبارەت بە هەبوونی کودەتا و پیلانگێڕییەکی گەشەسەندوو و بەردەوام بخاتە نێو دەستانی حکوومەتی هەرێمی باڤاریا، ئەو هەرێمە تا ساڵی ١٨٧٠ و تەفلیبوونی بۆ نێو یەکییەتیی ئەڵمانی، یەکێك بوو لە گەورەترین و بەهێزترین و کاریگەرترین وڵاتانی سەربەخۆی ئەڵمانیا. وردەکارییەکانی پیلانگێڕی و کودەتایەکەش بەمشێوەیە بوو:

ئادەم وایزهاویت ئامرازی کودەتایەکە بوو، ناوبراو لە زانکۆی ئەنگۆلد شتات مامۆستایەکی بەسوعیی بواری یاسا بوو، بەلام لە ئایینی مەسیحییەت هەلگەڕایەوە و چووە نێو ڕێبازی شەیتانەوە.

لە سالی ١٧٧٠دا سووخۆرانی جوولەکە ئەوانەی دەستگەی ڕۆچیلدیان دامەزراند ناوبراویان بەکریّ گرت بۆ ئەوەی چاوێك بە پرۆتۆکۆلە کۆنەکاندا بگێڕێتەوە و لەسەر بنەمای نویّ ڕێکیان بخاتەوە- مەبەست لە پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی زایۆنیزمە.

ئامانج لەو پرۆتۆکۆلانە زەمینەسازی بوو بۆ ( کەنشتی ئەهریمەن) جیهان کۆنترۆل بکەن، کۆنترۆلەکەش دوای ئەو مەرگەساتە سەرتاپاگیرەی بە ڕێگەی دکتاتۆرانەی ئەهریمەنی خەریکن خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، ڕێبازی ئەهریمەنی و ئایدۆلۆژیایەکەی بەسەر مرۆڤدا بسەپێنن. وایز هاویت لە یەکەمی ئایاری سالی ١٧٧٦ دا ئەرکەکەی خۆی بە کۆتا هێنا ( مەبەستی نووسەر لە ( کەنشتی ئەهریمەن) و ڕێبازی ئەهریمەنی ئەو جوولەکانەن بە ئامانجی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتەکەیان لەسەر داروپەردووی جیهانی وێرانکراودا پیلان بۆ وێرانکردنی جیهان دادەڕێژن.

ئەو پیلان و نەخشەیەی وایز هاویت کێشاویەتی ڕووخاندن و وێرانکردنی گشت حکوومەت و ئایینەکانی سەر گۆی زەوی دەکاتە پێویستی.

لە ڕێگەی دابەشکردنی گەلانیشەوە دەگەنە ئەو ئامانجە و بە جۆریم ناوی بردووە، ئەم واژەیە واتای مێگەلی مرۆیی دەگەیەنیّ و جوولەکەکان بە مرۆڤەکانی نێو ئاینەکانی دیکەی دەلێن، دابەشکردنەکەش بریتییە لە دروستکردنی بەرە و سەربازگەی دژ بەیەك

کە تا هەتایە دەکەونە ململانێ و جەنگەوە، جەنگەکانیشیان لەهەنبەر چەند گرفتێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەژادپەرستی و کۆمەڵایەتییە و بەبێ وەستان بەرهەم دەهێندرێ.

نەخشە و پیلانەکە پێویستی بەوە هەیە ئەو بەرە و سەربازگەیانە پرچەك بکرێن، دواتریش لە کشت کاتێکدا ڕووداوێك دروست دەکرێ یان ڕێکدەخرێ، بۆ ئەوەی ئەو سەربازگە و بەرە دژیەیەکانە بکەونە گیانی یەکتر، ئەوجا خودی خۆیان لاواز و بێدەستهەلات دەکەن و حکوومەتە نیشتمانییەکان و دەستگە کۆمەلایەتی و ئایینەکان وێران دەبن.

وایز هاویت لە سالی ١٧٧٦دا کۆمەڵەی نوورانییەکانی دامەزراند بۆ ئەوەی کودەتا و پیلانەکە بخاتە واری کردارییەوە. وشەی نوورانیش گوزارشتێکی ئەهریمەنییانەیە و واتای هەلگرانی ڕووناکی دەگەیەنێ.

جا بۆئەوەی جیهان بە پیلانە ئەهریمەنییەکە ڕازی بێت، وایز هاویت دەستی بە درۆیان کرد، بانگەشەی دەکرد و دەیگوت ئامانجی گەیشتنە بە تاکە حکوومەتێکی جیهانی و لە خاوەن توانا بێهاوتایەکانی ئەقلی و هزری پێکدێت.. بەمەیش توانی زیاتر لە دوو هەزار کەس لە کەسە هەرە سەرکەوتووەکانی چەندان بوار و کایەی هەمەجۆر بۆ خۆی ڕابکێشێ.

دوای ئەمە، وایز هاویت ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلاتی دامەزراند بۆ ئەوەی وەك مەلبەند و سەنتەری سەرکردایەتیی نهێنیی ئەندازیارانی جێبەجێکردنی پیلان و نەخشە نوێیەکە دەست بەکار بێت.

پیلانەکەی وایز هاویت و شوێنکەوتەکانی پێویستی بەوە بوو بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانیان بەپێی ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە کار بکەن:

-بەکارهێنانی بەرتیل و پارە و سێکس، بۆ وەدیهێنانی کۆنترۆڵ و بەرزەفتکردنی گشت ئەو کەسانەی لە جۆرەها لایەن و لەنێو گشت حکوومەتەکان و جۆرەها بواری چالاکیی مرۆییدا، پۆستی و پێگەی هەستیاریان هەیە.

کاتێکیش یەکێك دەکەوێتە تەڵەی نوورانییەکانەوە، هەردەبێ لە کارکردن لەپێناو ئەواندا خۆی بەفیڕۆ بدات، نوورانییەکان لە ڕێگەی هەڕەشە و زۆرەملێی سیاسی، یان هەڕەشەکردن بە وێرانکردنی ئابووری ئەو گوشارە دروست دەکەن، یانیش وای لێ دەکەن ببێتە قوربانیی ئابڕووچوونێکی گەورە و گشتی، یانیش بە ئازاردانی جەستەیی و تەنانەت مردنی خۆی و ئەندامانی خانەوادەکەی هەڕەشە دەکەن.

-ئەو نوورانییانەی لە زانکۆ و پەیمانگە زانستییەکاندا وەك مامۆستا کار دەکەن، لەسەریان پێویستە گرنگی بەو خوێندکارانە بدەن کەوا لە ڕووی ئەقڵییەوە باڵان و سەر بە خانەوادە مەزنەکانن، بۆ ئەوەی حەز و خولیای هەنبەر نێونەتەوەییبوونی جیهانییان لە مێشکدا بچێنن ، هەروەها دواتریش بە فەراهەمکردنی چەند کورسییەکی خوێندنی تایبەت لەسەر بنەمایەکانی ڕێبازی جیهانی ڕابهێندرێن.

ئەمجۆرە خوێندکارانە بیرۆکەی نێونەتەوەیی یان جیهانییان دەخرێتە مێشکەوە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی پەسندی دەکەن و لە مێشکیاندا دەچەسپێ و دێنە سەر ئەو باوەڕەی پێکهێنانی یەك حکوومەتی جیهانی لە سەرانسەری جیهاندا تاکە ڕێگەی دەربازبوونە لە جەنگ و کارەساتە یەك لە دوای یەکەکان.

هەروەها دەبێ ئەو باوەڕیان لەلا دروست بکرێ کە خاوەنی بەهرە و توانای تایبەتی ئەقڵی، مافیان هەیە ئەو کەسانە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە کە کارامەیی و زیرەکییان لەوان کەمترە، چونکە جوییم نازانن چ شتێك لە رووی جەستەیی و ئەقڵی و ڕووحییەوە لە بەرژەوەندییاندایە.

ئەمڕۆ لە جیهاندا سێ قوتابخانەی تایبەت بەمە هەن.. یەکەمیان دەکەوێتە شارۆچکەی گوردنستۆنی ئیسکۆتلەندا، دووەمیش دەکەوێتە شارۆچکەی سالمی ئەڵمانیا و سێیەمیش لە ئانافریتای یۆنانیدایە.

میر فیلیپی مێردی ئەلیزابێسی دووەمی شاژنی ئینگلترا لە گوردنستۆن خوێندوویەتی، لۆرد لویس ماونتباتنی مامی ئەم دەرفەتەی خوێندنی بۆ دەرەخسێنێ، خودی لۆرد لویس لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا بووە سەرکردەی بالای دەریاوانیی بریتانی.

- ئەرکی کەسییەتییە خاوەن دەستهەلات و هەژموونەکانی دەکەونە نێو تەڵەی نوورانییەکانەوە، هەروەها ئەو خوێندکارانەی مەشقی تایبەتیان پێکراوە، ئەوەیە وەك بەکرێگیراوی پشت پەردە بەکاربهێندرێن، دوای ئەوەی لە شوێنی هەستیاری نێو گشت حکوومەتەکان وەك کەسانی شارەزا و پسپۆڕ دادەمەزرێن، بەشێوەیەك بتوانن ئامۆژگاری پێشکێشی گەورە پیاوانی نێو دەوڵەتەکان بکەن و لەسەر گرتنەبەری چەند سیاسەتێك ڕایانبهێنن لە دوور مەودادا خزمەتی نەخشە و پیلانە نهێنییەکانی ڕێکخراوی تاکە جیهان بکات و گەیشتن بە قۆناغی وێرانکردنی یەکجارەکیی گشت ئاین و حکوومەتێك بهێنێتە کایەوە.

- کـۆنترۆڵکردنی ڕۆژنامەگـەری و گشـت ئۆرگـان و کـەناڵ و ئێستگەکانی ڕاگەیاندن و دواتریش پێشکێشکردنی هەواڵ و زانیـاری بـە جـۆرێک بەشێوەیەک ئـەو باوەڕەیـان لـە مێشـکدا دروست بکـات کـە پێکهێنـانی تاکـە یـەک حکوومـەتی نێونەتـەوەیی تـەنیا ڕێگـەی چارەسەرکردنی گرفتە هەمەجۆرەکانی جیهانە.

بەڵام چۆن ئـەم پیلانـە ئەهریمەنییـە سـەر دەگرێ و سـەرکەوتن وەدەستدەهێنێ لە کاتێکدا دوو هێزی مەزنی وەک ئینگلتەرا و فەڕەنسا لە جیهاندا هەن؟

لێرەوە وایز هاوبت لەپێناو وێرانکردنی هـەردوو ئیمپراتـۆر یـانیش هەر هیچ نەبێت شەکەت و لاوازکردنیان، بیری لە حەتمییـەتی کـارکردن کردەوە.

وایز هاوبت فەرمانـەکانی بـۆ کۆمەڵـەی نوورانییـەکان دەرکرد بۆ ئەوەی ئاگری جەنگە ئیستعمارییەکان خۆش بکەن و لە هەمان کاتیشدا بریتانیـا و ئیمپراتۆرەکـەی بەتـەواوی شـەکەت و دەستەپاچـە بـبن، دواتریش بـۆ شـەکەتکردنی فەڕەنسـا شۆڕشـێك ڕێکبخـەن... ئەمەشیان هێنایەدی، چونکە دوای ساڵی ١٧٨٩ شۆڕشی فەڕەنسا هەڵگیرسا.

نووسەرێکی ئـەڵمانی بـەناوی (سـفاك) دەقـە پاکنووسـکراوەکەی کودەتا و پیلانگێڕییە کۆنەکەی (پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی زایۆنیزم)ی لە پەڕتووکێکـدا دانـاو ناونیشـانی(تاکە دەستنووسـی ڕەسـەن)ی بـۆ هەڵبژارد.

لـە سـاڵی ١٧٨٤دا دانەیـەکی ئـەم بەڵگەنامەیـە بـۆ کۆمەڵـەی نوورانییـەکان نـاردرا، واتـا بـۆ ئـەو کەسـانەی وایـز هاوبـت ڕەوانـەی فەڕەنسـای کردبـوون لەوێـدا ئـاگری شـۆڕش خـۆش بکـەن.. بـەڵام

نامەبەرەکە لە شارۆچکەی ڕاتسبۆن و لە ڕێگەی فرانکفۆرت بەرەو پاریس هەورەتریشقەیەك لێی دەدات و دەیکوژێ، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی بەڵگەنامە وێرانکارەکە بکەوێتە دەست پیاوانی ئاسایش لەو کاتەی تەرمەکەیان دەپشکنی، ئەوانیش بەڵگەنامەکانیان دایە دەستهەڵاتە پێوەندیدارەکانی حکوومەتی باڤاریا.

دوای ئەوەی حکوومەتی باڤاریا بەوردی بەڵگەنامەی کودەتایەکەی خوێندەوە، فەرمانی بە پیاوانی ئاسایش کرد هەڵکوتنە سەر ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات و داگیری بکەن و بچنە سەر ماڵی ژمارەیەك هاوبەشی وایز هاوپت کەوا کەسییەتیی زۆر بە دەستهەڵات و هەژموونداربوون، یەکێك لەو شوێنانە کۆشکی بارۆن باسۆس بوو لە سندسدۆرف.

چەند بەڵگەیەکی دیکەش لە کاتی هێرشەکاندا کەوتنە دەست و حکوومەتی باڤاریایان هێنایە سەر ئەو باوەڕەی بەڵگەنامەکە دەقی ڕەسەن و سەرەکیی نەخشە و کودەتایەکە و لەلایەن ئەو ( کەنشتە ئەهریمەنییەوە) کێشراوە کەوا کۆمەڵەی نوورانییەکانی بەرزەفت کردووە.

لە کۆتاییشدا و لە ساڵی ١٧٨٥ حکوومەتی باڤاریا ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵاتی داخست و کۆمەڵەی نوورانییەکانیشی بە پێشێلکارانی یاسا لەقەڵەم دا.

دەستهەڵاتەکانی باڤاریا لە ساڵی ١٧٨٦دا وردەکارییەکانی کودەتا و پیلانگێڕییەکەیان بەناونیشانی (( نووسراوە ئەسڵییەکانی سیستم و ڕێبازی نوورانییەکان)) بڵاو کردەوە... هەروەها چەند دانەیەکیشیان بۆ گەورە پیاوانی دەوڵەت و کەنیسەش نارد.. بەڵام

دزەکردنی نوورانییەکان و دەستهەلأتەکانیان هێندە بەهێز بوو، ئەم هۆشدارییە پشتگوێ خرا، هەروەك چۆن پێشتریش هۆشدارییەکانی مەسیح پشتگوێ خران.

لەو کاتییەوە چالاکییەکانی نوورانییەکان بەشێوەی نهێنی بەڕێوە دەچوون، وایزهاوبت ڕێنماییەکانی خۆی بۆ شوێنکەوتەکانی دەرکرد بەوەی دزە بکەنە نێو ڕیز و ئەنجوومەنەکانی کۆمەڵەی شینی ماسۆنی و پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی دیکەی نهێنی لەنێو جەرگەی ڕێکخستنە نهێنییەکاندا کردە ئەرك و فەرمان.

ڕێگە بە هیچ کەسێکیش نەدرا بچنە نێو ڕیز و ڕێبازی نوورانییەکانەوە تەنیا ئەو ماسۆنییانە نەبن کە باوەڕبوونیان بە نێونەتەوەییبوون سەلماند و لە ڕەفتارەکانیاندا دوورکەوتنەوە لە خودا دەبیندرا.

نوورانییەکان بەمشێوەیە دەمامکی مرۆڤایەتییان بۆ داپۆشینی ئەو چالاکییە وێرانکەرانە بەکارهێنا کە لە گشت ئایین و ڕێوڕەسمێکی ئاسمانی بەدوورن.

کاتێکش خەریکی خۆئامادەکردن بوون دزە بکەنە نێو ئەنجوومەنی ماسۆنییەکانی بریتانیا، داوایەکیان ئاراستەی جۆن ڕۆبنسۆن کرد سەردانی ولأتانی ئەورووپا بکات.

ڕۆبنسۆن یەکێك بوو لە گەورە ماسۆنییەکانی ئسکۆتلەندا و لە زانکۆی ئەدنبرە مامۆستای فەلسەفەی سرووشتی و ئەمینداری نهێنیی کۆمەڵەی پاشاتیش بوو.

بەلام فێڵەکەیان بەسەر ڕۆبنسۆندا تێنەپەڕی، باوەڕی بەوەش نەکرد ئەو ئامانجەی جیهانخوازەکان دەیانەوێ پێی بگەن دامەزراندنی دکتاتۆریەتێکی نەرم و خۆشەویست و میانڕەو بێت.

لەگەڵ ئەمەیشدا، ڕۆبنسۆن بیروڕا و بۆچوونەکانی خۆی ئاشکرا نەکرد، بەڵکو لەنێو دڵی خۆیدا بە نهێنی هێشتنییەوە... نوورانییەکان دانەیەکی پاکنووسکراوی نەخشەی کودەتایەکەی وایزهاویتیان دایە دەستی بۆ ئەوەی شرۆڤەی بکات و بیپارێزێ.

لە ساڵی ١٧٨٩دا شۆڕش لە فەڕەنسادا هەڵگیرسا، هۆکارەکانی سەرهەڵدانی شۆڕشەکەش بریتی بوون لە ملکەچی نواندنی پیاوانی دەوڵەت و کەنیسە لەهەنبەر ئەو ئامۆژگارییەی ئاراستەیان کرابوو تاکو ئەو هۆشدارییانە پشتگوێ بخەن کەوا ئاراستەیان کرابوو.

جا بۆ ئەوەی ڕۆبنسۆن حکوومەتەکانی دیکە لە مەترسیی نوورانییەکان ئاگادار بکاتەوە، لە ساڵی ١٧٩٨دا دەستی بە نووسینی پەرتووکێك کرد و ناوی لێنا ( بەڵگەی هەبوونی کودەتایەك بۆ وێرانکردنی گشت حکوومەت و ئایینێك).. بەلام ئەم هۆشدارییەش هەروەك ئەوانەی پێشوو پشتگوێ خرا!.

لەو کاتیدا تۆماس جیفرسۆن ببووە قوتابییەکی وایزهاویت و سەرسەختترین بەریگریکاری ناوبراو، لەو کاتیشدا حکوومەتی وڵاتەکەی وایزهاوبتی بە پێشێلکاری یاسا لە قەڵەم دا.. ئەوجا نوورانییەکان لە ڕێگەی جیفرسۆنەوە توانیان دزە بکەنە نێو ئەنجوومەنی تازە لەدایکبووی ئەو کاتی ماسۆنییەکانی نێو ئینگلترای نوێ.

هەرچەندە پێم وایە ئەم زانیارییانە زۆرێك لە ئەمریکییەکان دەحەپەسێنێ و دووچاری هێدمەیان دەکات، بەڵام حەزم لێیە ئەم ڕاستییانەی خوارەوە تۆمار بکەم:

جۆن ڕۆبنسۆن لە ساڵی ١٧٨٩دا سەبارەت بە دزەکردنی کۆمەڵەی نوورانییەکانی بۆ نێو ئەنجوومەنەکانیان هۆشداری دایە ڕێبەرانی ماسۆنی.

داڤید باینی سەرۆکی زانکۆی هارفاردیش لە نۆزدەی تەمووزی ساڵی ١٧٩٨دا هەمان هۆشداری بەگوێی خوێندکارانی دەرچوودا چرپاند و بۆی ڕوونکردنەوە هەژموونی گەشەسەندووی نوورانییەکان لە نێوەندە سیاسی و ئایینییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا شتێکی بەڵگەنەویستە.

جۆن کوینسی ئادامز ئەنجوومەنی ماسۆنییەکانی لە ئەمریکا ڕێکخستبوو... لە ساڵی ١٨٠٠دا بڕیاری دا دژ بە جیفرسۆن خۆی بۆ سەرۆکایەتیی کۆمار بپاڵێوی، بۆیێ سێ نامەی بۆ کۆلۆنێل ویلیام ستوون نارد و تیایاندا باسی ئەوەی کردبوو چۆن جیفرسۆن بە چەند ئامانجێکی وێرانکارانە ئەنجوومەنی ماسۆنییەکانی بەکارهێناوە.

ئەوەی ڕاستی و دروستیی نێوەڕۆکی ئەم نامانەش دەسەلمێنێ، سەرکەوتنی جۆن کوینسی ئادامز بوو لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا.. تا ئێستەیش ئەم نامانە لە پەڕتووکخانەی ڕیتنبۆرگ سکوێر لە شاری فیلادلفیا پارێزراون.

ویلیما مۆرجان لە ساڵی ١٨٢٦دا دەگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەرکەکەی بەسەریدا دەسەپێنێ ڕاستیی نوورانییەکان و پیلانگێڕی و

نەخشە نهێنییەکانیان و دوا ئامانجیان بە ماسۆنییەکانی دیکە و ڕای گشتی ڕابگەیەنێ.

نوورانییەکانیش دەستەوەستان نەبوون و کەسێکی خۆیان بەناوی ڕیچارد هوارد ڕاسپارد حوکمی کوشتن وەك ناپاکێك بەسەر مۆرجاندا پێڕەو بکات.

کاپتن مۆرجان لە مەترسییەکە ئاگادارکرایەوە، بۆیێ هەوڵی دا بچێتە کەنەدا، بەلآم هوارد لە نزیك سنوور دەستی پێی ڕادەگات و لە نزیك دۆڵی نیاگرا تیرۆری دەکات.

لێکۆڵینەوەکان کەسێکی نیویۆرکییان بەناوی ئافیری ئەلین دۆزییەوە سوێندی خواردبوو گوێی لە هوارد بووە لەنێو کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵەیەکی نهێنی لە نیویۆرك بەناوی (سوارچاکانی پەرستگە) ڕاپۆرتێکی خوێندووەتەوە و تیایدا باسی ئەوەی کردووە چۆن حوکمی لەنێو بردنی کاپتن مۆرگانی بەجێهێناوە.

هەروەها تیشك خرابووە سەر ئەوەی چۆن ڕێکارەکانی بەڕێکردنی بکوژەکە بۆ شوێنێکی دوور لە ئینگلترا جێبەجێ کراون.

تەنیا چەند کەسانێك کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، دەزانن ئەو ڕووداوە لەو کاتیدا بووە هۆی ڕق و بێزاری و تووڕەیی نزیکەی ٤٠٪ ماسۆنییەکانی باکووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وازیان لە ماسۆنییەت هێنا.

من نووسراوی نێو کۆبوونەوەیەکی گەورەی ماسۆنییەکانم لەلایە ئەوکات بۆ تاوتوێکردنی ڕووداوەکە بەڕێوەچووبوو.

دەشتوانین وێنای ئاستی هەژموونی جێبەجێکاران و داڕێژەرانی کودەتا و پیلانە ئەهریمەنییەکە بکەین، چونکە توانیویانە ڕووداوی

گــەورە و بەرجەســـتەی لــەمجۆرە لـــە پرۆگرامـــەکانی خوێنـــدنی خوێندنگەکانی ئەمریکادا لابەرن.

نوورانییـەکان لـە سـاڵی ١٨٢٩دا لـە نیویـۆرك کۆنگرەیـەکیان بەڕێوەبرد، نوورانییەکی ئینگلیزی بەناوی ڕایت دەستی بە قسان کرد و بە ئامادەبووانی نێـو کۆنگرەکـەی ڕاگەیانـد کۆمەڵەکـەیان بڕیاری داوە کۆمەڵـــەکانی وەك عەدەمییـــەکان و ئەیتەیســـتەکان و چـــەند بزووتنەوەیەکی دیکەی تێکدەرانە لە یەك ڕێکخراودا بەناوی کۆمۆنیزمدا کۆ بکاتەوە.

ئامانجی ئەو هێزە تێکدەرانەش ڕێخۆشـکردن بـووە بـۆ کۆمەڵـەی نوورانییەکان بۆ ئەوەی لە ئاگری جەنگ و شۆڕشەکان خۆش بکەن.

کلینتۆن ڕۆزفلتی باپیری فرانکلین ڕۆزفلت و ( هۆراس گریلی) و ( چـارلز دانـا) بـۆ کۆکردنـەوەی پـارە لـەپێناو ئـەم پرۆژەیـە نوێیـەدا ڕاسپێردران.

پارەی کۆکراوەی تایبەت بەم پرۆژەیەش درایە هەریەکە لە (کارل مـارکس) و (ئـەنجلس) کاتێـك پـەرتووکی سـەرمایە و مانیفێسـتی کۆمۆنیزمیـان لـە گـەڕەکی سـوهۆفیی لەنـدەنی پایتـەختی ئینگلیـزدا نووسی.

وایز هاوبت دوای ئەوەی بانگەشەی دەکرد نوورانییەت بە مردنـی خۆی دەمرێ، لە ساڵی ١٨٣٠دا مرد، جا بۆ ئـەوەی فێـڵ لـە ڕاوێـژکارە ڕووحانییـەکانی بکـات، وەهـا خـۆی نیشـان دەدا تۆبـەی کـردووە و گەڕاوەتەوە نێو باوەشی کەنیسە.

بەمشـێوەیە لـەو کاتـەی کـارڵ مـارکس لـەژێر سەرپەرشـتیی نوورانییەکانـدا مانیفێسـتی کۆمـۆنیزمی نووسـی، پرۆفیسـۆر (کـارل

ریتەر)یش لە زانکۆی فرانکفۆرت بیرۆکەیەکی دژ بە کۆمۆنیزمی ئامادە دەکرد، ئەویش هەر لەژێر سەرپەرشتیی کۆمەڵەیەکی دیکەی سەر بە نوورانییەکاندا بوو، بەشێوەیەك سەرانی کودەتا و پیلانگێڕییە جیهانییەکە بتوانن هەردوو بیردۆز بۆ لەیەککردنی نەتەوە و گەلان بەکاربێنن، بەشێوەیەك مرۆڤەکان تیایدا ببنە دوو بەرەی دژ بەیەك، دواتریش هەردوو بەرە پڕ چەك بکرێن و هان بدرێن شەڕی یەکتری بکەن و یەکتری لەنێو ببەن و دەستگە ئایینی و سیاسییەکانی هەردوو بەرەش بەتەواوی لەنێو بچێت.

ئەو کارەی ریتەر دەستی پێکردبوو، لەلایەن فریدریك نیچەی ئەڵمانییەوە تەواوکرا و ڕێبازێکی بەناوبانگی بەناوی خۆی دانا واتا (نیچەیزم)

ئەم ڕێبازەش بناغەی بنیادنان و پەیدابوونی ڕێبازی نازیزم بوو.

هەر ئەم ڕێبازانەش بوون زەمینەیان بۆ بەکرێگیراوانی نوورانی فەراهەم کرد هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی هەڵگیرسێنن.

نوورانییەکان لەساڵی ١٨٣٤دا جیۆسیبی مازینیی ڕێبەری شۆڕشگێڕی ئیتاڵیایان وەك بەڕێوەبەری بەرنامەکانی نانەوەی ئاشووب لە جیهاندا هەڵبژارد.. مازینی تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٨٧٢دا مرد، ئەو پۆستەی هەر لێ نەسەندرایەوە.

لە ساڵی ١٨٤٠ جەنەڕاڵێکی ئەمریکیان بەناوی بابك ناردە لای، بەڵام هێندەی نەبرد بابکیش کەوتە ژێر کاریگەری و هەژموونی مازینییەوە.

ئەو کات جەنەڕاڵ بابك زۆر تووڕە و ڕەنجاو بوو، چونکە سەرۆك جیفرسۆندافیس هێزە هیندییەکانی نێو سوپای ڕەوانەی ماڵەوە

کردبوویەوە کە لەژێر سەرکردایەتیی جەنەڕاڵ بابکدا بوون، چونکە ئەو هێزانە لەژێر دەمامکی ڕەفتاری ئاسایی نێو جەنگ کاری دڕندانەیان کردبوو.

جەنەڕاڵ بابك بیرۆکەی تاکە حکوومەتی جیهانیی پەسند کردبوو، تەنانەت دواتر بووە سەرۆکی کەهنووتیی کودەتایە ئەهریمەنییەکە... لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٨٥٩-١٨٧١ لەپێناو دانانی نەخشە و پیلانێکی سەربازی بۆ هەڵگیرساندنی هەرسێ جەنگی جیهانی و شۆڕشە مەزنەکان قوڵی لێ هەڵماڵیبوو، پێشی وابوو هەرهەموویان لە سەدەی بیستەمدا دەبنە هۆی ئەوەی کودەتا و پیلانەکە بگەنە دوا قۆناغی خۆیان.

جەنەڕاڵ بابك لە ساڵی ١٨٤٠ زۆربەی کارەکانی خۆی لە کۆشکەکەی خۆیدا لە شارۆچکەی لیتل ڕۆکی ویلایەتی ئەرکانساسدا بەڕێوەدەبرد.

کاتێك نوورانییەکان و ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات بەهۆی چالاکییە بەرفراوانە شۆڕشگێڕییەکەی مازینی لەنێو ئەورووپادا گومانیان کەوتە سەر و کەوتنە ژێر پرسیارەوە، جەنەڕال بابك ڕاسپێردرا لەسەر بنەمای نوێ ئەنجوومەنی ماسۆنییەکان نوێ بکاتەوە و ڕێکیان بخاتەوە،ناوبراو سێ ئەنجوومەنی باڵای دامەزراند و ناوی لێنان باڵادیە، یەکەمیان لە چارلستۆنی ویلایەتی کارۆلینای باشووری ئەمریکا و دووەمیش لە ڕۆما و سێیەمیش لە بەرلین بوو.

هەروەها ئەرکی دامەزراندنی بیست و سێ ئەنجوومەنی لاوەکی سەر بەو ئەنجوومەنە سەرەکییانە خرایە ئەستۆی، ئەو بیست و سێ ئەنجوومەنە لاوەکییەش دابەش ببوونە سەر شوێن و مەڵبەندە

ستراتیژەکانی سەرانسەری جیهان... ئەو ئەنجوومەنانەش لەو کاتیدا و تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت بارەگەی سەرکردایەتیی گشتیی نهێنیی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی جیهانین.

ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی مارکۆنی باس لە داهێنانە بێتەلەکەی خۆی (ڕادیۆ) بکات، زانایانی نوورانی توانیبوویان چەند پێوەندییەکی نهێنی لەنێوان بابك و سەرۆکەکانی ئەو ئەنجوومەنانە ڕێکبخەن.

ئاشکراکردنی ئەم نهێنییەش وای لە ئەفسەرانی هەواڵگری کرد درك بەوە بکەن چەند ڕووداوێك کە بەڕووکەش هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ یەکتریدا نییە لە شوێنی جیاجیای جیهاندا و لە یەك کاتدا ڕوودەدەن و دواتر چەند هەلومەرج و دۆخێکی مەترسیدار دەهێننە ئاراوە و دوای ماوەیەك دەگۆڕێن و دەبنە جەنگ و شۆڕش.

نەخشە و پیلانەکەی جەنەڕاڵ بابك چەندە سادە بوو هێندەش کارا بوو... پیلانەکە ئەوەی کردبووە پێویستی هەرسێ بزووتنەوە جیهانییەکە ڕێکبخات: مەبەست لە کۆمۆنیزم و نازیزم و زایۆنیزمی سیاسی و چەندان بزووتنەوەی دیکەی جیهانییە، دواتریش بۆ خۆشکردنی ئاگری هەرسێ جەنگی جیهانی و هەرسێ شۆڕش بەکاربهێندرێن.

ئامانج لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی ڕەخساندنی دەرفەت و زەمینەسازی بوو بۆ نوورانییەکان تاکوو دەستهەڵاتی قەیسەرەکانی ڕووسیا بڕووخێنن و ناوچەکە بکەنە پێگەی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی ئەیتەیست (الملحد). بە سوود وەرگرتنیش لە ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریای بریتانی و ئەڵمانی زەمینەسازی بۆ ئەو جەنگە کرا کە لە بنەڕەتەوە بەکرێگیراوانی

نـوورانی لـەو دوو دەوڵەتـەدا هەڵیانگیرسـاند... دوای کۆتـایی هـاتنی جەنگەکەش کۆمۆنیزم وەك ڕێبازێك بنیادنرا و بۆ تێکدان و وێرانکردنی دەوڵەتەکانی دیکە و ئایینەکان بەکارهێندرا.

بـەڵام زەمینەسـازی بـۆ هەڵگیرسـانی جـەنگی دووەمـی جیهـانی بـەهۆی نـاکۆکیی نێـوان فاشیسـتەکان و بزووتنـەوەی زایـۆنیزمی جیهانییەوە ڕەخسێندرا.

پیلانە داڕێژراوەکـەی ئـەو جەنگـەش وەهـا بـوو بـە وێرانکـردن و ڕووخاندنی نازیزم و زیاترکردنی دەستهەڵاتی زایۆنیزمی سیاسی کۆتایی بێت، بۆ ئـەوەی زایـۆنیزم بتـوانێ لـە فەڵەستیندا دەوڵـەتی ئیسـرائیل دامەزرێنێ.

ئامانجەکانی پشت پاڵپشـتیکردنی کۆمـۆنیزم ئـەوەبوو هێزەکـەی لەهەنبەر کۆی هێزەکانی جیهانی مەسـیحیدا بگاتـە قۆنـاغی بەرابـەری، دواتریش هەر لە هەمان سنووردا بوەستێندرێ، بۆ ئـەوەی دەسـت بـە قۆنـاغێکی دیکـە بکـات، ئـەویش زەمینەسـازییە بـۆ دوا مەرگەسـاتی مرۆیی.

پـیلان و نەخشـەی جـەنگی سـێیەمی جیهـانیش وەهایـە دەبـێ بـەهۆی ئـەو ململانێیـەوە هەڵگیرسـێ کـەوا نوورانییـەکان لـەنێوان زایـۆنیزمی سیاسـی و سـەرکردەکانی جیهـانی ئیسـلامی دەیـوروژێنن، دەبێ ئەو جەنگەش بەشێوەیەك بەڕێوەببرێت و ئاراستە بکرێ، ئیسـلام و زایۆنیزمی سیاسی یەکتری لـەنێو ببـەن، لـە هـەمان کاتیشدا گـەلانی دیکە یەخەی یەکتری بگرن و بکەونە نێو جەنگەوە، تـا دەگاتـە دۆخـی شەکەتبوونێکی تەواوی جەستەیی و ئەقڵی و ڕووحی و ئابووری.

جەنەراڵ بابك لە ١٠ ئابی ساڵی ١٨٧١دا بە مازینی ڕادەگەیەنێ ئەوانەی بەرتەمایی ئەوەیان هەیە بگەنە دەستهەڵات و کۆنترۆڵکردنی ڕەهای جیهان، لە دوای جەنگی سێیەمی جیهانی دەبنە سەبەبکاری مەترسیدارترین و گەورەترین کارەساتی کۆمەڵایەتی کە مێژوو بەخۆیەوەی دیبێ.. ئەمەی خوارەوەش دەقی چەند ڕستەیەکە و لە نامەکەی نێو مۆزەخانەی بریتانی لە لەندەن پارێزراوە:

(( جڵەوی بزووتنەوە ئەیتەیستەکان و عەدەمییە تێکدەرەکان بەردەدەین، هەروەها کار بۆ ڕوودانی مەرگەسات و تراژیدیایەکی گشتیی مرۆیی دەکەین کە قێزەونیی خوانەناسیی ڕەها بکەوێتە بەرچاوی گشت گەلێك، هەروەها سەرچاوەی دڕندەیی و مەرەگەساتێکی هەژێنەری خوێناوی تیادا دەبینن.. ئەوسا هاوولاتیانی گشت نەتەوەیەك لەهەنبەر ئەو کەمینەیەی بانگەشەی شۆڕشێکی جیهانی دەکەن، هەست دەکەن ناچارن بەرگری لە خۆیان بکەن، بۆیێ ڕادەبن تاکوو تاکەکەسە وێرانکەرەکانی شارستانییەت لەنێو ببەن... هەروەها جەماوەری مەسیحیش لەو کاتیدا بۆی ڕوون دەبێتەوە بیر و هزرە لاهووتییەکەی سەرگەردان و بێمانا بووە، ئەو جەماوەرەش تینوو و هەڵوەدای نموونەیەك دەبێت بەرەو پەرستشێك ئاراستەی بکات.. ئەوسا لە باوەڕێکی بێگەردی شەیتانیەوە ڕۆشنایی و نوورێکی بێگەردی بۆ دێت و دەبێتە دیاردەیەکی جیهانی و بەهۆی کاردانەوەی گشتیی جەماوەر و دوای وێرانبوونی هاوکاتانەی مەسیحییەت و ئەیتەیستی دێتەکایەوە!

کاتێکیش مازینی لە ساڵی ١٨٧٢ مرد، بابك ڕێبەرێکی دیکەی شۆڕشگێڕی ئیتالی بەناوی ئەدریانۆ لیمی وەك جێنشینی مازینی دەستنیشان کرد.

کاتێکیش لیمی مرد، لینین و ترۆتسکی جێگەیان گرتەوە، پشتگیریی مادیی چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی هەموو ئەو کەسانەیش لەلایەن خاوەنانی بانکە جیهانییەکانی بریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا و ئەمریکاوە دەستەبەر دەکرا.. لێرەدا لەسەر خوێنەر پێویستە ئەوەی بیر بێتەوە خاوەنی بانکە جیهانییەکان لەمرۆژگارەدا – هەروەك پارە گۆڕەرەوەکان و سووخۆرانی سەردەمی مەسیح– بەکرێگیراو و ئامرازی دەستی نوورانییەکانن.

ئەو بیرۆکەیە ئاخنراوەتە ڕووح و مێشکی جەماوەرەوە کە کۆمۆنیزم بزووتنەوەیەکی کرێکارییە و لەپێناو بەرگریکردن لە مافی کرێکاران و وێرانکردنی سەرمایەداری دامەزراوە.. ئەم پەرتووکە – جیهان.. گەمەی دەستی ئیسرائیله– هەروەها پەرتووکی تەمێکی سوور لەسەر ئەمریکایە– دەری دەخەن ئەفسەرانی هەواڵگری لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و بریتانیا چەند بەڵگە و دیکۆمێنتێکی دروستیان دەستکەوتووە، دەیسەلمێنن سەرمایەدارانی جیهانی هەر لە ساڵی ١٧٧٦ بەهۆی بانکە نێودەوڵەتییەکانیانەوە پارە و خەرجیی گشت جەنگ و شۆڕشێکیان دابین کردووە.

شوێنکەوتەکانی (کەنشتی ئەهریمەتی) لە سەردەمی ئێمەدا حکوومەتەکانمان ئاراستە دەکەن و ناچاریان دەکەن بچنە نێو جەنگ و شۆڕشەکانەوە، لەمەیشدا نەخشە و پیلانەکەی جەنەڕاڵ بابك جێبەجێ

دەکەن کە ئامانجی تێوەگلاندنی جیهانی مەسیحییە لە جەنگێکی سەرانسەری و لەسەر ئاستی نەتەوە و تەواوی جیهاندا.

چەندان بەڵگەنامە هەن بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە دەیسەلمێنن بابك خۆی وەك وایزهاویت لە سەردەمی خۆی، سەرۆکی ڕووحیی سیستمی کەهنوتیی شەیتانی بووە.

جگە لەو نامەیەی مازینی لە ساڵی ١٨٧١ دا نووسیویەتی، نامەیەکی دیکە کەوتووەتە دەستی کەسانی نامۆوە و لە ڕێکەوتی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٨٨٩شدا بۆ سەرۆکانی ئەو ئەنجوومەنە باڵایانەی نووسیوە کە پێشتر پێکی هێناون.. ئەو نامەیەش بۆ ئەوە نووسراوە سەبارەت بە پەرستنی ئیبلیس و ئەهریمەن، بنەمایەکانی باوەڕی شەیتانی ڕاڤە بکات.. لە نامەکەدا هاتووە:

(( دەبێ وەها لە جەماوەر بگەیەنین ئێمە باوەڕمان بە خودا هەیە و دەیپەرستین، بەڵام ئەو خودایەی دەیپەرستین خەیاڵی پووچ و وەهم لێمانی دادەبڕێت.. هەروەها دەبێ ئێمە کە گەیشتووینەتە چاودێریی زانیاریی بەرزەوە پاکی و بێگەردیی باوەڕی ئەهریمەنی بپارێزین.. بەڵێ شەیتان خودایە.. وەڵێ داخەکەم، (ئەدۆنای)ش (ئەمە ئەو ناوەیە شەیتانییەکان بۆ ئەو خوایەی بەکاردێنن کە ئێمە دەیپەرستین) خودایە.. ڕەها تەنیا دەبێ وەك دوو خواوەند بوونی هەبێت!))

بەمشێوەیە باوەڕبوون بە هەبوونی ئیبلیس خۆی لە خۆیدا کوفر و بێدینییە.. بەڵام ئایینی ڕاستین و فەلسەفەی پاك و بێگەرد بریتییە لە باوەڕهێنان بە ئەهریمەن وەك خواوەندێکی هاوتا و هاوشانی ئەدۆنای.. بەڵام ئەهریمەن، کە خواوەندی ڕۆشنایی و خێر و چاکەیە،

لە پێناو مرۆڤایەتیدا دژ بە ئەدۆنای خواوەندی تاریکی و بەدخوازی دەجەنگێ.

نووسراوە پیرۆزەکان تەنیا لە چەند شوێنێکی دیاریکراودا ناوی ئەهریمەن دەهێنن ئەشعیا:١٤، لۆقا: ١٠. بەلام باوەڕی ئەهریمەنی بەشێوەیەکی یەکجارەکی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ ئەهریمەن شۆڕشی لە ئاسماندا بەڕێوەبرد، ئیبلیسیش تۆبەرەی ئەدۆنایە، برای ئەو میخائیلەیە کە کودەتا ئەهریمەنییەکەی لە ئاسماندا پووچەڵ کردەوە... هەروەها ڕێوڕەسمە ئەهریمەنییەکان دەڵێن میخائیل لە کەسایەتیی یەسووعەوە هاتووەتە سەر زەوی بۆ ئەوەی ئەو ڕەفتارە ئاسمانییەکەی لە زەویدا دووبارە بکاتەوە، بەلام شکستی هێنا.. جا لەبەرئەوەی ئەهریمەن باوکی درۆ و دەلەسەیە، بەڕوونی بەدیاردەکەوێ هێزە ڕووحییەکانی تاریکی ژمارەیەکی زۆری ئەو کەسانە لە خشتە دەبات کە بانگەشەی ڕۆشنبیری دەکەن بۆ کردنی ئەو کارانەی دەیخوازن، ڕێك هەروەك چۆن لە ئاسماندا کردیان.

ئەو پڕوپاگەندەیەی ناراستەکارانی کودەتا و پیلانگێڕییە ئەهریمەنییەکان لەنێو جەماوەردا بلاویان کردەوە، وایکرد ڕای گشتی باوەڕیان وەهابێت دژبەرانی مەسیحییەت هەرهەموویان بێدین و خوانەناس و ئەیتەیست بن.. بەلام ڕاستییەکە ئەوەیە ئەمە درۆ و دەلەسەیەکی بە ئەنقەستی ئاراستەکراوە، ئامانجیش لێی شاردنەوەی ئەخشە و پیلانە نهێنیی کاهینەکانی ڕێبازی ئەهریمەنی بوو، واتا ئەو کەسانەی سەرپەرشتیی (کەنشتی ئەهریمەنی) دەکەن و ئاراستەی دەکەن، بەشێوەیەك بتوانن ڕێگە لە مرۆڤایەتی بگرن دەستووری دادپەروەریی خواوەندی لەسەر زەویدا پێڕەو بکەن..ئەو کاهینانە لە

تاریکیدا خەریکی جموجوڵن و بەردەوام لەپشتی پەردەوەن، تەنانەت لە هەنبەر نۆرینەی هەرە نۆری شوێنکەوتە لەخشتەبراوەکانیان پارێزگەری لە نهێنیی کەسییەتی و ئامانجەکانیان دەکەن.. پەرتووکە پیرۆزەکان پێیان ڕاگەیاندووین نەخشە و پیلانەکانی وەك ئەوەی وایزهاویت و بابك بەڕاستی و بەبێ هیچ گومانێك دادەندرێن و جێبەجێ دەکرێن تا ئەو ڕۆژە دێت هێزە شەڕخوازەکانی ڕووحی دەتوانن گۆی زەوی کۆنترۆڵ بکەن.

ئایەتێکیش پێمان دەڵێ دوای گوزەرکردنی ئەو ڕووداوانەی لێیانەوە دواین، ئەوا ئەهریمەن ماوەی هەزار ساڵ کۆتوبەند دەخرێتە دەست و پێی ( لێرەوە ڕوون دەبێتەوە باس و قسەکە سەبارەت بە مەسیحی دەجالە نەك ئیبلیس.. ئەمەیش لۆژیکیترە).

من بانگەشەی ئەوە ناکەم بڵێم دەزانم ئەو ئایەتە چ ماوەیەکی دیاری کردووە یان ئەو ماوەیە بە پێوەرە مرۆڤییەکەی ئێمە چەندە، بەڵام ئەوەی ئێستە بەلامەوە گرنگە ئەوەیە تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوە لەو کودەتا و پیلانگێڕییە ئەهریمەنییە لەژێر تیشکی ئەو باسانەی لەنێو پەرتووکە پیرۆزەکاندا هاتوون، منیان خستووەتە سەر ئەو باوەڕەی کە دەکرێ ئەهریمەن کۆتوبەند بکرێت و هێزە ئەهریمەنییەکان بەشێوەیەکی خێراتر بخرێنە نێو ئابلۆقەوە، ئەگەر هاتوو ڕاستیی هەبوونی کودەتا و پیلانگێڕییەکی بەردەوامی ئەهریمەنی بڵاوکرایەوە و هەموو خەڵك بە زووترین کات پێی بزانن.

دوور لە دەمەتەقێ و بێزیاری، لەسەر گشت مەسیحییەك پێویستە بزانێ دوو هێزی سەرئاسا هەن، یەکەمیان خودایە و لە تەوراتدا بە چەندان ناو هاتووەتە بەریاس، دووەمیش ئەهریمەنە و چەندان ناوی

هـەن.. ئـەوەی گرنگیشـە لێـی بـدوێین، ئەوەیـە بـەپێی پەیامـە سرووشییەکانەوە، ڕۆژی حەشر و حیسابیش هەیە.

ئیبلیسیش ئەو کۆتوبەندە تێکدەشکێنێ کە ماوەی هەزار ساڵ لە دەست و پێی کراوە و سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە بۆ ئـەوەی ئاشووب و هـەراوزەنا لەسـەر زەویـدا هەلگیرسێنێ.. خـوداش دوای ئەمـە لەتـەك دەستەبژێرێك دێتـە نێو مەسـەلەکە و بـەرخ و بزنـەکان لەیـەکتری جیا دەکاتـەوە.. دەشـزانین ئەوانـەی پشـت لـە لایـەنگریی خـودا دەکـەن ئەهریمەن یان ئیبلیس دەبێتـە حوکمڕانیـان و ئاشـووب و هـەراوزەنا و بێسـەروبەرییەکی تاهـەتایی دەخاتـە نێویانـەوە، تەنانـەت ڕقیـان لـە سەروەر و سەرۆکەکانیان دەبێتەوە و لەهەنبەر یەکتریشدا ڕق وکینە لە دڵ دەگرن، چونکێ بۆیان ڕوون دەبێتەوە بە دوورکەوتنەوەیان لە خودا لەخشـتە بـراون و تاهەتایـە خۆشەویسـتی و هاوڕێیـەتیی خودایـان لەدەست داوە.

نیافـە کاردینـاڵ کـارۆ دودریگـزی ئەسـقەفی شـاری سـانتیاگۆی پایتەختی چیلی لە ساڵی ١٩٥٢دا پەرتووکێکی بـەناوی ( لادانـی پەچە لەسەر نهێنیی ماسۆنییەت) بڵاوکردەوە، تیایدا ڕوونی کردبوویەوە چۆن نوورانییەکان و شـوێنکەوتەکانی ئەهریمـەن و ئیبلـیس لـەنێو جەرگـەی کۆمەڵەیەکی دیکەی نهێنیدا کۆمەڵەیەکی نهێنییان دروستکردووە... لە پەرتووکەکەیـــدا ژمارەیـــەکی زۆر بەڵگەنامـــەی یەکلاکـــەرەوەی بڵاوکردبوویەوە و سەلماندبووی تەنانەت سـەرانی ماسـۆنییەتیش، واتـا ماسۆنییە پلە ٣٢ و ٣٣ یەکان، نازانن چـی لـە ئەنجوومەنـە مەزنـەکانی خۆرهـەڵات و ئـەو ئەنجوومەنـە نوێیانـەدا دەگـوزەرێ کـەوا بابـك دایمەزرانـدبوون، واتـا ئەنجوومەنـەکانی سرووشـە بالادییـەکان و

ئەنجوومەنە تایبەتەکانی سەربەو ئەنجوومەنە، تیایدا مەشق بە ژنانی ئەندامی ئەندامی کودەتا و پیلانگێڕییە جیهانییەکە دەکرا و چەند نهێنییەکیان پێ دەگوترا.. کاردینالی ناوبراو لە لاپەڕە ١٠٨ی پەرتووکەکەیدا مارجیۆتای وەك سەرچاوەی متمانە هێناوەتەوە بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ بەر لەوەی لیمی بابك وەك جێنشینی مازینی و ئاراستەکاری بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی هەڵبژێری، یەکێك بووە لە شوێنکەوتە زۆر پابەند و توندڕۆیەکانی ئیبلیس.

نەخشە و پیلانەکەی وایزهاوبت پێویستی بەم شتانەی خوارەوە هەیە:

- نەهێشتنی سەرجەم حکوومەتە نیشتمانییەکان.
- ڕەتکردنەوەی بنەمای میرات.
- ڕەتکردنەوەی موڵکییەتی تایبەتی.
- نەهێشتنی هەستی نیشتمانی.
- نەهێشتنی خانوو و شوێنی نیشتەجێبوونی تاکەکەسی و ژیانی خانەوادەیی و ڕەتکردنەوەی ئەو بیرۆکەیەی پێی وایە ژیانی خانەوادەیی ناوك و چەقێکە و شارستانییەتی لە چوار دەوریدا بنیاد دەنرێ.
- ڕەتکردنەوە و نەهێشتنی گشت ئایینەکان، وەك زەمینەسازییەك بۆ هەوڵی دانانی باوەڕی ئەهریمەنی لە شوێنیاندا کەوا لە حوکمڕانی و سەپاندنی بەسەر مرۆڤایەتیدا مۆرکێکی ڕەهای هەیە.

# بارەگە و مەلبەندی سەرکردایەتیکردنی پیلانگێڕی و کودەتایەکە

بارەگە و مەڵبەندی سەرکردایەتیکردنی پیلانگێڕی و کودەتایەکە تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا بوو، چوونکە خانەوادەی ڕۆچیڵد لەوێ دامەزرا و سەقامگیربوو و ژمارەیەك لەو گەورە دەوڵەمەند و پارەدارانەی جیهانی خستە ژێر دەستهەڵاتی خۆی کەوا ویژدانی خۆیان فرۆشتبووە ئەهریمەن.

دواتر کاهینەکانی سیستمی ئەهریمەنی بارەگەی سەرکردایەتیی خۆیان گواستەوە سویسرا، دوای ئەوەی حکوومەتی باڤاریا لە ساڵی ۱۷۸٦ پەردەی لەڕوودا هەڵماڵین و تا کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی لەوێ مانەوە، دواتر چوونە نیویۆرك و بارەگەی سەرکرادیەتییان چووە نێو تەلاری هاڵۆدیرات.. لە نیویۆرکیشدا خانەوادەی ڕۆکفلەر لە بواری کردەکانی پارەدان و فەراهەمکردنی داراییەوە، شوێنی خانەوادەی ڕۆچیلدیان گرتەوە.

هەرچەندە بڕیارە کۆتاییەکان بەردەوام لە دەستی ئەو ئەنجوومەنە شەڕخوازانەیە کە ئەو ئەهریمەنانە دەبزوێنێ، ئەوا ئەم دەروازەیە بەچەند بەشێکی وانەیەك بە کۆتادێنم، وانەکە یەکێك لە سەرانی ئەنجوومەنەکانی ماسۆنیی بالادی لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا لە پاریس بۆ ئەندامانی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵاتی گوتبوویەوە:

لەژێر کاریگەری ئێمەوە ئاستی پێڕەوکردنی یاسایەکانی جووییم دابەزیوەتە نزمترین ئاست، هەروەها سەنگ و قورسایی یاساش بەهۆی

چەند لێکدانەوەیەکی ئازادانەوە تێکوپێك دراوە کە ئێمە خستوومانەتە نێو ئەم بوارەوە.. دادوەران بە فەرمان و ڕای ئێمە حوکم لەسەر پرسە گرنگەکان دەدەن: واتا لەژێر تیشکی ئەو بنەمایانەی بۆیان دادەنێین تاکو بەهۆیانەوە حوکمی جوویيم بکەن، بێگومان ئەمەیش بەهۆی چەند کەسێکی وەك بووکەشووشەی دەستی ئێمە جێبەجێی دەکرێ ، هەرچەندە هیچ پێوەندییەکی ئاشکرا و بەرچاو لەنێوان ئێمە و ئەواندا نییە... تەنانەت چەند پیر و ئەندامانی بەڕێوەبردنیش ڕازین ڕاوێژمان پێ بکەن.

ئایا هیچ کەسێکی ئاقڵ هەیە نکوڵی لەوە بکات قۆناغە زنجیرەیی و یەك لەدوای یەکەکانی کودەتایەکە- ڕێك وەك ئەوەی وایز هاوپت لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و جەنەڕاڵ بابك لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا نەخشەیان بۆ داڕشتووە- پێڕەو کرا بێت ؟

هەردوو ئیمپراتۆریای ڕووسی و ئەڵمانی ڕووخێندران، ئیمپراتۆریای بریتانی و فرەنسیش بوونە هێزی پلە دوو و سێ، ئەو سەرانەی تاجی پاشایەتییان لەسەر بوو (پاشایەکان) وەك بەروبوومێکی پێگەییو کەوتنە خوارەوە.. جیهانیش بەهۆی ئەو پڕوپاگەندانەی نوورانییەکان بڵاویان دەکردەوە، دووجار دابەش کرایە سەر دوو سەربازگە و بەرەی دژ بەیەك... هەروەها ئاگری دوو جەنگی جیهانیش هەڵگیرسا و لە جیهانی مەسیحییەتی خۆرئاواییدا خوێنی دەیان ملیۆن کەس ڕژێندرا، بەبێ ئەوەی هیچ کامێك لە تاوانکاران و بەرپاکەرانی ئەو قەسابخانانە هیچ هۆیەکی کەسییان دژ بە بەرەی دژ و خەڵکانی دیکە هەبێت! !.. هەروەها شۆڕشی ڕووسی و چینی بووە ئەمری واقیع و کۆمۆنیزمیش گەشەی پێدرا و بەهێز کرا تا هێزەکەی

بارتەقای گشت دەوڵەتانی خۆرئاوای مەسیحیی لێهات.. بەلام لە خۆرهەلاتی دوور و نێوەڕاستدا کودەتا و پیلانگێڕییەکە بۆ زەمینەسازکردنی جەنگی سێیەمی جیهانی بەردەوامە!!

ئێستە و هەر لەم کاتەدا دەبێ ئەم نەخشە و پیلانگێڕییە لە ڕێگەی ئاگادارکردنەوەی ڕای گشتیی جیهانی بوەستێندرێ و هۆشدارییان پێ بدرێ کە دوا مەرگەسات و تراژیدیا بەڕێوەیە و هیچ گومانێکی تیادا نییە، لەدوای مەرگەساتەکەش جەستە و ئەقڵ و ڕووحی مرۆڤایەتی بەتەواوەتی دوور دەخرێتەوە و دەکرێتە کۆیلە.

ویلیام کار دەڵێ یەکییەتیی جەماوەری مەسیحی کە من شەرەفی سەرکردایەتیکردنیم پێ براوە، کۆی ئەو زانیارییانەی خستووەتە بەردەستی هەمووان کەوا دەستی کەوتوون، بۆ ئەوەی تیشک بخاتە سەر ڕوخسار و ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی کودەتایەکە... ئێمە ئەو زانیاریانەمان لە دوو پەرتووکدا بڵاوکردووەتەوە، ئەوانیش: جیهان گەمەی دەستی ئیسرائیلە، ئەوی دیکەشیان تەمی سووری سەر ئەمریکایە، لەگەڵ چەندان بڵاوکراوەی دیکە...

ئێمە بەهۆی زانیاریمان لەهەنبەر پیلانگێڕی و کودەتایەکەوە پێشبینیی ڕووداوەکان دەکەین، ئەو ڕووداوانەی پێشبینیشمان کردبوون هێندە بەوردی هاتنەدی وایانکرد سەرنجی بیرمەندانی گشت جیهان بۆ خۆیان ڕابکێشن.

## بەشی یەکەم

# بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی

بۆ ئەوەی بزانین لەمڕۆدا چی دەگوزەرێ، دەبێ بگەڕێینەوە ئەو ڕابردووەی ڕووداوەکانی پێشەکی و زەمینەی ڕووداوەکانی دواترن. دواتریش لەسەرمان پێویستە مێژوو بخوێنینەوە و لێکی بدەینەوە، چونکە بەڕاستی مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە و ئامانجی ململانێیەکی بەردەوامیش لەدێر زەمانەوە هەمان ئامانجە.. مەبەستمان لە ململانێیە بەردەوامە کۆنەکەی نێوان هێزی چاکە و خراپەیە، بۆ ئەوەی بۆمان ڕوون بێتەوە ئاخۆ ویستی خواوەندی مەزن سەردەکەوێ و زاڵ دەبێت، یانیش خراپەکاری و وێرانەیی باڵی بەسەردا دەکێشێ.

ڕاستییەکەی، هەردوو هێزی چاکە و خراپە، دابەش بوونەتە سەر چەند پارتێکی جۆراوجۆر، لەنێوان خۆیاندا و لە هەوڵیاندا بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش لە ململانێدان.. ئەم ناکۆکییەش لە ڕا و بۆچوونەکان بەهۆی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە سەری هەڵداوە کە بۆ بڵاوکردنەوەی درۆودەلەسە و ڕاستیی پڕ لە کەموکورتی و گەیاندنیان بە جەماوەر بەکارهێنراون و هەرگیز بۆ گواستنەوەی ڕاستییە تەواوەکانی تایبەت بە هەر ڕووداو و بابەتێك بەکار نەهێندراون.

بازرگان و دەلالەکانی جەنگ هۆکارەکانی بۆ دابەشکردنی مرۆڤایەتی بەسەر چەند بەرەیەکی دژ بەیەك ڕاگەیاندنیان بەکارهێناوە، جەنگ و ململانێی نێوان ئەم بەرە و سەنگەرانە بەچەند هۆیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئایینی بووە، بەشێوەیەك بەردەوام

توانیویانە هەر هەموو بەرە و سەنگەرەکان دژبەیەك پەمپ بدەن بۆ ئەوەی بگەنە ئاستی ئەو هەڵچوونەی هەندێکیان هێرش بکەنە سەر هەندێکی دیکە و لە کۆتاییشدا هەرهەموویان وێران ببن و لەنێو بچن!

ئەوانەی پسپۆری بواری بەراوردکردنی ئایینەکانن لە رابردوودا بۆیان روونبووەتەوە کە تەنانەت لەنێو تیرە و هۆزە تەواو دوورەدەست و گۆشەگیرەکانەوە هەستێکی ئایینییان هەیە و دنەیان دەدات لە پرسیاری لەمجۆرە بفکرن و گفتوگۆی لەسەر بکەن: بۆچی لەدایکبووین؟ .. ئامانج لە ژیانی ئێمەدا چییە؟.. ئەو مەبەست و ئامانجانە چین کە دەبێ لە خزمەتیان دابین و هەوڵیان بۆ بخەینە گەڕ؟.. دوای مردنمان بۆ کوێ دەچین؟ .. تەنانەت پێدەچێ دواکەوتووترین تیرە و هۆزەکانی ئەفریقیای نێوەڕاست و ئوسترالیاش هیچ گومانێکیان لە بوونی خودا و جیهانی رووحی و ژیانی دوای مردن نەبێت.

لە هەمان کاتیشدا لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە بەراوردکاریی ئایینەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە زۆربەی ئەو ئایینانەی رێباز و رێوڕەسمەکانیان باوەڕهێنان بە خواوەندێکی بالاَ و سەروو دەکەنە مەرج، لە بنەمایەکی بەرزی سیستماتیکەوە سەرگەی خۆیان دەگرن و مرۆڤەکان هان دەدەن خواوەندی بەرز و مەزن بپەرستن و رێز لە دایباب و پیران بگرن و هاوسێ و چاکەکارانیان خۆشبوێت و نوێژی سەر مردووان بکەن.. بەلاَم دواتر شەڕخوازان بە هەڵپە و چڵێسی و ئالووش و بەدخوازییەکانیان هاتوون تاکو بە زۆرەملێ خەڵك بەرزەفت بکەن و ببنە حوکمڕانیان، بۆیێ ئایینیان لە ئاستە بەرزەکە هێناوەتە ئەو ئاستەی نزمەی ئەمڕۆ دەیبینین.. هەندێك ئایین هێندە نزم بوونەتەوە

کاهینەکانیان بۆ نزیکبوونەوە لە خودا قوربانیی مرۆیی پێشکێش بکەن!!.. تەنانەت خودی مەسیحییەتیش وەك نوێترین ئاین، گەیشتووەتە ئاستێکی نزم و دابەش بووەتە سەر چەندان کۆمەڵە و ڕێباز، تا وای لێهاتووە باوەڕ بەوە نەمێنێ ئەو زۆرینە گەورەیەی رایدەگەیەنن مەسیحین وەك سەربازانی مەسیح هەژمار بکرێن!!

بەشێوەیەکی گشتی، مەسیحییەت لەهەنبەر کارە خێرخوازی و چاکەکارییەکانەوە دابەزیوەتە ئاستێکی نزم.. لە ڕابردوودا هۆگری و خۆشەویستی هەبوو و لە ئایینی مەسیحیدا یەکییەتی و پتەوییەك دەبیندرا.. بۆ نموونە لە پێناسەکردنی هاوسێدا: هاوسێ بریتییە لەو کەسەی لەهەنبەر تۆدا خۆشەویستی و چاکەکاری نواندووە و دەتوانیت متمانەت پێی هەبێت.. پەرتووکە پیرۆزەکان هانمان دەدەن بارتەقای خۆمان هاوسێیەکانمان خۆشبوێن.. باشترین هۆکاریش بۆ دروستکردنی هاوسێیانی باش ئەوەیە کاری چاکەیان لەگەڵ بکەیت بەبێ ئەوەی هەست بە خۆپەرستی بکەیت، چونکە نەمانی کارە خێرخوازییە تاکەکەسییەکان واتا نەمانی گیانی یەکییەتی و گیانی یەکبوونی ساغ و پتەوی بە کۆمەڵ.

لەمڕۆژگارەدا بۆ کردنی کاری خێر و چاکە ڕێگەیەکی زۆر ساردوسڕمان گرتووەتەبەر، چونکە کردنی کاری خێر و چاکەمان داوەتە پاڵ کارمەندانی تایبەت بە خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی جڤاك.. گوتەیەکی زۆر باویش هەیە و دەڵێ: فلانە شت وەك چاکەکاریی نێو کار و پیشە ساردە!!.. شتێکی باشە ئەوەمان بیربێتەوە تەنانەت یاسایەکانی دەستەبەری کۆمەڵایەتیی حکوومیش، تاکەکەس لە مافەکانی هاوسێ نابوێرێ.. نوێژی بەبێ کاری چاك هیچ

سوودێکی نییە، هەروەها هێزی بنەمای ئەیتەیستی لە بۆشایی و لاوازی و هەڵوەشانەوەی باوەڕەوە دروست دەبێت.

جا بەهەر هۆیەك بێت ئەوا ڕێباز و مەزهەبە مەسیحییەکان لەو ولاتانەی بە جیهانی ئازاد ناودێرکراون، زۆر بەخێرایی کۆنترۆلی گەنجانی لەدەست دەردەچێ... هەر گەنجێکیش لە دەست مەسیحییەت دەچێ وەك باوە دەبێتە کەسێکی عەلمانی. زۆر بەخێراییش دەبێتە هاوڕێ و لایەنگری یەکێك لە ڕێبازە خوانەناسەکانی وەك کۆمۆنیزم و نازیزم.

زۆرینە هەرە مەزنەکەی مەسیحییەکانیش سەربازانی مەسیح نین، لە کاتێکدا دەبینین لەسەر گشت ئەندامانی هەردوو پارتی کۆمۆنیست و نازی پێویستە سوێندی لایەنگری و پشتگیری ڕەهای سەرکردەکانیان بخۆن، هەروەها گشت کاتەکانی بێدارییان لە بەرەوپێشبردنی ئامانج و پرسەکەیدا بەسەرببەن و بەشێوەیەی یەك لە دە پارەی چالاکییەکانی پارتەکەی بدات.

هەروەها ئەگەر کەسانی ئەیتەیست و شوێنکەوتەکانی داروینی لێ وەدەرنێین، ئەوا زۆربەی خەڵك باوەڕیان بە چیرۆکی خەلقبوون هەیە، بەلام پێدەچێ سەبارەت بە سەربردەی ئادەم و حەوا و بەهەشتی عەدن جیاوازی گەورە لە ڕا و بۆچوونیان هەبێت.

ئەوەی لێرەدا بەلامانەوە گرنگە، ئەوەیە گشت بوونەوەرێکی مرۆیی ڕێژەیەك ئازادی ئیرادەی پێ بەخشراوە، ئازادییەکەشی زەمینەی بۆ دەرەخسێنێ بڕیار بدات ئاخۆ باوەڕ بە هەبوونی خودا و شەیتان بهێنێ یانیش ببێتە کەسێکی ئەیتەیستی مادی.. چونکە ئەوەی باوەڕ بە هەبوونی خودا و شەیتان بهێنێ، لەسەری پێویستە خۆی ساغ

بکاتەوە لە خزمەتی کامەیاندا دەبێت.. بەڵام کەسی ئەیتەیست باوەڕ بە بیرۆزی حوکمی ڕەها دەهێنێت و پشتگیری لە پارت و دەوڵەت دەکات.. بەڵام سزای لادانیش چەشتنی ئازار و ئەشکەنجە و زیندان و زۆربەی جاریش مەرگە.

ئێمە دەبینین کەسانی ئەیتەیست بەتەواوی هەبوونی هێزە شاراوە و غەیبییەکان ڕەت دەکەنەوە، بەڵگەش دەهێننەوە و دەڵێن تەنانەت تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت بوونی خوداش نەسەلمێندراوە... چەندان تیپ و گرووپی ئەیتەیستی هەن، وەك: کۆمۆنیستە ڕاستینەکان، ماسۆنییەکانی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات، بیرمەندە ئازادەکان، هەروەها ئەندامانی کۆڕپەندی نا خواوەندی و نوورانییەکان و عەدەمییەکان و ئانارکیست و نازیـە ڕاستینەکان و مافیاکانیش هەن.. هەروەها کەسانی بێباوەڕی دیکەش هەن شەرم لە بەڕێوەبردنی چالاکییە ئەیتەیستییەکانی نێو کۆمەڵەکانی نازیزم و کۆمۆنیزم دەکەن، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بەرەو پەیوەستبوونی هەمەچەشنی عەلمانی دەچن.

زۆربەی کەسانی ئەیتەیستی بیروباوەڕەکانیان لەسەر ئەو بنەمایە بنیاد دەنێن کە دەڵێ یەك ڕاستی هەیە ئەویش مادەیە، هەروەها هێزە کوێرەکانی ئەم مادەیە کە هەندێکجار بە وزەش ناوی دەبەن، پێشکەوتوون تا لەسەر شێوەی گژوگیا و دواتریش ئاژەڵ و ئینجا مرۆڤ بەدیارکەوتوون.. بە هەموو جۆرێکیش نکوڵی لە هەبوونی ڕووح و ژیانی دوای مردن دەکەن.

کۆمۆنیزمی نوێ لەساڵی ١٧٧٣ لەلایەن کۆمەڵێك لە سەرمایەداران و دەوڵەمەندانی جیهانی (بارۆنەکانی دارایی) دامەزرا و هەر لەو کاتییەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەیتەیستی بەکاریان هێنا کە لەسەر بنەمای دکتاتۆریەتێکی سەرتاپاگیر داڕێژرابوو. لینین لە پەرتووکەکەی خۆیدا

(کۆمۆنیزم باڵی چەپڕەو) بە ڕوونی باسی دەکات و لە لاپەڕە ٥٣ی پەڕتووکەکەدا نووسیویەتی:

" بیردۆزەکەمان ڕێبازێکی باوەڕپیانە نییە، بەڵکو ئامراز و هۆکارێکی کارە".

کارل مارکسیش ( ١٨١-١٨٨٣) ئەڵمانییەکی بە ڕەچەڵەك جوولەکە بوو..یەکەمین جار لە ئەڵمانیا و دواتریش لە فەرەنسا بەهۆی چەند چالاکییەکی شۆڕشگێڕییەوە وەدەرنرا، دواتر ئینگلترا مافی پەناهەندەیی پێبەخشی.. لە ساڵی ١٨٤٨دا مارکس مانیفێستی کۆمۆنیزمی بڵاو کردەوە.. ئەویش ددانی بەوەدا ناوە لەوانەیە نەخشەی وەرچەرخاندنی جیهان بۆ چەند کۆمارێکی سۆسیالستیی سۆڤییەتی چەندان سەدە بخایەنێ.

کارڵ ڕیتەریش ( ١٧٧٩-١٨٥٩) کەسێکی ئەڵمانی بوو، مامۆستای مێژوو و زانستە جیۆ سیاسییەکان بوو.. ناوبراو بیردۆزێکی دژ بە مانفێستی کۆمۆنیستی نووسی، نەخشەیەکی دانا و تیایدا ڕایگەیاند نەژادی ئاری دەتوانێ دەست بەسەر ئەورووپا و دواتریش جیهاندا بگرێ.. چەند ڕێبەر و سەرکردەیەکی ئەیتەیستی ئاریی نەخشەکەی ڕیتەریان پەسندکرد و کاریان پێ دەکرد، بۆیێ نازیزمیان لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجی دەستبەسەرداگرتنی جیهان و گۆڕینی بۆ دەوڵەتێکی ئەیتەیستی بەکارهێنا کە بەتەواوی ملکەچی دکتاتۆریەتە سەرانسەرییەکەیان بێت.

ڕێبەرانی هەردوو کۆمەڵەی ئەیتەیستی لەسەر دەستەهەڵاتی دەوڵەت کۆك و تەبان و سەرۆکی دەوڵەتەکەش بە خودای سەر زەوی دادەنێن، ئەم باوەڕەش بیرۆکەی تألیە مرۆڤ دەخاتە واری کردارییەوە.

باوەڕی کارڵ ڕیتەر دوای لێکۆڵینەوە و شرۆڤە مێژووییەکەی تۆکمە بوو بەوەی کە کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی جیهانیی بواری دارایی هەن پەیوەستی هیچ وڵاتێك نین و پشتگیری لە هیچ دەوڵەتێك ناکەن، بەڵام دەست لە کاروباری گشت وڵاتێك وەردەدەن، لە ساڵی ١٧٧٣دا بەمەبەستی بەکارهێنانی بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانی بۆ وەدیهێنانی هەڵپە و بەرتەماییە نهێنییەکانیان، ماسۆنییەتی ئازادی خۆرهەڵاتیان دامەزراندووە.. ڕیتەر ڕایگەیاندبوو زۆربەی ئەو کەسە داراییە جیهانییانە، ئەگەر هەر هەموشیان نەبن، جوولەکەن یان ڕەچەڵەك و بنەچەیان جوولەکەیە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ بەتەواوی سرووتە ئایینییەکانی جوولەکە پێڕەو دەکەن یان نا.

ڕیتەر لە وەڵامدانەوەی مانیفێستی کۆمۆنیستیی کارڵ مارکسدا تاوتوێی ئەو مەترسییانەی کردووە و پێی وایە ئەگەر جیهان ڕێگە بەو کۆمەڵە پیاوە بدات بەردەوام کۆنترۆڵی سیاسییانەیان بەسەر کۆمۆنیستی جیهانیدا هەبێت و بەپێی نەخشە و پیلانەکانیان ئاراستەی بکەن، ئەوا مەترسیی گەورە دێنە پێشێ.. لە کۆتاییدا چەند پێشنیازێکی واقیعی و کردەی بەرەنگاربوونەوەی کودەتایەکەی بارۆنە جیهانییەکانی بواری دارایی دەخاتە بەردەم سەرکردە ئارییەکانی جەنگ، هەروەها پلانێکی دژ بە پیلانە یەکەمەکەیان بۆ دەکێشێ لەڕووی فراوانی و دوورمەودابیەکەیەوە، بە ڕۆڵی خۆی ئامانجی کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە سرووشتییەکانی جیهانە لەپێناو بەرژەوەندیی نەژادی ئاری.

ڕیتەر ئاماژەی بە دامەزراندنی نازیزم و بەکارهێنانی فاشیزم واتا سۆسیالیزمی نیشتمانی کردووە وەك ئامرازێك بۆ وەدەیهێنانی

بەرتەمایی و ئامانجەکانیان، ئامانجەکانیشیان بە وێرانکردنی نەخشە و پیلانی بارۆنە جیهانییەکانی (دارایی) و دواتریش داگیرکردنی جیهانەوە دێتەدی.. هەروەها ئاماژەی بە پرسێکی دیکەش کردووە، ئەویش ئەوەیە کە بارۆنە جیهانییەکانی بواری دارایی دەیانەوێ سامییەت لە هەموو رووییەکەوە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانیان بەکاربێنن، لەبەرئەوە لەسەر رێبەر و سەرکردە ئارییەکان پێویستە ناسامیزم لە هەموو رووەکانی بەکاربێنن بۆ ئەوەی پرسی ئاری بەرەو پێش ببەن.

**نەخشە و پلانەکەی کارل ریتەر ئەم پێشنیازانە دەگرێتە خۆی:**

-ملپێکەچکردنی گشت ولآتانی ئەورووپی بۆ ژێر هەژموون و دەستەلآتی ئەلمانیا.. هەروەها ریتەر جەختی لەسەر گرنگیی باوەرهێنان بە گەلی ئەلمانی کردووەتەوە لەوەی کە لەرووی جەستەیی و ئەقلی لە رەگەز و نەژادی سامی بەرزتر و پێشکەوتووترە.. خودی ئەم هزر و بیرۆکەیەش ئەو ناوکە بوو کە پیاوانی ئاریی نێو بواری راگەیاندن بیردۆزی سەرەوەربوونی نەژادی ئەلمانییان لەسەر بنیاد نا.. ئەم بیردۆزە ئامرازی دەستی ئەو جۆرە کەسانە بوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی بانگەشە و پروپاگەندەکانی بارۆنە داراییەکانی جیهانی بەکاریان هێنا، واتا ئەو بارۆنانەی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد رەگەز و نەژادی سامی گەلی هەڵبژێردراوی خودان، هەر نەژادی سامیشە چاودێریی و گرنگیدانی خودایی هەڵبژاردووە ببێتە خاوەنی گۆی زەوی.. بەمشێوەیە ملیۆنان کەس دابەش بوونە سەر دوو بەرەی دژ بەیەك.

-هەروەها کارل ریتەر راسپاردەیەکی دیکەی نووسیبوو تیایدا داوای کردبوو پێرەویی لە سیاسەتێکی دیاریکراوی دارایی بکرێ،

بەجۆرێك ڕێگە لە خاوەنی بانکە جیهانییەکان بگرێ و نەیەڵێ ئابووریی ئەڵمانیا کۆنترۆڵ بکەن (هەروەك چۆن کۆنترۆڵی ئابوورییەکانی ئینگلترا و فەرەنسا و ئەمریکایان کردبوو).

- هەروەها ڕاسپاردەیەکی دیکەشی هەبوو تایبەت بوو بە دروستکردنی ئابووری پێنجەمی نازی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمۆنیستی، لە ڕاسپاردەکەدا ئامانجی باوەڕهێنان بوو بە چینی بالاّ و نێوەڕاستی ئەو وڵاتانەی ئەڵمانیا بەتەمابوو بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە تا وەها بخاتە مێشکیانەوە فاشیزم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیزم تاکە هۆکار و ئامرازی لەبارە و پێشوازیکردن لە سوپای ئەڵمانی وەك پارێزەری ئەو وڵاتانە لە مەترسیی کۆمۆنیستی، تاکە چارەسەر و فریادڕەسیانە.

-هەروەها ڕێتەر وەك ڕاسپاردە داوای کردبوو کۆمۆنیزم بەتەواوی وێران بکرێ، ڕەچەڵەکی جوولەکەش لە ڕەگوڕیشەوە دەربهێندرێ، بۆ ئەوەی ڕێبەرانی ئاری بتوانن بەتەواوی جڵەوی پرس و کاروبارە جیهانییەکان بگرنە دەست.

ململانێ و دانانی نەخشە و پیلان بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان، ڕێگە بۆ ڕێبەرانی هەردوو بەرەی ئەیتەیستی خۆش دەکات چەپەڵترین پیلانگێڕی و کودەتا بهۆننەوە و گشت جۆرە تاوانێکی وەك تیرۆرکردنی تاکەکەسی تا دەگاتە جینۆساید بکەن.. تەنیا لەپێناو شەکەتکردن و پرزە لێبڕانی ئەو وڵاتانە جەنگ هەڵدەگیرسێنن کە بەتەمان ملیان پێ کەچ بکەن.

لێکۆڵینەوەی بواری بەراوردکاریی ئایینەکان ئاماژە بەوە دەکات هەرگیز ناکرێ نازیزم و کۆمۆنیزم بە هیچ کام لەو ئایینانە بەراورد بکرێ

کەوا داوای باوەڕهێنان بە خودا دەکەن.. خۆ ڕاستە ڕێبەر و سەرۆکی ئەیتەیستەکانی ولاتانی سێکەچ ماوەیەك ڕێگە بە بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی باوەڕهێنان بە خودا دەدەن، بەلام ڕێگە بە پێڕەوانی ئایینی نادەن هیچ جۆرە هەژموونێکیان هەبێت یان ڕەفتاری کۆمەلایەتی و سیاسیی هاونەژادەکانیان ئاراستە بکەن..ئامانجی دوورمەودای هەردوو باوەڕی ئەیتەیستیش ئەوەیە گشت زانیارییەکی تایبەت بە هەبوونی خودا و ڕووح یان ژیانی دوایی لە مێشکی مرۆڤ بسڕنەوە.. بۆ ئەمەیش گشت ئامراز و هۆکارێك بەکاردێنن، وەك کوشتن و بەرنامە بەردەوامەکانی شۆردنەوەی مێشك و هتد.. ئەگەر بگەینە ئەو ڕاستییانەش بەتەواوی بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە هەر قسەیەك لەبارەی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان موسلمانان و ئەیتەیستەکان یان قسەیەکی پووچی بێمانایە یانیش جۆرێکە لە ڕیکلام و پڕوپاگەندە.

سادەترین ئامراز بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی جیهانی ئێستەمان شرۆڤەکردنی ڕووداوەکانی مێژووە لەژێر تیشکی ئەو باسەی خستمانە ڕوو، بەو پێیەی چەند داشێکی سەر گەمەی شەتەرەنجی جیهانین.. ڕێبەرانی نوورانی جیهانییان دابەشکردووەتە سەر دوو سەربازگە و بەرەی دژ بەیەك و پاشا و شاژن و ڕاهیب و سوارچاکیان ڕێك وەك پارچەکانی نێو گەمەی شەترەنج بەکارهێناوە... جەماوەری گشتیشیان وەك سەربازەکانی نێو شەترەنج هەلسووڕاندووە.. سیاسەتە توندوتیژە بێبەزەییەکانیان دنەیان دەدات خەلك تەنیا بە پارچەکانی شەترەنج بزانن و بە ئارەزووی خۆیان بیانجوولێنن، لەوانەیە ئەوان قوربانی بە پارچەیەکی گەورە یان ملیۆنێك سەرباز بدەن ئەگەر تەنانەت یەك هەنگاویش لە دوا ئامانجیان نزیکیان بکاتەوە، واتا ئامانجی کۆنترۆلکردنی دکتاتۆرییانەی ئەهریمەن.

لەسەر زاری ڕیتەری پرۆفیسۆر گێڕدراوەتەوە قۆناغی هەنووکەیی پیلانگێڕی و کودەتایەکە لە بانکی ئامشیل مایرۆپاوەر و ناسراو بە (ڕۆچیلد) دەستپێکردووە و دەکەوێتە فرانکفۆرتی ئەلمانیا. لەوێدا سێزدە لە گەورە بازرگانەکانی زێڕ و زیو کۆبوونەتەوە و بڕیاریان داوە پێش ئەوەی دەست بە بەرقەرارکردنی دەستهەڵاتە ڕەهایەکایان بکەن بەسەر سامان و سەرچاوە سرووشتی و مرۆییەکانی سەرانسەری جیهان، گشت سەرێکی ڕێکردوو بەرەو ئەورووپا لەنێو ببەن و گشت حکوومەتەکانیش بڕووخێنن و گشت ئایینە سیستماتیکەکانیش بسڕنەوە، دواتریش حوکم و دەستهەڵاتە دکتاتۆرەکەی ئەهریمەن بەرپا بکەن.. لە پیلانەکانیاندا بەکارهێنانی بنەمایە مادییەکانی مێژوو و دیالەکتیکی هەبوو بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکانیان باسوخواسێکی گەرمە.

جا کاتێك بچووکترین گومان دەکەوێتە دڵی ئەو هێزە شاراوانە و هەست دەکەن یەکێك لە گەمە و ئامرازەکانی دەستیان – ڕێبەر و سەرۆکەکان– زیاد لە پێویست بە مەسەلەکان دەزانێ، یەکسەر فەرمانی لەنێوبردنی دەردەکەن.. هەر لەبەر ئەمەیش بوو ڕووداوەکانی تیرۆرکردنی تاکەکەسی و زۆرێك لە شۆڕش و جەنگەکان بەرپابوون و تیایاندا ڕووحی دەیان هەزار مرۆڤی تیادا چوو و هەزاران کەسیش ئاوارە و دەربەدەر بوون.. زۆر زەحمەتە هەر سەرکردەیەکی سەربازی پاساوێك بۆ ڕووداوی بەردانەوەی بۆمبی ئەتۆمی بەسەر هیرۆشیما و ناکازاکی بهێنێتەوە، لەو ڕووداوەدا سەت هەزار کەس لە چاو تروووکاندنێکدا کوژران و نزیکەی دوو هێندەی ئەم ژمارەیەش بە سەختی بریندار بوون.. هێزەکانی یابانی شکستیان خواردبوو، پرسی

ڕادەستکردنیش چەند کاتژمێر و با بڵێین چەند ڕۆژێکی مابوو، هیچ پێویستیش نەبوو ئەو کارە ئەمریمەنی و دۆزەخییە بکرێ.. تاکە هۆی لۆژیکی بۆ لێکدانەوەی ئەم مەسەلەیە ئەوەبوو هێزە شاراوەکان بڕیاریان دابوو ئەم چەکە نوێیەی پاکتاوکردنی بە کۆمەڵ نمایش بکەن، بۆ ئەوەی هۆشداری بدەنە ستالین لەوەی ئەگەر لە داواکارییەکانیدا پێ درێژی بکات، خۆی و وڵاتەکەی هەمان چارەنووسی یابانیان دەبێت.. ئەمە تاکە بیانووە، تەنانەت بە نیمچە پاساوێکی ئەو تاوانە قێزەونەش ناچێ کە دژی مرۆڤایەتی کردیان.

بەڵام ئێستە بۆمبی ئەتۆمی و هایدرۆجینی بە بەراورد بە هەندێك چەکی دیکەی کۆمەڵکوژ، هێندە لەنێوبەر و کاریگەر نییە.. چونکە هەردوو بەرەی کۆمۆنیستی و سەرمایەداری دەستیان بە کۆکردنەوەی گازی دەمار (الاعصاب) کردووە و لە عەنبار و جبەخانەکاندا هەڵیان گرتووە، ئەو چەکە مەترسیدارە دەتوانێ گشت بوونەوەرێکی زیندووی سەر گۆی زەوی بسڕێتەوە.. ئێستە نەهێشتن و سڕینەوەی گشت شوێنەوار و ژینگەیەکی ژیان لە ناوچەیەکدا، بەندە بەو داواکارییە سەربازی و ئابوورییانەی خزمەتی ئامانجەکانیان دەکەن.

هێزە هێرشبەر و داگیرکەرەکان دوای چەند ڕۆژێکی کەم لە بەکارهێنانی گازەکەدا، دەتوانن بەبێ هیچ مەترسییەك لە ناوچە پیسبووەکاندا بپەڕنەوە، ئەوساکێ ئەو ناوچانەش دەبنە ناوچەی مردووان، بەڵام تەلار و ئامرازەکان وەك خۆیان دەمێننەوە و هیچیان لێ نایەت.

جارێکیان ئەدمۆن بۆرك نووسیبووی: گۆی ئەو شتانەی هێزە بەدخوازەکان بۆ سەرکەوتن پێویستیانە ئەوەیە چاکەخواز و لایەنە

باشەکان دارێك لەسەر بەردێك دانەنێن.. ئەمەیش ڕاستییەکی مەزنە و بۆرك پەی پێ بردووە.

شرۆڤەکردنی بەراوردکارییانەی ئایینەکان بە پێوەندی لەگەڵ ئەو هەلومەرجانەی لەمرۆدا تاقییان دەکەینەوە، شرۆڤەکاری بێلایەن دەگەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی پێی وایە ئەوانەی باوەڕیان بە خودا و ژیانی دوایی هەیە، باوەڕێکی پڕ لە خۆشەویستی و هیوایان هەیە، بەڵام خوانەناسی و ئەیتەیستی لەسەر بنەمای بێهیوایی و ڕقوکینەیەکی ڕەش بنیاد نراوە.. جیهان هیچ کاتێك بە قەد ساڵی ١٨٤٦ هەوڵی تێوەئاخنینی عیلمانیەتی بۆ نێو ژیانمان نەداوە، کاتێك هۆلیۆك و برادلۆ و کەسانی هاوشێوەی ناوبراو سووربوون لەسەر ئەو ڕایەی کە دەڵێ دەبێ گرنگیدانەکانی مرۆڤ تەنیا بەند بێت بە بەرژەوەندییە هەنووکەییەکانی ژیانییەوە.

ئەم بانگەشەکارانەی عیلمانیەت پێش ئەو مێگەلە ساختەیەی پەیامبەرانی وەك کارڵ مارکس و کارل ڕیتەر و لینین و ستالین و هیتلەر و مۆسۆلینی کەوتوون.. ئەو کەسانە ملیۆنان مرۆڤیان بەهۆی بەرهەم و شتە سەیرەکانی دەستکردی خۆیان لەخشتە بردووە، هەروەها زۆرێك لەو مەسیحییە باوەڕدارانەشیان لە خشتە بردووە کە دەبوایە تێگەیشتووتر و ئاقڵتر بن.

لێرەوە لەسەرمان پێویستە لەلای دوو پارێزانی سەرەکیی کودەتا و پیلانگێڕییەکە یان سەرانی ئەهریمەن بسەنگرێنەوە و هەڵوەستەیەك بکەین. یەکەمجار هەڵوەستەیەك لەلای جوولەکەکان دەکەین.

ئێمە لەمرۆژگارە بەهەموو ئەو کەسانە دەڵێین جوولەکە (یەهودی) کە ڕۆژێك لە ڕۆژان چوونەتە نێو ئایینی جوولەکەوە..

ڕاستییەکەی زۆرێك لەو کەسانە لەڕووی ڕەچەڵەك و نەژادەوە سامی نین، چونکە بنەچەی ژمارەیەکی یەکجار زۆریان هیرۆدی و ئەیدۆمین کە خوێنی تورکی مەغۆلی لە لەشیان دەگەڕێ.

ڕەچەڵەك و نەژادی ناسامی و تورکی و فینلەندی لە سەدەی یەکەمی زایینییەوە و لەمیانی ڕەوگە دالآن و تەنگەلآنێکی (الممر) زەمینییەوە لە ئاسیاوە هاتوونەتە ئەورووپاوە و دەکەوێتە باکووری دەریای قەزوینەوە.. بەم گەلە بتپەرستانە دەگوترێ خەزەر.. ئەوانە لە دوورترین شوێنی خۆرهەلآتی ئەورپادا نیشتەجێبوون، لەوێدا مەملەکەتی بەهێزی خەزەریان پێکهێناوە، دواتریش بەهۆی هێرش و پەلاماری بەردەوامەوە وردەوردە ڕووبەری قەڵەمڕەویی خۆیان فراوانتر کردووە، تا لە کۆتاییی سەدەی دووەمدا دەستیان بەسەر زۆربەی زەوییەکانی ئەورووپای خۆرهەلآتدا گرتووە کە دەکەوێتە خۆرئاوای چیای ئۆراڵ و باکووری دەریای ڕەش.

خەزەرەکان لەو کاتیدا تەفلی ئایینی جولەکە بوونە، لە مەسیحیەت و ئیسلامیان بە باشتر زانیوە، هەروەها لەوێدا پەرستگە و فێرگەی فێرکردنی ئایینی یەهودییان لە سەرانسەری مەملەکەتەکەیاندا بنیاد ناوە.. خەزەرەکان لە سەردەم و ترۆپکی هێزی خۆیاندا سەرانەیان ( الجزیە) لە بیست و پێنج گەلی ژێردەستی خۆیان وەرگرتووە.

دەوڵەتی خەزەر نزیکەی پێنجسەت ساڵ حوکمڕان بوو ، لە کۆتاییدا لە سەدەی سێزدەیەمی زایینی لە لایەن ڕووسییەکانی باکوورەوە هێرشیان کرایە سەر و تێکشکێندران.

گیانی شۆڕشگێڕی لە خەزەرییە جولەکەکانەوە پەڕییەوە ئیمپراتۆریای ڕووسی و تا شۆڕشی سووری تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ بەردەوام بوو.

داگیرکردنی خەزەرییەکان لە سەدەی سێزدەیەمدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە زۆرێك لەو خەڵکانەی بە جوولەکە ناویان دەبەین لەنێو ئیمپراتۆریای ڕووسیدا مانەوە.

ڕاستییەکی دیکەش ئەوەیە فینلەندییەکان و چەند کۆمەڵەیەکی دیکەی بە ڕەچەڵەك ڕووسی، بنەچە و نەژادیان ئاری نەبووە.. گەلی ئەڵمانیش وەك دوژمنێك لێیان نواڕیون و هەر لەسەر ئەم بنەمایەش ڕەفتاریان لەگەڵدا کردوون.

ئێستە دێینە سەر باسکردنی سووخۆرەکان. ڕاستییەکەی ژیاننامەی مەسیح ئەوەمان بۆ دەردەخات وەك پێغەمبەرێك هەموو کەسێکی خۆشویستووە تەنیا یەك کۆمەڵەی تایبەت نەبێت.. زۆر ڕقی لە سووخۆرەکان بووەتەوە، ئەمەیش لە کەسییەتییەکی ئایینی وەك مەسیح شتێکی سەیرە.. مەسیح چەندان لەبەر ئەو ڕەفتارە خراپەیان واتا سووخۆری، هێرشی توندی کردووەتە سەر سووخۆرەکان و ئابڕووی بردوون و بە پەرستەرانی پارە ناوی هێناون، هەروەها لەمەڕ ئەو سووخۆرانەوە گوتوویەتی: ئەوان کەنشتی ئەهریمەنن.. ئەم ناسناوە بەهێزەش بەهۆی ڕقی ئەستووری مەسیح بووە لەو کەسانەی پارە دەگۆڕنەوە و خەریکی کاری سووخۆرین، ڕۆژێکیان حەزرەتی مەسیح قامچییەکی گرتە دەست و لە هەیکەل وەدەری نان و ئەم قسانەی پێگوتن: هەیکەل ماڵی خودا بوو.. بەڵام ئێوە کردووتانە ئەشکەوتی دزان... مەسیح بەم کارە تۆڵەخوازییەی دژ بە پارە گۆڕەرەوە و سووخۆران، وازی لەسەر بڕیاری مەرگی خۆی کرد.

مێژوو پێمان نیشان دەدات کە پارەگۆڕەرەوە (الصراف) جیهانییەکان لە پیلانە نهێنییەکانیاندا ئاشووبیان ناوەتەوە.. نوورانییەکان کشت هێزێکی شەرخوازی جیهان ئاراستە دەکەن.

مێژوو دەیسەلمێنێ سینیکای فەیلەسووف و ریفۆرمیستی رۆمانی (٤ پێش زاین لەدایکبووە و ٦٥ زاینی مردووە) چەشنی مەسیح ویستبووی پەردە لە رووی کردە خراپەکارییەکان و هەژموونی شەرخوازانەی ئەو سووخۆرانە رابماڵێ کەوا دزەیان کردبووە نێو رۆماوە.. سینیکا بەخێوکار و مامۆستای تایبەتی نیرۆن بوو، کاتێکیش نیرۆن بووە ئیمپراتۆر سینیکای فەیلەسووف وەك راوێژکار و هاورێی دڵسۆزی مایەوە.. بەڵام هێندەی پێنەچوو نیرۆن بۆبابای خواست، ئەو ژنە نیرۆنی خستە نێو داوی سووخۆرە بەدخوازەکانەوە.. ئیدی نیرۆن بووە بەدناوترین سەرۆك و دەستەڵاتداری نێو مێژوو، کەسییەتییەکەشی کەوتە نێو ئەوپەری دڵرەشی و ناکەسی و نزمییەوە، تەنانەت وای لێهات تەنیا بۆ تێکدان و وێرانکردنی گشت شتێکی جوان و چاك دەژیا، کارە تۆڵەخوازییەکانی شێوە و رەوتی دوژمنایەتییەکی ئاشکرای گرتبوو.. بەمشێوەیەش سینیکای فەیلەسووف هیچ کاریگەرییەکی بەسەر نیرۆنەوە نەما، بەڵام لەهەنبەر هەژموونە بەدخواز و رەفتارە خراپەکانی سووخۆرەکان و لەپێناو ئاشکراکردن و داماڵینی دەمامکیان، ساتێك هەدادانی نەبوو.

لە کۆتاییدا سووخۆرەکان داوایان لە نیرۆن کرد رێگاری دەمکوتکردنی سینیکا بگرێتە بەر، چونکە سینیکا جەماوەرێکی زۆری هەبوو.. نیرۆنیش فەرمانی بە سینیکا کرد بە دەستی خۆی خۆی بکوژێ!

ئەمە یەکەمین رووداوی بەناوبانگ بوو تیایدا سووخۆرەکان کەسییەتییەکیان لەنێوبرد کە ببووە کۆسپی بەردەمیان و ناچاریان کرد بەدەستی خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێ، بەڵام دوا رووداو نەبوو، چونکە بەدرێژایی مێژوو ژمارەیەك رووداوی هاوشێوەی

خۆکوشتن و تاوانی کوشتن دەبینرێ خراوەنەتە قالبی ڕووداوی ئاسایی و خۆکوشتنەوەز

مەسەلەی جیمس فۆرستال یەکێکە لە خراپترین نموونەی ئەم دۆخانە و لەم سالآنەی دواییدا ڕووی داوە.. فۆرستال لە سالی ١٩٤٥ گەیشتە ئەو باوەڕەی خاوەن بانکە ئەمریکییەکان بە نهێنی خەریکی دامەزراندنی یەك کۆمەلە و ڕێکخستنن و ئەندامەکانیشی خاوەنی بانکە جیهانییەکانن و کۆنترۆلی دارایی فەرەنسا و ئینگلترا و ولآتانی دیکەشیان کردووە.. هەروەك لە یادداشتنامەی ژیانیشیدا ئامآژەی بۆ کردووە گەیشتە ئەو باوەڕەش بازرنە جیهانییەکانی دارایی بەرپرسیاری ڕاستەوخۆی هەلگیرساندنی ئاگری هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانین.. ناوبراو هەولێکی زۆری خستە گەڕ سەبارەت بەو ڕاستییە باوەڕ بە ڕۆزفلت و گشت کەسانی پلە بالآی نێو حکوومەت بهێنێ.. بەلآم نازانین ئاخۆ دواتر لەمە شکستی هێنا و بەهۆی بێهیوابوونییەوە خۆی کوشت، یانیش بۆ دەمکوتکردنی هەتاهەتایی تیرۆر کراوە.. ئەو کردانەی کوشتن کە مۆرکی خۆکوشتنی بەسەردا براوە، بە درێژایی سەدەکان لە کودەتا و پیلانگێڕییە جیهانییەکاندا هۆکارێکی پەسندکراوی سیاسییە.

کاتێکیش ئیمپراتۆر یۆستنیانۆسی یەکەم ( ٤٨٣-٥٦٥ زایینی) یاسایە مەدەنییە بەناوبانگەکانی دەرکرد و تیایاندا هەولی دابوو سنوورێك بۆ ئەو کارە ناڕەوایانە دابنێ کە بازرگانانی جوولەکە لە بازرگانی و ئالوێرەکاندا پەنایان بۆ دەبردن.. بەلآم بازرگانانی جوولەکە هەر خودی بەکرێگیراوانی نوورانییەکان بوون، بەهۆی بازرگانیی ناڕەوا و قاچاغچییەتییەکی بەرفراوانەوە توانیبوویان لەسەر حیسابی

بازرگانانی دیکەی جگە لە خۆیان ئیمتیازی زۆر نادادپەروەرانە و ستەمکارانە وەدەستبێنن، بەمشێوەیە توانیان ئەو بازرگانە ستەملێکراوانە قەللۆش بکەن و لە گۆڕەپانی کار وەدەریان بنێن.. یاسای یۆستنیانۆس تا سەدەی دەیەم سەرچاوەی سەرەکیی ماف بوو، تا ئێستەیش بە گرنگترین سەرچاوەی ماف و ئەحکامەکان دادەندرێ.. بەڵام سووخۆرەکان بە زیرەکی و زۆرزانیی خۆیان توانییان ئەو خێر و چاکەیە سەراوژێر بکەنەوە کە یۆستنیانۆس خەریکی وەدیهێنانی بوو.. ئینسکۆلۆپیدیای فنك ئاند واگنازی یەهوودی بەمجۆرە وەسفی بازرگانە جوولەکەکانی ئەوکاتی دەکات: جوولەکە لەو کاتیدا تەواوی ئازادییە ئایینییەکانی خۆیان هەبوو، تەنانەت هەندێك مەڵبەند و پێگەی بچووك بەردەوام دەرگەی بۆ ئەوان لەسەر پشت بوو.. بازرگانیکردن بە کۆیلەیش بە سەرچاوەی یەکەمی سامانی هەندێك جوولەکەی ڕۆمانی دادەندرا، بەلام لە ساڵی ٣٣٥ و ٣٣٦ و ٣٨٤ی زاینی چەندان یاسا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم جۆرە بازرگانییە دەرچوون.

مێژوو بۆمانی ڕوون دەکاتەوە بازرگانانی جوولەکە و پارە گۆڕەرەوەکان هەر تەنیا لە بازرگانیی کۆیلەدا کاری ناڕەوایان نەکردووە، بەڵکو بازرگانییە خراپ و ناڕەوایەکانی وەك مادەی هۆشبەر و بازرگانیکردن بە سێکس و قاچاغچییەتیکردن بە شەراب و بۆن و خشڵ و گەوهەر و چەند کالایەکی دیکەی بە نرخیشیان ڕێکدەخست و قۆرغیان دەکرد.. ئەوجا بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان و پارێزگەریکردن لە چالاکییە ناڕەوایەکانیان، پەنایان دەبردە بەر بەرتیل و کڕینی پشتگیری و دەنگی بەرپرسانی گەورە.. بەمشێوەیە بەهۆی

مادەی هۆشبەر و شەراب و ژنەوە، توانیان ئەخلاقی گەل تێکبدەن..
مێژوو تۆماری کردووە پۆستنیانۆسی گەورە ئیمپراتۆری ڕۆما هێندە بەهێز نەبووە بتوانێ سنوور و ئاستێك بۆ ئەمجۆرە چالاکییانە دابنێ.

لە لێکۆڵینەوەیەکی ئیدوارد گیبۆنی مێژوونووسی بریتانیدا (١٧٣٧-١٧٩٤) تاوتوێی کاریگەرییە خراپەکار و تێکدەرەکانی بازرگان و سووخۆرانی جوولەکەی کردووە و پێی وایە دەستی درێژ و بەتوانایان لە نزمکردنەوە بێهێزکردن و ڕووخاندنی ئیمپراتۆریای ڕۆمانیدا هەبووە.. ئەمەیش ناونیشانی پەرتووکەکەی بووە.. گیبۆن زۆر بە وردی و دووروودرێژییەوە باسی لە ڕۆڵی خراپی پۆبابای ژنی نیرۆن کردووە و دەڵێ: ئەو ژنە بۆ خولقاندنی جۆرە هەلومەرجێکی خراپی نێو ڕۆما ڕۆڵێکی خراپی هەبووە، هاتنەکایەی ئەو هەلومەرجە نالەبارانەش وایان لە گەلی ڕۆمانی کردووە وەك سەرخۆشێك بە کەمتەرخەمییە بنوارێتە وێرانبوون و داڕووخانە خێرایەکەی ڕۆما.. بە کەوتنی ئیمپراتۆریای ڕۆمانیش هەژموون و دەستهەڵاتی جوولەکە هاتەکایەوە، ئەورووپاش کەوتە نێو چاخە تاریکەکان.

ئینسکلۆپیدیای ئینگلیزیش سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێ: بازرگان و سووخۆرانی جوولەکە زۆر حەزیان لە بواری بازرگانی بوو، ئەوەی لەم بوارەشدا یارمەتیدەریان بوو، کارامەیی و بڵاوبوونەوەیان بوو لە گشت شوێنێکدا.. زۆربەی بازرگانیی ئەورووپا لە چاخە تاریکەکاندا لەژێر دەستی جووەکاندا بوو ، بەتایبەتیش بازرگانیکردن بە کۆیلە.

کاتێك دەنوارینە پارە و دراوی کۆنی پۆلۆنی و هەنگاری، دەتوانین هەست بە کاریگەریی ئەو هەژموونە ڕەهایەی جووەکان

بکەین، ئەم دراوانە چەند نەخشێکی یەهوودییان لەسەرە.. ئەمەیش نیشانەی سووربوونی جوولەکە بووە بۆ کۆنترۆڵکردنی دراو و دواتریش دەرکردن و لە سکەدانی ئەو دراوەش هەر لەژێر دەستی خۆیاندا بووە. سووخۆرانی جوولەکە لەو کاتیەوە دروشمێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو کە دواتر ( ئامشل مایەر پاوەر -١٧٤٣- ١٨١٢ی زایینی) پێی بەناوبانگ بوو، دروشمەکە دەڵێ: لێگەڕێن ئەرکی دەرچوواندن و لەسکەدانی دراوی نەتەوە و گەلێك بگرینە ئەستۆ و سەرپەرشتی بکەین، ئەوجا پاشان گوێ بەوە نادەین کێ یاسایەکان بۆ ئەو نەتەوە و گەلە دادەنێت!!.

ئامشل مایەر پاوەر ئەم دروشمەی وەك تێز و پێشنیازێك خستووەتە بەردەم هاوبەشەکانی، بۆئەوەی کرۆکی ئەو پاڵنەرەیان بۆ ڕاڤە بکات کە وای لە سووخۆران کردووە لە ساڵی ١٦٩٤دا هەوڵی کۆنترۆڵکردنی بانکی ئینگلترا بدەن.

بارۆنەکان -ئەوانەی سەرانی ئاری بوون- سووربوون لەسەر شکاندنی قۆرغکارییە یەهوودییەکەی نێو بواری بازرگانی و دراو و ئاڵوێرەکانی ئەورووپا.. هەر ئەمەیش پاڵنەری سەرەکییان بوو کاتێك لە ساڵی ١٠٩٥ دا بەرەکەتی هەندێك ڕێبەری مەسیحییان وەدەستهێنا بۆ ئەوەی جەنگەکانی خاچپەرستی یان جەنگە پیرۆزەکان بەڕێوەببەن.

لەنێوان ساڵانی ١٠٩٥ و ١٢٧١دا هەشت هەڵمەتی خاچپەرستان ڕێکخرا، ئامانجی ڕووکەش و بەرچاوی هەڵمەتەکان پاراستنی ئەو مەسیحییانە بوو کە سەردانی لانکەی مەسیحیان دەکرد، ئامانجێکی دیکەشیان دامەزراندنی حوکمڕانییەکی مەسیحی بوو لە فەڵەستین.. بەڵام ڕاستییەکەی چەند جەنگێك بوون و بۆ دابەشکردنی دانیشتووانی

ئەورووپا بەسەر دوو بەرەی دژ بەیەك هەڵگیرسێندران: یەكەمیان لەگەڵ جوولەكەكان بوون و دووەمیشیان دژیان بوون.

كەنیسەی كاسۆلیكی لە ساڵی ١٢١٥دا چوارەمین كۆنگرەی خۆی بەڕێوەبرد، بابەت و پرسی سەرەكیی كۆنگرەكە شرۆڤەكردن و تاوتوێكردنی دەستدرێژییەكانی جوولەكە بوو لە گشت وڵاتانی ئەورووپیدا... لەو ماوە مێژووییەدا ڕێبەرانی كەنیسە و سەركردەی دەوڵەتەكان بە یەكگرتوویی كاریان دەكرد.. ڕێبەرانی كەنیسە ڕەزامەندیی تەواوی خۆیان لەهەنبەر بەردەوامبوونی هێرش و هەڵمەتە خاچپەرستییەكاندا دەربڕی.. هەروەها لەپێناو دانانی ئاستێك بۆ ئەو سووخۆرییەی جوولەكەكان خەریكی بوون، چەند بڕیار و ڕاسپاردەیەكیان دەركرد .. بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەش چەند ڕێنماییەكیان دەركرد تیایاندا داوای دیاریكردن و سنووربەندكردنی شوێنی نیشتەجێبوونی جوولەكەكانیان دەكرد، بەو واتایەی دەبووایە جووەكان تەنیا لە گەڕەكە تایبەتییەكانی خۆیاندا نیشتەجێ ببن و نەتوانن ماڵەكانیان ببەنە گەڕەكەكانی دیكە، هەروەها ڕێگەشیان لە مەسیحییەكان گرت ببنە لایەنێكی بەكارهاتوویان و نەدەبوایە بەهیچ شێوەیەك لە مامەڵەی جوولەكەكاندا ببنە بریكار، ئەمەیش بۆ ڕێگەگرتن بوو لە سووخۆر و بازرگانانی جوولەكە بۆ ئەوەی نەتوانن مەسیحییەكان وەك نمای كارەكانیان بەكاربێنن، چونكە جوولەكەكان لە ڕێگەی هەندێك كرێگرتەی مەسیحییەوە چەند گرێبەست و پەیماننامەیەكی گوماناویان دەبەست، لە كاتی ئاشكرابوونیشدا مەسیحییەكان ئۆباڵ و سزای كارە ناڕەوایەكانی جوولەكەكانیان دەگرتە ئەستۆ... لەلایەكی دیكەوە یاسایەكان جوولەكەكانیان

قەدەغەکرد ژنان و کچانی مەسیحی لە ماڵ و دەستگەکانی خۆیاندا بەکاربێنن، چونکە ئەو ژن و کچانەیان لەخشتە دەبرد و دەیانکردن لەشفرۆش و لەپێناو وەدەستهێنانی پارە و هەژموونیش بەکاریان دەهێنان.. دواتریش چەند یاسایەکی دیکە دەرچوون رێگەیان لە جوولەکەکان گرت هەندێك کردەی دیکەی بازرگانی بەڕێوەببەن.. بەڵام کەنیسە بە گشت هێز و دەستهەڵاتی خۆی و بە پاڵپشتیی سەرکردە و رێبەری دەوڵەتەکانیش نەیتوانی سەرانی پارە و دارایی بخاتە ژێر رکێفی خۆی و ملیان پێ کەچ بکات... ئەو یاسایانە ئاگری رقوکینەی نوورانییەکانیان دژ بە کەنیسەی مەسیح خۆشکرد، بۆیێ لەپێناو لاوازکردن و بێدەستهەڵاتکردنی کەنیسە و جیاکردنەوەی لە دەوڵەت، نەخشە و پیلانیان دانا.. جا نوورانییەکان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، لەنێو خەڵك و جەماوەری سادەدا بیرۆکەی عەلمانی و بێ ئایینیان بڵاو کردەوە.

حکوومەتی فەرەنسی لە ساڵی ١٢٥٣دا چارەسەرێکی ریشەیی بۆ گرفت و پرسی جوولەکە دانا و بەهۆی پێشێلکردنی یاساوە هەر هەموویانی وەدەرنا، بەشێکی زۆری دەرکراوەکان پەنایان بردە بەر ئینگلترا و ئەو وڵاتەش وەك پەناهەندە وەریگرتن.. تا ساڵی ١٢٥٥ جوولەکەکان توانیان کۆنترۆڵی چەند گەورە پیاوێکی بواری کەنیسەی ئینگلیزی و زۆرێك لە پیاوماقوولان و دەرەبەگەکان بکەن.. ئەم سووخۆرانە و ئەوانەی بە دانایانی جوولەکە ناوبانگیان دەرکردبوو، سەر بە نوورانییەکان بوون.. ئەمەیش لە میانی ئەو لێکۆڵینەوەیە ئاشکرا بوو کە شا هێنری سێیەم لەهەنبەر ئەو ئابڕووچوون و قۆڵبڕی و بەرتیل و تاوانانەی بۆنیان بە گشت لایەکدا بڵاو ببوویەوە، فەرمانی بەڕێوەبردنی دەرکرد، بەتایبەت دوای کوشتنی سان هیۆ ئۆف لینکۆڵن لە ساڵی

۱۲۵۵دا، لێکۆڵینەوەکان سەلماندییان هەژدە جوولەکە ئەو کردانەیان ڕێکخستووە، بۆیێ درانە دادگە و فەرمانی لەسێدارەدانیان بەسەردا جێبەجێ کرا.

شا هێنری لە ساڵی ۱۲۷۲دا مرد، دواتر شا ئەدواردی یەکەم بووە جێنشین و فەرمانی قەدەغەکردنی سووخۆریی جوولەکەکانی دەرکرد.. دواتریش لە ساڵی ۱۲۷۵ دا چەند یاسایەکی تایبەت لە پاڕلەمان دەرچوون و بە یاساییەکانی تایبەت بە جوولەکە ناونران.. ئامانج لەو یاسایانە کەمکردنەوەی هەژموون و دەستهەلاَتی سووخۆرانی جوولەکە بوو لەسەر گشت قەرزارانیان، نەك هەر قەرزارە مەسیحییەکان بەتەنیا، بەڵکو جوولەکە هەژارە قەرزارەکانیشی گرتەوە.. ناکرێ ئەو یاسا و سیستمانە بە دوژمن و دژیەری سامییەت دابندرێ، چونکە پارێزگەری لەو جوولەکانە دەکرد کە پابەندی یاسایەکان.

سووخۆرانی جوولەکە پێیان وابوو لەو جارەشدا، دەتوانن بەرەنگاری فەرمانەکانی پاشا ببنەوە.. بەلاَم هەڵەیەکی گەورەیان کرد، چونکە پاشا فەرمانی دەرکردنی گشت جوولەکەیەکی لە ئینگلتەرادا دەرکرد.. ئەمە دەستپێکی ئەو دۆخە بوو کە مێژوونووسان بە وەدەرنان و دوورخستنەوەی مەزن ناویان بردووە.

دوای ئەوەی شا ئیدوارد هەنگاوی یەکەمی هەڵێنا، سەکسۆنیا لە ساڵی ۱۳٤۸ و هەنگاریا لە ساڵی ۱۳٦۰ و بەلجیکا لە ساڵی ۱۳۷۰ و سلۆڤاکیا لە ساڵی ۱۳۸۰ و نەمسا لە ساڵی ۱٤۲۰ و زەوییە نزمەکان (هۆڵەندا) لە ساڵی ۱٤٤٤ و لە کۆتاییشدا ئیسپانیا لە ساڵی ۱٤۹۲ هەمان هەنگاوی شا ئیدواردیان هەڵێنا.

وەدەرنانی جوولەکەکان لە ئیسپانیا گرنگییەکی تایبەتی هەبوو.. چونکە لە سەدەی چواردەیەمدا سووخۆرانی جوولەکە بۆ یەکەمین جار

:ژانیان وەها لە حکوومەتی ئیسپانی بکەن مافی وەرگرتنی باج وەدەستبهێنن و ڕاستەوخۆ باج لە گەلی ئیسپانی وەربگرن، ئەمەش وەك دەستەبەرکردن و نەفەوتانی ئەو قەرزە بووە کە بەیانەخشیە حکوومەت..سووخۆرانی جوولەکە بە خراپترین شێوە سوودیان لەو دەرفەتە وەرگرت، هێندە توندوتیژ و دڕندانە بوون ئەگەر خەڵك نەیتوانیبایە قەرزەکانیان بداتەوە، داوای هۆقە گۆشتێکیان لە خەڵکی قەرزار دەکرد، ئەم ڕەفتارەش دڵی خەڵکی پڕ لە ڕق و تووڕەیی کرد و یەك چەخماخە بۆ تەقینەوەی ڕق و تووڕەییەکە بەس بوو... چەخماخەی ڕق و تووڕەییەکەش لەنێو ئەو گوتارە ئاگرینانە تیشکیان دەدا کە فێرناندۆ مارتسنسز دەیخوێندنەوە و بەهۆیەوە جەماوەر ڕاپەڕین و یەکێك لە گەورەترین قەسابخانە خوێناوییە بەناوبانگەکانیان بەرپاکرد.. ئەمەیش یەکێکە لەو نموونانەی کە جوولەکەکان بەهۆی سیاسەتی سەرکردە و ڕێبەرە تاوانکارەکانیان خەڵکی بێوەی و بێگوناهیان هاندا.

جوولەکەکان لە ساڵی ١٤٩٥ لە لیتوانیا و لە ساڵی ١٤٩٨ لە پورتوگال و لە ساڵی ١٥٤٠ لە ئیتاڵیا و لە ساڵی ١٥٥١ لە بافاریا وەدەرنران.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بە خاڵێکی گرنگی نێو ئەو ڕێکارانە بکەین، هەندێك لە پارەدەر و دەستڕۆیشتووانی جوولەکە تەگبیریان دەکرد لەبۆردۆ و ئەفینۆن و چەند مەملەکەتێکی بابەوی و مەرسیلیا و باکووری ئەزلزاس و بەشێك لە ئیتاڵیای باکوور پەناگە و شوێنی حەوانەوە بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.. مەسەلەکەش هەر وەك ئینسکۆلۆپیدیای بریتانی لەبارەیەوە دەدوێ بەمجۆرەی لێهات: جەماوەری جوولەکە دیسانەوە خۆی بینییەوە بەرەو خۆرهەلات و بەتایبەت بەرەو هەردوو ئیمپراتۆریای پۆلۆنی و تورکی دەچێت.. بەلام هەندێك لەو جوولەکانەی

نێش و ئازاری مانەوەی نێو خۆرئاوایان لە ئاوارەیی پێ باشتر بوو، کەوتبوونە بەر کۆی ئەو کۆتوبەندانەی لە قۆناغی پێشوودا بەسەریاندا سەپێندرابوو.

بەمشێوەیە دەتوانین بڵێین چاخە تاریکەکانی جوولەکە لەگەڵ نیشانە و دەرکەوتەکانی چاخی ڕێنسانسی ئەورووپادا بەدیارکەوتن.. ئەمەیش پاڵپشتیی لە ڕاستی و دروستیی بیرۆزی هەندێك لە مێژوونووسان دەکات کە پێی وایە نەتەوە و گەلانی ئەورووپا تەنیا لە کاتی خۆ ڕاپسکاندن و ڕزگاربوون لە چرنووکی ئابوورییانەی جوولەکە توانییان بچنە نێو چاخی ڕابوون و گەشەکردنەوە.

ئەو جوولەکانەی لە ئەورووپادا مابوونەوە دوای کردە گەورەکەی کۆچپێکردنی بەزۆر، هەر لە گەڕەکەکانی خۆیان نیشتەجێ بوون کە بە جیتۆ ناو دەبران و جوولەکەکانیش بە (کاحل) ناویان دەبرد، لەوێدا بەسەر جوولەکەکان سەپێندرابوو دوور لە جەماوەری گەل و نەتەوەکان بژین، لەوێدا حاخام و دەستەڵاتدارانیان حوکمڕانییان بەسەردا دەکردن، ئەو حاخام و دەستەڵاتدارانەش ملکەچی فەرمان و ڕێنماییەکانی نوورانییەکان و گەورە سووخۆرانی جوولەکە بوون، مەبەستمان ئەو سووخۆرانەیە لە هەندێك وڵاتی ئەورووپیدا توانیان لە پێگە و پۆستەکانی خۆیاندا بمێننەوە.. بەکرێگیراوانی نوورانییەکانیش لە گەڕەکەکانی جیتۆدا نیشتەجێ ببوون، دژ بەو کەسانەی وەدەریان نان و دایانبڕیون ژەهری ڕق و کینە و گیانی تۆڵەکردنەوەیان دەڕژاندە دڵی جەماوەری جوولەکە. هەروەها حاخامەکانیش بە گوێچکەی جوولەکەکانیان دەچرپاند هەر ئەوان گەلی هەڵبژێردراوی خودان و ڕۆژی تۆڵەکردنەوە بێگومان زۆر نزیکە و هەر خۆیان دەبنە خاوەنی گۆی زەوی و هەموو شتەکانی سەری.

دەبیٚ ئـەوەش بڵـێین زۆربـەی ئـەو جوولەکانـەی بـەرەو ئـەورووپای خۆرهەلآت کۆچیان کرد. ئەوەیان بەسەردا سەپێندرابوو تەنیا لـە شوێنی دەستنیشانکراوی نیشتەجێبوونیان بژین، ئـەو شـوێنـەش کەوتـووە سـەر سنووری خۆرئاوای ڕووسیا و لە کەنارەکانی دەریای بەلتیك لە باکوورەوە تـا دەگاتـە کـەنارەکانی دەریـای ڕەش لـە باشـووردا درێـژ ببوویـەوە.. زۆریەشـیان بـە ڕەچـەڵەك جوولەکـەی خـەزەری بـوون.. جوولەکـە خەزەرییەکان بە ڕۆشنبیری و کەلتووری یـەدیش ناسراون (یـەدیش نـاوی ئەو زمانەیە کە پێـی دەئـاخفن)، هـەروەها بـەوە ناسـراون زۆر دڵـڕەش و نەگریس و قرچۆکن، لـە مامەڵـە ئابوورییەکانیشـاندا ڕێگـەی زۆر نـەگریس دەگرنە بەر و ئـەخلاقیان زۆر نـزم و خراپـە..لێرەدا دەبیٚ لـەو عیبرانییـە دێرینانـەیان جیـا بکەینـەوە کـە تـەورات باسـی کـردوون، چـونکە ئـەو عیبرانییانە بەزۆری کەسانی بەئەدەب و ڕەوشتبەرز بوون.

بەکرێگیراوانی نوورانییەکان لەنێو گەڕەکەکانی جیتۆدا ئـاگری ڕق و کینــە و حــەزی تۆڵەکردنــەوەیان خــۆش دەکــرد.. وردە وردە هەلومەرجەکـەیان قۆسـتەوە و دەسـتیان بـە ڕێکخسـتن کـرد، تـا بـووە بزووتنەوەیـەکی شۆڕشـگێڕیی جیهـانی و ئامـانجی تۆقانـدن و وێرانکـاری بوو.

سـەران و کەسـە بەناوبانگـەکانی بـواری دارایـی ئـەم بزووتنـەوە شۆڕشگێڕییەیان پێشخسـت، تـا کردیانـە کۆمـۆنیزمی جیهـانی... ئەوانە کاری توندوتیژانەی تاکەکەسییان ڕێکدەخسـت تـا بـووە بزووتنەوەیـەکی سیستماتیکی شۆڕشگێڕی و دواتـریش بـۆ گەڕاندنـەوەی جوولەکـەکان بـۆ ئەو ولآتانەی پێشـتر بـەزۆر لێیـان وەدەرنرابـوون، پیلانێکـی ڕێکوپێکیـان ڕێکخسـت، گەڕانەوەکـەش بەشـێوەی دزەکـردن بـوو، چـونکە لـە ڕووی یاساییەوە قەدەغە بوو بگەڕێنەوە ئەو ولآتانە.. جا لەبەرئەوەی ڕێگـەیان

لیّ گیرابوو لەو وڵاتانە نیشتەجیّ ببن و کاریان دەستکەویّ، پارە و سەرمایەیەکی زۆریان خرایە بەردەست بۆ ئەوەی سیستمی بازاڕی ڕەش دامەزرێنن، لەو بازاڕانەدا گشت جۆرە بازرگانی و ئاڵوێرێکی قەدەغەکراویان دەکرد.. هەروەها بەپێی ڕێبازی کۆمپانیای نهێنیی قۆرغکردن کاریان دەکرد، ئەمەیش ڕێگەی بۆ بارۆنەکانی دارایی خۆشکرد پارە بۆ ئەو تۆڕانە دابین بکەن تاکو بە نهێنی بمیننەوە.

بەلاّم گومانی چەند نووسەر و مێژوونووسێکی وەك کۆنت دی بۆنسین و خاتوو نیستا و وبستەر و سێر و ترسکۆتیان ورووژاند و ئەو نووسەرانە گەیشتنە ئەو باوەڕەی نوورانییەکان هێز و دەستی شاراوەی پشت بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانین.. هەردوو نووسەر ویلیام فۆس و سیسیل گیراهتی لە پەڕتووکەکەیاندا بەناوی ( الحلبە الاسبانیە) دەڵێن: پرسی ناسین و ئاشکراکردنی سەرکردە و ڕێبەرە ڕاستەقینەکانی ئەو کۆمپانیایە قۆرغکارییە نهێنییەی جیهانی کۆنترۆڵ کردووە و چۆنییەتیی گەیشتنیان بە ئامانجەکانیان مەسەلەیەکە و لە دەرەوەی بواری ئەم پەڕتووکەدایە.. بەلاّم هەر بە یەکێك لە گرنگترینی ئەو پرسانە دادەنرێ کە دەبێ چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە... جا ئەو کەسەی ڕۆژێك ئەو مەتەڵە هەڵدێنێ و دەیخاتە بەر چاوی خەڵك، پیاوێکی زۆر دلێر و بەجەرگە، ژیانیشی بەبەراورد بەو ئەرکەی چاوەڕوانیەتی هەر هیچ نییە، ئەرکەکەش بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی جیهان لەمەڕ ئەو ڕێکار و کارانەی کۆمەڵەی ئەهریمەن دەیگرنەبەر و خۆیان وەك کاهینانی ئایینێکی نهێنی سەپاندووە و دەیانەوێ ئایینەکەیان بەسەر جیهاندا بسەپێنن.

ئێمە بە شرۆڤەکردنی ئەو ڕاستییانەی خوارەوە دەتوانین بڵێین پیلانی دزەکردنی جوولەکەکان بۆ نێو ئەو وڵاتانەی لێیانەوە وەدەرنراون، سەرکەوتنی وەدەستهێناوە: چونکە جوولەکەکان لە ساڵی ١٦٠٠دا

گەڕاوەنەتەوە ئینگلترا و سالی ١٥٠٠ گەڕاوەنەتەوە مەجەر، بەلام لە سالی ١٥٨٢ دووبارە وەدەرنراوەنەتەوە. هەروەها سالی ١٥٦٢ گەڕاونەتەوە سلۆڤاکیا و لە سالی ١٧٤٤ دووبارە بەزۆرەملێ دەرکراونەتەوە. سالی ١٧٠٠ گەڕاونەتەوە لیتوانیا. جا بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی چەند جار دەرکراون، بەلام ئەوان گشت جارێك کۆمەڵەیك تۆڕ و ڕێکخستنی شاراوەیان لە دوای خۆیان جێهێشتووە و پیلانیان بۆ چالاکییە شۆڕشگێڕییەکان داناوە و ئاشوویان ناوەتەوە.

لێرەدا لەلای گەورەترین سەرانی پیلانگێڕی ئەهریمەنی دەوەستین کە بە نوورانییەکان ناسراون.

ڕوون و ئاشکرایە حاخامەکانی جوولەکە لە لێکدانەوەی مانا نهێنییەکانی نووسراو و پەڕتووکە پیرۆزەکاندا بانگەشەی دەستهەلاتێکی ڕەها دەکەن، پێشیان وایە ئەمە بەپێی سرووشتێکی تایبەتی خواوەندییە.. بەلام ئەگەر ئەو کەسانە ئامرازێکیان لەبەر دەستدا نەبووایە سرووشە وەرگیراوەکانیان بخەنە واری کردارییەوە، ئەوا ئەم بانگەشەیە گرنگییەکی ئەوتۆی نەدەبوو.. لەبەرئەوە، ژمارەیەك سووخۆر و حاخامە گەورەکان و بەڕێوەبەران و کەسانی دەستهەلاتدار کۆبوونەوە و بڕیاریان دا کۆڕپەندێکی نهێنی دامەزرێنن کار بۆ وەدەیهێنانی ئامانجەکانیان بکات، ناویشیان لە کۆڕپەندەکەیان ناوە کۆمەلگەی نوورانی.

# بەشی دووەم

# شۆڕشی ئینگلیزی

# (١٦٤٠- ١٦٦٠ زاینی)

هێزە شەڕخوازەکان گەیشتنە ئەو ڕاستییەی چنگگیرکردنیان لە سیستمەکانی دەستهەلآت و حکوومەتەکانەوە تەنیا لەمیانی کۆنترۆلکردنی خاوەن پۆست و پایە گەورەکانی نێو کۆشک و تەلارەکانی دەستهەلآتی ئیمپراتۆرییاییەکان دەبێت، ئەمەیش دەرفەت دەڕەخسێنی چنگ لە سەرچاوە و سامانەکان گیر بکەن، بە کورتی ئابووری زەوت بکەن و دەستی بەسەردا بگرن.

ڕاستییەکی مێژوویی هەیە مێژوویی هەیە و بریتییە لەوەی شا ئەدواردی یەکەمی شای ئینگلترا یەکەمین کەس بووە جوولەکەی لە ولآتەکەی خۆیدا وەدەرناوە، لەبەرئەوە سەرکردە و بارۆنە دارایییەکانی جوولەکە لە فەرەنسا و ئەلمانیا، بڕیاریان دا ئینگلترا ئامانجی یەکەمیان بێت.

بەمشێوەیە شانە نووسـتووەکانیان دووبەرەکی و تەنگوچەڵەمەیان لەنێوان شا و حکوومەتەکەی و خاوەنکار و فەرمانبەرانی و کرێکار و خاوەن کارگە و دواتریش لەنێوان دەوڵەت و کەنیسەدا نایەوە.. پیلانگێڕەکان بیردۆز و بۆچوونی دژ بەیەکیان دەهێنایە ئاراوە کە بانگەشەی چارەسەری جۆراوجۆری پرسە سیاسی

و ئایینییەکانیان دەکرد، ئەمەیش بۆ تێکدانی ڕیزی گەلی ئینگلیز و دابەشکردنیان بوو بۆ سەر بەرەی دژ بەیەك... سەرەتا گەلی ئینگلیزیان دابەش کردە سەر دووبەر و سەنگەری: پرۆتستانتی و کاسۆلیکی... دواتر بەرەی پرۆتستانیش دابەش بووە سەر دوو کۆمەڵەی: پابەند و سەربەخۆیەکان.

جا کاتێك ناکۆکی کەوتە نێوان شارلی یەکەم و پەرلەمانی ئینگلتڕا، بەکرێگیراوانی سەر بە ( مناسح بن ئیسرائیل)ی سووخۆر پێوەندییان بە ئۆلیڤەر کرۆمویلی سەرکردەی بەرهەڵستکاری ئینگلیزی کرد، و پێیان گوت ئەگەر بێت و بتوانێ ئەو پرۆژە نهێنییەیان بۆ جێبەجێ بکات کە مەبەستی ڕووخاندنی عەرشی بریتانیابوو، ئەوا پارەوپوولێکی زۆری پێدەبەخشن.

هەروەها فرناندیز کارڤاجالی ڕێبەری پورتوگالیی بە ڕەچەڵەك جوولەکە ڕۆڵی پیلانگێڕ و نەخشەدانەری سەرەکیی کاروبارە سەربازییەکانی کردەی کرۆمویلی دەگێڕا، بۆیێ سەرلەنوێ لایەنگرانی کرۆمویلی ڕێکخستەوە کە بە (سەرە خڕەکان) ناسرابوون، دواتر سوپایەکی نموونەیی لێیان پێکهێنا، باشترین چەك و پێداویستیی جەنگیشی بۆ دەستەبەر کردن.. جا لەو کاتەی کودەتایەکە لە واری جێبەجێکردندا بوو، سەتان تێکدەری ڕاهێنەر هێنرانە نێو ئینگلتڕا، بۆ ئەوەی تەڤلی تۆڕ و شانە نهێنییەکانی سەر بە جوولەکەکان ببن.. هەمان شتیش لەم ڕۆژگارەدا لە ئەمریکا بەڕێوە دەچێت.

تۆڕ و شانە نهێنییەکانی جوولەکە لە ئینگلترای ئەو کاتیدا بەسەرۆکایەتیی جوولەکەیەك بوو بەناوی دی سۆز.. هەروەها فرنالدیز کاڤاجال بەهۆی دەستهەڵات و هەژموونەکەی خۆیەوە توانی (دی سۆز)

وەك باڵیۆزی پورتوگال لە ئینگلترا دامەزرێنێ.. سەرکردە و ڕێبەرانی ئاژاوەگێڕی جوولەکە لە ماڵی ناوبراو کۆ دەبوونەوە هەر لەو ماڵەشدا پیلانی کودەتا و سیناریۆیەکانیان بەڕێوە دەبرد، چونکە پارێز بەندیی سیاسی و دیبلۆماسی هەبوو.

بڕیاری یەکەمی پیلانگێڕەکان دروستکردنی دووبەرەکی بوو لەنێو گەلی ئینگلیزی و نانەوەی ناکۆکی لەنێوان کەنیسە و دەوڵەتدا.. بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش ڕێبازی کالفنیان ئاخنییە نێویەوە، خودی ئەو ڕێبازەش دەستکردی خودی جوولەکەکان بوو.. ناوی تەواوی کالفن (کۆهین) بوو، لە کاتی سەفەرە بانگخوازییەکەی لە سویسراوە بەرەو فەرەنسا ناوی خۆی گۆڕیبوو، سەفەرەکەشی لەپێناو بانگەشەکردن بوو بۆ بیروباوەڕەکەی.. کاتێکیش بەرەو ئینگلترا دەچێت ناوی خۆی دەگۆڕێ بۆ کالفن.. مێژوو بۆمانی ڕوون دەکاتەوە کە چۆن سویسرا لانکە و پێگەی یەکەمی زۆرێك لە شۆڕش و پیلانگێڕییەکان بووە.. هەروەها ئەوەش بەدیار دەخات کە سەرکردە و ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکانی جوولەکە لەپێناو شاردنەوەی ڕەچەڵەکە ڕاستینەکەی خۆیان ناوی خۆیان گۆڕیوە.

لە ساڵی ١٩٣٦ و لەنێو ئاهەنگی ڕێکخراوی بنای برێسی جوولەکە لە پاریسدا، ئاهەنگێڕەکان بەوپەڕی گوڕوتاوەوە جەختیان لەوە کردەوە کالفن بە ڕەچەڵەك جوولەکە بووە.

سەرکردە و ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکان جگە لە دەمەتەقێ و بێزبازییە ئایینییەکان، چەند گرووپ و دەستە و تاقمێکی چەکداریشیان بۆ زیاتر تەشەنەسەندنی ئاگری ئاشووب و شڵەژان لە سیاسەت و کاردا ڕێکدەخست.. ڕاڤە و باسی تێرووپڕی لایەنێکی پڕ لە نهێنیی شۆڕشی

ئینگلیزی و وردەکارییەکانی دیکەی ئەو قۆناغە، لە هەردوو بەش و بەرگە قەبارە گەورەکەی ژیانی شا شارلی دووەم دەبینین کەوا ئیسحاق دزرائلی (١٧٦٦-١٨٤٨) داینــاوە، نــاوبراو یەکێکە لـە جوولەکـە ئینگلیزییەکان و چەندان جار سەرۆکوەزیران بووە و باوکی بنیامین لۆرد بیکۆنسفیلد بووە.. ئیسحاق دزرائیلی لە پەرتووکەکەی خۆیدا ئەوە بەدیاردەخات زانیاریی بەهادار و گرنگی لە میلخوار دی سالمی جوولەکە وەرگرتووە کە لە حکوومەتی ئەو کاتی بریتانیادا نوێنەری فرەنسا بووە.. دزرائیلی لە پەرتووکەکەی خۆیدا تیشك دەخاتە سەر وێکچوون و هاوشێوەیی جۆرەکانی پیلانداانان و ئامادەکارییەکان بۆ ئەو کردانەی پێش هەردوو شۆڕشی ئینگلیزی و فرەنسی کەوتوون... بەمشێوەیە دەتوانین زۆر بەڕوونی کاریگەری و ڕۆڵی دەستی شاراوەی ڕێکخەرانی بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانی لە هەردوو شۆڕشدا ببینین.

بەڵگەی تەواوی تاوانبارکردنی کرۆمۆیل بە بەشداریکردن لە پیلانگێرییە شۆڕشگێڕییەکەی جوولەکەی جیهانی، کەوتووەتە دەست لۆرد (ئەلفرێد دۆگلاس)کە سەرنووسەری گۆڤاری هەفتانەی لین ئینگلش بووە و کۆمپانیای پەخشی باکوور لە بریتانیادا دەری کردووە.. لۆرد دۆگلاس لە گوتارێکیدا کە لە ژمارە ٣ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢١ی گۆڤارەکەدا بلاو کراوەتەوە، باس لەوە دەکات چۆن لە ئەمستردامی هۆڵەندا گەیشتووەتە لای هاوڕێی (بەڕێز ل.د. ڤان ڤالکرت)، بەرگێکی بزری دۆسییەکانی کەنشت مولجیمی دەستکەوتووە.. ئەم بەرگە لە سەردەمی جەنگی ناپلیۆنیدا بزربووە و چەندان دۆسیە و نامەی تیادایە و بەڕێوەبەرانی ئەم کەنشتە ناردوویانە و گەیشتووەتە دەستیان.

ئەم دۆسییە و نامانە بە ئەڵمانی نووسراون، یەکێکیان کە ڕێکەوتی شەشی حوزەیرانی ساڵی ١٦٤٧ی لەسەرە لە ( ئەی. کەی) واتا ئۆلیڤەر کرۆمۆیلەوە بۆ ئیبنزیرات نێردراوە و تیایدا نووسراوە:

لە بەرانبەر یارمەتیی مادیدا بەرگری لە قبولکردنی جوولەکەکان لە ئینگلترا دەکەم.. بەڵام ئەمە ئەستەمە تا ئەو کاتەی پاشا شارڵ زیندوو بێت.. بەبێ دادگەیکردن ناتواندرێ شارل لە سێدارە بدرێ، لەبەرئەوە پێشنیاز دەکەین تیرۆر بکرێ.. بەڵام ئێمە ناچینە نێو ڕێکاری پەیداکردن و ئامادەکردنی بکوژەکە، وەلێ ئەگەر ویستی ڕابکات ئێمە یارمەتیی دەدەین.

حاخام برات لە ڕێکەوتی ١٢ ی تەمووزی ساڵی ١٦٤٧دا لە وەڵامی ئەم نامەیەی سەرەوە، نامەیەکی دیکە دەنووسێت، لە نامەکەیدا هاتووە:

ئێمە لەو کاتەدا یارمەتیی مادیی پێشکێش دەکەین کە شارل لابرێت و جوولەکە لە ئینگلترا وەربگیرێن... تیرۆرکردن زۆر مەترسیدارە... دەبێ دەرفەتی هەڵاتن بدرێتە شارڵ.. ئەوسا دەستگیرکرانەکەی بۆ دادگەییکردن و لەسێدارەدانی دەبێتە هۆیەکی لەبار و گونجاو... یارمەتییەکەش زۆر و مشە دەبێت.. بەڵام پێش بەڕێوەچوونی دادگەییەکە، گفتوگۆکردن لەسەر مەرجەکانی چ سوودێکی نییە.

لە دوانزەی نۆڤێنبەری هەمان ساڵدا، دەرفەت بۆ شا شارڵی یەکەم ڕەخسێندرا هەڵبێت.. دواتریش -بێگومان- دەستگیر کرا.. هەردوو گەورە مێژوونووسی بریتانی هۆلیس و لودلۆ کۆکن لەسەر ئەوەی هەڵاتنی پاشا و دواتر ڕێگەلێگرتنی بە پیلان و تەگبیری

کرۆمۆیل بووە.. دوای وەستاندنی پاشاش ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی هاتنە پێشێ، چونکە کرۆمۆیل گشت ئەندامانی پارلەمانیی سەر بە پاشای پاکتاوکرد.. بەلاّم ئەنجوومەنەکە لە دانیشتنەکەی خۆی لە شەوی پێنجی دیسێمبەری ساڵی ١٦٤٨دا، لەگەڵ ئەو پاکتاوەی دەرهەقی کرا و بە زۆرینەی دەنگی ئەندامەکانی سازش و ملکەچییەکەی پاشایان پەسند کرد و بۆ گەیشتنە ڕێککەوتنێکی نوێ لەگەڵیدا بە کارێکی تەواویان دانا.

واتای ئەمە بۆ کرۆمۆیل نەمانی ڕۆڵەکەی و بێبەشکردنی بوو لەو پارە و پوولەی سەرانی جیهانیی بواری دارایی پێیان دابوو، بۆیێ دووبارە بۆ دەستەوەشاندن دەستی بە بزاوتی نوێ کردەوە.. لەبەر ئەوە فەرمانی بە کۆلۆنێل براید کرد هەموو ئەو ئەندام پارلەمانانە پاکتاو بکات کە لە پێناو ڕێککەوتن لەگەڵ پاشادا دەنگیان دابوو..ئەوەی دواتر ڕووی دا ئەو ڕووداوە بوو کە لە پەرتووکی مێژوویی قوتابخانەکاندا بە پاکتاوکردنی براید ناسراوە.. دوای ئەو پاکتاوکردنە تەنیا پەنجا ئەندام لە ئەنجوومەنەکەدا مانەوە، لە پێناو بەرژەوەندیی کرۆمۆیلدا دەستهەلاّتێکی ڕەهایان گرتە دەست.. لە نۆی کانوونی دووەمی ساڵی ١٦٤٩دا پێکهێنانی دادگەیەکی بالاّی داد ڕاگەیەندرا و ئەرکەکەشی دادگەییکردنی پاشا بوو.. بەشێکی زۆری ئەندامانی ئەو دادگەیەش داروودەستە و خەڵکانی نێو سوپایەکەی کرۆمۆیل بوون.. کاتێکیش پیلانگێڕان نەیانتوانی تەنیا یەك ئاوقاتی ئینگلیزیش بدۆزنەوە دژ بە پاشا ڕۆڵی داواکاری گشتی ببینێ ، کارفاجال جوولەکەیەکی بێگانەی بۆ ئەو ئەرکە ڕاسپارد کە ناوی (ئیسحاق دۆریسلاوس) بوو و لە ئینگلترادا بەکرێگیراوی و کاری بۆ مناسح بن

ئیسرائیل دەکرد .. ئەوسا شارڵی یەکەم نەك بەو تۆمەتانەی گەلی ئینگلیزی دابوویانە پالی، بەڵکو بەو تۆمەتانە کرا کەوا سوودخۆرە جیهانییەکانی جوولەکە ئاراستەیان کردبوو.. لە ۳۰ حوزەیرانی سالی ١٦٤٩دا فەرمانی کوشتنی پاشا بە ئاشکرا و لەبەردەم کۆشکی میواندارێی وایتهۆل لە لەندەن بە گیوتین جێبەجێ کرا.

بەمشێوەیە سوودخۆرانی جوولەکە و کاهینانی کەنشتی ئەمریمەن تۆلەی ئەو کۆچپێکردنە بەزۆرەیان کردەوە کە لەلایەن شا ئەدواردەوە لەهەنبەریاندا جێبەجێ کرا.. کرۆمۆیلیش لە بەرانبەر تاوانەکانیدا پارە و پوولی وەرگرت.

تەنیا تۆڵەسەندنەوە تاکە ئامانجی سوودخۆرە جیهانییەکانی جوولەکە نەبوو، بەڵکو ئامانجی سەرەکییان کۆنتڕۆڵکردنی ئابووریی ئینگلترا و گرتنە دەستی جڵەوی کاروبارەکان بوو. ئەوان پیلانیان دادەڕشت ئینگلترا دژ بە وڵاتانی دیکەی ئەورووپی لە جەنگ بگلێنن، چونکە جەنگەکان پێویستیان بە پارەوپوولێکی زۆر هەیە، ئەمەیش سەرکردە و سەرانی ئەورووپا ناچار دەکات قەرز لە سوودخۆرە جوولەکەکان وەربگرن، دواتریش دەبێتە هۆی زیاتر بوونێکی خێرای قەرزی نیشتمانیی وڵاتانی ئەورووپی.

ئەگەر لە کوشتنی شارڵ لە سالی ١٦٤٩ تا دەگاتە دروستکردنی بانکی ئینگلترا لە سالی ١٦٩٤ دا بە دوای سەرە داوەکانی ڕووداوەکان و بەدوایەکداهاتنیان بگەڕێین، دەبینین قەرزی نیشتمانی لە زیادبوونێکی بەردەوامدا بووە.. بۆشمان ڕوون دەبێتەوە خاوەن سەرمایەکانی جیهانیش توانیویانە مەسیحییەکان تێك بەربدەن.

گرنگترین ڕووداوێکیش لەم پێودانگەوە ڕوویان دابێت، ئەمانە بوون:

سالی ١٦٤٩: کرۆمۆیل بە پشتبەستن بە پارەوپوولی جوولەکە هێرشی کردە سەر ئێرلەندا.. درۆگهیدا ووکسفۆردی دەستگیر کرد.. پرۆتستانتە ئینگلیزەکان سەرزەنشت کران لەوەی کاسۆلیکییە ئێرلەندییەکان دەچەوسێننەوە.

سالی ١٦٥٠: مۆنترۆزی سەرکردەی ئینگلیزی دژ بە کرۆمۆیل ڕاپەڕی، بەلام شکستی هێنا و دەستگیرکرا و لەسێدارە درا.

سالی ١٦٥١: شارلی دووەم هێرشێکی کردە سەر ئینگلترا، بەلام شکستی هێنا و بە ڕێگەی دەریایی گەڕایەوە فەرەنسا.

سالی ١٦٥٢: ئینگلترا چووە نێو جەنگی دژ بە هۆلەندییەکان.

سالی ١٦٥٣: کرۆمۆیل خۆی وەك مەزن و سەروەری پارێزەری ئینگلترا ڕاگەیاند.

سالی ١٦٥٤: ئینگلترا کەوتە نێو چەندان جەنگی نوێوە.

سالی ١٦٥٦: ئاشووب و شپرزەیی و بێسەروبەری کەوتە نێو موستەعمەراتە ئەمریکییەکانەوە.

سالی ١٦٥٧: کرۆمۆیل مرد و ڕیچاردی کوڕی وەك پارێزەری نوێی ئینگلترا لە شوێنی داندرا.

سالی ١٦٥٩: ڕیچارد ڤیز لە پیلانگێڕی دەکاتەوە و واز لە دەستهەلات دێنێت.

سالی ١٦٦٠: ژەنەڕال مۆنك لەندەن داگیر دەکات.. شارلی دووەم وەك پاشا ڕادەگەیەندرێ.

سالی ١٦٦١: پەردە لە ڕووی ئەو کودەتایانە ڕادەماڵدرێ کەوا کرۆمۆیل و هەندێك لە داروودەستەکەی تیایدا بەشداربوون، وەك: براد شۆ و ئیرتۆن، هەروەها هەڵچوونێکی میللی لە لەندەن بەرپا دەبێت، گۆڕی مردووەکان هەڵدرانەوە و لە دار دران.

سالی ١٦٦٢: ململانێیەکی ئایینی لەنێوان تائیفەکانی پرۆتستانتیدا هاتەکایەوە و ئەو تائیفانە چەوسێندرانەوە کە ڕازی نەبوون مل بۆ کەنیسەی ڕەسمیی ئینگلترا ( ئینجلیکانی) کەچ بکەن.

سالی ١٦٦٤: دیسانەوە ئینگلترا دەچێتەوە نێو جەنگی دژ بە هۆڵەندا.

سالی ١٦٦٥: قەیرانێکی توندی ئابووری دووچاری ئینگلترا دەبێت... بێکاری و برسییەتی هەوکی گەل دەگرن و تاعوونە گەورەکە بلاو دەبێتەوە.

سالی ١٦٦٦: ئینگلترا دژ بە فەرەنسا و هۆڵەندا دەچێتە نێو جەنگێکی نوێوە.

سالی ١٦٦٧: بەکرێگیراوانی کابال ململانێیەکی نوێی سیاسی و ئاینییان نایەوە.

سالی ١٦٧٤: لەنێوان ئینگلترا و هۆڵەندا ئاشتی بەرقەرار بوو.. هێزە شاراوەکان دووبارە دەستیان بە دابەشکردنەوەی دەورەکان کردەوە.. بەڕێز ( ولیام ستراد هۆلدەر)ی کالفام بۆ پلەی سەرکردەی گشتیی هێزە هۆڵەندییەکان بەرزکرایەوە، ناویشی گۆڕا بۆ ولیم پاشای ئۆرانج.. چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ئەو و ماریی کچی دۆق یۆرکدا ڕێکخرا.. دۆق لە میراتگریی عەرشی ئینگلترا دوورخرایەوە.

ساڵی ١٦٧٧: ماری کچە شازادەی ئینگلیزی شووی بە ولیم ئۆف ئۆرانج کرد.. جا بۆ ئەوەی ولیم بکاتە عەرشی ئینگلترا، دەبوایە شارلی دووەم و دۆق یۆرك لەنێو ببرێن.

ساڵی ١٦٨٢: کودەتایەك لە ماڵی ڕای ڕێکخرا، ئامانجی کودەتایەکە لەنێوبردنی شارلی دووەم و دۆق یۆرك بوو.. بەڵام کودەتایەکە سەری نەگرت.

ساڵی ١٦٨٥: شارلی دووەم مرد و دۆق یۆرك بەناوی پاشا جیمسی دووەم چووە سەر تەختی پاشایەتی.. بۆ لەکەدارکردنی ناوبانگی پاشا چەند پڕۆپاگەندەیەك بلاوکرانەوە.. دۆق مۆنمارت ڕازی کرا یانیش بەرتیلی پێ درا بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی یاخبوونێك بکات و پاشا لەنێو ببات.. لە ٣٠ی حوزەیراندا جەنگی سیدجمور هەڵگیرسا و لەو جەنگەدا مۆنمارت دەستگیرکرا و لە ١٥ی تەمووزدا لە سێدارە درا.. لە مانگی ئابدا جیفریزی دادوەر هەڵمەتێکی خوێناوی دادگەییکردنی بەڕێوەبرد و نزیکەی ٣٠٠٠ کەس لە لایەنگرانی مۆنمارت بوونە قوربانی و زیاتر لە ١٠٠٠ کەسیشیان حوکمی فرۆشتنیان -وەك کۆیلە- بەسەردا سەپێندرا.

ساڵی ١٦٨٨: هێز و دەستە شاراوەکە فەرمانیان بە ولیم ئەمیر ئۆرانج کرد هێزەکانی لە ئینگلترا دابەزێنێتە کەناری تۆربای، ئەمەیش شا جیمس دووەمی ناچارکرد سازش بکات و بەرەو فەرەنسا تێ بتەقێنێ، چوونکە بەهۆی دەبەنگی و بێتوانایییە کەسییەکەی و ئەو پڕوپاگەندەیەی بە دژی جیمس بلاوکرابوویەوە و ناوبانگی لەکەدار کردبوو، گەل ڕقیان لێی دەبوویەوە.

سالی ١٦٨٩: ولیم و ماری وەك شا و شاژنی ئینگلترا ڕاگەیەندران.

شا جیمسی دووەم نیازی نەبوو بەبێ بەرگری عەرشی پاشایەتی جێبهێڵێ.. بەلام لەبەرئەوەی کاسۆلیکی بوو، ئەوا چەند هێز و دەستێکی شاراوە هەوڵیان دا ولیەم شازادەی ئۆرانج وەك پاڵەوانێکی پرۆتستانتی بەدەربخەن.. شا جیمس لە پێنجی شوباتدا دابەزییە کەناری ئێرلەندا. دواتر جەنگی بۆرنی هەڵگیرسا و تیایدا کاسۆلیکی و پرۆتستانتییەکان ڕووبەڕووی یەکتری بوونەوە.. پرۆتستانتییەکان لە دوانزەی حوزەیرانی گشت ساڵێك ساڵیادی سەرکەوتنیان لەو جەنگەدا بەرز ڕادەگرن.. لەوانەشە هیچ کامیشیان نەزانن ئەو جەنگە بە پیلانی سووخۆرە جیهانییەکان بوو و لەپێناو ئەوەدا بوو بە توانا و هەژموونی ئابووری و سیاسیی ئینگلترا بگەن.. ئامانجی یەکەمیشیان وەدەستهێنانی ڕەزامەندی بوو بۆ دامەزراندنی بانکێك لە ئینگلترا و دەستبەرکردنی ئەو قەرزە نیشتمانییانەی ئینگلترا بۆ وەگەڕخستنی داینەمۆی جەنگەکە وەك قەرز لێی وەرگرتبوون.. مێژوو دەری خستووە چۆن پێ بەپێ پیلانەکانیان جێبەجێ کردووە.. ئەو دەوڵەت و گەلانەی چوونەتە نێو ئەو جەنگ و شۆڕشانەوە، لە کۆتاییدا هیچ دەرئەنجامێکی سوودبەخشیان وەدەستنەهێناوە.. هەروەها نەگەیشتوونەتە چارەسەرێکی گونجاوی هیچ کام لە گرفتە سیاسی و ئاینی و کۆمەڵایەتییەکانیان.. تاکە براوەی ئەو جەنگانەش کۆمەڵە بچووکە سووخۆرەکان و بازرگانانی جەنگ و هاوڕێیان و ئەو کرێگرتانە بوون بازرگانییان بە چەك و فیشەك و کەشتییەکانەوە کردووە و ئەرکی تەرخانکردنی قەرزیان بۆ ئەو شۆڕش و جەنگانە دەستەبەرکردووە.

هەرکە ئەو سەرکردە هۆڵەندییەش گەیشتە سەر عەرشی پاشایەتیی ئینگلیزی، یەکسەر باوەڕی بە خەزێنەی ئینگلیزی هێناوە ڕێژەی ١,٢٥٠,٠٠٠ جونەیە لەو سووخۆرە جوولەکانە بە قەرز وەرگری کە چاکەیان بەسەریەوە هەبووە و گەیاندوویانەتە سەر عەرشی پاشایەتی.. پرۆگرامەکانی خوێندن لە خوێندنگەکاندا بۆ مندالآنمان باسی دانوستانەکانی تایبەت بەو قەرزە دەکەن، ئەندامە ئینگلیزەکانی نێو دانوستانەکان (جۆن هۆبلن) و ( ولیام پاترسۆن) بوون، بەلآم لایەنەکەی دیکەی دانوستانەکە واتا سووخۆرە قەرزدەرەکان بەهیچ شێوەیەك لەم پرۆگرامانەی خوێندندا قسەیان لەبارەوە نەکراوە ! !.. بەدرێژاییی مێژووش شوناس و ناویان شاردراوەتەوە.

بەڵگەنامە مێژوییەکانی تایبەت بەو دانوستانانە، دەڵێن لەنێو کەنیسەیەکی داخراودا بەڕێوەچوون و تەواو نهێنییەکەی پاراستووە.. هەروەها سووخۆرە جیهانییەکان ڕازی بوون ١,٢٥٠,٠٠٠ جونەیە بدەنە گەنجینەی ئینگلیزی بەمەرجی خۆیان – واتا سووخۆرەکان– بەند و مەرجەکانی ڕێککەوتنەکە دابنێن.. لایەنی ئینگلیزش بەو مەرجانە ڕازی بووە... ئەمانەی خوارەوەش چەند مەرجێکن:

١)ناوی کەسانی قەرزدەر بە نهێنی بمێنێتەوە، پەیمانێك بدەن بۆ ئەوەی ئەو قەرزدەرانە لە ئینگلترا بانکێك دامەزرێنن.

٢) بەڕێوەبەرانی بانکەکانی ئینگلترا ڕێگەی دیاریکردنی نرخی دراویان پێ بدرێ لە بەرانبەر زێڕدا.

٣) ڕێگە بە بەڕێوەبەری بانکەکان بدرێ مافی دەرکردنی قەرزی دە جونەیهییان هەبێت، لە بەرانبەر هەر جونەیهێکی زێڕدا کە لە ڕەسیدی نێو بانکەکانیاندا هەیانە.

٤) ڕێگەیان پێ بدرێ قـەرزە نیشتمانییەکە تۆمار بکەن و ئەوە دەستەبەر بکەن کە لیستە سەرەکییەکانی بدرێت، لەگەڵ دانی ڕێژەی سوود لە ڕێگەی سەپاندنی باجی ڕاستەوخۆ بەسەر گەل و جەماوەردا.

بەمشێوەیە شا ولیام ئۆف ئۆرانج گـەلی ئینگلیـزی بـە ڕێـژەی ١,٢٥٠.٠٠٠ جونەیهی ئیستەرلینی فرۆشتە سووخۆرانی جوولەکە!!..

سووخۆرانیش لـە کۆتاییـدا گەیشتنە مـەرام و نیـازی خۆیـان و بـانکی ئینگلترایان خستە ژێر کۆنترۆڵی ئابووریی خۆیانـەوە، هـەروەها مـافی دەرکردنـی دراوی بریتانییـان وەدەسـتهێنا و دوای ئەمـەیش ئـیتر بەلایانەوە گرنگ نەبوو کێ یاسا و دەستوورەکانی ئەو گەلە دادەڕێژێ.

بۆ درککردن و تێگەیشتن لـە بنـەمای هاوکێشـەی دراو بـە زێـڕ، هەرئەوەندە بەسە ئەم نموونە سادەیە بهێنینەوە:

بەڕێوەبەری بانکەکانی ئینگلترا دەتوانن بـە ڕێـژەی ١٠٠٠ جونەیـە لـە بەرانبـەر هـەر ١٠٠ جونـەیهێکی زێـڕدا قـەرزێك دەربکـەن کـە وەك دەستەبەر دەیخەنە سەر ڕەسیدەکەیان. جا ئەگـەر ڕێژەی سوودەکە ٥٪ بێت، دەتوانن ساڵانە ٥٠ جونەیە وەدەستبێنن، ئەمـەیش یەکسـانە بە نیوەی بەهای ئەو سەد جونەیهەی وەك دەستەبەرکردنی قەرزەکە لە بانك دایانناوە!!.. جا ئەگـەر کەسێك یـان دەستگەیەك بیـەوێ لـە بانکەکەدا بڕێك پارە قەرز بکات، ئەوا بەڕێوەبـەرانی بانکەکـە ناچاریان دەکرد زەوی یان پشکێك یان موڵکێك بە بارمتە دابنـێ کـە بەهایەکـەی لـە قەرزەکـە زۆر زۆرتربێـت.. خـۆ ئەگـەر لـە دانـەوەی سـوودەکە یـان خودی بڕە پارەکـە دوا بکـەوێ، ئـەوا بەڕێوەبـەرانی بانکەکـە ڕێکاری پێویسـتیان دەگرتەبـەر بـۆ ئـەوەی دەسـت بەسـەر موڵـك و بارمتـە

دارایییەکەدا بگرن.. بەمەیش پارەیەکی هێندە زۆریان دەست دەکەوت لە خودی قەرزەکە یەکجار زۆرتر بوو.

نیاز و مەبەستی شاراوەی قەرزدەران و ... وخۆرە نێودەوڵەتییەکان بەرەو بێتواناکردنی ئینگلترا ئاراستەی دەگرت بۆ ئەوەی هەرگیز نەتوانێ قەرزە نەتەوەیییەکەی بداتەوە.. ئامانجی پیلانەکەیان دروستکردنی هەلومەرجێکی نێودەوڵەتی بوو بۆ ئەوەی ببێتە هۆی تێوەگلانی گشت ئەو گەل و نەتەوانەی دەکەونە نێو داو و تەڵەکانیان و بەتەواوی نغرۆی نێو قەرزەکانیان بن.

هێز و دەستە شاراوەکان لە پشت پەردەوە ڕۆڵی خۆیان دەگێڕا و بووکەشووشە گونجاوەکانیان دەجوولاند، هەروەها ڕێگەیان بۆ هەڵگیرساندنی ئەو جەنگانە خۆش کرد کە بە جەنگی میراتگریی ئیسپانی ناسرابوون.. لەساڵی ١٧٠١دا دۆق مارلبۆرۆ وەك سەرکردەی گشتیی هێزە چەکدارەکانی هۆڵەندا دەستنیشان کرا، هەروەها بەپێی ئینسکلۆپیدیای جوولەکە لەلایەن سووخۆرێکی جوولەکەی هۆڵەندی بەناوی (سلۆمۆن مەدینا) وە بەبەهای ٦٠٠٠ جونەیە مووچەیەکی ساڵانەی بۆ بڕایەوە.

ئەو ڕووداوانەی وەك زنجیرەیەك بەدوای یەکتریدا هاتن و بوونە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ی فڕەنسا، بۆمان ڕوون دەکەنەوە ڕێژەی قەرزی نەتەوەیی بریتانی چۆن کەڵەکە و قەبە بووە تا لە ساڵانی ١٦٦٨و ١٨١٥دا گەیشتووەتە ٨٨٥ ملیۆن جونەیە. لە ساڵی ١٩٤٥دا قەرزەکە گەیشتە ئاستێکی خەیاڵی و لە ٢٢ ملیار جونەیە تێپەڕی کرد.

****

## بەشی سێیەم

# ڕێبەرانی شۆڕشی فەرەنسی

لە بەشی پێشوودا ئەو بەڵگەیەمان پێشکێش کرد کە چۆن و بە چ ڕێگەیەك كۆمەڵەیەكی بچووكی سووخۆران توانیان بەسەر توانایە ئابوورییەكانی ئیمپراتۆریایەكی مەزنی وەك ئینگلتەرادا زاڵبن.

هەروەها ئینسکۆلۆپیدیای جوولەكە پێمان دەڵێ وشەی ئیدۆم لە مێژووی جوولەكەدا مانا و چەمكی خۆی هەیە و واتای سوور دەگەیەنێ.

مێژووش بۆمانی دەگێڕێتەوە، چۆن زێڕینگەرێكی جوولەكە بەناوی (ئامشێل مووسا پاوەر) لە گەڕان و گەشتی سەر خاكی ئەورووپای خۆرهەڵات شەكەت بووە و لە ساڵی ١٧٥٠دا بڕیاری داوە بەتەواوی لە فرانكفۆرتی ئەڵمانیا نیشتەجێ ببێت، لەوێ لە ناوچەی جود ینسراسدا دوكانێكی پارە گۆڕینەوە دەكاتەوە.. لەسەر دەرگەی دوكانەكەشیدا قەڵغانێكی سوور وەك هێمای پیشەكەی هەڵدەواسێ. لێرەوە پێویستە ئەوە وەبیر بهێنینەوە شۆڕشگێڕەكانی جوولەكە لە ئەورووپای خۆرهەڵاتدا ئاڵای سووریان وەك دروشم هەڵبژاردووە، چونكە ڕەنگی سوور نیشانەی خوێنە.

لە شرۆڤەكردنی بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانیشدا زۆر گرنگە ئەوەمان لەیاد بێت ئاڵای سوور سیمبوڵی شۆڕشی فەرەنسی و گشت ئەو شۆڕشانەی دیكەن كە تا ئێستە بەدوایدا هاتوون.

لەمانەیش مانادارتر و بەڵگەدارتر، ئەوەیە کاتێك لینین بە پارەی سووخۆرە جیهانییەکان حکوومەتی ڕووسی ژێروژوور کرد و لە ساڵی ۱۹۱۷دا دکتاتۆرییەتی یەکەمی پرۆلیتاری دامەزراند، دیزاینی ئاڵای دەوڵەتەکەی ڕەنگی سوور بوو، چەکوش و داسێکیشی لەسەر بوو، لەسەریشیدا ئەستێرەی یەهووزا هەبوو.

ئامشێل مووسی باوەر کوڕێکی هەبوو لە دایکبووی ساڵی ۱۷٤۳ بوو و ناوی ئامشێل مایەر باوەر بوو.. باوکەکە لە ساڵی ۱۷٥٤دا مرد، لەو کاتیدا تەمەنی کوڕەکەی گەیشتە پانزە ساڵی.. باوکی لەسەر گشت کاروبارەکانی تایبەت بە پیشەی زێڕینگەری و سووخۆری ڕایهێنابوو.

کوڕەکە وەك نووسەری بانکی ئۆبنهامێر دەستی بەکار کرد.. ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێنەپەڕی کارامەیی و شارەزایی و بەهرەی خۆی لە کاروبارەکانی پارەگۆڕینەوەدا سەلماند. ئەمەیش وای لە خاوەنی بانکەکان کرد بە بەشداریکردنی ناوبراو وەك هاوبەشی بەشێکی بچووك پاداشتی بکەن.. دواتر هێندەی نەبرد بەرەو فرانکفۆرت گەڕایەوە بۆ ئەوەی لەوێدا دەستگەکەی باوکی بەڕێوە ببات.. قەڵغانە سوورەکەش بەوپەڕی شانازییەوە بە سەردەرەی دەرگەکەوە بە هەڵواسراوی مابوویەوە.. جا لەبەر ئەوەی ئامشێل مایەر باوەر دەیزانی گوزارشت و نیشانە و هێمایە نهێنییەکانی ئەو قەڵغانە چین، بڕیاری دا ناوێکی نوێ لە خانەوادەکەی بنێ.. بۆیە ناوی (ڕۆچیڵد)ی بۆ خانەوادەکەی هەڵبژارد، وشەی ڕۆچیڵد بە ئەڵمانی واتا قەڵغانی سوور.. بەمشێوەیە خانەوادەی ڕۆچیڵد پەیدابوو.

ئامشێل مایەر باوەر لە ساڵی ۱۸۱۲دا مرد، پێنج منداڵی هەبوو زۆر بەوردی لەسەر ئەوە ڕایهێنابوون ببنە ئیمپراتۆری پارەوپوول و

زێـڕ.. بـەتواناترین منداڵیشــی نـاوی (ناسـان) بـوو و لـە کاروبـارە داراییەکاندا توانایەکی سەرئاسای دەنواند.. تەنانەت لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا بە ئامـانجی کۆنترۆڵکردنی توانـا ئابوورییـەکانی ئینگلیـز ڕەوانــەی ئیـنگلتەرا کـرا.. ناسـان ڕۆچـیڵد لـە سـەفەرەکەیدا ٢٠,٠٠٠ جونەیهی وەرگرت، ئەویش توانی بە گۆڕینی ئەم ڕێژەیە بە دوو هێندە واتـا ٦٠,٠٠٠ جونەیـە لـە مـاوەی تـەنیا سـێ سـاڵدا توانـا و شـارەزاییە داراییەکەی بسەلمێنێ.

مایەر ڕۆچیڵد لە ساڵی ١٧٧٣دا هێشتاکە تەمەنی سی و سێ ساڵ بوو.. دوانزە پیاوی زۆر دەوڵەمەندی لـە فرانکفۆرتـدا بینـی بـۆ ئـەوەی باوەڕیان پێ بهێنێ سامان و سەرمایەکانیان کۆبکەنەوە و یەك کۆمەڵـە یـان گــرووپ پێکبهێــنن، بــۆ ئــەوەی بتــوانن پــارەی بزووتنــەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی دەستەبەر بکەن.

ڕۆچیڵد بـۆی ڕوونکردنـەوە شۆڕشـی ئینگلیـزی بـە چ شـێوەیەك ڕێکخراوە و پیلانی بۆ دانراوە، هەروەها ئەو هەڵانەشی بۆ ڕوونکردنەوە کە لەکاتی شۆڕشەکەدا کراون.. چونکە شۆڕشێکی زۆر هێـواش بـووە و ماوەیەکی زۆری خایاندووە.. هەروەها کۆنەپەرستان بەپێی پێویست و لە ماوەیەکی خێرادا و بە توندوتیژییەوە پاکتاو نەکراون.

نەخشـەی پیلانگێڕییەکـەی فەڕەنسـا پشـتی بـە مـانۆڕکردن بـە سامانە یـەکگرتووە زەبەلاحەکـەیان بەسـتبوو، ئەمـەیش دەبێتـە هـۆی دروسـتکردنی هەلومـەرجی پـڕ لـە نیگـەرانیی ئـابووری، بەشـێوەیەك بێکاری لەنێو جەماوەری گەلی فەڕەنسیدا بەشێوەیەکی سەرانسەری بڵاو دەبێتـەوە، بـەرەو دۆخێکـی نزیـك لـە برسـییەتی و قـاتوقڕیی دەبـات، ئەوسا بەرپرسیاریەتیی داڕووخانی ئابووری دەکەوێتە ئەستۆی پاشا و

دەربار و پیاوماقوولان و کەنیسە و پیشەسازان و خاوەنکاران، پاشانیش کەسانی هاندەر و بانگەشەکاری بەکرێگیراو دزە پێدەکەن نێو جەماوەری گەل، بۆ ئەوەی هەستی ڕقوکینە بڵاو بکەنەوە و دلوای تۆلەکردنەوە لە چینە دەستەڵاتدارەکان بکەن کە لە ڕووی سێکسییەوە زۆر داوێنپیسن، هەروەها گشت جۆرە تۆمەتی ڕاستین و بوختانێکیشیان بۆ هەڵدەبەستن.

ئەمەی خوارەوەش دەقی پوختەکراوی ئەو پیلانی کارەیە کە سرووشتی کودەتایەکە بەدیاردەخات و ئەو جۆرە کەسانە بۆ کۆنترۆڵکردنی گشت جۆرە سامانێك و ڕەنجدەرانی بیر و بازوو کێشاویانە (تێبینی بکە ئەم گوتەیەی خوارەوە یەکێکە لە پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی زایۆنیزم):

ڕۆچیڵد بە ڕاڤەکردنی ڕەهەندەکانی پیلانەکە دەستی بە قسان کرد و گوتی: ((لەبەرئەوەی زۆرینەی خەڵك زیاتر بەرەو شەڕخوازی دەچن نەك حەزی چاکەکاری و خێرخوازی، ئەوا باشترین هۆکار بۆ وەدەستهێنانی باشترین دەرئەنجام لە حوکمڕانیدا بەکارهێنانی توندوتیژی و تیرۆر و تۆقاندنە، نەك گفتوگۆیە زانستییە هێمنەکان.. یاسا -بە باوەڕی ناوبراو- هێزێکی باوەڕپێهێنەری دەمامکدارە... هەروەها گەیشتن بەو دەرئەنجامە لۆژیکییەی کە دەڵێ یاساکانی سرووشت دەیسەلمێنن هەق و ڕاستی واتا هێز.

دواتر ڕۆچیڵد جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە ئازادیی سیاسی تەنیا بیرۆکەیەکی داماڵراوە و هەرگیز نابێتە ڕاستینەیەکی واقیعی.. لەمەوە ئەو دەرئەنجامە دێتە دەست کە ئەوەی بۆ گەیشتن بە دەستەڵاتی سیاسی پێویستە ئەوەیە کەسێك یان دەستگە و

دامەزراوەیەك لەنێو جەماوەردا بانگەشەی ئازادی و ڕزگاریی سیاسی بڵاو بكاتەوە، چونكە ئەگەر جەماوەرەكە باوەڕی بەو بیر و هزرە دامالراوە هێنا، بەوەش ڕازی دەبێت وەك بەرگریكردنێك لەو بیر و ئایدۆلۆژیایە لە هەندێك ئیمتیاز و مافی خۆی خۆش ببێت... هەروەها پیلانگێڕانیش دەتوانن دەست بەسەر ئەو ماف و ئیمتیازانەدا بگرن.

پاشان ڕۆچیڵد جەخت لەوە دەكاتەوە كە دەستەڵاتی زێڕ توانیویەتی كورسیی فەرمانڕەوایی لە دەستەڵاتدارە ئازادیخوازەكان بستێنێ.. هەروەها ئەوەشی وەبیری گوێگرانی هێناوەتەوە ئایین ڕۆژگارێك بەسەر جڤاكدا زاڵبووە.. بەڵام كاتێك ئایین بە ئازادی گۆڕدراوەتەوە، خەڵك نەیانزانیوە ئەو ئازادییە بەشێوەیەكی میانڕۆ بەكاربێنن... ئەمەیش دنەی داوە ئەو دەرئەنجامە وەدەستبێنێ كە پیلانگێڕان دەتوانن بۆ خۆشكردنی ئاگری ململانێیە چینایەتییەكانی نێو جڤاك، بیرۆكەی ئازادی بەكاربێنن.. هەروەها گوتوویەتی بۆ ئێمەو سەركەوتنی پیلانەكەمان هەرگیز گرنگ نییە ئاخۆ حكومەتە بەرقەرارەكە لە ناوەوە یان لە دەرەوەڕا دەڕووخێندرێ، چونكە كەسی سەركەوتوو جا هەر كێیەك بێت، پێویستی بە پارەوپوول و سەرمایە هەیە، پارە و پوول و سەرمایەش بەتەواوی لە دەستانی ئێمەدایە.

*ڕۆچیڵد دوای ئەمە ڕایگەیاند گەیشتن بە ئامانج بە هەر ئامراز و هۆكارێك ڕەوایە، چونكە ئەو دەستەڵاتدار و فەرمانڕەوایەی بەپێی بنەما و یاسایە ئەخلاقییەكان فەرمانڕەوایی دەكات، لە مانۆڕەكاندا ئەو سیاسییە زیرەكە نییە، چونكە پابەندی ڕاستی و هەق و یاسا و شەریعەتەكان دەبێت و نایەوێ درۆ لەگەڵ جەماوەرەكەی خۆیدا بكات، بەمشێوەیە پێكە و دۆخی لاواز دەبێت و بەردەم لەبەردەم هەڕەشەی

لەرزین و داڕووخاندا دەبێت. دواتریش گوتوویەتی: ئەوانەی حەزیان لە دەستهەلاتدارییە دەبێ پەنا ببەنە بەر پیلانگێڕی و فیتنەچییەتی و فرووفێڵ و درۆ و بوختانی هەڵبەستراو، چونکە نموونە باڵاکانی کۆمەلایەتیی وەك ڕاستگۆیی و ڕەفتاری ڕاست و دروست، لە سیاسەتدا تەنیا چەند کەموکورتییەکی گەورەن و هیچی دیکە.

من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە ئەو بەڵگەنامانەی لە ساڵی ١٩٠١دا کەوتنە دەست پرۆفیسۆر نیلۆسی ڕووسی، دواتر لە ساڵی ١٩٠٥ وەك پەڕتووکێك بەناوی (مەترسیی جوولەکە) لە ڕووسیا چاپ و بڵاوی کردەوە ، تەنیا دەقێکی فراوانکراوی کودەتایە ڕەسەن و بنچینەییەکە بووە. لە بەراوردکردنی دەقەکەشدا بەشی یەکەم وەك ئەو شتانەن کە تیایدا هاتوون.. بەلام هەندێك زانیاریی دیکەی بۆ زیادکراوە و ڕوونی دەکەنەوە چۆن پیلانگێڕان داروینیزم و مارکسیزم و تەنانەت بنەما و ڕێبازەکانی فەلسەفەی نیچەشیان بەکارهێناوە.. لە هەموو ئەمانەیش گرنگتر ئەو بەڵگە نامانەی لە ساڵی ١٩٠١دا ئاشکرابوون، ڕوونی دەکەنەوە چۆن زایۆنیزم وەك چەکێکی نوێی نێو کودەتایەکە بەکاردەهێندرێ.. لێرەوە پێویستە ڕوونی بکەینەوە زایۆنیزم لە ساڵی ١٨٩٧دا لەدایکبووە.

پەڕتووکی (مەترسیی جوولەکە) لەلایەن بەڕێز ڤیکتۆر مارسدن وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئینگلیزی و کۆمپانیای چاپەمەنی بریتۆنز لە لەندەن لەژێر ناونیشانی پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی زایۆنیزم لە ساڵی ١٩٢١ چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.

لەوانەشە ئەم پرسیارە خۆی زەق بکاتەوە: بەڵگەی دروستیی بەڕێوەچوونی ئەو کۆبوونەوە نهێنییانە چین؟.. جا ئەگەر لە بەڕێوەچوونی ئەم کۆبوونەوانە دڵنیابینەوە، چۆن بیسەلمێنین بابەتی لەمجۆرەیان تیادا تاوتوێ کراوە؟

وەلامی ئەم پرسیارە زۆر سادە و سانایە.. گرنگیدان و چاودێریی خواوەندی بووەتە هۆی ئاشکرابوونی ئەم پیلانە ئەهریمەنییە.

لە سالی ١٧٨٥دا سوارچاکێك بە ئەسپەکەی خۆی ڕێگەی نێوان فرانکفۆرت و پاریسی گرتبوو و چەند زانیارییەکی تێروتەسەلی گشتیی سەبارەت بە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی و چەند ڕێنماییەکی تایبەت بە شۆڕشی فەرەنسی لەگەڵ خۆیدا هەلگرتبوو.. ئەو ڕێنماییانە لە نوورانییە جوولەکەکانی ئەڵمانیا دەرچوو بوون و ئاراستەی سەروەری مەزنی (ماسۆنیی خۆرهەلات)ی نێو وڵاتی فەرەنسا کرابوو.. هەروەها ئەنجوومەنی ماسۆنییەکانیش کە بە ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات ناسرابوو، لە فەرەنسا ببووە چەند پێگە و تۆڕێکی نهێنی و لەسەر دەستی (دۆق دورلیان)ی سەروەری مەزنی ماسۆنییەکانی فەرەنسا ئامادەکاریی بۆ شۆڕش و کاری توندوتیژی دەکرد.

لەو کاتەی کابرای سوارچاك ملی ڕێگەی گرتبوو، لە ناوچەی ڕاتیسبۆندا هەورەتریشقەیەك لێی دەدات و دەیکوژێ.. ئەو بەلگەنامانەی هەلیگرتبوون دەکەوێتە دەست پیاوانی پۆلیسەوە، ئەوانیش دەیدەنە دەست دەستەهەلاتە خۆجێییەکانی باڤاریا.. بەمشێوەیە و لە کاتی شرۆڤەکردنی ئێمە بۆ پێشکەوتنی ڕووداوەکان، پێوەندییەك لەنێوان بنەماڵەی ڕۆچیلد و جوولەکە نوورانییەکانی فرانکفۆرت و ئەو نوورانییانەش دەبینین کەوا دزەیان کردبووە نێو ماسۆنییەتی ئازادی فەرەنسا و ئەوانیش ئەنجوومەنی تایبەتی خۆیانیان بەناوی (ئەنجوومەنە مەزنەکانی خۆرهەلات) دامەزراندبوو.

نوورانییەکان لەگەڵ مارکیز میرابۆ بەریککەوتن. میرابۆ سەر بەچینی ئەرستۆکراتەکان بوو، لە نێوەندی دەربار و کۆشکی پاشایەتیشدا هەژموونێکی مەزنی هەبوو. هاوڕێیەکی گیانی بە گیانیی

ئـەو تۆقــە بــوو کــە وەك نمایــە بەرچــاوەکەی شۆڕشــی فەڕەنســی هەڵبــژێردرابوو.. لــە مانــەیش گــرنگتر، مــارکیز میرابــۆ لــە ئــەخلاق داماڵرابوو، ژیانی پڕ لە داوێنپیسی و بەد ئەخلاقی و کاری نابەجێ بوو، ئەمەیش وایکرد تا بیناقاقای بکەوێتە نێو قەرزی زۆر گەورەوە.

بۆ گەورە سووخۆرەکان زۆر ســانا بــوو وەهــا لــە بــەکرێگیراوانیان بکــەن لەگــەڵ میرابــۆی گوتاربێــژی بــەناوبانگی فەڕەنســی بکەونــە نێـو پێوەندییەوە..جا لەژێر پەردەی هاوڕێیەتی و سەرسامبوون بە بەهرەی گوتاربێژیی ناوبراوەوە، ئەو بەکرێگیراوانە یارمەتیی مادییـان دەخستە بەردەم میرابۆ بۆ ئەوەی لە تەنگوچەڵەمە داراییەکانی دەربازی بکەن.. بەڵام ئەوەی مەبەستیان بوو، پیلاندانان بوو بۆ کەوتنە نێـو خەرەنـدی خراپەکاری و بەدڕەوشتی و سێکسێکی زۆر نزم.. ئیدی میرابۆ گەیشتە دۆخێـك پارەیــەکی زۆری ئــەو کەســانە قــەرزار بێــت و بکەوێتــە ژێـر ڕەحمــەت و ویســتیان.. لــە کۆبوونەوەیەکــدا کــە بــۆ تۆمــارکردنی قەرزەکانی بەڕێوەچوو، میرابۆ بە جوولەکەیەکی گەورە ناسـێندرا، ئـەو جوولەکەیـە نـاوی موسـا منـدلۆهن بـوو، نـاوبراو میرابـۆی خستە ژێـر گرنگیپێـدان و باوەشـی بـۆ کـردەوە، لـە کـاتێکی زۆر گونجاویشـدا بـە ژنێکـی زۆر جـوان و دڵڕفێنـی ناسـاند، ئـەو ژنـە چـەندە جـوان بـوو، هێندەش لە ئاکار و ڕەوشتی جوان بەدووربوو.

ئەو ژنـە جـووە جـوان و شۆخوشـەنگە ژنـی پیاوێـك بـوو بـەناوی هێرز.. بەڵام ئەم مەسەلەیە لـە دڵـی میرابـۆدا تـەنیا ئـاگری عـەودالّی و هــەڵوەدایی گەشـترکرد.. هێنـدەی پێنەچـوو ژنەکـە ئەوەنـدەی لەگـەڵ میرابـۆ کـاتی بەسـەر دەبـرد، نیـو هێنـدە لەگـەڵ مێردەکـەی خۆیـدا نەبوو!.. بەمشێوەیە میرابـۆ هـیچ چـارە و دەرچـە و هێـز و ویستێکی

ئەما، بە قەرزی زۆر کۆتوبەندکرابوو و لە هەمان کاتیشدا ژنەکەی هێزی بەتەواوی دڵی ڕفاندبوو.

بەمشێوەیە نەك تامەکە بەڵکو قوڵاییەکەشی قووت دا!.. بەڵام بەکرێگیراوەکان، هەروەك ڕاوچییە شارەزایەکان، سەرەتا پەتەکەیان لێ توند نەکرد.

هەنگاوی دواتریان ئەوەبوو بیخەنە نێو نوورانییەتەوە.. دەشبووایە سوێندێکی گەورە بخوات پارێزگەری لە نهێنی بکات و لەژێر هەڕەشەوگوڕەشەی کوشتن ملکەچییەکی تەواو بنوێنێ.. هەنگاوی دواتریان ئەوەبوو خستییانە نێو چەند هەڵوێستێکی دیاریکراوەوە کە دوای ماوەیەك بەشێوەیەکی لێڵ و شاراوە بووە شتێکی باو.. مەبەستمان ئەو ڕێگە و شێوازەیە لە دوای ئابڕووچوون و ناوزڕاندن و لەکەدارکردنی کەسێك دەبێتە هۆی شێواندن و وێرانکردنی وێنە مەعنەوی و کۆمەڵایەتییەکەی .. دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو ئابڕووچوون و هەڵمەتی ناوزڕاندنەش ئەوەبوو هاوڕێیان و کەسانی نزیکی سەر بە چینە کۆمەڵایەتییەکەی ڕوویان لێی وەرگێڕا و لێی تەوەلا بوون.. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دڵ و مێشکی میرابۆ پڕ بێت لە ڕقوکینە و ڕقوکینەکەش گۆڕا بۆ حەزی تۆڵەکردنەوە و بە باوەڕداربوون بە بنەمایەکانی پرسی شۆڕش هەستی ڕق و حەزی تۆڵەکردنەوەی خۆی بەدەرخست.

ئەرکی میرابۆ هەوڵدان بوو بۆ ئەوەی سەرنجی دۆق دۆرلیان ڕابکێشێت و لە خشتەی ببات و باوەڕی پێ بهێنێ بە ڕۆڵی سەرکردە و ڕێبەری شۆڕش ڕازی بێت.. ڕێککەوتنە نهێنییەکە بە جۆرێك بوو دۆق دۆرلیان لە دوای پاشا خۆی وەك دەستەهەڵاتدارێکی دیموکراسیخواز

رابگەیەنێ.. پیلانگێرانی کودەتای شۆڕشی فەرەنسی سووربوون لەسەر ئەوەی بەهیچ شێوەیەك میرابۆ و دۆق دۆرلیان نەزانن پیلانی لەسێدارەدانی پاشا و شاژن و و هەزاران پیاوماقوولی ئەرستۆکراتی لە گۆڕێدایە.. هەروەها ئەو باوەڕەشیان لەلایان دروستکرد ئامادجی شۆڕشەکە تەنیا پاککردنەوەی سیاسەت و ئایینە لە خەیاڵی پووچ و دکتاتۆرییەت و کەڵەگایی.

ئەرکی ڕێکخستن و هەماهەنگیی سەرووت و ڕێورەسمی نوورانییەکان خرایە ئەستۆی ئادەم وایز هاوبت بۆ ئەوەی لە (ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات)ی ماسۆنییەکاندا بەکاری بێنێ.. وایز هاوبت لە فرانکفۆرت دەژیا، میرابۆ دۆق دۆرلیان و تالیرانی هاوڕێی بە وایز هاوبت ناساند، ئەویش لەلایەن خۆیەوە ئەو ئەرکەی خستە ئەستۆی خۆی بە نهێنییەکانی (ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات)ی ماسۆنییەکانیان ئاشنا بکات- واتا ماسۆنییەتی ئازادی فەرەنسی.. لە سەروبەندی ساڵی ١٧٨٩دا زیاتر لە دوو هەزار ئەنجوومەن لە فەرەنسا سەریان هەڵدا و هەموویان سەر بە ماسۆنییەتی مەزنی خۆرهەڵات بوون، لق و پۆپەکانیان زیاتر لە سەت هەزار ئەندام دەبوون. بەمشێوەیە نوورانییەتی یەهودی بە سەرپەرشتیی موسا مندلسۆهن و لەسەر دەستی ئادەم وایز هاوبت توانیان دزە بکەنە نێو دڵی ماسۆنییەتی ئازادی ئەورووپی.

دوای ئەمە نوورانییە جووەکان لەنێو ئەنجوومەنی ماسۆنییەکان چەند لیژنەیەکی نهێنیی شۆڕشگێڕییان دامەزراند. بەمشێوەیە بناغە پتەوەکەی بزووتنەوەی شۆڕشی فەرەنسا لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی سەر بە ئەنجوومەنەکانەوە دارێژرا.

دوای ئەوەی میرابۆ لە ئەرکەکەیدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا، وردە وردە خەریکبوو هاوڕێیەکەی بخزێنێتە نێو خراپەکاری و بەدڕەوشتی، تا هاوڕێیەکەی گەیشتە ئەو ئاستە نزمەی پێشتر خۆی تێیکەوتبوو، بەمەیش بەرەو گۆشەگیربوونی کۆمەڵایەتی ڕاپێچی کرد.. چوارساڵی نەبرد تا شان و پشتی دۆق دۆرلیان بە قەرزی زۆر چەمایەوە، بەشێوەیەك هیچ دەرچەیەکی نەبینیەوە و بە ناچاری ڕێگەیەکی مەترسیداری گرت، ئەویش بەشداریکردن بوو لە کردەکانی قاچاغچییەتی و بازرگانیی قەدەغەکراو، بۆ ئەوەی قەرەبووی هەندێ زیانی بکاتەوە. بەڵام بەردەوام سەرکێشییەکانی شکستیان دەهێنا و بەشێوەیەکی سەیر و لێڵ ئاشکرا دەبوو، بەمەیش کەوتە نێو هەڵوێستی خراپتر و زیانی گەورەتری بەرکەوت.

لە ساڵی ١٧٨٠ قەرزەکانی گەیشتنە ٨٠٠,٠٠٠ لیرەی فرەنسی.. دیسانەوە سووخۆرەکان لێی نزیکبوونەوە و سەبارەت بە کاروبارە دارایییەکان ئامۆژگاریی تایبەتیان دەکرد و بەشێوەی کاش پارەیان دەدایێ.. داو و تەڵەیان لە دەوروبەریدا دادەنایەوە و لە مانۆڕ و لەخشتەبردنیدا ئەو پەڕی کارامەییان دەخستە گەڕ، تا بارودۆخەکەی گەیشتە ئاستێکی هێندە خراپ، هیچ چارەی نەما تەنیا بەبارمتەدانانی گشت موڵك و زەوی و کۆشك و تەلارەکانی نەبێت، بەو کۆشکە پاشایەتییەشەوە کە بۆ خودی خۆی تەرخان کرابوو، ئەمەیش وەك دەستەبەرکردنی قەرزەکانی ئەستۆی بوو.. دواتر دۆق دۆرلیان گرێبەستێکی واژۆ کرد و ڕێگەی بە خاوەنقەرزەکان دەدا گشت زەوی و موڵکەکانی هەڵسوڕێنن، تاکو ڕێژە پارەوپوولێکی بۆ دەستەبەر بکەن

قەرزەکانی پێ بداتەوە و دەرامەتێکی جێگیریشی پێ بدەن بتوانێ پێی بژیەت.

دۆق دۆرلیان هیچ کاتێك پیاوە گرنگ و پرشنگدارەکەی نێو مەسەلە ئابوورییەکان نەبوو.. لە کاتی واژۆکردنی گرێبەستەکەش لەگەڵ قەرزدەران و سووخۆرانی جوولەکەدا بە هەموو ئەقڵی خۆی وای دەزانی گرێبەستەکە رێککەوتنێکی دروست و بێ گرفتە.. چونکە سووخۆرەکان هەڵسوڕاندنی مولکەکان و کورتهێنانە داراییەکەیان گرتە ئەستۆ تاکو بیکەنە سەرکەوتنێکی مادی.. نێ لەمە زیاتر چی دەوێ... ڕاستییەکەی دۆق هەرگیز گومانی نەدەکرد بە واژۆکردنی ئەو گرێبەستە جەستە و ڕووحی خۆی فرۆشتووەتە ئەهریمەن.. بەڵام ئیدی کار لە کار ترازا و بە تەواوی کەوتە ژێر دەستی بەکرێگیراوەکان.

هێز و دەستە شاراوەکانی پشت پەردە جوولەکەیەکی بە بنەچە ئیسپانیان بۆ سەرپەرشتیکردنی موڵك و کۆشکی پاشایەتیی بالیە ڕۆیالی دۆق دۆرلیان دەستنیشان کرد.. ناوی ئەو سەرپەرشتیارە جوولەکەیەش شۆدرلۆس دی لا کلۆس بوو.. شۆدرلۆس بە پەرتووکەکەی بەناوی ( پێوەندییە مەترسیدارەکان) و چەندان پەرتووکی ئابڕووبەرانەی سێکسی بەناوبانگ بوو..بە ئاشکرا بەرگری لە داوێنپیسی و بەدڕەوشتییە بێسنوورەکان دەکرد، بەو پاساوەی سیاسەتی خۆشەویستی لە گشت لایەنێکەوە شرۆڤە دەکات، چونکە شەیدای سیاسەتە ! !

ئەو کابرایە کۆشکی دۆقی کردە گەورەترین و بەناوبانگترین خانەی ئابڕووبەری و تا ئێستە جیهان نموونەی لەمشێوەیەی بەخۆیەوە نەبینیوە.. دواتریش بووە ئەو مەڵبەندەی وردەکاریی نەخشە و پیلانی تێکدانی باوەڕە ئایینییەکان و ئاکاری گشتیی فەرەنسی دادەندران و

جێبەجێ دەکران. کۆی ئەو ڕەفتارانەی لەسەر بنەمایەکی حاخامییەوە بەڕێوەدەبران: شۆڕشگێڕە گەنجە بەدڕەوشتەکانم پێ باشترە!

شۆدرلۆس دی لاکلۆس لەم ئەرکەدا بەتەنیا نەبوو، بەڵکو هاوبەشێکی دیکەی جوولەکەی هەبوو بەناوی کاگلیۆستۆ بجۆزیف بالسامۆ.. ئەو کەسە خانوویەکی دۆقی کردە چاپخانە و بڵاوکراوە و ئاگادارییەکانی شۆڕشی لێ لەچاپ دەدا.. هەروەها لیژنەی ڕاگەیاندنکارە شۆڕشگێڕە ماندەرەکانی ڕێکخست کە ئامانجیان بڵاوکردنەوەی ئەدەبی شۆڕشگێڕی بوو، چەندان ئاهەنگی مۆزیك و شانۆگەری و کۆبوونەوەی گوتاربێژیی بۆ گفتوگۆکردن بەڕێوەدەبرد.. ئامانجی لە کۆی ئەو شتانە وروژاندنی هەستوسۆزی جەماوەر و زەمینەسازکردن بوو بۆ شۆڕش.. بالسامۆ بازنەیەکی شۆفار و چاوی چاودێریکردنی ڕێکخست، بۆ ئەوەی زانیاریی تایبەت بە ئابڕووچوونەکان بگەیەننە پیاوانی نێو هێزە شاراوەکە و لە پرسەکانی ناوزڕاندنی کەسییەتیە باڵایەکانی کۆمەڵایەتیدا بەکاریان بێنن.. ئەو ژن و پیاوانەی دەکەوتنە نێو تەڵەی لاکاوس و بالسامۆ، یەکسەر دەبوونە نێچیری هەڕەشەکردن و فەرمان و کرداری زۆرەملێ، تا دەبوونە ئامرازی بەردەستیان و بەوپەڕی گوێڕایەڵییەوە فەرمانەکانیان بەجێ دەهێنا.

بەمشێوە موڵك و ماڵی دۆق دۆرلیان بووە مەڵبەند و بارەگەی نەخشە و پیلاندانان بۆ شۆڕش.

شانە نوستووەکان دزەیان کردە نێو هۆڵی کۆبوونەوە و شانۆ و پیشانگەی هونەری و یانە وەرزشییەکان، ئیدی ئەو شوێنانەیان کردە هۆڵی سەرکێشی و شوێنی لەشفرۆشی و مەیخانە و مادەی هۆشبەر.. ڕێبەرانی پێشبینیکراوی شۆڕشی فەرەنسی کەوتبوونە نێو ئەو کەشە پڕ لە پەتایەوە، لەوێدا ویژدانیان لەکار کەوت، دواتریش بە هاندانیان بۆ

نقەمبوون بەنێو کاری بەدخوازی و داوێنپیسی، بەیەکجاری ویژدانیان نەما.

سکادر لە پەرتووکەکەیدا بەناوی (مێری خوێن) و لە کاتی باسکردنی کۆشکی بالیە ڕۆیاڵدا دەڵێ: ئەو کۆشکە بارتەقای گشت شوێنەکانی پاریس پیاوانی پۆلیسی سەرقاڵکردبوو.

خوشکی شاژن ئەنتوانێت چەند نامەیەکی کەسییانەی بۆ شاژن نارد و ئاگاداری کردەوە نەخشە و پیلانی کودەتایەك لە گۆڕێدایە و خاوەن بانکە جیهانییەکانیش دەستیان تێدایە، هەروەها ئەنجوومەنی ماسۆنییەتی ئازادی فەرەنسیش تیایدا بەشدارن.. بەلام ماری ئەنتوانێت (١٧٥٥-١٧٩٣) نەیتوانی باوەڕ بەو شتە ترسێنەرانە بکات، وەك وەلامێکیش بۆ هۆشداری و ئاگادارکردنەوەکەی خوشکەکەی لەوەی کە نووسیبووی نوورانییەکانی فەرەنسا لەژێر پەردەی ماسۆنییەتی خێرخوازەوە کار بۆ ڕووخاندنی دەوڵەت و کەنیسە دەکەن، ماری ئەنتوانێت نامەیەکی بۆ خوشکەکەی ناردبوو و تیایدا نووسیبووی: (نیگەرانییەکەت سەبارەت بە ماسۆنییەت لە جێگەی خۆیدا نییە و زێدەڕۆیانەیە، چونکە لێرەوە لە گشت شوێنێکی دیکەی ئەورووپا کەمبایەخترن).

مێژوو هەڵەی گەورە و سەرچیغڕێشتنی ماری ئەنتوانێت دەخاتە بەرچاو، چونکە بەردەوام هۆشدارییەکانی خوشکەکەی پشتگوێ دەخست، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی خۆی و مێردەکەی بەرەو گیوتین ڕاپێچ بکرێن.

زۆربەی شرۆڤەکارانی مێژوو پێیان وایە، شاژن ماری ئەنتوانێت ژنێکی بەلارولەنجە بووە و زۆر حەزی لە ڕابواردن و سەرگەرمی بووە و

کەوتووەتە نێو شەپۆلی خۆشی و شادی و ئەو چێژانەی باڵیان بەسەر دەرباری کۆشکی فەرەنسیدا کێشابوو، هەروەها باس لە چەندان پرسی عەشقبازی و وروژێنەر دەکەن کە وەك ڕاستییەك دەیدەنە پاڵی، وەك ناپاکیکردن لە مێردەکەی لەگەڵ هاوڕێیەکانی و ژیانە ڕووت و پڕ لە سەرکێشییەکەی.. بەڵام ڕاستییەکەی ئەم وێنەیەی ماری ئەنتوانێت تەنیا لەلایەن بالسامۆ و هاوکارانی کێشرابوو، کێشانی ئەو وێنە ساختەیە لە چوارچێوەی هەڵمەتێکی بەرفراوانی ناوزڕاندن دژ بەو شاژنە بەڕێوەچوو.. چەسپاندنی ئەم وێنە خراپە لە مێشکی جەماوەردا بووە ڕێخۆشکەرێك بۆ ئەوەی دوای شۆڕش گەل داوای سەری بکەن.. مێژوونووسان سەلماندوویانە ئەو بەندوباڵۆرانەی بۆ ماری ئەنتوانێت هەڵبەستراون، تەنیا درۆ و بوختانن.. زۆر ئارامگرتنی ناوبراو لەهەنبەر فروفێڵ و تەڵە و داوی دوژمنەکانی و ئەو نەفسبەرزییەی بەهۆیەوە ڕوویەڕووی چارەنووسەکەی خۆی بووە و ئەو ئازایەتییەی لە کاتی نزیککەوتنەوەی لە گیوتین پیشانی دا، ڕاستیی پاکییەتیی ئەو شاژنەمان بۆ دەسەلمێنن.. ناکرێ ئەم سیفەتانە لە ژنێکی داوێنپیسی بەئاڵووشدا ببیندرێن.

جا بۆ بەردەوامبوون لە زڕاندنی ناوبانگی شاژن، وایزهاویت و مندلسۆهن پرسی ( ملوانکەی گەوهەری) یان وروژاند.. ڕووداوەکەش بەمجۆرە بووە:

لەو کاتیدا خەزێنەی فەرەنسی لە خراپترین دۆخدا بووە، حکوومەتی فەرەنسی پەنای بردبووە بەر بارۆنەکانی سەرمایە و دارایی بۆ ئەوەی قەرزێکی زۆری بدەنێ.. لەو کاتیدا بەکرێگیراوێکی شۆفاری سەر بە سەرانی کودەتایەکە دەچێتە لای زێڕینگرەکەی دەربار، بەناوی

شاژنەوە داواکارییەکی درۆین دەنووسێت و دەیداتە دەست زێڕنگرەکە، بۆ ئەوەی ملوانکەیەکی زۆر گرانبەها بۆ شاژن دروست بکات کە هەر لە ملوانکە ئەفسانییەکان دەچوو، نرخەکەشی گەیشتە چارەکە ملیۆنێک لیرەی فرەنسی.. زێڕینگرەکەش ملوانکەکە دروست دەکات و دەیداتە دەست شاژن بۆ ئەوەی ڕا و بۆچوونی بزانێ، بەلام شاژن بە هەموو شێوەیەك ملوانکەکەی ڕەت کردبوویەوە و بێ ئاگایی خۆیشی لە نامەکە پیشاندابوو.. بەلام سەربردەکانی تایبەت بەو ملوانکە ئەفسانەییە، وەك پیلانگێڕەکان هەولیان بۆ دابوو، لە گشت شوێنێکدا کەوتە سەر زاران.. هەروەها ئامێری زەبەلاحی بوختان و پروپاگەندەیان بەگەڕخست کە لە لایەن بالسامۆوە سەرپەرشتیی دەکرا، هێندەی نەبرد ماری ئەنتوانێت نوقمی لافاوی ڕەخنە و سەرکۆنەکردن بوو، کەسیەتییەکەی لەکەدار بوو، ناوبانگی کەوتە نێو چلپاو.. کاتێکیش ئەو هەلمەتە گەیشتە ترۆپك، بالسامۆ دەستە پۆلاینەکەی خۆی وەشاند، چاپخانەکەی خستەگەڕ و هەزاران هەزار بلاوکراوەی دژ بە شاژن بلاوکردەوە، بوختانێکی دیکەی کردبوو گوایە عاشقێکی نهێنیی شاژن وەك دەربڕینی سەرسامی بە جوانی و شۆخوشەنگیی شاژن، ئەو ملوانکەیەی پێشکێش کردووە!

بەلام خۆ مەسەلەکە لەم ئاستەش نەوەستا، بەلکو پیلاندانەرانی ناوزڕاندنەکە بۆ لەکەدارکردنی ناوبانگی شاژن بیرۆکەیەکی چەپەلتر و ئەهریمەنانەتریان داهێنا.. نامەیەکیان بۆ کاردینال برێنس دی ڕۆهان نووسی کە واژۆیەکی ساختەی شاژنی لەسەر بوو.. لە نامەکەدا داوا لە کاردینال کرابوو نیوەی شەوێ لەگەل شاژندا بچێتە کۆشکی بالیە ڕۆیال، بۆ ئەوەی سەبارەت بە ملوانکەکە بئاخڤن.. پیلانگێران بە

لەشفرۆشێکی کۆشکەکەیان ڕاسپاردبوو پۆشاکی شاژن لەبەر بکات و شەوێ چاوی بە کاردینال بکەوێ.. هەواڵەکەش گەیەندرایە ڕۆژنامە و بلاوکراوەکـــان و ســـەربردەی زۆر هـــەرزانی سێکســـییان تیـــادا بلاوکردبوویـەوە تیایانـدا هـەردوو گـەورە کەسییەتیەکانی دەوڵـەت و کەنیسە کرابوونە ئامانج.

مێژوو باس لەوە دەکات دوای ئـەوەی ملوانکە گەوهەرییەکە لـە فرەنسـا ئەرکـە زۆر چـەپەڵ و نەگریسـەکەی بەجێگەیانـد، بردرایـە ئینگلترا.. دەشڵێن زۆربـەی دانـە گەوهـەرەکانی بەشێوە ئەسڵییەکەی خۆی لەلای جوولەکەیەك بەناوی ئیلیاسۆنەوە پارێزراوە.

هـەروەها بەڵگەیـەکی دیکـەی یەکلاکـەرەوە هەیـە دەیسـەلمێنێ سوورخۆرانی جوولەکە لە ئینگلترا پێوەندییان بە دانانی ئـەو نەخشـە و پیلانانە هەیـە کـە بوونـە هـۆی هەڵگیرسـانی شۆڕشـی فرەنسـی.. ئـەم بەڵگەیـەش لەلایـەن لیـدی کۆینزبـۆرۆی ژنـە نووسـەری پـەڕتووکی (کـەهنووتی ئەهریمـەنی) یـەوە لێـی کۆڵراوەتـەوە.. لـە میـانی لێکۆڵینـەوەکانی خۆیـدا، چـاپکراوێکی کـۆنی وەگـیر دەکـەوێ، چاپکراوەکە بەناونیشانی (دوژمنایەتی و ڕکابەریی هەنبەر سامییەکان) لەلایـەن برتـار لازاری جوولەکـە لـە سـاڵی ١٨٤٩دا نووسـراوە.. لیـدی کۆینزبـۆرۆ لـە زانیارییـەکانی نێـو پەڕتووکەکـەدا دەگاتـە ئـەو دەرئەنجامەی بنیامین گۆڵد شمید و ئەبراهامی بـرای و هاوبەشـەکەیان مووسا میکانا و برازایەکەی سێر موسی مۆنتیفیۆر کە هەر هەموویان لە ئیـنگلترا پـارەداری جوولەکـە بـوون، پێوەنـدییان لەگـەڵ برایـە جوولەکـەکانی نێـو ئـەورووپادا هـەبووە و بەیەکـەوە کاریـان بـۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشی فرەنسی کـردووە.. هـەروەها چـەندان بەڵگـەی

دیکە دۆزراونەتەوە و دەیسەلمێنن دانییل ئیتشیعی بەرلینی و دالید فریدلاندری زاوای و هێرز گریبیری ئەلزاسی و ڕۆچیلد دەستیان لە کودەتایەکەدا هەبووە.. بەمشێوەیە دەمامکی ئەو کەسانە بەردەبنەوە کە لەو کاتیدا هێزی شاراوەی پشت بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانی بوون.

زۆریش گرنگە شرۆڤەی ئەو هۆکار و ئامرازانە بکەین کە ئەو سووخۆرانە بۆ کورتهێنانی دارایی حکوومەت بەکاریان هێناوە، چونکە دواتر هەمان ئەو هۆکار و ئامرازانە لە ئەمریکا و ڕووسیا و ئیسپانیا و وڵاتانی دیکەدا بەکارهاتوون.

سێر والتەر سکۆتی نووسەری بریتانی لە بەرگی دووەمی ژیانی ناپلیۆندا، وێنەیەکی ڕوونی قۆناغە سەرەتاییەکانی گەمەی شۆڕشی فرەنسی دەخاتە ڕوو.. بەمجۆرە باسی بارودۆخی ئەو کاتی دەکات: ئەو دەوڵەمەند و بارۆنانەی پارەیان دایە حکوومەتی فرەنسی، ڕێك وەك ڕەفتاری سووخۆرانی هەنبەر بانکێکی مایەپووچ ڕەفتاریان کرد.. چونکە بەدەستێك لەپێناو دەستبلاّوی و خۆشڕابواردنەکانی قەرزی پێویستیان پێ دەدا، بۆ ئەوەی بە دەستەکەی دیکە پاشماوەی ئەو سامانە بگوشن کە بۆ دانەوەی سوودە نا لۆژیکییەکان دەچوو.. بەمشێوەیە زنجیرەیەکی دوورودرێژی قەرزی ڕووخێنەرانەی ئەو سووخۆرانە بەدوای یەکتریدا هاتن کە لە دوای خۆیدا ماف و ئیمتیازی جۆراوجۆریشی بۆ سووخۆرەکان دەستەبەر دەکرد، ئەو مافانەش وەك دەستبەرکردنی ئەفەوتانی قەرزەکانیان بوو.. بەمشێوەیە شپرزەیی دارایی دووچاری دەوڵەتی فرەنسی بوو.

دوای ئەوەی بارودۆخی حکوومەتی فرەنسی زۆر خراپ بوو، ناچاربوو داوای قەرزی نوێ بکات بۆ ئەوەی پارە و گوژمە بۆ ئەو پڕۆژە

جەنگییانە دابین بکات کە خودی جەماعەتی کودەتایەکە پەلکێشی نێویان کردبوو.. سووخۆرەکان بە خۆشخووییەوە ڕەفتاریان کرد و قەرزی پێویستیان خستە بەردەم حکوومەتی فەرەنسی، بەو مەرجەی خۆیان ڕێککەوتنامەی گرێبەستی قەرزەکە بنووسن.. ئەو مەرجانەی نووسیبوویان لە ڕووکەشدا نەرم و لێبوردە بوو، بەڵام دواتر توانیان ماری ژەهراوی بخەنە نێو ژوورەکەوە، مەبەست لە نوێنەرەکەیانە بەناوی بەڕێز نیکەر کە خستیانە نێو حکوومەتی فەرەنسییەوە، قەرزدەرەکان داوایان لێی کرد لە ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی پاشادا وەزیرێکی باڵا بۆ کاروبارە داراییەکان دابنێ.. قەرزدەرەکان بانگەشەیان دەکرد کە نیکەر لە کاتێکی زۆر کەمدا دەتوانێ فەرەنسا لە تەنگوچەڵەمە داراییەکان دەرباز بکات.. بەڵام ئەوەی لە چوار ساڵی پاشتردا ڕووی دا، ئەوە بوو نیکەر بووە هۆی ئەوەی حکوومەتی فەرەنسی بە خراپترین شێوە بخاتە نێو تەڵەی قەرزدەرە جوولەکانەوە، تەنانەت بەهای قەرزی نیشتمانی بووە ١٧٠ ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی.

(کاپتن ئەی.ڕامزی) لە پەرتووکەکەی خۆی بەناوی (جەنگێکی بێ ناو) دا زۆر بە وردی بارودۆخەکەی خستووەتە بەرباسەوە و نووسیویەتی: شۆڕش گورزێکە و دەوەشێندرێتە جەستەیەکی ئیفلیج.. کاتێك چنگی قەرزەکان توند دەبن، قەرزدەرەکان کۆنترۆڵی جۆرەها کایە و لایەنی ڕاگەیاندن و چالاکییە سیاسییەکان دەکەن و چنگیش لە پیشەسازی توندتر دەکەن.. بەمشێوەیە گۆڕەپان و شانۆیەکە بۆ گورزی شۆڕش ئامادە و هەموار دەبێت... دەستی ڕاست- کە دەستی پارەی قەرزە- ئیفلیجی بە جەستەکەدا بڵاو دەکاتەوە، بە دەستی چەپیش کە دەستی شۆڕشە- خەنجەرێك لە دەست دەگرێت و قوربانییەکە دەداتە بەر

خەنجەران.. هەروەها تێکدانی ئەخلاقیش کردەکە ئاسانتر دەکات و ڕێگەی هەمواری بۆ دەڕەخسێنێ

جا لەو کاتەی بلاوکراوەکانی تایبەت بە ناوزڕاندن و لەکەدارکردن نەفرەت بەسەر پیاوانی کەنیسە و دەوڵەتدا دادەبارێنن، بەکرێگیراوانی کودەتایەکەش ئەو کەسانە ئامادە دەکەن کە بڕیاریان لەسەر دەدرێ ببنە ڕێبەرانی دەستهەلاتی ترس و تۆقاندن و کوشتن، ئەمەیش پێش داڕووخانی پاشایەتی و دەستهەلاتەکان دێت.. یەکێك لەو ڕێبەرانە ڕۆبسپێر و دانتۆن و مارا بوون.. ئەو پیاوانەی بۆ هێرشکردنە سەر باستێل و ئازادکردنی زیندانیکراون و دەبەنگەکان بژار کرابوون، لە دێری یەعقووبییەکاندا یەکیان دەگرتەوە.. بەمشێوەیە وردەکارییەکانی پیلانە خوێناوییەکە لەنێو چوار دیواری تەلارێکی پیرۆزدا دادەندرا، هەر لەوێشدا لیستی ناوی کەسانی کۆنەپەرستی سەر بە چینی ئەرستۆکرات و لایەنگرانی پاشا دانرا کە دەبووایە لەنێو ببرێن.. هەروەها بڕیاریش لەسەر ئەوە دەدرێ تاوانکار و شێتوشوارەکان بەریان هەڵبدرێ و لەنێو جەماوەری گەلدا دەست بە کوشتن و سەربڕین و دەستدرێژیی ئاشکرا بکەن، لە هەمان کاتیشدا ئەندامانی شانە نووستووەکان مانۆیل بەڕێوە دەبەن و کەسایەتییە مەزنە سیاسییەکان و سەرانی ئیکلیرۆس و ئەفسەرانی سەر بە پاشا لە شوێنێکدا مۆڵ دەدەن.

# بەشی چوارەم

# کەوتنی ناپلیۆن

کەســە بانکییــە نێودەوڵەتییــەکان (ســووخۆرانی جوولەکــە)، پیلانیان بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشی فرەنسی دارشت، پیلانەکەشیان بەجۆرێك بوو خۆیان وەك بکەری شاراوەی پشت پێکهێنانی حکوومەتە ئەورووپییەکان بمێننەوە، ئەمەیش لەپێناو ئەوەدا بوو ئەو حکوومەتانە هەر لەژێر دەستهەلاتی خۆیاندا بمێننەوە و بتوانن کۆنترۆڵیان بکەن و بە ئارەزووی خۆیان بەکاریان بێنن و دواتریش لە دوورمەودادا بیانکەنە مۆرەی سەر تەختی شەترەنج.

چونکە لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی فرەنسیدا یەعقووبییەکان دەستیان بەسەر دەستهەلاتدا گرت.. داواشیان لە دۆق دۆرلیان کرد لەپێناو لەسێدارەدانی ئامۆزایە پاشایەکەی دەنگ بدات.. دۆق پێی وابوو دەبێتە پاشای دەستووریی فرەنسا، بۆیێ لەپێناو لەسێدارەدانی ئامۆزایەکەی دەنگی دا، بەمەیش هێزە نهێنییەکان و پیلانگێرە راستینەکانی لە سەرزەنشت و گومان دوورخستەوە، خۆیشی کردە جێگەی تیروتانە و گومانی چاوەڕوانکراو.. دواتر هێزە شاراوەکان فەرمانی لەنێوبردنی ئەویشیان دەرکرد، گشت هێز و وزەی لەکەدارکردن و ناوزڕاندنیان لەپێناودا چڕکردەوە..دۆق لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لە گیوتین نزیکبوویەوە!.. لەو کاتەی لە ڕێگە قەرەباڵغەکاندا لەنێو گالیسکەیەکدا دەبێت، بە گوێیەکانی خۆی دەنگی

گشت چینەکانی جەماوەری دەکەوتە بەرگوێ و لە هەنبەر ئابڕووچوون و لەکەداربوونیدا نارەزاییان دەردەبڕی و ڕق و قینی خۆیان پیشان دەدا!

کاتێکیش بۆ میرابۆ ڕوونبوویەوە تەنیا ئامرازێکی دەستی هێزە نهێنییەکە بووە بۆ تۆڵەکردنەوە لە خەڵك بەکارهێنراوە، پەنجەی پەشیمانیی گەست.. هەرچەندە تەواو بێ ئەخلاق و بەد ببوو، بەڵام نەیتوانی بەرگەی دیمەنە توندوتیژە زێدەڕۆیەکان و کارە پڕ تۆڵەخۆزاییەکانی یەعقووبییەکان بگرێ، کار و کردەوە قێزەونەکانی یەعقووبییەکان دژی ئەو کەسانە دەکران کە سەروەرە نهێنییەکانیان پەنجەی تۆڵەکردنەوە و ئەشکەنجەدانیان بۆیان درێژ دەکردن و فەرمانی لەنێوبردنیان دابوون.. ڕاستییەکەی میرابۆ دژ بە ئازاردانی پاشا بوو، ئامانجی پیلانە کەسییەکەی کەمکردنەوەی ڕۆڵی پاشا بوو، بۆ ئەوەی تەنیا وەك نمایەکی دەستهەڵات بمێنێتەوە، خۆیشی ببێتە ڕاوێژکاری سەرەکیی پاشایە کارتۆنییەکە.. لەبەرئەوە کاتێك لەوە دڵنیابوویەوە ئامانجی سەروەرەکانی کوشتنی لویسە، هەوڵی دا بیباتە دەرەوەی پاریس و لە بارەگەی هێزەکانیدا شوێنێکی بۆ بکاتەوە، هێزەکانیشی هێشتا پشتگیرییان دەکرد.. بەڵام یەعقووبییەکان بە پلانەکەی میرابۆیان زانی و فەرمانی لەنێوبردنی ئەویشیان دەرکرد!

وەلێ مەسەلەکە لەهەنبەر ئەودا جیاوازییەکی تێکەوت، چونکە ڕێکخراوەکانی ناوزڕاندن و لەکەدارکردن کاتی پێویستیان لەبەردەمدا نەبوو تۆڕێکی ئابڕووبردن و تۆمەتبارکردنی بۆ بچنن، بۆیێ پەنایان بردە بەر ژەهرخواردکردنی، بەشێوەیەك تاوانەکە وەك ڕووداوی

خۆکوشتن هاتە بەرچاو.. لەو پەرتووکەی سەبارەت بە گەوهەر ئامـاژەمان پێی دا ئەم تێبینییانە نووسراون:

لویس دەیزانی میرابۆ ژەهرخوارد کراوە.

دانتۆن و ڕۆبسپێر لە ئەهریمەنە بەرجەستەکراوەکانی سەردەمی تیرۆر و تۆقاندن بوون.. کاتێکیش ڕۆبسپێر و دانتۆن لە خزمەتکردنی ئامانجی نوورانییەکان بوونەوە و کاریان تەواو بوو، نۆرەی ئەوانیش هات، تۆرێکی تۆمەتبارکردن و ئابڕووبردنیان بۆ چنرا و دواتر ڕەوانەی بەردەم گیوتین کران.

گەورە نووسەری بریتانی سێر والتەر سکۆت درکی بە زۆر ڕاستیی تایبەت بە هێزە نهێنییەکانی پشت شۆڕشی فەرەنسی کردووە.. هەر کەسێك پەرتووکەکەی ناوبراو (ژیانی ناپلیۆن) بخوێنێتەوە، هەست دەکات نووسەر لە پیلانگێڕییەکەدا ڕەگوڕیشە و دەستی شاراوەی جوولەکەی ئاشکرا کردووە.

سێر والتەر ئاماژە بەوە دەکات کەسییەتییە سەرەکییەکانی شۆڕش زۆربەیان کەسانی بیانی بوون، هەروەها تێبینیشی کردووە ئەو کەسانە گوزارشتی تایبەتی جوولەکەیان بەکارهێناوە وەك بەڕێوەبەران و دلنایان.. هەروەها ئاماژەی بەوەشکردووە (مانۆیل) بەشێوەیەکی لێڵ و پڕ لە ڕەمز و ڕاز وەك داواکاری گشتیی کۆمۆنەی پاریس دامەزراوە.. سێر والتەر دەڵێ ئەو کەسە بەرپرسی گواستنەوەی هەزاران قوربانی بووە بۆ بەندیخانەکانی پاریس، ئەو قوربانیانە دواتر لە قەسابخانە شوومەکەی مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٧٩٢ لەنێوچوون و تەنیا لە بەندیخانەکانی پاریسدا ژمارەیان گەیشتە ٨,٠٠٠ کەس. هەروەها سێر والتەر تێبینیی کردووە کۆمۆنەی پاریس (ئەنجوومەنی

هەرێمی پاریس) دواتر کەوتووەتە دەستی ئەو یەعقووبیانەی داوای ڕشتنی خوێنێکی زۆرتریان دەکرد.. سکۆت پێی وایە ڕۆبسپێر و دانتۆن و مارا تا تەواوکردنی ئەرکەکانیان و لەسێدارەدانیان ئەندامانی کەنشتی یەعقووبییەکان بوون.. هەر مانۆیلیش بوو چەخماخەی هەڵمەتی دژ بە پاشا و شاژنی هەڵگیرساند و بووە هۆی ئەوەی هەردووکیان بەرەو گیوتین ببرێن..کەسێکی دیکە بە ناوی دافێدەوە پارمەتیدەری مانۆیل بووە، ئەو دافێدە ئەندامێکی نێو لیژنەی ئاسایشی گشتی بووە و قوربانییەکانی دادگەیی کردووە.. بەوەش بەناوبانگ بووە بەردەوام داوای کوشتن و خوێنڕشتنی کردووە.

سێر والتەر نووسیوویەتی ئەو دایڤیدە هەموو ڕۆژێك بە دەستەواژەی ( با خوێنێکی زۆرتر بڕژێ) دەستی بە کاروباری ڕۆژانەی کردووە.. هەر ئەویش بووە پەرستشی بوونەوەری مەزنی هێناوەتە ئاراوە (کە ماوەیەك شۆڕشی فەرەنسی لە شوێنی ئایینی مەسیحی داناوە و فەرمانی ڕەتکردنەوەی دەرچووە)!.. سرووتە بتپەرستییە پێڕەوکراوەکانیش جۆرە لاساییکردنەوەیەکی جوولە و چرپەکانی ئاهەنگی ئەو حاخامانە بووە کە سرووشیان لە ئەهریمەن وەرگرتووە.. ئەم سرووتانە شوێنی ڕێوڕەسم و سرووتە مەسیحییەکانیان گرتەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە خاڵێك بکەین و بڵێین: پەڕتووکە قەبارە گەورەکەی سێر والتەر سکۆت ( ژیانی ناپلیۆن) کە لە نۆ بەرگ پێکهاتبوو و ڕاستییەکی زۆر و زەوەندی دەخستە ڕوو، بزرکرا و لە ئێستەدا لە هیچ شوێنێك بەرچاو ناکەوێ!!

هەروەها دەبێ ئاماژە بە پەڕتووکێکی دیکەش بکەین کە (ج. ڕینیە) بە ناونیشانی ( ژیانی ڕۆبسپێر) نووسیویەتی، ناوبراو

بەشێوەیەك نووسیویەتی وەك بڵێی زانیاریی سەبارەت بە چەند نهێنییەك هەبێ.. لە پەرەگرافێکدا نووسیویەتی: لە ماوەی نێوان ۲۷ی نیسان و ۲۸ی حوزەیرانی ساڵی ۱۷۹٤ حوکم و دەستهەڵاتی تیرۆرستی و تۆقاندن گەیشتە ترۆپك. لەو ڕۆژەی دواییدا ڕۆبسپێر هەناسە سارد کرا و پشتی تێکرا، هەروەها بەرپرسی تیرۆر و تۆقاندنی هیچ کەسێك نەبوو، کردەییش نییە ڕۆبسپێر ئەو کەسە بووبێت.. چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی لەو کاتیدا هەژموونـدار و بەدەستهەڵات بوون لە بیست کەس تێپەڕی نەدەکرد.. لە شوێنێکی دیکەدا ڕینیە نووسیویەتی: ڕۆژی بیست و هەشتی تەمموز ڕۆبسپێر لە بەردەم کۆمەڵەی گشتیدا گوتارێکی دووررودرێژی خوێندەوە و تیایدا هێرشێکی توندی کردە سەر ئەو کەسانەی وەك خۆی دەڵێ تیرۆرستی توندڕۆ بوون.. بەڵام ئەم هێرشەی چەند دەستەواژەیەکی لێڵ و ناڕۆشنی تیادا بوو و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دارێژرابوون و چەند تۆمەتبارکردنێکی دیارینەکراوی تیادابوو.. ئەو وشە و ڕستانەی هاتنە سەر زاری، بەمجۆرە بوون: من ئێستە و لەم کاتەدا ناوێرم ناوزەدیان بکەم.. هەروەها ناشتوانم ئەو پەردەیە دادڕم کە ماوەی چەندان سەدە و نەوەی دێرینە ئەم مەتەڵەی داپۆشیوە.. بەڵام من جەخت لەوە دەکەمەوە، لەنێو بەڕێوەبەرانی ئەو کودەتایەدا کەسانی سەر بە ڕێبازی تێکدان و خراپکردن و دەستبڵاوی هەن، ئەمانەیش کاریگەرترینی ئەو هۆکارانەن کەوا کەسانی بێگانە بۆ تێکدان و گەندەڵکردن و بۆگەنبوونی دەوڵەت دایانهێناوە، مەبەستم لەو کەسانەش کاهینە ئەیتەیستە چەپەڵەکان و ڕێبازە پڕ لە خراپەکاری و بەد ڕەوشتییەکەیانە.. هەروەها ڕینیە بەمشێوەیە بۆچوونی خۆی

نووسیوە: ئەگەر ڕۆبسپیر ئەم قسانەی بەزاریدا نەهاتبان لەوانەبوو سەرکەوتن وەدەستبێنێ.. بەڕاستی ڕۆبسپیر زیاد لەپێویست ئاخاوت، لەبەرئەوە بە گوللە لە شەویلاکی درا و تا ڕۆژی دواتر و وادەی پەلکێشکردنی بەرەو گیوتین، دەمکوت کرا!!

بەمشێوەیە ماسۆنییەکی دیکە لەنێوبرا کە دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسابوو زیاد لەپێویست بە مەسەلەکە بزانێ.

دوای ئەوەی پیلانگێڕانی کودەتایەکە هەموو ئەو قوربانییانەیان لەنێو برد کە لە شۆڕشی فەرەنسیدا بڕیاری پاکتاوکردنیان درابوو، قۆناغێکی نوێی پیلانگێڕییەکی جیهانییان دەستپێکرد.. ئەنسلیم مایەر ڕۆچیڵد، ناسان مایەری کوڕی بەمەبەستی کردنەوەی لقێکی دەستگەی ڕۆچیڵد لە لەندەن، ڕەوانەی ئینگلترا کرد.. ئامانجیش لەمە پتەوکردنی پێوەندیی ئەو سووخۆرە جیهانییانە بوو کەوا بانکی ئینگلترایان کۆنترۆڵ کردبوو و دەستیشیان بەسەر بانکەکانی فەرەنسا و هۆڵەندا و ئەڵمانیادا گرتبوو..دوای ئەمە خاوەن بانکەکان بڕیاریان دا ناپلیۆن وەك ئامرازێکی جێبەجێکاری خواست و ویستەکانیان بەکاربێنن، بۆیێ زنجیرەیەك جەنگی ناپلیۆنییان هەڵگیرساند، لەمەیشدا ئامانجیان ڕووخاندنی چەندان پاشایەتیی دیکەی ئەورووپی بوو.

دوای ئەوە ناپلیۆن بە سوپایەکەی ئەورووپای داگیرکرد، لە ساڵی ١٨٠٤دا خۆی وەك ئیمپراتۆرێك ڕاگەیاند، جۆزیفی براشی کردە پاشای ناپۆلی و لویسی وەك پاشای هۆڵەندا و جیرۆمی وەك پاشای وێستفالیا دەستنیشانکرد.

ناسان ڕۆچیڵدیش، کارەکانی بەشێوەیەك ڕێکخست هەر چوار برایەکەی خۆی کردە پاشای دارایی ئەورووپا، بە واتایەکی دیکە بوونە دەستهەڵاتی نهێنی و دەستی شاراوە.

سویسرا بارەگە و پێگەی سەرکردایەتییەکەیان بوو، لەبەرئەوە بڕیاریان دا سویسرا بە بێلایەنی بهێڵنەوە و بۆ دەستەبەرکردنی سەلامەتیی خۆیان و پارە و پوول و داراییەکانیان، نەیخەنە نێو هیچ ململانێیەکەوە.

لە بارەگەی سەرکردایەتیی خۆیاندا لە ژنێفی سویسرادا سەر لەنوێ چەندان پیلانگێڕی و کودەتای نهێنییان داڕشتەوە، کاروبارەکانیشیان بەشێوەیەك ڕێکخست بتوانن لە جەنگەکاندا قازانجی زۆر ناڕەوا و نایاسایی وەدەستبێنن، واتا ئەو جەنگانەی خۆیان هەڵیاندەگیرساندن بەبێ ئەوەی هیچ شت و بەرژەوەندییەکی هەردوو بەرەی شەڕکەر یان دەرئەنجامی جەنگەکە لەبەرچاو بگرن.. ئامرازی ئەراهەمکردنی ئەم مەبەستەشیان کۆنترۆڵکردنی کارخانەکانی چەك و تەقەمەنی و پیشەسازیی کەشتی و کانەکان و پیشەسازییە کیمیاییەکان و دروستکردنی دەرمان و تەنووری پۆڵا و هتد بوو.

بەمشێوەیە گشت شتێك بەبێ هیچ گرفتێك دەچووە پێشێ.. بەڵام تاکە شتێك هەبوو کۆمەڵە پیلانگێڕ و کودەتاچییەکەی قەڵس کردبوو، ئەویش خۆپەرستی و لووتبەرزی و پۆزە بێمانایەکانی ناپلیۆن بوو، تا گەیشتە ئەو ئاستەی پشتی تێیان کرد و پەردەی لە ڕوودا هەڵماڵین.. بەمشێوەیە سنوورێکی بۆ سەرکێشییەکانی خۆی دانا.

هەندێك بۆچوون هەیە گوایە زستانە سەختەکە و ساردییە لە ڕادەبەدەرەکەی ڕووسیا ئەو هەڵمەت و هێرشانەی ناپلیۆنیان کردە

گەورەترین کارەساتی سەربازی لە مێژوودا کە لەسەرەتادا بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە دەچوونە پێشێ.. بەڵام ڕاستییەکەی هۆی شکستی ناپلیۆن تێکچوونی هێڵەکانی پێوەندی بوو کە نەیهێشت کۆمەکی لۆجستی و سەربازی و چەك و فیشەکی پێ بگات.

ئەو پیلانە- کەوا هێزە نهێنییەکان بۆ ڕووخاندن و وێرانکردنی هێزەکانی ناپلیۆن پێڕەویان کرد و ناچاریان کرد دەستبەرداری عەرشەکەی بێت- لەو کاتییەوە بووەتە ڕێبازێکی تەقلیدیی هێزە نهێنییەکانی پشت شۆڕشەکانی جیهان.. پیلانەکەش زۆر سانا و سادەیە، بریتییە لە دانانی بەکرێگیراو و شۆفارە نهێنییەکانیان لە چەق و سەنتەرە سەرەکییەکانی نێو لق و بەشەکانی سوپایەکان، هەر لە پرچەککردنەوە بگرە تا دەگاتە پێوەندی و ڕێگەوبانەکان و گواستنەوە و هەوالگری.. بەمشێوەیە سەرکردەکانی کودەتا دەتوانن لە ڕێگەی تێکدانی کردەکانی پرچەککردن و برینی فەرمانەکان و دەرکردنی فەرمانی دژ و نەناردنی پێداویستیی لۆجستی بۆ ئەو شوێنەی زۆر پێویستی پێی هەیە و سیخوڕیکردن و دژە سیخۆڕیکردنەوە، تەنانەت لەنێو بەهێزترین و سیستماتیکترین هێزدا شپرزەیی و بێسەرەوبەری و هەراوزەنا بلاو بکەنەوە.. چونکە ئەو شانە نوستووانەی لەو شوێن و پێگە هەستیارانە دادەندرێن، بارتەقای دە هەزار پیاوی نێو گۆڕەپانی جەنگ دەتوانن کاری گەورە بکەن.. ئەو ئامراز و هۆکارانەی لە ڕووخاندن و شکستپێهێنانی ناپلیۆندا بەکارهێنران، دواتر لە ساڵی ١٩٠٤ بۆ تێکشکاندنی سوپایەکانی ڕووسیا لە بەرانبەر سوپایەکانی یابان وەگەڕخران، هەروەها لە ساڵی ١٩١٧ و لە کاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی ڕووسی و بەرپاکردنی یاخیبوون لە سوپای ئیتاڵی لە ساڵی

۱۹۱۸دا بەکارهاتن. دزەکردنی کۆمۆنیستەکان بۆ نێو پێگە و پۆستە هەستیارەکانی ئەڵمانیا ئەفسەرێکی سوپای ئەڵمانی ناچار کرد لە ساڵی ۱۹۱۸دا داوای ئاگربەستێك بکات و پێی بەخشرا. هەروەها هەمان ئەو هۆکار و ئامرازانە لە ساڵی ۱۹۳٦دا بۆ تێکشکاندنی کارایی سوپای ئیسپانی بەکارهێنران. هەمان ئەو پیلانانە بۆ شکستپێهێنانی سوپایەکەی هیتلەر لە ڕووسیا بەکارهێنران دوای ئەوەی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا هێرشێکی سەرکەوتووانەی لە ڕووسیا بەڕێوەبرد.

بەمشێوەیە دەبینین مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، چونکە ئەو هێزانەی کۆنترۆڵی ڕەوتی کاروبار و ڕووداوەکانیان کردووە هەموو جارێ هەمان ڕێگە و هۆکار بەکار دەهێننەوە.. بەڵام لەمانەیش گرنگتر، ئەوەیە نەوەکانی ئەوانەی بوونە هۆی کەوتن و شکستخواردنی ناپلیۆن، هەر هەمان ئەو کەسانەن بوون کە لە ساڵی ۱۹٥٤ و تاکوو ئێستەیش بوونە هۆی بەربەرچدانەوە و شکاندنی هێزە نیشتمانییەکانی وڵاتی چین..چەند فەرمانێك دەرچوون کە بایی ملیۆنان ملیۆن دۆلار چەك و تەقەمەنی لەجیات ئەوەی بگاتە دەست چیان کیای چیك و لایەنگرانی، نقومبێتە نێو قووڵایی زەریای هندی.. ئەو ڕاستییەی وایکردووە هەردوو حکوومەتی ئەمریکی و بریتانی ناپاکی لەو هاوپەیمانانەمان بکەن کەوا لە چین و کۆریادا دژ بە کۆمۆنیستەکان دەجەنگن، ئەوەبوو خاوەنی بانکە جیهانییەکان مانۆڕیان بوو بۆ ئەوەی هەژموون و دەستهەڵاتی کۆمۆنیستەکان بەسەر ئاسیادا بسەپێنن، بۆیێ سیاسییەکانی ئەو دوو وڵاتەیان لە خشتە برد وایان لێکردن لە ناوچەکەدا دەستبەرداری هێزەکانی دژ بە کۆمۆنیزم بن!

مێژوو تۆماری کردووە ناپلیۆن لە ساڵی ١٨١٤دا بە چ شێوەیەك لە پاریس دەستبەرداری ـەرشی پاشایەتی بووە و چۆن بۆ دوورگەی ئیلبا نەفی کراوە و لەوێشدا ڕایکردووە و هەوڵی داوە شکۆی پێشووی وەدەستبێنێتەوە، هەروەها چۆن جاری دووەم دژ بەو پیاوانە کاری کردووە کەوا بەتەواوی گەمە و پیلانەکانیان لەبەردەستدا بوو.. ناسان ڕۆچیلد و بازنە جیهانییەکەی بۆ شکستپێهێنانی ناپلیۆن پشتگیرییان لە ئەڵمانیا کردووە.. پیلانەکەشیان وەدەستهێنانی پارەیەکی زۆر بووە، جا دەرئەنجامی ململانێیەکە هەرچی بێت بەلایانەوە گرنگ نەبووە.. ئەوجا پێش هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی واترلۆ، ناسان ڕۆچیلد لە پاریس بووە.. لە کۆشکێکدا بووە کە ڕاستەوخۆ دەیڕوانییە کۆشکەکەی لویسی هەژدەیەم.. لە لایەکی دیکەشەوە هەوڵی ڕێکخستنی تۆڕێکی سیخوڕی و چاوی چاودێریکردنی داوە، تاکوو لە ڕێگەی کۆتری نامەبەرەوە ورد و درشتی هەواڵەکانی جەنگی واترلۆی بۆ بێنن، چونکە لەوکاتیدا لە ئان و ساتی هەڵگیرساندا بووە،... هەروەها بۆ گواستنەوەی هەواڵە هەڵبەستراوەکانی جەنگ بۆ نێو ئینگلترا، تۆڕێکی دیکەی دامەزراند.. جا کاتێك ناسان لە سەرکەوتنی ولنگتۆن و هێزەکەی دڵنیا بوویەوە، فەرمانی بۆ بەکرێگیراوەکانی دەرکرد هەواڵی پێچەوانە بۆ ئینگلترا بگوازنەوە و جەخت لەسەر سەرکەوتنی ناپلیۆن و دۆڕانی سوپای ئینگلیزی بکەنەوە..ئەو ڕووداوە پەندێکی باوەی هێنایە ئاراوە کە دەڵێ: " کۆترەکە پێی گوتم". ئەگەر کەسێکی ئینگلیزی بە هاوڕێیەکی بڵێ: لە کوێوە ئەم زانیارییانەت هێنا؟ هاوڕێیەکەی دەڵێ: ئۆو، کۆترەکە پێی گوتم!

کۆترەکانی ناسان ڕۆچیڵدیش هەواڵی دزڕیان پەخش دەکرد و درۆی زۆر شاخداریان بەنێو گەلی ئینگلیزیدا بڵاو دەکردەوە، ئەمەیش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی تۆقین لەنێو جەماوەردا.. بازاڕی ئابووری و دارایی بە تەواوی ڕووخا، نرخی جونەیهی ئیستەرلینی دابەزییە ئاستی یەك شلن، نرخی پێداویستییەکانیش بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار داڕووخا.. ئەوسا ناسان کەشتییەکی بچووکی بە دووسەت جونەیە بەکرێگرتبوو هاتووچووی نێوان فەرەنسا و ئینگلترای پێدەکرد.. لە کاتی گەیشتنیدا خۆی و هاوڕێیەکانی هەرچی کۆمپیاڵە و پشك و موڵکیان کەوتە بەردەستی کڕییان، جا کاتێك هەواڵی ڕاستینی سەرکەوتنی ولنگتۆن گەیشت، نرخەکان گەڕانەوە باری ئاسایی خۆیان و سووخۆرانی جیهانی قازانج و سامانێکی خەیاڵییان وەدەستهێنا.

دەستگەی ڕۆچیڵد بە بۆنەی داستانە سەرکەوتووەکەی ولنگتۆن و وەك دەربڕینی خۆشی و شادیی لەنێو بردنی ناپلیۆنەوە، قەرزێکی بە ڕێژەی ١٨ ملیۆن جونەیهی ئیستەرلیتی دایە حکوومەتی ئینگلیزی، پێنج ملیۆنیشی قەرز بەخشییە حکوومەتی ڕووسی.. ئەمەیش وەك بەشێوەیەکی ڕەسمی باسکرابوو، بۆ نۆژەنکردنەوەی وێرانبوونی دوای جەنگ بوو.. کاتێکیش ناسان ڕۆچیلد لە ساڵی ١٨٣٦ دا مرد، کۆنترۆڵکردنی بانکی ئینگلترای دەستەبەر کردبوو، قەرزی نەتەوەیی ئینگلیزی بەهۆی ئەو کارەساتە گەورەیەی ڕۆچیڵد لە ساڵی ١٨١٥دا بەسەر ئابووریی ئینگلترای هێنابوو، گەیشتبووە ٨٨٥,٠٠٠.٠٠٠ جونەیهی ئیستەرلینی.

مرۆڤ بە ئاستەم لە ڕیزی هەزاران ماسۆنیدا دەتوانێ تاکە یەك ماسۆنیی ئەورووپی ببینێتەوە شتێك سەبارەت بە سەربردە

ڕاستینەکەی دزەکردنی نوورانییەکانی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلاتی بۆ نێو ڕیزەکانی ماسۆنییەتی ئازادی ئەورووپی بزانێ.. بەلام سەرکردە و سەروەرە گەورەکانی ماسۆنییەتی ئازاد لە ئینگلترا ئەرکیان بە ڕاستیی مەسەلەکە کردووە، هەر ئەمەیش بوو وایکرد برایانی ماسۆنییان لە پێوەندی و نزیکبوونەوە بە هەر ماسۆنییەکی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلاتی ئاگادار بکەنەوە.. هەروەها بابا بیۆسی نۆیەم دەیزانی نوورانییە شۆڕشگێڕەکان دزە دەکەنە نێو ڕیزەکانی ماسۆنییەتی ئازادی ئەورووپا، ئەمەیش هانی دا دژ بە کۆمۆنیستی و ماسۆنی هێرش و هەلمەتێکی ئاشکرا بەڕێوەببات و هۆشداری بداتە مەسیحییەکان لەوەی ئەچنە ڕیزی ماسۆنییەتەوە. خۆ ئەگەر هەندێك کەس بچووکترین گومانیان لە ڕاستیی ڕۆڵی ماسۆنییەکانی نێو شۆڕشی فەرەنسیدا هەیە، لێرەدا گفتوگۆیەکی نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی فەرەنسی دەهێنینەوە کە لە سالی ١٩٠٤ سەبارەت بەم مەسەلەیە بەڕێوەچووە.

دوای چەندان پرسیاری لێکۆلینەوەیی بەڕێز مارکیز ڕۆزانبۆ سەبارەت بەوەی ئاخۆ ماسۆنییەتی ئازاد دروستکراوی شۆڕشی فەرەنسییە، گوتوویەتی: کەواتە ئێمە بەتەواوی سەبارەت بەم خالە هاوڕاین کە ماسۆنییەت تاکە دروستکەری شۆڕشی فەرەنسی بووە، ئەو ئەرك و لایەنە گرنگانەی ئێستە لەم دانیشتنەدا دەیانبیستم، دەیسەلمێنن هەندێك لە ئامادەبووان ڕێك وەك من بە مەسەلەکە دەزانن.

ئەوسا جۆمل -کە یەکێکە لە ئەندامە بەناوبانگەکانی مەحفەلی خۆرهەلاتی گەورە- هەلدەستێتە سەرپێ و دەلێ: ئێمە نەك هەر دەیزانین، بەلکو بەتەواوی بە خەلکی رادەگەیەنین.

لەسالی ١٩٢٣دا ئاهەنگێکی مەزنی ئێوارە رێکخرا و تیایدا چەندان کەسییەتیی گرنگیدەر بە سیاسەتی نێو دەولەتی بەشداربوون، هەروەها چەند کەسێکیش لەوانەی پێوەندیگەلێکیان لەگەل رێکخراوی کۆمەلەی گەلاندا هەبوو تیایدا بەشداربوون.. لەو ئاهەنگەدا سەرۆکی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات لە فرەنسا پێشنیازی کرد ئامادەبووان پێکی کۆماری فرەنسی هەلدەن کە رۆلە و زادەی ماسۆنییەتی ئازادی فرەنسییە، هەروەها پێکی ئەو کۆمارە جیهانییە هەلبدەن کەوا لە ماسۆنییەتی جیهانییەوە لەدایك دەبێت.

سووخۆرانی جیهانی لە فرەنسا توانیبوویان هانی بەکرێگیراوانیان بدەن و بیانگەیەننە پۆستە راوێژکارییە هەستیارەکانی ئەو سەرکردە سیاسییانەی پەیماننامەی فەرسایان دارشتبوو.

دوای ئەمە گەورەترین سەرکەوتنیان لە سالی ١٩٢٤دا گەیاندنی بەرێز هیریۆی نوێنەریان بوو بە پێگە و پۆستی هەژموون و دەستهەلاتی فرەنسا. بەمشێوەیە سەرکردەکانی (ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات)ی ماسۆنیی لە فرەنسا توانیان لەسەر دەستی حکوومەتەکەی بەرێز هیریۆدا لە ماوەی سالێکدا پرۆژە و سیاسەتە ناوخۆییەکانیان بخەنە واری کردارییەوە.. لێرەدا چاوێك بە هەندێك رووداوی مێژووییدا دەگێرینەوە کە لە سالی ١٩٢٣ بەدواوە روویان دا و بەلگەی هەژموون و دەستهەلات و کۆنترۆلی نوورانییەکانی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلاتە بەسەر سیاسەتی فرەنسادا:

- لە ینایری ساڵی ١٩٢٣دا ئەنجوومەی مەزنی خۆرهەڵاتە بڕیاری ڕەتکردنەوەی بالیۆزخانەی فرەنسای لە ڤاتیکان دەرکرد، پاڕلەمانی فرەنسیش لە بیست و چواری ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٤ بڕیارەکەی جێبەجێ کرد.

- لە ساڵی ١٩٣٢ ئەنجوومەنەکان داوای پێڕەوکردنی بیرۆکە و ئایدۆلۆژیای عەلمانییان دەرکرد.. هیریۆ لە هەڤدەی یۆنیۆی ساڵی ١٩٢٤دا بەیاننامەیەکی پشتگیریی بۆ ئەم بیرۆکەیە بڵاوکردەوە.

- لە ٣١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٣دا ئەنجوومەنە مەزنەکانی خۆرهەڵات داوای کرد لێبوردنێکی گشتی بۆ گشت زیندانییە تاوانکار و ناپاکەکان دەربچێ.. زۆرێك لە ڕێبەرە باڵایەکانی کۆمۆنیستی سوودیان لە بڕیارەکە وەرگرت، یەکێك لەو کەسانە (مارتی) بوو، ناوبراو دواتر بووە ڕێکخەری ئەو تیپە کۆمۆنیستیانەی لە ساڵی ١٩٣٦-١٩٣٩ شانبەشانی کۆمۆنیستەکانی ئیسپانیا جەنگان.

ئەنجوومەنی نوێنەران لە دەنگدانی پانزەی تەممووزی ساڵی ١٩٢٤دا ڕەزامەندی لەسەر پرۆژەی لێبوردنەکە دەربڕی. بەمشێوەیە ئەو چەتە تاوانکارە نێو دەوڵەتییانەیان بەسەر گەلدا سەپاند کە لەژێر فەرمانی ئەنجوومەنی باڵای خۆرهەڵاتدا-نوورانییەکان- کار و ڕەفتاریان دەکرد.

ئەنجوومەنەکە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢دا بۆ باوەڕهێنان بە گەلی فرەنسی هەڵمەتێکی گەورەی دەستپێکرد، بۆ ئەوەی پێوەندییەکی دیبلۆماسی لەگەڵ حکوومەتی سۆڤییەتی دروست بکەن، بەڵام ئەو هەڵمەتە هێندە سەری نەگرت و نەچووە پێشێ تا بەڕێز هیریۆ گەیشتە دەستهەڵات.. ئەم هەڵمەتە هاوڕێیەتییەی فرەنسی

ڕووسی لەو کاتەوە دەستپێکرد کە لە بڵاوکراوەی ڕەسمیی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات لە فەرەنسا لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ و لە لاپەڕە ٢٨٦دا گوتارێکی لەسەر مەسەلەکەدا بڵاوکردەوە، پێوەندییە سیاسییەکانی نێوان حکوومەتی فەرەنسی و حکوومەتی شۆڕشگێڕیی ڕووسی لە بیست و هەشتی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٤دا بەرپابوو. هەمان هێزی شەڕخوازیش لە ئێستەدا هەمان قەوانی ددانپێدانان بە چینی میللی لێ دەداتەوە.

لە پەرتووکی ( الحلبە الاسبانیە)ی ولیەم فۆسدا کە لە ساڵی ١٩٢٩ خانەی یانەی نووسەران لە لەندەنی ئینگلتەرادا لە چاپی داوە، زانیاری دوورودرێژ و پێویست لەسەر ئەو کودەتایە وەدەستدێنین، لە نووسینەکانی نێو ئەو پەرتووکەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات لەنێوان ساڵانی ١٩٢٣- ١٩٢٤ لە فەرەنسا و ئیسپانیا خەریکی ڕێکخستنی بووە، جا بۆ ئەوەی بەردەوامبوونی کودەتایەکەی سووخۆرانی جیهانی بەدیاربخەین، تیشک دەخەینە سەر چەند ڕووداوێک:

لیۆن بلۆم لە ساڵی ١٨٧٢ لە پاریس هاتووەتە دونیاوە و دایبابی جوولەکە بوون. بەهۆی ئەو ڕۆڵەی لە پرسی دریفۆسدا گێڕای زۆر بەناوبانگ بوو.. هەروەها لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٦دا وەک سەرۆکوەزیران هەڵبژێردرا و تا حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٧ لە هەمان پۆستدا مایەوە. دواتر لە ئاداری ساڵی ١٩٣٧ دووبارە هەڵبژێردرایەوە و تا مانگی نیسانی هەمان ساڵ مایەوە، لایەنگرانی توانیان ڕێگەی بۆ خۆش بکەن بگەڕێتەوە نێو کایەی سیاسی و لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٧ تا حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٨ کردیانە جێگری سەرۆکوەزیران. پێم

وایە ئێستە مەندیس فرانس هەمان ڕۆڵ دەگێڕێت ( ئەمە کاتی نووسینی ئەم پەڕتووکەیە).

ئەرکی بلۆم لەو ماوەیەدا ئەوە بوو بەپێی ویست و داواکاری سەرکردە نهێنییەکانی شۆڕشی جیهانی، سیاسەتی حکوومەتی فەڕەنسی لەهەنبەر ئیسپانیا ڕێکبخات.. گشت گومانێکیش لە خۆیان دووربخاتەوە، پیلانگێڕەکان خەریکی زەقکردنەوە و هێنانەپێشەوەی ژەنەڕاڵ فرانکۆ و لایەنگرانی سەر بە هەردوو باڵ و بەرە بوون، چونکە ئەوان پیلانگێڕ و نەخشەدانەر و جێبەجێکاری ئەو ڕووداوانە بوون کە بوونە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی نێوەخۆی ئیسپانیا.

بلۆمیش لە جێبەجێکردنی نەخشە و پیلانی سەرکردە نهێنییەکاندا ڕۆڵێکی مەزنی گێڕا، ڕۆڵەکەشی بریتیبوو لە بەخشینی چەك و فیشەك و پارە بە هێزەکانی پاشایەتیی فەڕەنسا.. هەروەها بۆ هێشتنەوەی ڕێگە کراوە چیاییەکانی (برینیی) هەوڵی خۆی خستەگەڕ.. لەلایەك هەوڵی دا پێڕەوی سیاسەتی دەستوەرنەدان بکات، چونکە ئەو سیاسەتە بەسەر هێزە نیشتمانییەکانی فرانکۆدا پێڕەو دەکرا.

لەوانەیە هەندێك خوێنەر وابزانن ئێمە لە مەسەلەی ئەو هەژموونەی ماسۆنییەت لە پرسە نێودەوڵەتییەکاندا دەیسەپێنێ، زێدەڕۆیی دەکەین.. بەڵام پێیان دەڵێین فەرموون بڕۆن پەڕتووکی (دکتاتۆریەتی ماسۆنیی) ئەی گی. میشێل بخوێننەوە.. چونکە نووسەرەکە لە پەڕتووکەکەیدا دەیسەلمێنێ ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات لە فەڕەنسا لە ساڵی ١٩٢٤دا بڕیارێکی دەرکرد کە پێویستە کۆمەڵەی گەلان کۆنترۆڵ بکرێ و بکرێتە ئامرازێکی ژێردەستی ماسۆنییەتی ئازاد.. ترۆتسکی لە پەڕتووکەکەی خۆیدا بەناوی (

ستالین) نووسیویەتی: ئەمڕۆ تاوەری نوێی بابل لە خزمەتی ستالین دایە.. یەکێك لەو مەڵبەندە سەرەکییانەی ئەو تاوەرەش لە ژنێف لانکەی پیلانگێڕییە.

گرنگیی قسەکەی ترۆتسکی سەبارەت بە کاریگەریی ئەمریمەنییانەی ماسۆنییەکانی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵاتە لەنێو کۆمەڵەی گەلاندا، ڕاشیکەیاندووە مەسەلەی هەژموونی ئەو ئەنجوومەنە لەمڕۆژگارەدا بەسەر ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش ڕاست دەردەچێ.. ئەوەی چاودێریی ڕەوتی ڕووداوەکانی نێو نەتەوە یەکگرتووەکانیش بکات، دەبینێ ئەو گفتوگۆیانەی بەڕێوە دەبرێن و ئەو یاسایانەی لەوێ دەردەچن، بۆ کەسێکی ئاسایی و بازارییانە زۆر سەیر و بێ مانا دێنە بەرچاو.. بەڵام ئەگەر ئەو بڕیارانەمان لە شوێنە دروستەکانی پیلانگێڕییەکی کۆمەڵەی کودەتاچییەکان دانان، ئەوا زۆر بە جوانی ڕوون دەبنەوە.. بۆ جێبەجێکردنی ئەمەیش، هەر تەنیا ئەوەندە بەسە دوو ڕووداوی گرنگ وەك نموونە بهێنینەوە:

یەکەمیان: نوورانییەکان پێیان وایە زۆر پێویستە گشت جۆرە حوکمێکی دەستووری لەنێو ببرێ، جا ئەگەر پاشایەتی بێت یانیش کۆماری.

دووەمیان: نوورانییەکان نیازیان وایە لەگەڵ هاتنە پێشەوەی دەرفەتدا دکتاتۆریەتێکی جیهانی دامەزرێنن، کاتێکیش دڵنیا دەبن لەوەی کە دەتوانن دەستهەڵاتێکی ڕەها زەوت بکەن و بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، ئاوی لێ ناخۆنەوە و یەکسەر دەرفەتەکە دەقۆزنەوە.

م.ج. مارکۆس دەڵێ: مەڵبەندی ماسۆنییەتی جیهانی لە ژنێفە.. هەروەها نووسینگەی دەستگە پێوەندارەکانی سەر بە ماسۆنییەت

لەوێن.. ئەمەیش ئەو شوێنەیە نوێنەران و بریکارانی ماسۆنییەت لە گشت لایەکی جیهانەوە ڕووی تێ دەکەن.. بەمشێوەیە دەبینین نهێنیی ئەو ڕێکخراوانەی پێوەندییان بە ماسۆنییەتەوە هەیە ڕوون و ئاشکرایە.

بەمشێوە دەتوانین لە قسە و ئاخاوتنەکانی سەروەر و سەرۆکە مەزنەکەی ئەنجوومەنی ماسۆنییەکانی ئیسپانیا تێبگەین کاتێك ساڵی ١٩٢٤دا لە ژنێف گەڕایەوە لە بەردەم کۆنگرەی ئەو ئەنجوومەنەدا تیشکی خستە سەر چەند مەسەلەیەك و بەمجۆرە دوا: لە ڕاپەڕاندنی کاروباری لیژنەکاندا چەند دەستپێشخەرییەکەم کرد و یارمەتیم دان.. هەروەها گوێم لە پۆل بۆنکۆر، جوهرکس، لو سیۆر، ودی جو فنال گرت... چەند بریکارێکی بزووتنەوەی ماسۆنییەکانی فەرەنساشم لەگەڵدا بوو.. ئەوانە لەیەکتریان دەپرسی: ئایا ئێمە لە کۆبوونەوەیەکی جیهانیداین یان کۆبوونەوەکە تایبەتە بە ڕەوتێکی ماسۆنی؟ جۆزیف ئەفینالی ئەمینداری گشتیی کۆمەڵەکە بوو.

حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕەتی کردەوە تەفلی کۆمەڵەی گەلان بێت.. هەندێك بەرژەوەندیش لەپشت ئەم سیاسەتە گۆشەگیرییەدا هەبوو.. بەمشێوەیە بریار لەسەر تێکدانی کۆمەڵەی گەلان و دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان درا.. ئەوجا دەرفەتی هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانی هاتە پێشێ. داروپەردووی کۆمەڵەی گەلان کۆکرایەوە بۆ ئەوەی لەسەر شوێنەوارە داڕووخاوەکەیدا دیوار و تەلارێکی نوێ بنیاد بنرێ، تەلار و دامەزراوە نوێیەکەش نەتەوە یەکگرتووەکان بوو، ئەم ڕێکخراوەش لە کاتی دامەزراندنیدا یەکیەتیی سۆڤییەت و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای وەك دوو ئەندامی زۆر بەهێز و هەژموون وەرگرت.. بەڵگەی

بەرزەفتکردنی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لەلایەن هێزە نهێنییەکانەوە و توانایـان بـۆ جێبـەجێکردنی نەخشـە و پیلانـەکانیان لـەنێو ئـەم ڕێکخراوەدا، ئـەوەبوو نەتـەوە یـەکگرتووەکان فەڵەسـتینی ڕادەسـتی زایۆنیزمی سیاسی کرد، چونکە زایۆنییەکان ماوەی نیـو سـەدە هـەوڵی وەدەیهێنـانی شـتێکی لـەمجۆرەیان دەدا.. هـەروەها چـین و کۆریـای بـاکوور و مەنشـووریا و مـەنگۆلیا و دوورگـەکانی هینـدی خۆرهـەڵات و چەند بەشـێکی هینـدی چینی بـە کۆمۆنیسـتەکان بەخشـی.. لێـرەدا پێویسـتە ئـەوەمان لـە بـیر بێـت کـە لیـنین پێشـبینیی کردبـوو هێـزە کۆمۆنیستییەکان لەلای خۆرهەڵاتەوە جیهانی خۆرئاوا داگیر دەکەن.

هەروەها ئەفسەرێکی هەواڵگریی ئەمریکی و بریتانی ڕۆڵی خـاوەن بانکە جیهانییەکانیان لە شۆڕشی ڕووسیدا ئاشـکرا کردبـوو و دواتـریش مەسەلەکەیان گەیاندبووە حکوومەتەکانیان.. حکوومەتی بریتـانیش لـە نیسانی ساڵی ١٩١٩دا سەبارەت بەم بابەتە پەرتووکێکی سپیی دانـا.. و زۆر بەخێرایی مەسەلەکەی داپۆشت، بەڵام هەندێك زیان بەر پیلانگێـڕی و کودەتایـــە جیهانییەکـــە گەیشـــتبوو.. بەمشـــێوەیە پەنجـــەی تۆمەتبارکردن بۆ خاوەن بانکە جیهانییەکان درێژ کرا، بـەوە تۆمـەتبار دەکران پـارە بـۆ جوولەکـەکان تـەرخان دەکـەن بـۆ ئـەوەی پیلانـی دەستگرتن و کۆنترۆڵکردنی جیهـان جێبـەجێ بکـەن.. خـاوەنی بانکـە جیهانییەکانیش دەبوایە ئامرازێك بدۆزنەوە وەڵامی ئـەو تۆمـەتبارکردن و هەڕانـە بدەنـەوە.. دڕەنـدەییان لـە وەڵامدانـەوەی ئـەو تۆمەتانـە بەدیارکەوت کاتێك ستالینی نا جوولەکـە بـۆ گرتنـەوەی جێگـەی لیـنین دانـرا، ئـەویش ترۆتسـکی لەسـەر ڕێگـەی خـۆی لادا و لـەو پاکتـاوە بەناوبانگانەی گەیاندیانە دەستهەڵات، دەسـتی بـە لـەنێوبردنی سـەتان

هەزار جوولەکەی ڕووسی کرد.. ئەمەیش بەسە بۆ ئەوەی باوەڕ بە کەسانی دڵسۆز و کەسانی سرپووی بێئاگاش بهێندرێ کە سوورخۆرە جیهانییەکان هیچ بەهایەك بۆ هیچ گەلێك دانانێن جا سەر بە هەر ئایین و نەژاد و ڕەنگێك بن، بەڵکو بە پارچەکانی شەترەنجی جیهانییان دەزانن و هەر کاتێ بیانەوێ و بەرژەوەندییان وا بخوازێ، دەستبەرداریان دەبن.

بەشی پێنجەم

# شۆڕشی ئەمریکی

بۆ ئەوەی لەو شێواز و ڕێگەیە تێبگەین کە بەهۆیەوە پیاوانی هەژموونـدار و ئەوانـەی دەسـتیان بەسـەر بـانکی ئینـگلترا و پیـاوانی کەنیسەدا گرت، چۆن توانییان دەست بەسەر بازرگانی و ئالوێرەکـان و سیسـتمی دراویـی ئـەمریکادا بگـرن کـە هێشـتاکە چـەند ویلایـەتێکی جیاجیای سـەر بـە ئیسـتعماری بریتـانی بـوو، ئـەوا دەبـێ بگەڕێینـەوە سەرەتای چیرۆکەکە، کاتێك بنجامین فـرانکلین وەك نوێنـەری ڕێبـەرانی دروستکردنی موستەعمەراتەکانی ئـەمریکا لـە سـالآنی ( ١٧٠٦-١٧٩٠) سەردانی ئینگلترای کرد.

لـە لاپـەڕە ٩٨ی بەڵگەنامـەی ژمـارە ٢٣ی ئەنجوومـەنی پیرانـی ئەمریکا، ڕاپۆرتێکی ( ڕۆبێرت ل. ئوین) ـی سەرۆکی پێشووی لیژنـەی بانك و دراوەکانی کۆنگرێسـی ئـەمریکی دەخوێنینـەوە کـە تایبەتـە بـە گفتوگۆیـەکی نێـوان هاوبەشـانی ڕۆچـێلد و بنجـامین فـرانکلین.. ئـەم ڕاپۆرتە باس لەو دەکات چۆن پرسـیار لـە نوێنـەری ئـەمریکی کـراوە سەبارەت بە هۆی گەشەسـەندنی ژیـانی ئـابووریی نێـو موسـتەعمەراتە ئەمریکییەکانـەوە، فـرانکلینیش ڕێـك بـەمجۆرە وەڵامـی داوەتـەوە: مەسەلەکە سانایە، چونکە ئێمە خۆمان دراوەکەمان دەردەکەین و پێـی دەڵـێن کاغـەزە داراییـەکان.. هـەروەها کـاتێکیش دەری دەچـوێنین

بەشێوەیەك كارەكە دەكەین لەگەڵ پێداویستییەكانی پیشەسازی و بازرگانیماندا بگونجێ.

ئەم وەڵامە سەرنجی بنەماڵەی ڕۆچیڵدی بۆ دەرفەتێكی گەورەی ڕەخساو ڕاكێشا بۆ ئەوەی قازانجی زەبەلاح وەدەستبێنن.. بۆ ئەمە تەنیا پێویستیان بەوەیە یاسایەك دەربكەن ڕێگە بە موستەعمەراتەكان نەدات خۆیان دراوی خۆیان لێ بدەن، هەروەها ناچاریان بكەن پشت بەو بانكانە ببەستن كە بەم شتە ڕادەسپێردرێ.. لەو كاتیشدا ئامشێل مایەر ڕۆچیڵد هەر لە ئەڵمانیا دەژیا و سەربازی بەكرێگیراوی بۆ حكومەتی بریتانی دابین دەكرد، لە بەرانبەر ٨ لیرە بۆ هەر سەربازێك.. هەژموون و دەستهەڵاتی ناوبراو بەسبوو بۆ ئەوەی یاسایەك سەبارەت بە چاپكردن و دەرچوونی دراوی ئەمریكی دەربچوێنێ.

بەمشێوەیە كاغەزە داراییەكانی پێشووی ئەمریكا هیچ بەهایەكیان نەما.. لەسەر دەستهەڵاتی موستەعمەراتەكانیش پێویست بوو چەند برە پارە و دەستەبەرییەك وەك سپاردە بخاتە نێو بانكی ئینگلتراوە تاكوو بۆ بەڕێوەبردنی كاروبارەكان پارەی پێویستی دەستكەوێ.. فرانكلین سەبارەت بەم مەسەلەیە گوتوویەتی:

بەڵام بانكی ئینگلترا ڕەتی كردەوە زیاتر لە ٥٠٪ ی بەهای كاغەزە داراییەكانی ئەمریكی بدات كە بەپێی یاسایە نوێیەكە خرابووە سەرشانی.. ئەمەیش مانای وایە بەهای ڕۆیشتنی دراوی ( السیولة النقدیة) نەختینەی ئەمریكی ڕێك بۆ نیوە دابەزیوە.

مێژوونووس و لێكۆڵەران هۆی ڕاستەوخۆی شۆڕشی ئەمریكی دژ بە ئینگلترا دەدەنە پاڵ باجی (بەناوبانگی چای).. بەڵام فرانكلین- كە

کەسێکی زۆر گرنگ و بەرجەستەی نێو شۆڕشەکە بوو- هۆیەکانی بەمشێوەیە شی کردووەتەوە: ئەگەر هەوڵ و هەنگاوی ئینگلترا بۆ لێسەندنەوەی مافی دەرکردنی دراو لە ویلایەتە یەکگرتووەکان نەبووایە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دڵەوە ڕازی بوو ئەم باجە و هاوشێوەکانیشی پەسند بکات، ئەمەیش دۆخی بێکاری و بێزاری و ڕقوکینەی هێنایە ئاراوە.

ئەم تووڕەیی و بێزارییە وردە وردە دانیشتووانی گشت ویلایەتە یەکگرتووەکانی گرتەوە.. بەڵام ژمارەیەکی کەمیان درکیان بەوە کرد باجە زۆر قورسە نوێیەکان و سزایە سەپێندراوە ئابوورییەکان، دەرئەنجامی چالاکییەکانی چەتە و دزانی جیهانی بوو کە خەزێنەی بریتانییان خستبووە ژێر دەستی خۆیانەوە..

یەکەمین پێکدادانە چەکدارییەکانی نێوان بریتانییەکان و خەڵکی نێو موستەعمەراتەکان لە لکسنگتۆن و کۆنکوردا لە ١٩ی نیسانی ساڵی ١٧٧٥دا ڕوویان دا .. لە ١٠ی ئایاردا کۆنگرەی دووەمی کۆنگرێس لە فیلادلفیادا بەسترا و جۆرج واشنتۆن وەك سەرکردەی هێزی دەریاوانی و وشکایی دەستیشان کرا.. لە ٤ی تەمووزی ساڵی ١٧٧٦دا کۆنگرێس ڕایگەیاند بەڵگەنامەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی دەخاتە واری کردایییەوە.

دوای ئەمە ململانێیەکە حەوت ساڵ بەردەوام بوو، سووخۆرە جیهانییەکان لە ماوەیەی جەنگ و ململانێیەکاندا ئەرکی دەستەبەرکردنی پارەوپوولی بەڕێوەبردنی ئەو جەنگە ئیستعمارییانەیان گرتە ئەستۆ کە دەرفەتێك بوو و لەنێویدا کۆمەڵەی ڕۆچیڵد بە ئامادەکردن و پەیداکردنی سەربازی بەکرێگیراو لە ئەڵمانیاوە بۆ حکوومەتی بریتانی پارەو سامانێکی زەبەلاحی قازانج کرد، پیاوە

ئاسـاییە بریتانییـەکان هـیچ ڕقوکینەیـەکیان لەبەرانبـەر هاوڕێیـە ئەمریکییەکانیان لە دڵدا نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەنهێنی هاوسۆزی پرسی ئەمریکا بوون.

ژەنـەڕاڵ کۆرنوالیسـی سـەرکردەی بریتـانی لـە ١٩ی تشـرینی یەکەمی ساڵی ١٧٨١دا تەسلیمبوونی خۆی ڕاگەیاند، لەگەڵ ئەویشدا سوپای بریتانی بەتەواوی بە سەربازە بەکرێگیراوە ئەڵمانییەکانیشەوە خۆیـان ڕادەسـت کـرد.. لـە ٣ی ئـەیلوولی سـاڵی ١٧٨٣ و لـە پەیماننامەیەکی ئاشتیی پاریسدا، بەشێوەیەکی ڕەسمی سەربەخۆیی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ڕاگەیەنـدرا.. تاکـە دۆڕاویـش لـەم مەسـەلەیەدا گـەلی بریتـانی بـوو.. قـەرزی نەتـەوەیی بریتانیـا بەشـێوەیەکی زۆر بـە ئاسـتێکی زۆر بـەرز زیـاد بـوو، سـووخۆرە جیهانییـەکانی لـە وەدیهێنـانی هـەنگاوی یەکـەمی نەخشـە و پیلانـە دوورمەودایـەکانی تایبـەت هەڵوەشـاندنەوەی ئیمپراتۆریـای بریتـانی سەرکەوتنیان وەدەستهێنا.

بە کرێگیراوەکانی سـووخۆرە جیهانییـەکان زۆر بـە مکوڕبوونـەوە تێدەکۆشان ڕێگە لە هەوڵی یەکبوون و یەکییەتییەکەی نێـوان ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بگرن.. چونکە کـۆنترۆڵکردن و خـراپ سوود وەرگـرتن لـە ویلایەتـەکان بەشـێوەی جیاجیـا سـاناتر بـوو لـە کۆنترۆڵکردنی یەکییەتیی ویلایەتـەکان...بۆ سـەلماندنی دەستوەردانی خـاوەنی بانکـە جیهانییـەکان لـە کاروبـاری نێوخـۆیی گـەلی ئـەمریکی، هەرئەوەندە بەسە نێوەڕۆکی ڕاپۆرتی نێو کۆبوونەوەی ساڵی ١٧٨٧ فیلادلفیا بهێنینەوە، لە ڕاپۆرتەکـەدا باوکـە دامەزرێنـەرەکانی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان تـاوتوێی پێویسـتبوونی دەرکردنـی هەنـدێك یاسـایان

کردبوو کەوا دەبنە لەمپەرێك بۆ خۆپاراستن لە خراپ سوود وەرگرتنی ئەو سووخۆرانە.

بەکرێگیراوانی نەخشە و پیلانگێڕییەکە ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان خستبووە گەڕ بۆ ئەوەی دراوی ئەمریکی بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.. بەڵام گشت هەوڵەکانیان بەبادا چوو.. چونکە لە برگەی پێنجەمی بەشی هەشتەمی مادەی یەکەم لە دەستووردا هاتووە: کۆنگرێس لە دەرکردنی دراو و دیاریکردنی بەهایەکەیدا خاوەن دەستهەڵاتە.

زۆربەی گەلی ئەمریکی پێیان وایە هەر لەو کاتەوەی دەستوور دانراوە بووەتە شتێکی هێندە پیرۆز ناکرێ دەستی بۆ ببرێ و دەستکاری بکرێ، پێویستە کۆی ئەو یاسایانەی دەریش دەچن لەگەڵ دەستووردا بگونجێن.. بەڵام ڕاستییەکەی زۆرجار ڕێز و حورمەتی ئەو دەستوورە پێشێلکراوە!

بێگومان لێکۆڵینەوە لە پرسی کۆنترۆلکردنی ئابووریی ئەمریکا لەلایەن سووخۆرانی جیهانییەوە، زۆر گرنگە.. چونکە بەڕێوەبەرانی بانکی ئینگلترا نوێنەر و بریکارێکی خۆیان بەناوی ئەلیکسەندەر هامیلتۆن لە ئەمریکا دانا.. هەڵمەتی پڕوپاگەندە ئاراستەکراوەکەش توانی مۆرکی ڕێبەرێکی نیشتمانی پێ ببەخشێ.. ناوبراویش بەم سیفەتە پێشنیازی دامەزراندنی بانکێکی فیدراڵی پێشکێش کرد، بە مەرجێ ئەو بانکە سەر بە کەرتی تایبەت بێت.. ئەم داواکارییەش دژی ئەو داوایە بوو کە لەو کاتیدا باو بوو و داوای دەکرد مافی دەرکردنی دراو و سەرپەرشتیکردنی لە دەستی حکوومەتە شەرعییەکانی نوێنەری گەل بێت.

پێشنیازەکەی هامیلتۆن داوا دەکات سەرمایەی بانکی فیدرالی بکرێتە ١٢ ملیۆن دۆلار بۆ مەرجەی بانکی ئینگلترا ١٠ ملیۆن قەرز بدات و دوو ملیۆنەکەی دیکەش لەلایەن دەوڵەمەندانی ئەمریکاوە دابین بکرێ.

هێشتا سالی ١٧٨٣ نەهاتبوو، هامیلتۆن و رۆبێرت مۆریسی هاوبەشی، بانکی ئەمریکا ( بانك ئۆف ئەمریکا ) یان رێکخست.. مۆریس لە کۆنگرێسی ئەمریکیدا چاودێری دارایی بوو، هەر ئەویش وای لە خەزێنەی ئەمریکی کرد دوای حەوت ساڵ لە جەنگ بکەوێتە دۆخی کورتهێنان.. ئەمەیش بەڵگەیەکی دیکەی بەرنامە و شێوازی کارکردنی دەستهەلاتە نهێنییەکەیە لە بەکارهێنانی جەنگ بۆ جێبەجێکردنی نەخشە و پیلانەکانی بزووتنەوەی شۆرشگێریی جیهانی.. مۆریس هەر بەوەندەش نەوەستا، بەڵکو تەواو دڵنیابوویەوە خەزێنەی ئەمریکی ئاوی تێوەرکراوە و هیچی تیادا نەماوە، ئەوسا رێکارێکی دیکەی گرتەبەر و لە رێگەی باربوو و پیتاککردن (اکتتاب) بەو پارەیە لە سەرمایەی بانکی ئەمریکیدا کەمە پارەکەی نێو خەزێنەکەشی لەنێوبرد کە رێژەکەی ٢٥٠ هەزار دۆلار بوو.. بەرێوەبەرانی بانکی ئەمریکاش بەکرێگیراوی بەرێوەبەرانی بانکی ئینگلترا بوون.

بەلام رێبەر و باوکانی سەربەخۆیی ئەمریکا هەستیان بە مەترسییەکە کرد و درکیان بەوە کرد لەوانەیە کۆنترۆڵ و هەژموونی بانکی ئینگلترا بەسەر بانکی ئەمریکا لە دۆخی بەخشینی مافی دەرکردنی دراو بە بانکی ئەمریکا، ببێتە هۆی کۆنترۆلکردنی سەرلەبەری ئابووریی ئەمریکا.. بۆیێ لە کۆنگرێسدا مەسەلەکەیان

ورووژاند و توانیان ناچاری بکەن مافی دەرکردنی دراو بە بانکی ئەمریکا ڕەت بکەنەوە.

بنجامین فرانکلین لە سالّی ١٧٩٠ مرد، یەکسەر بەکرێگیراوانی سووخۆرە یەهوودییەکانی جیهان هەولّێکی نوێیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی توانا داراییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرزەفت بکەن.. لە گەیاندنی بریکارەکەیان واتا ئەلیکساندەر هامیلتۆن بۆ پۆستی وەزیری دارایی سەرکەوتنیان وەدەستهێنا.. هامیلتۆن توانی وەها لە حکوومەتی ئەمریکی بکات بە پێدانی مافی دەرکردنی دراو ڕازی بێت، ئەو مافەش لە بنەڕەتەوە پشت بە قەرزە تایبەت و گشتییەکان دەبەستێ، جا بە پاساوی ئەوەی ئەو دراوەی کۆنگرێس دەری دەکات لە دەرەوەی وڵاتدا بێبەهایە، بەلاّم ئەو دراوەی پشت بە قەرزی تایبەت و گشتی دەبەستێ دەستەبەری پاساییانەی هەیە و دەکرێ گشت ئالّوێر و مامەلّەیەکی پێ بکرێ مەسەلەکەیان لە بەرژەوەندیی خۆیاندا شکاندەوە.. بەمشێوەیە گەل بووە قوربانیی دەستی ئەو پیاوانەی وەك دۆست و هاوڕێ خۆیان پیشان دەدەن!

سەرمایەی نوێی بانکەکە بە ٣٥ ملیۆن دۆلار دەستنیشان کرا، بەو مەرجەی بانکە ئەورووپییەکان بە ٢٨ ملیۆن دۆلار بەشداری تیادا بکەن.. پێدەچێ سووخۆرە جیهانییەکان هەستیان کردبێ هاملتۆن زیاد لە پێویست شت دەزانێت، بۆیێ شەڕە شمشێرێکیان لەنێوان ناوبراو و شمشێربازێکی شارەزا بەناوی ئارۆن بیر دروستکرد و هاملتۆن کوژرا.

لە کۆمەلّەی ڕۆچیلّدەوە ڕێنمایی درایە خاوەن بانکە ئەمریکییەکان بە پێدانی قەرز و کۆمپیالّە و دەستەبەرییەکانی دیکە

رێبنە (السیولە) لە بازاڕەکاندا زیاد بکەن.. هۆکارەکانی پڕوپاگەندە و ڕاگەیاندن زۆرینـەی گەشبینی و خۆشگوزەرانییان لێ دەدا و مژدەی خۆشگوزەرانی و گەشەکردنی هەموانیان ڕادەگەیاند.. دەزگاکانی پڕوپاگەندە مژدەیان بە گەلی ئەمریکی دەدا دەبێتە مەزنترین گەلی سەر گۆی زەوی.. هەموانیش لە کردەی بنیادنانی ئەو گەلەدا بەپەلە پارە و دارایی خۆیانیان بەکارهێنا.

کاتێکیش نرخەکە گەیشتە ئەو ئاستە، کۆمەڵەی ڕۆچێلد ڕێنمایی نهێنیـی دەرکـرد و تیایـدا داوای کردبـوو چـیدیکە قـەرز و قولـە و دەستەبەرییەکان نەدەن، گوشاریش بخەنە سەر ئەو ڕێژە پارەیەی لە بازاڕدایە و دەستاودەست دەکات، ئەمـەیش بـووە هـۆی هێنانەکایـەی قـەیرانێکی زۆر قـووڵی دارایـی و داڕووخـانێکی ترسـناکی ئـابووری.. بەمشێوەیە هاووڵاتییـان نـەیانتوانی ڕووبـەڕووی بـاری قـورس و ئەرکە داراییەکانیان ببنـەوە، لـە هـەمان کاتیشـدا سـووخۆرەکان لـە بەرانبـەر بەخشینی بەشێکی کـەمی نرخـی تـەواوی زەوی و زار، دەستەبەری و بارمتەی زەوی وزارییەکی وەهایان وەدەستهێنا بەهایەکانیان ملیۆنـەها دۆلار دەبوو.

دەبـێ لێـرەدا ددان بـەوەدا بنـێین کـە سـەرلەبەری کردەکـە بـە شێوەیەکی یاسایی و شەرعی بەڕێوەچوو! !.. بـەڵام ڕاستییەکەی ئـال کابووڵی و داردەستە چەتەکەی لە چەتە بانکییـە جیهانییـەکان زۆر بـە حورمەت و بەڕێزتر بوون! !

قەیرانەکە هەروا بە ئاسانی و بـەبێ ڕەخنـە و گلـەیی ژمارەیـەکی زۆری سـەرکردە و ڕێبـەرە ئەمریکییـەکان تێنەپـەڕی.. بـەڵام پێدەچـێ هۆشـداری و لێدوانـەکانیان نـەیتوانیبێ ببێتـە هـۆی ڕزگـارکردنی

هاوپەیمانانیان لە تەڵە و تۆڕەکان.. لە نامەیەکی جۆن ئادامز (١٧٣٥-١٨٢٦) کە لە ساڵی ١٧٨٧دا بۆ ( تۆماس جیفرسۆن)ی ناردووە، نووسیویەتی: هۆی ئەم بێسەروبەری و شپرزەیی و وێرانییە کەموکورتییەکانی نێو دەستوور یان نەبوونی شەرەف و چاکەکاری نییە، هێندەی بەهۆی ئەو نەزانیی نێو بواری کاروباری ئابووری و دراوی نەختینەیی و سرووشتی ژمێریاری و ڕۆیینەییەوەیە ( السیولە) .

تۆماس جیفرسۆنیش وەڵامی داوەتەوە و نووسیویەتی: من باوەڕم وایە ئەم دەستگە بانکییانە مەترسییان زۆر لەو سوپایانە گەورەترە ئامادەن هێرش بهێننە سەر ئازادییەکەمان.. ئەو بانکانە ئەرستۆکراتیەتێکی داراییان هێناوەتە ئاراوە و لە ڕێگەی دەستهەڵات و هەژموونی خۆی ڕکابەری لەگەڵ حکوومەت دەکات و ڕووبەڕووی دەبێتەوە.. پێم وایە دەبێ مافی دەرکردنی دراو لەو دەستگەیانە وەربگیرێتەوە و بدرێتەوە گەل، چوونکە کەس لە گەل زیاتر شایستەی ئەو مافە نییە.

ئەندرۆ جاکسۆنیش گوتوویەتی: ئەگەر دەستوور مافی دەرکردنی کاغەزی دراویی داوەتە کۆنگرێس، مانای وا نییە کۆنگرێس مافی هەبێت ئەو مافە بداتە چەند کەس و دەستە و دامەزراوەیەکی دەرەکی.

ئەم ڕەخنەگرتنە ئاشکرایانە سووخۆرە جیهانییەکانی ترساند، لە کۆسپوتەگەرەی بەردەمیان ئاگاداری کردنەوە، جا ڕۆچیڵد بە بۆنەی هاتنی وادەی دەرکردنی ماف و ئیمتیازی بانکی ویلایەتە یەککگرتووەکان لە ساڵی ١٨١١دا ئەم هۆشدارییەی ڕاگەیاند: دەبێ حکوومەتی ئەمریکی ڕەزامەندی لەسەر داواکاریی نوێکردنەوەی ماف و

ئیمتیازی بانکی ئەمریکا دەربڕیی، دەنا لەنکاو دەبینی لە جەنگێکی ویرانکەر گلاوە.

ئەمریکییەکان باوەڕیان نەکرد نیازی خاوەن بانکە جیهانییەکان ئەوەبێت لەپێناو بەرژەوەندییەکانیان ئاگری جەنگێك خۆش بکەن، وایان زانی فرۆفێڵێك لە مەسەلەکەدا هەیە.. هەروەها ئەندروا جاکسۆنیش هەمان ڕای هەبوو، دواتر ناوبراو گوتبووی: ئێوە تەنیا ئەشکەوتی دزان و کۆمەڵە خوێنمژێکن، دەبێ تێکوپێکتان بشکێنم و لەنێوتان ببەم، سوێند بەخوا دەتانپلیشێنمەوە.

ناسان ڕۆچیڵدیش چەند ڕێنماییەکی دەرکرد و تیایاندا گوتبووی: دەرسێکی باشی ئەو ئەمریکییە بێشەرمانە دابدەن، با بگەڕێنەوە سەردەمی ئیستعمار و پێش سەربەخۆیی.

حکوومەتی بریتانی لە ساڵی ١٨١٢ ئاگری جەنگی هەڵگیرساند، ئامانجیش لەو جەنگەدا هەژارکردن و ئاو وەرکردن بوو لە خەزێنەی ئەمریکی بە جۆرێك دەستهەڵاتە ئەمریکییەکان ناچار بن دەستی ئاشتی درێژ بکەن و داوای یارمەتیی دارایی بکەن.. ناسان ڕۆچیڵد بڕیاری دا یارمەتیی پێویستی دارایی نادرێ تەنیا لەو کاتەدا نەبێت حکوومەتی ئەمریکی بە نوێکردنەوەی ماف و ئیمتیازی بانکی ئەمریکا ڕازی بێت.

پیلانەکەی ناسان ڕۆچیڵد بەتەواوی سەری گرت.. ئەمەیش بووە هۆی دروستکردنی تەنگەتاوی و ڕق و بێزاریی جەماوەر، جەماوەرەکەش سەرزەنشتی سیاسەتە هەڵەکانی حکوومەتە نیشتمانییەکانیان دەکرد، لەو کاتەی هێزە نهێنییەکان لە پشت پەردە و دوور لە هەر جۆرە گومانێك کاری خۆیان دەکرد، تەنیا ژمارەیەکی کەمی خەڵك دەیانزانی خەریکی داڕشتنی چ پیلانێکن.

کۆنگرێسی ئەمریکی لە ساڵی ١٨١٦ و وەك چۆن داوای لێ کرابوو ماف و ئیمتیازی بانکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی نوێکردەوە.. هەندێك لە کەسانی جێگەی باوەڕ هاواریان دەکرد ئەندامانی کۆنگرێس هەم بەرتیلیان پێ دراوە هەمیش چاویان لێ سوورکراوەتەوە بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی ئەو یاسایەدا دەنگ بدەن کەوا گەلی ئەمریکی گەڕاندەوە نێو دۆخی کۆیلەبوونی ئابووری.

لینۆرای کچی لیۆنیل ڕۆچیڵد لە ساڵی ١٨٥٧دا لە لەندەن لە ئۆنسۆی ئامۆزای مارەکرا ( باوەڕیشیان وەهابوو دەبێ شتەکان و کاروبارەکان لە چوارچێوەی خانەوادەدا بمێننەوە).. ئەم ئاهەنگەی بووکگواستنەوەیە بووە بۆنەیەکی گەورە و ژمارەیەکی زۆر لە کەسییەتییە جیهانییەکانی لەلەندەن کۆکردەوە، لەوانە بنجامین دزرائیلی پیاوی دەوڵەتی بریتانی کە لە ساڵی ١٨٦٨دا کرایە سەرۆکوەزیران و لە ساڵی ١٨٧٤یشدا دووبارە دانرایەوە.

دزرائیلی سەبارەت بەو بۆنە گرنگە گوتوویەتی: لێرە و لەژێر ئەم بنمیچەی ناویانگی بە گشت پایەختەکانی جیهان و گشت کون و قوژبنێکی جیهاندا بڵاو بووەتەوە، سەرانی ڕۆچیڵد کۆبوونەتەوە.. خۆ ئەگەر بتانەوێ، ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەینە دوو پارچە و دابەشی دەکەین، بەشێکیان دەدەینە جیمس، بەشەکەی دیکەش بە لیۆنێل دەبەخشین.. هەروەها ناپلیۆنی سێیەمش (ئیمپراتۆری ئەو کاتی فرەنسا) لە قسەم دەرناچێت.. بەڵام پیلانێکی هێندە قورس بۆ بسمارك دادەڕێژین دەیکاتە کۆیلەیەکی سەرشۆڕی خۆمان.

دواتر مێژوو ئەوەی تۆمار کردووە چۆن بنەماڵەی ڕۆچیڵد کەسە نزیکەکەی خۆیان ( یەهووزا بی. بنجامین)یان لە ویلایەتە

یەکگرتووەکانـدا وەك نوێنـەری سـەرەکیی خۆیـان دامەزرانـدووە.. بەمشێوەیە جەنگی نێوەخۆیی ئەمریکا گەلی ئەمریکیی کردە دوو بەش و بووە ڕاستییەکی بەرچاو!

دواتر سووخۆرەکان باوەڕیان بە ناپلیۆنی سێیەم هێنا مەکسیك داگیر بکـات و بیخاتـە سـەر ئیمپراتۆریەکـەی خـۆی.. حکوومـەتی بریتانیشیان ڕازی کـرد دووبـارە ولایەتـەکانی بـاکوور داگیر بکاتـەوە و بیانخاتەوە نێو سنووری ئیستعمارییەوە.. جەنگی نێوەخۆیی ئـەمریکی بـۆ سـووخۆرە جیهانییـەکان، جـەنگێکی ئـابووری بـوو.. ڕێگـە بـۆ سووخۆرە جیهانییەکان زۆر خۆش بوو گوشـاری ئـابووری پـتر بکـەن و دوای ئەوەی کۆیلەکان ئازاد کـران تـرس و تـۆقینی دارایـی بخەنـە نێو ویلایەتـەکانی بـاکوور.. ئـەبراهام لینکـۆڵن گوتوویـەتی: هـیچ گـەل و نەتەوەیەك ناتوانێ هێندە ددان بەخۆیدا بگرێ لەوەی نێوەی تاکـەکانی ئازاد و نیوەکەی دیکەشی کۆیلە بن.

خـاوەن بانکـە جیهانییـەکان قـەرزی سـنووربەند و دیاریکراویـان بەخشییە هێزەکانی باشوور، بۆ ئەوەی لە جـەنگی دژ بـە باکورییـەکان ببنــە پاڵپشــت و هاوکاریـان.. هــەروەها ٢٠١,٥٠٠,٠٠٠ بــە قــەرز درایـە ناپلیۆن بۆ ئەوەی پاڵپشتیی لە هێرشەکەی مەکسیك بکەن.. لـە سـاڵی ١٨٦٣دا هێزە نهێنییەکانی پشـت پـەردە هـەردوو ویلایـەتی لویزیانـا و تکساسـیان بـۆ نـاپلیۆنی سـێیەم پێشـنیاز کـرد بـۆ ئـەوەی یارمـەتیی باشوورییەکان بدات، چونکە دژ بـە باکوورییـەکان زۆر پێویسـتیان بـە یارمەتی هەبوو.

قەیسەری ڕووسی بە مەسەلەکەی زانـی، هـەواڵ بـۆ ئینگلیزەکان نـارد ئـەوان لـەپێناو بەرژەوەنـدیی باشـوورییەکان هاتوونەتـە نێـو

مەسەلەکە و یارمەتیی سەربازییان بۆ دەنێرن، ئەگەر کارێکی وەها بکەن، ئەوا ڕووسیا وەهای لێك دەداتەوە جەنگ بە دژی ڕاگەیاندراوە..

جا وەك جەختکردنەوە لەسەر هۆشدارییەکەشی چەند کەشتییەکی جەنگیی ڕووسی ناردە بەندەرە باکوورییەکانی نیویۆرك و سان فرانسیسکۆ و خستنیە ژێر فەرمانی لینکۆڵنەوە.

جا کاتێك کۆسپوتەگەرەی دارایی چوار دەوری ویلایەتەکانی باکووری تەنییەوە، سووخۆرە جیهانییەکان لارییان نەبوو قەرزیان پێ بدەن، بەو مەرجەی ڕێژەی ٢٨٪ سوو بدەن.

ئەگەر سووخۆرەکان پەیتا پەیتا قەرزیان بە هەردوو لایەنی شەڕکەر نەدابووایە، دەکرا ئەو جەنگە لە ماوەی چەند مانگێکی دیاریکراودا کۆتایی پێ بێت.. ئەو قەرزانەش سوویێکی زۆریان خرابووە سەر.. سووخۆرەکان حیسابی وردودرشتیان کردبوو و پیلانیان بۆ هەموو شتێك دانابوو بۆ ئەوەی بەتەواوی دەست بەسەر لایەنە ئابوورییەکانی ئەو گەلەدا بگرن.. کاتێکیش بۆیان ڕوونبوویەوە کاتی کۆتاییهێنان بە جەنگ هاتووە، جەنگەکەیان ڕاگرت.

دواتر لینکۆڵن هەوڵی دا کۆتوبەندی ئابووری سەر ویلایەتەکانی باکوور داڕنێ و تێدەکۆشا دەستوور پێڕەو بکات و پشتی بە برگەی پێنجەمی مادەی یەکەم بەستبوو کە جگە لە کۆنگرێس ڕێگە بە هیچ لایەنێکی دیکە نادات دراو دەربچوێنێ، هەروەها ٤٥٠ ملیۆن دۆلاری ڕەسمیشی دەرچوواند و پاڵپشتی و چوارچێوەی پشتگیریکاریشی قەرزی نەتەوەیی بوو.. سووخۆرە جیهانییەکان تۆڵەیان لە لینکۆڵن سەندەوە، چونکە وایان لە کۆنگرێس کرد یاسایەك دەربکات، بەپێی یاسایەکە قەدەغەکرا کاغەزە داراییەکانی لینکۆڵن لە دانەوەی سوودی

قەرزە حکوومییەکان و کاروباری دیکە وەربگیرێت..هەروەها سووخۆرە جیهانییەکانیش ئەو کاغەزە داراییەیان وەرنەگرت، ئەمەیش بووە هۆی بێبەهاکردنی دراوەکە!!.. بەهای ئەو جۆرە دۆلارەیان دابەزاندە ئاستی ۳۰ سنت بۆ هەر دۆلارێك.

کاتێك ئەو کارەیان سەری گرت، خەریکی کڕینی تەواوی ئەو جۆرە دۆلارە بوون.. دواتریش قەرزە حکوومییەکانیان بەو دراوە کڕی، بەهای هەر دۆلارێکیشیان بە یەك دۆلار هەژمارکرد.. بەمەیش لەسەر ڕێگەی خۆیاندا کۆسپوتەگەرەیەکی مەترسیداریان لادا و لە هەر دۆلارێکیشدا ۷۰ سنت قازانجیان کرد!!.

لە ڕۆژنامەی (لەندەن تایمز)دا گوتارێك بە فیتی سووخۆرێکی جیهانی بڵاوکرایەوە، نێوەڕۆکەکەشی تایبەت بوو بە لینکۆڵن و دراوە داراییەکەی.. لەو گوتارەدا نووسرابوو: ئەگەر ئەو سیاسەتە داراییە هەڵەیەی لە ئەمریکای باکوورەوە دەستی پێکرد، ڕەزامەندی لەسەر بدرابووایە و ددانی پێدا بنرابووایە، ئەوا حکوومەت دەیتوانی ئەو کاغەزە دراوییانە بەبێ هیچ خەرجی و تێچوویەك دەربکات کە دەیویستن.. بەم کاغەزانەش گشت قەرزەکانی دەدایەوە، ئەمەیش مانای وابوو قەرزی لەسەر نەدەما.. هەروەها گشت پارەپوولێکی دەکەوتە بەر دەست بۆ ئەوەی بازرگانی و ئاڵوێرەکانی پێ بەڕێوەببات.. ئەوجا گەلی ئەمریکی لە مێژووی جیهاندا دەبووە یەکەم گەل گەشەکردنێکی لەمشێوەیە بەخۆیەوە ببینێ... بەمەیش لە گشت شوێنێکی جیهاندا ئەقڵ و سامانی بۆ خۆی بەکێش دەکرد.. دەبێ ئەم دەوڵەتە وێران بکرێ و داری لەسەر بەردی نەهێڵدرێ، دەنا دەبێتە

هۆی پلیشاندنەوەی گشت دەستهەلآت و پاشایەتییەکی سەر گۆی زەوی.

بلاوکراوەی (دی هازا رد سیرکیولار)ی وەرزی، گرنگی بە کاروباری بانکی ئەودیو دەریایەکان دەدا.. و تیایدا نووسراوە: جەنگ دەبێتە هۆی لەنێو بردنی کۆیلەیەتی.. هەر ئەمەیشە ئێمە و هاوڕێیە ئەورووپییەکانمان پالپشتی دەبین، چونکە کۆیلەیەتی بریتییە لە پەیداکردنی دەستی کار.. بەلآم ئەو پیلانە ئەورووپییەی ئینگلترا دەستپێیکرد، لەسەر ئەو بنەمایە دارێژراوە کە سەرمایە دەتوانێ لە ڕێگەی کرێ و دەستهەقەوە کۆنترۆڵی دەستی کار بکات.. لەسەر سەرمایەدارەکانیش پێویستە بزانن بەکارهێنانی ئەو قازانجە زەبەلاحەی لە جەنگەکانەوە وەدەستی دەهێنن، دەبێ بۆ کۆنترۆلکردنی بەهای دراو بەکاری بێنن.. جا بۆ جێبەجێکردنی ئەم خالەش، دەبێ وەك بناغەیەکی کردە بانکییەکان پشت بە کۆمپیالە و قەوالە حکوومییەکان ببەسترێ.. ئێمە لە ئێستەدا چاوەنوارین وەزارەتی دارایی ئەمریکی ئەم ئامۆژگارییەمان لە گوێ بگرێ و بیکاتە بەرنامەیەکی کار.. هەروەها بۆ ئێمە سوودبەخش نییە بۆ ماوەیەکی زۆر ڕێگە بە دەستاودەستکردن و بەکارهێنانی کاغەزە سەوزە داراییەکانی لینکۆلن بدەین، چونکە ناتوانین کۆنترۆلی بکەین.. بەلآم لە بەرانبەردا دەتوانین کۆمپیالە و قەوالە حکوومییەکان کۆنترۆڵ بکەین و لە پشتیشیەوە تەولوی دراو و دواتریش سەرلەبەری ئابووری بخەینە ژێر دەستی خۆمانەوە.

سووخۆرە جیهانییەکان پارەی هەلمەتی هەلبژاردنەکانیان بۆ ژمارەیەکی زۆری نوێنەران و پیرەکان تەرخانکرد، بۆ ئەوەی بەهۆی

ئەوانەوە پڕۆژە یاسای پارە گۆڕەرەوەکـان (الصیارفة) دەنگی لەسەر بدرێ، ئەم پڕۆژەیە لە ساڵی ١٨٦٣دا بـووە یاسـا، هەرچەندە سەرۆك لینکـۆڵن زۆر دژی وەسـتایەوە.. بەمشـێوەیە دیسـانەوە سـووخۆرە جیهانییەکان خولێکی دیکەشیان بردەوە.

لە نامەیەکی دەستگەی ڕۆچیڵد و برایە سـەرمایەدارەکانی کـە لـە ڕێکـەوتی ٢٥ی حـوزەیرانی سـاڵی ١٨٦٣دا لـە لەنـدەن بـۆ دەسـتگەی بەڕێزان و سـەروەرانی ئیکلهایمـەر و مۆتـون فانـدەر گۆڵـد، نـاردراوە و ناونیشانەکەی: ٣ وول ستریت نیویۆرکە، هاتووە:

گەورە بـەڕێزەکانم.. بـەڕێز جـۆن شـێرمان لـە هـەرێمی ئۆهـایۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە بۆی نووسیوین و مەزەندەی خۆی سەبارەت بەو قازانجانە ڕاگەیاندووە کەوا دەکرێ بەهۆی ئەو یاسـایەی کـۆنگرێس سـەبارەت بـە کاروبارەکـانی بانکەکانـەوە دەری کـردووە، وەدەسـتی بهێنین.. پێدەچێ ئەم یاسایە بەپێی پلانە جێبەجێکراوەکەی کۆمەڵەی بانکە بریتانییەکان بووبێت.. هەروەها ئەو کۆمەڵەیە هاوڕێیە هۆشداریی داوەتە هاوڕێیە ئەمریکییەکانی و پێی ڕاگەیانـدوون ئەگـەر ئـەو پەسند بکرێت و بڕیاری لەسـەر بدرێ، دەبێتـە هـۆی هـەڵڕژانی لافـاوی قـازانج بەسەر کۆمەڵەی پارەگۆڕەوەکان لە گشت جیهاندا.. چونکە ئەم یاسایە دەسـتهەڵات و هـەژموونی تـەواو دەداتـە بـانکی نیشـتمانی کـۆنترۆڵی بارودۆخی ئابووریی و دارایی نێـو دەوڵـەت بکـات، ئـەو کەمینەیـەی بە نهێنیـی و ڕاسـتیی یاسـایەکە دەزانـن، هـیچ بەرهەڵسـتییەك نـانوێنن، چـــونکە هەلپـــەی وەدەســـتهێنانی قـــازانجی هەیـــە، یـــانیش بەرژەوەندییەکانی بەندە بە پەسندکردن و دەنگدان لەسەر یاسایەکە..

بـەلام جـەماوەری گـەل نـاتوانێ لـە سرووشـتی پڕۆژەکـە ئـەو مـاف و

ئیمتیازانـه تێبگـات کـەوا کەسـانی سـەرمایەدار وەدەسـتی دەهێـنن، تەنانەت ئەو گومانەشیان لەلا دروست نابێت ئەم سیستم و یاسایە دژی بەرژەوەندییەکانیان بێت.

(دلسۆزانتان ڕۆچیلد و برایەکانی).

نامەی ئیکلهایمەر و مۆرتۆن و فاندەرگۆلدیش بەمجۆرەیە:

وەها دێتە بەرچاومان بەڕێز جۆن شیرمان سیفەتەکانی پیاوێکی سـەرکەوتووی بـواری داراییـی تیـادا بێـت، چـونکە گەیشـتن بـە سـەرۆکایەتیی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی کردووەتـە ئامـانجی خـۆی، ئێستەیش ئەندامی کۆنگرێسە، بیرکردنەوە دروستەکەی وای لێکـردووە درك بەوە بکات کە قازانجە مەزنەکە بریتییە لـە پاراسـتنی هاورێیـەتیی ئـەو کـەس و دەسـتگەیانەی سەرچـاوەیەکی مـەزن و فراوانـی داراییـان لەبەردەسـتە.. بـەلام سـەبارەت بـە رێکخسـتنی بـانکی نیشـتمانی و سرووشتی ئـەو قازانجانـەی دەکـرێ بـەهۆی بـەکارهێنانی پـارە تیایدا وەدەسـتبێ، تکایـە چـاوێك بـە بلاوکـراوە هاوپێچـەکاندا بخشـێنن کـە بریتییە لە:

-ژمارەیـەك کـەس - لـە پێـنج کـەس کـەمتر نـەبن- دەتـوانن دەستەیەکی بانکی دامەزرێنن.

- نابێ سەرمایەی هیچ بانکێك لە یـەك ملیـۆن دۆلار کـەمتر بێـت، تەنیا ئەو ولاتانە نەبێت کە ژمـارەی دانیشـتووانەکانیان لـە ٦٠٠٠ کـەس تێناپەڕێ.

-بانکەکان دەبنە دەستەی تایبەت، ئامانجیان وەدەستهێنانی قازانجە بۆ کەسەکان، دامەزرێنەرانیشی مافیان هەیە فەرمانبەر و کارمەندەکانیان هەڵبژێرن.

-یاسایەکانی ویلایەتەکە هیچ دەستهەلاتێکیان بەسەر بانکی نێو ویلایەتەکەدا نییە، تەنیا ئەو ڕێکارانە نەبن کە ماوەماوە کۆنگرێس دەریان دەکات.

- ئەو بانکانە سپێردراوەکان وەردەگرن، هەروەها بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان قەرزی گونجاو دەدەن، هەروەها دەتوانن کۆمپیاڵە و قەواڵەکان بکڕن و بیانفرۆشن و کاروبارە گشتییەکانی بانکی بەڕێوەببەن.

- بۆ دروستکردن و دامەزراندنی بانک پێویستە سەرمایەیەکی ملیۆن دۆلاری هەبێت، کۆمپیاڵە و قەواڵەکانی حکوومی بەقەد ئەو ملیۆن دۆلارە بکڕێ.. جا لەبەر ئەوەی قەواڵەی حکوومی بە داشکاندنی ٥٠٪ دەفرۆشرێ، ئەوا ئێستە دەکرێ بانکێک بە ٥٠٠,٠٠٠ دۆلار دابمەزرێندرێ.. ئەم قەواڵانەش خەزێنەی ئەمریکی لە واشنتۆن دایدەنێت وەك دەستەبەرکردنی کاغەزە داراییەکانە و حکوومەت پێشکێشی بانکەکەی دەکات.

- حکوومەت سوودێکی تایبەت بە بەهای قەواڵە و کۆمپیاڵەکان دەدات، ڕێژەکەشی ٦٪ و ساڵی دوو جار دەیدات.. جا ئەگەر بەهای هەنووکەیی کۆمپیاڵە و قەواڵەکان ڕەچاو بکەین، درك بەوە دەکەین حکوومەت سوودی پارە سپێردراوەکە بە ڕێژەی ١٢٪ی دەدات، دانی سوودەکەش بە زێڕ دەبێت.

- حکوومـەت لـە بەرانبـەر قەواڵـە و کۆمپیاڵـە باسـکراوەکاندا ڕۆیینەی(السـیولە) پێویسـت پێشکەشـی ئـەو بانکـە دەکـات کـە ئـەو قەواڵەیە وەك سپێردراو دادەنێت، سوودێکی ساڵانە بـە ڕێـژەی ١٪ داوا دەکات.

- جـا ئەگـەر داواکـاری بـۆ ڕۆیینـەی دارایـی زۆر بـوو، بانکەکـە دەتـوانێ لـە پێشکەشـکردنی قـەرز بـە خـەڵکی پـارە بەشـێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەکاربێنێ، سوودەکەشی تەواوە و دەگاتە ١٢٪.

- بەمشێوەیە ئەو سوودەی بانکەکە لە قەواڵە و کۆمپیاڵەکانـەوە دەسـتی دەکـەوێ، ئـەو سوودەشـی دەخرێتـە سـەر کـەوا بـەهۆی بەقـەرزدانی کاغـەزی دارایـی و ڕۆیینـەی دراوییـەوە دێتـە بەرهـەم، هەروەها قازانجە کتوپڕەکانیشی دەخرێتـە سـەر، بۆ ئـەوەی قـازانجی بانکەکە بۆ ٢٨ و ٣٣,٣٪ بەرز بێتەوە

-بانکەکان دەتوانن بەپێی ویستی خۆیان قەبارەی ئاڵوێرەکانیان کەم و زیاد بکەن ، هەروەها بانکەکە چۆنی پێ باش بێت دەتوانێ قەرز بدات یـانیش نەیـدات.. گرێبەسـتی ئـەو بانکانـە لەلایـەن کۆمەڵەیـەکی بـانکیی نیشـتمانییەوە کۆدەکرێتـەوە کـە کارەکانیـان یـەك دەخـات.. بەمشێوەیە بانکەکان دەتوانن بـە ئـارەزووی خۆیـان و چـۆنی بیانـەوێ کاریگەری لە بازاڕی داراییدا بکەن. چونکە بۆ نموونە بانکەکان دەتوانن لەسەر ئەوە ڕێك بکەون مەسەلەی دانی قـەرز ڕەت بکەنـەوە، بەمـەیش دەبنە هۆی دابەزین لە بازاڕە داراییەکان و دەشتوانن کاریگەری لەسـەر گشت بەرهەمێکی نیشتمانیشدا دروست بکەن.

-بانکـە نیشـتمانییەکان لەهەنبـەر ڕێـژەی کۆمپیاڵـە و قەواڵـە و سەرمایە و سپاردەکان هیچ باجێك نادەن.

تکامان وایه ئەم نامەیه بە نامەیەکی زۆر نهێنی بزانن.. ئەوپەڕی ڕێزمان قبووڵ بکەن.

خاوەن بانکەکانی ئەمریکی دوای ئەو نامانە ئەو بنەمایانەی سەرەوەیان پێڕەو کرد.. بەمشێوەیه کاریان بۆ کێشانەوەی ڕێژەی دراو کرد و بەهای قەرزەکانیان بە ئاستێك دابەزاند قەرزارەکان نەتوانن ڕووبەڕووی ئەرك و بەرپرسیاریەتییە داراییەکانیان ببنەوە، خاوەن بانکەکان دەستیان بەسەر زەوی و زار و دەستەبەرییە بارمتەکراوەکاندا گرت کە بەهایەکانیان زۆر لە بەهای قەرزەکان زیاتر بوو.. بەمشێوەیه کەسانی بانکی قازانج و بەرهەمێکی باشیان کۆکردەوە.

دوای ئەو ئەزموونە غەماوی و گەورەیە لینکۆلن هەستی کرد ئەمجارە گەلی ئەمریکی ئامادەی بیستنی دەنگی ئەقڵە، بۆیێ بۆجاری دووەم هێرشێکی ئاشکرای توندی کردە سەر سووخۆرانی جیهانی.

لە گوتارێکیدا بۆ گەل گوتی: من لە ئاسۆدا مەترسیی قەیرانێك دەبینم وردەوردە نزیك دەبێتەوە.. قەیرانێکە و دەموروژێنێت و وام لێ دەکات لە ترسی لە دەستچوونی سەلامەتیی وڵاتەکەم هەڵبلەرزم.. ئێستە دەستهەڵات و سەروەرییەکەی کەوتووەتە دەست گرووپ و دامەزراوە و کۆمپانیایە گەورەکانەوە.. ئەوجا دوای ئەمەیش گەندەڵی و خراپەکاری دەگاتە بەرزترین پێگە و پۆست.. کەسانی سەرمایەدار کار بۆ پاراستنی دەستهەڵات وەهەژموونیان دەکەن بەسەر دەوڵەتدا، لەمەیشدا بەخراپ سوود لە هەست و سۆز و دووبەرەکییەکانی گەل دەبینن.. تەواوی سەروەت و سامانی وڵاتیش دەکەوێتە دەستی چەند

کەسێك کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، ئەمەیش دەبێتە هۆی وێرانکردنی کۆمار.

ئەوکات لینکۆلن لە کۆتاییی ماوەی سەرۆکایەتیدا بوو، بەلام لە هەلبژاردنەکاندا دووبارە وەك سەرۆك هەلبژێردرایەوە، قۆلی خۆیشی لێ هەلمالیبوو بەسەر دەستهەلاتی سووخۆرە بە هەلپە و چاوبرسییەکانی جیهانیدا زال بێت.. بەلام پێش ئەوەی دەست بۆ کارێکی وەها ببات و لەو کاتەی لە شەوی چواردەی ئەیلوولی سالی ١٨٦٥ لە نمایشێکی شانۆییدا بوو، لەسەر دەستی جۆن ویلکس بۆس تیرۆرکرا.. تەنیا ژمارەیەکی کەمی ئەمریکییەکان هۆیەکانی پشت ئەم تیرۆرکردنە دەزانن. لێکۆلەرەکان لەو کاتیدا لەنێو کەلوپەلەکانی بکوژەکەدا نامەیەکی کۆدداریان دۆزییەوە.. گەرچی نامەکە دوور و نزیك ئاماژە بە تاوانەکە ناکات، بەلام هەبوونی پێوەندیی نێوان بۆس و خاوەنی بانکە جیهانییەکان سەلماند و ئاشکرای کرد.. خۆ ئەگەر لینکۆلن ماوەیەکی درێژتر بژیابووایە، دەیتوانی بالی سووخۆرانی جیهانی ببڕێت.

پێش کوژرانی لینکۆلن، (سالمۆن بی. چایس)ی وەزیری داراییی ئەمریکی ( ١٨١٦- ١٨٤٦) لێدوانێکی دا و تیایدا گوتی: بەشداربوونم لە دەنگدان و بڕیاردان لەسەر یاسای پارە گۆڕەوەکان گەورەترین هەلەی داراییی نێو ژیانم بوو.. چونکە ئەم یاسایە بووە هۆی سەرهەلدانی قۆرغکردنێکی گەورە و کاریگەریی نەرێیی لەسەر بەرژەوەندییەکانی ولاتدا کرد.. لەسەرمان پێویستە ئەو دۆخە چاك بکەینەوە.. بەلام پێش ئەمە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی توندی نێوان بەرژەوەندییەکانی خەلك و بەرژەوەندییەکانی بانکەکان بەشێوەیەکی گشتی دەبینین کە پێشتر هەرگیز بەرچاومان نەکەوتووە.

لە سالی ١٨٨٦دا (١,٩٠٦,٦٨٧,٧٧٠) دۆلار لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەستاودەستی دەکرد. بەلآم لە سالی ١٨٧٦دا ئەم ڕێژەیە دابەزی و بووە ٦٠٥,٢٥٠,٠٠٠ دۆلار. بەمشێوەیە دەبینین خاوەن بانکەکان بە کێشانەوەی کاغەزە داراییەکان لەنێو بازاڕ و دۆخی دەستاودەستکردندا، بوونە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی دراوی لەنێو دەستی گەلدا، ڕێژەی زیاتر لە ١,٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠ دۆلاریان کێشایەوە، لە ئەنجامدا بووە هۆی ڕوودانی ٥٦,٤٤٦ ڕووداوی داڕووخانی دارایی و بە ڕێژەی ٢,٢٤٥,١٠٥,٠٠٠ دۆلار زیان وەبەر بەکارهێنان و خستنەگەڕی دارایی کەوت.. پشکی زۆری زیانەکان وەبەر بارمتەکراوەکان و دەستبەسەرداگیراوەکان کەوت.. خاوەن بانکەکان لە ماوەی نزیکەی دە سالدا بە کێشانەوەی ڕێژەی دراوی لە بازاڕەکان و درێژکردنەوەی ماوەی پێدانی قەرزەکان، ڕێژەی زیاتر لە دوو بلیۆن دۆلاریان خستە سەر سەروەت و سامانەکانیان.

****

## بەشی شەشەم

# مانۆڕە دراوییەکان

کاتێك بنەماڵەی ڕۆچیڵد بەتەواوی چنگیان لە بانکی ئینگلترا گیرکرد، سووربوون لەسەر ئەوەی زێڕ پۆشەر و پاڵپشتی دراوی کاغەزی بێت.. خاوەن بانکە ئەوروپییەکان لە ساڵی ١٨٧٠دا کاتێك ڕووبەڕووی ئاستەنگی بەردەم کۆنترۆڵکردنی دراوی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوونەوە تەنگەتاو بوون .. چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە لێدان و دەرکردنی دراوەکانیدا زیوی بەکاردێنا.. لەبەرئەوە خاوەنی بانکەکان بڕیاریان دا زیو لە بەهای هەنووکەیی و کاتیی ( الابرائیە) ویلایەتە یەکگرتووەکان دابماڵن.

خاوەن بانکە ئەوروپییەکان (ئەرنست سید)یان وەك نوێنەر و بریکاری خۆیان ناردە ئەمریکا، نیو ملیۆن دۆلاریشیان خستە بەر دەستی، بۆ ئەوەی لە کڕینی ویژدانی کەسییەتییە سەرەکییەکانی نێو دەستە و دامەزراوەکانی یاسادانانی ئەمریکی بەکاری بهێنێ.. خاوەن بانکەکان لە ساڵی ١٨٧٢دا چەند ڕێنماییەکیان بۆ بەکرێگیراوەکانیان دەرکرد، بۆ ئەوەی پرۆژە یاسای ڕیفۆرمی دەرکردنی دراوی کانزایی پێشنیاز بکەن.. ڕەشنووسی پرۆژەکە زۆر بە کارامەیی و شارەزایی دارێژرابوو، بەشێوەیەك مەبەستە ڕاستەقینەکەی شاراوە بوو و بە ئاسانی هەستی پێنەدەکرا.. ئەو سیناتۆرەی پرۆژەکەی پێشکێش

کردبوو (جۆن شێرمان) بوو، – کەمێك لەمەوبەر ئاماژەمان بە نامەکەی کرد– ئاراستەی دەستەگەی ڕاچێڵدی کردبوو.. لەم پرۆژەیەدا ئەندامێکی کۆنگرێس بەناوی (صمۆئیل هوپر) پشتگیری [1] ە شێرمان دەکرد.. دوای ئەوەی شێرمان لە کۆنگرێسدا گوتەیەکی زۆر جوان و سەرلێشێوێنەری پێشکێش کرد، پرۆژە یاسایەکە بەبێ هیچ نارەزایی و بەرهەڵستییەك تێپەڕێندرا!!

سێ ساڵ تێپەڕین و کەس بەدوای مەترسیی ڕاستینی پشت بڕیاردان و پەسندکردنی ئەو یاسایەدا نەچوو و هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەوە نەکرا.. چونکە ئەم پرۆژە یاسایە هەوڵێکی داپۆشەر و سەرلێشێوێنەر بوو بۆ ئەوەی زیو بەهای هەنووکەیی و کاتییانە ( الابرائی) خۆی لەدەست بدات.. ڕاپۆرتی کۆنگرێس دەڵێ تاکە یەك ئەندامیش بە دروستی و بەتەواوی لە نێوەڕۆکی یاسایەکە نەگەیشتن، تەنیا ئەو لیژنەیە نەبێت کە پرۆژە یاسایەکەیان پێشکێش کردبوو.

بەڕێز (جۆن. ئار، نیلسۆم) لە لاپەڕە ٤٩ی پەرتووکەکەی بەناوی ( ڕەشەبایەك لەسەر خەزێنەی ئەمریکی) نووسیویەتی: ئەرنت سید بە ( بەڕێز فردریك. ئەی. لۆکتباك)ی هاوڕێی خۆی گوتووە: ڕووبەڕووی لیژنەی ئەنجوومەنی پیران و کۆنگرێس بوومەوە و بەرتیلی پێویستم پێیان دا، هەر لە ئەمریکاشدا مامەوە تا دڵنیابوومەوە هەموو شتێك باشە.

خاوەن بانکەکان لە ساڵی ١٨٧٨دا دەستیان بە کێشانەوەی پلێینەی زۆرتری دراوی کرد و قەرزە بەخشراوەکانیشیان دیاری کرد، ئەمەیش بووە هۆی ١٠,٤٧٨ ڕووداوی مایەپووچ بوونی بازرگانی و بانکییانە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.. بەڵام کۆنگرێس لە ساڵی

١٨٧٩دا بۆ وەستاندنی قەیرانە دەستکردە خنکێنەرەکە لەسەر دەرچوواندنی ڕێژەیەکی زۆری دراو پێی داگرت، ئەمەیش دۆخەکانی مایەپووچیی بۆ ڕێژەی ٦,٦٥٨ دۆخ کەمکردەوە، بەڵام هێزە نهێنییەکانی پشت پەردە لە ساڵی ١٨٨٢دا چەند ڕێنماییەکیان دەرکرد، دەرئەنجامی مانۆڕە داراییەکان کە لەنێوان ساڵانی ١٨٧٨ و ١٨٩٢ بەڕێوەچوو، بریتی بوو لە بەرزبوونەوەی دۆخەکانی مایەپووچبوونی ئابووری لە ئەمریکا و ڕێژەکەشی گەیشتە ١٤٨٧٠ دۆخ، لە هەمان کاتیشدا کردەی دەستبەسەرداگرتنەکان (الحجوزات) بەسەر کێڵگە و ماڵی تاکەکەسەکاندا بەردەوام بوو.. تاکە سوودمەندی ئەو دۆخەش خاوەن بانکەکان و ئەو بەکرێگیراوانەیان بوون کەوا دەستیان بەسەر موڵکە بارمتەکراوەکاندا گرتبوو.

لە ڕووداوەکانەوە ئەوە بەدیاردەکەوێ خاوەن بانکە جیهانییەکان بەئەنقەست هەوڵی دروستکردنی دۆخەکانی شکستهێنان و هەژاری و بێهیوایی نێو ویلایەتە یەکگرتووەکانیان دەدا، بۆ ئەوەی لە پێناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانیدا کەشێکی گونجاو بڕەخسێنن، چونکە شۆڕش وەك ئامرازی کار و ئامانجەکانیان بوو.. نامەیەکی کۆمەڵەی خاوەن بانکە ئەمریکییەکان لە ١١ی مارسی ساڵی ١٨٩٣دا ئاراستەی گشت ئەندامان کراوە، و ئەم ڕاستییەی سەرەوە دەسەلمێنێ، لە نامەکەدا هاتووە:

(( دەبێ بڕوانامە زیوینییەکان و کاغەزەکانی سەر بە خەزێنە یەکسەر لە ئاڵوێرکردن و دەستاودەستکردن بکێشرێنەوە، بۆ ئەوەی چەند کاغەزێکی نوێی دارایی جێگەیان بگرنەوە کە پۆشەر و پاڵپشتەکەیان زێڕ بێت.. ئەمەیش پێویستی بە دەرکردنی چەند قەواڵە

و کۆمپیالەیەکی نوێ هەیە کە بەهایەکەی لەنێوان ٥٠٠ ملیۆن و یەك ملیار دۆلار بێت، هەر ئەمیش دەبێتە بناغەی دەستاودەستکردن و مامەڵەکردن بە دراوە نوێیەکە.. لەبەرئەوە لەسەرتان پێویستە سێیەکی ئەو دراوەی بکێشینرێتەوە کە ئێستە دەستاودەست دەکات ، هەروەها وەها باشترە نیوەی قەرزە بەخشراوەکان کەم بکرێنەوە.. هەروەها دەبێ بەتەواوی هەوڵی خۆتان بخەنەگەڕ بۆ ئەوەی خەڵك هەست بە گوشاری ئابووری بکات.

خاوەن بانکەکانی ئەمریکا ملیان دایە بەر فەرمانەکە، دەرئەنجامەکەش دروستبوونی دۆخی تۆقینێکی سەرانسەری بوو و لە ساڵی ١٨٩٣دا هەموو گەلی ئەمریکای گرتەوە. هاوولاتیی ئاسایی تۆباڵی دۆخەکەی دەخستە ئەستۆی حکوومەتەوە.

لە ساڵی ١٨٩٩دا لە ئینگلترا کۆنگرەیەکی گەورەی خاوەن بانکەکانی جیهان بەڕێوەچوو، ئەمریکا بە دوو نوێنەر بەشداریکرد، ئەوانیش (جی. بی. مۆرگان) و ( ئەنتۆنی دریکسیل) بوون.. کاتێك گەڕانەوە ئەمریکا دەستگەی ڕۆچیڵد ئەرکی نوێنەرایەتیکردن و بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییەکانی خستە سەرشانی مۆرگانەوە.. کاتێکیش مۆرگانیش توانی هەندێك چەکی کۆن و لەکارکەوتوو بفرۆشێتە حکوومەتی ئەمریکا، لە پۆستەکەیدا کارامەیی و شارەزایی خۆی سەلماند.

ئەو دەرئەنجامەی لە کۆنگرەی لەندەندا هاتە ئاراوە، دروستکردن و دامەزراندنی قۆرغکردنێکی جیهانی بوو و ئەم دەستگەیانەی لەخۆ گرت: (جی. بی. مۆرگان) و هاوبەشانی لە نیویۆرك، ( دریکسیل) و هاوبەشانی لە فیلادلفیا، (گرنفیل) و هاوبەشانی لە لەندەن، (مۆرگان

هارگیس) و هاوبەشانی لە پاریس، دەستگەی نێم، نێم واربۆرگ لە ئەڵمانیا و ئەمستردام.. دەستگەی سەرپەرشتیاری ئەو قۆرغکراییەش بنەماڵەی رۆچیڵد بوو.

مۆرگان و دریکسیل یەکیان گرت و لە ساڵی ۱۹۰۱دا دەستەی دەستەبەرییەکانی باکووریان پێکهێنا، ئامانجیش لەو دەستەیە مایەپووچکردنی کۆمپانیای هاینز- مۆرس بوو..کۆمپانیای هاینز – مۆرس چەند کەرتێکی گرنگی وەك پارەگۆڕینەوە و بارکردن و دروستکردنی پۆلا و چەند پیشەسازییەکی دیکەی کۆنترۆڵ کردبوو.. بۆیێ دەبوایە مایەپووچی بکەن و لە بازارەکانی ئەمریکی وەدەری بنێن، بۆ ئەوەی دەستگەی مۆرگان-دریکسیل بتوانێ هەڵبژاردنە فیدراڵییەکان کۆنترۆڵ بکات.

دەستگەی مۆرگان- دریکسیل لە ساڵی ۱۹۰۱دا توانی ( تیۆدۆر رۆزفلت) بگەیەنێتە سەرۆکایەتیی کۆمار. هەر ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی دادگە حوکم و بریاری سزادانیان دوابخات، چونکە پێشتر بەوە تۆمەتبارکرابوون بۆ پاکتاوکردن و لەنێوبردنی نەیارەکانیان هۆکاری ناڕەوایان بەکارهێناوە ..هەنگاوی دواتر بەستنەوەی دەستگەی مۆرگان-دریکسیلی بوو بە دەستگەی کۆهن-لوب.. ئەم دوو دەستگەیە ئەزموونێکی هاوبەشیان بەڕێوەبرد بۆئەوەی بزانن هێزیان چەندە.. ئەزموونە نوێیەکەش کارەساتێکی نوێی ئابووری بوو.. چونکە هەردوو رێکخراو لە ساڵی ۱۹۰۷ پیلانی تۆقاندنی وول ستریتیان بەڕێوەبرد، کاردانەوەی میللیی لەهەنبەر رەفتار و ئامرازی ئەو چەتانە، بەسبوو بۆ ئەوەی حکوومەت دنە بدات هەندێك رێوشوێن بگرێتە بەر.

حکوومەت لیژنەیەکی تایبەتی بەناوی (لیژنەی دراوی نیشتمانی) پێکهێنا و سەرۆکایەتیی لیژنەکەش خرایە سەرشانی ( نیلسۆن ئەلدریك).. دواتر ڕوونبوویەوە ئەلدریکیش سەروسەودا و پێوەندی لەگەڵ فۆرغکارییەکانی لاستیك و تووتندا هەیە.. ئەلدریك دوا کەس بوو لە کۆنگریسدا ئەو ئەرکەی بخرێتە سەرشان.. جا لەکاتی ئامادەبوونیان لە ئەورووپادا، چەندان ئاسانکاریی پێویستیان بۆ ڕێکخرا بۆ ئەوەی تاوتوێی ئەو ڕێگەیانە بکرێ کە خاوەن بانکەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی ئابووریی ولاتان دەیگرنەبەر.

ئەلدریك دوو ساڵ لە ئەورووپا مایەوە، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا ٣٠٠ هەزار دۆلاری گەلی ئەمریکای خەرجکرد و دواتریش گەڕایەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان.. تاکە دەستکەوتێکی گەلیش لەمەدا لێدوانەکەی ئەلدریك بوو کە گوتی: نەیتوانیوە بگاتە هیچ پلانێکی دیاریکراو ڕێگە لە دووبارە بوونەوەی ئەو قەیرانە داراییانە بگرێ کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی کردبووە پووشی بەردەم ڕەشەبا و بێکاریی تیادا بلاوکردبوویەوە و ببووە هۆی بەفیڕۆدانی سەروەت و سەرمایەی بچووك.

ئەلدریك سەردەمی جەنگی نێوخۆی ئەمریکاوە لە خانەوادەی ڕۆکفلەر نزیك بوو، تەنانەت گەنجێکی بنەماڵەی ڕۆکفلەر کچەکەی خواست.. پێش ئەوەی ئەلدریك بەرەو ئەورووپا سەفەر بکات ئامۆژگارییان کرد ڕاوێژ بە پۆل واربۆرگ بکات کە لە ساڵی ١٩٠٢ وەك کۆچبەرێکی ئەڵمانیا لە ئەمریکا نیشتەجێ ببوو، دواتر ڕوونبوویەوە ناوبراو لە هامبۆرگ و ئەمستردام ئەندامێکی دەستگەی م. م. واربۆرگی دارایی ئەورووپی بووە.. ئەم دەستگەیە –وەك پێشتر تیشکمان خستە

سەری- سەر بە کۆمەڵەی ڕۆچیلد بوو.. لە ماوەیەکی زۆر کورتدا توانی پشکێك لە دەستگەی کوهن-لۆب و هاوبەشانی لە نیویۆرکدا بکڕێ و بەبەهای نیو ملیۆن دۆلاری ساڵانە مووچەیەکی بۆ بڕابوویەوە.. هەروەها لە هاوبەشە نوێیەکانی نێو دەستگەی یەعقووب شیف بوو، ئەم یەعقووب شیفە لە ساڵی ١٨٨٢-١٩١٧ پارەی بۆ بزووتنەوە تیرۆرستییەکانی نێو ڕووسیا تەرخان کردبوو.

شیف بەتەواوی دەستی بەسەر چالاکییەکانی گواستنەوە و گەیاندن و هێڵەکانی گەیاندنی کۆمەك و یارمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا گرتبوو.. سەلماندیشی کۆنترۆڵکردنی ئەو پێگە و بوارانە بۆ سەرکەوتنی هەر بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی لە هەر وڵاتێکدا لە پێویستییە زۆر گرنگەکانە و دەبێ ڕەچاو بکرێ.

لە شەوی ٢٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٠دا فارگۆنێکی تایبەتی هێڵی ئاسنین لە وێستگەی هۆبوکنی نیوجرسی چاوەڕوان بوو.. سیناتۆر ئەلدریك و ئەی بیات ئەندرۆزی شارەزای بواری ئابووری و یەکێك لە گەورە کارمەندانی وەزارەتی دارایی گەیشتنە ئەوێ، ناوبراو لە ئەورووپا خوێندبووەی. هەروەها (شیلتۆن)ی سکرتێری تایبەتی ئەلدریك و (فرانك فاندەرلیپ)ی سەرۆکی بانکی نیشتمانیی نیویۆرکیش گەیشتە شوێنەکە.. خودی ئەو بانکەش لە هێڵی ئاسنیندا نوێنەری بەرژەوەندییەکانی ئال ڕۆکفلەر و کۆمپانیای کوهین- لۆب بوو.. بەڕێوەبەرانی ئەو بانکە بە هەوڵی هەڵگیرساندنی جەنگی ساڵی ١٨٩٨ ی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئیسپانیا بە ئاشکرا تۆمەتبار کران. جا بەبێ ڕەچاوکردنی دروستی و نادروستیی ئەم تۆمەتانە، ئەو بانکە

لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگ، لە کوبادا دەستی بەسەر کشتوکاڵی قامیشی شەکر و دروستکردنی شەکردا گرت.

چەند کەسێکی دیکەش لەوانەی تەفلی کۆبوونەوەکە ببوون ( ر. ب. دافیسۆن)ی پشکداری نێو کۆمپانیای مۆرگان و (چارل د. نۆرتۆن)ی سەرۆکی بانکی نیشتمانیی نیویۆرکی سەر بە کۆمپانیای مۆرگان بوون.. ئەو سێ کەسە بە هەوڵی کۆنترۆلکردنی دراو و ژمێریاریی سەرانسەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تۆمەتبار کرابوون.

دوو کەسی دیکەش لە کۆتاییدا گەیشتن، ئەوانیش: پۆل واربۆرگ و بنجامین سترۆنا بوون.. واربۆرگ زۆر دەوڵەمەند و هەژموونداربوو، دەڵێن گوایە ئەو لە پشت شانۆگەرییە کۆمیدییەکەی (ئانیی هەتیو)دا بوو کە بنەماڵەی واربۆرکی بە دەوڵەمەندترین پیاوانی جیهان داناوە و دەتوانن بە هۆکاری سەرتاسا پارێزگەری لە خۆیان و بەرژەوەندییەکانیان بکەن.. بنجامین سترۆناش بەو مانۆڕە داراییانە ناسرابوو کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانە گەورەکەی ساڵی ۱۹۰۷. سترۆنا یەکێك بوو لە گەورە جێبەجێکارانی کۆمپانیای ج. ب. مۆرگان، ناوبراو لە پۆستەکەی خۆیدا کە بەسێکی شارەزای بواری جێبەجێکردنی کار و فەرمانەکان ناسرابوو و بەبێ هیچ گفتوگۆ و ڕەتکردنەوەیەك گوێڕایەڵی کەسانی سەرووی خۆی بوو و وەك سەربازێکی بە وەفا بەبێ هیچ گفتوگۆیەك کارەکانی جێبەجێ دەکرد.

هەواڵنێری ڕۆژنامەکان بە کۆبوونەوەی ئەو پیاوانەیان زانیبوو کە کۆنترۆڵی سێکتەرە مەزنەکانی ئابووریی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان کردووە، بۆیێ وەك مێش و مەگەز ڕوویان لە فارگۆنە

تایبەتەکە کرد.. بەلام لێدوانی هیچ کام لە کەسەکانی نێو کۆبوونەوەکەیان دەست نەکەوت.. دواتریش بەرێز فاندەرلیب ئەرکی لەکۆڵ خۆکردنەوەی هەواڵنێرەکانی گرتە ئەستۆ و گوتی: ئێمە هەموومان بەرەو بەسەربردنی پشوویەکی هێمنی کۆتایی هەفتە دەچین.

دوای چەندان ساڵ ئەوجا زانرا چی لەو پشووەی کۆتایی هەفتەیە ڕووی داوە.. ڕووداوەکە بەمجۆرە بووە: لە دوورگەی جیکیلی جۆرجیا کۆبوونەوەیەکی نهێنی بەڕێوەچووە.. ئەو شوێنەش بارەگەیەکی دوورەدەست و موڵکی ج. ب. مۆرگان و چەند هاوبەشێکی دیکەی بوو.. ئەوەی لەو کۆبوونەوەیەدا باسی لێوەکرابوو، تاوتوێکردنی ڕێگە و ئامرازە بەردەستانەکانی وێرانکردن و ڕێگەگرتن بوو لەو پڕۆژە یاسایانەی دەخرێنە بەردەم کۆنگرێسەوە و ئامانجیان کەمکردنەوەی دەستەڵاتی قۆرغکاریی و دانانی ئاستێکە بۆ مانۆڕەکان و دانانی چەند پڕۆژە یاسایەکی دیکە لە شوێنی ئەو پرۆژانە بەو مەرجەی لە بەرژەوەندیی ئەندامانی نێو کۆبوونەوەکەدا بێت.

دوای ئەو کۆبوونەوەیە، لە نیویۆرک چەندان کۆبوونەوەی دیکە بەڕێوەچوون.. هەمان ئەو پیاوانەی پێشتر لێیان دواین بەڕێوەیان بردبوو، کۆبوونەکانیش لەپێناو باسکردن و بڕیاردان بوو لەسەر چەند وردەکارییەك.. پیلانگێڕەکان ناویان لە کۆمەڵەکەی خۆیان نا یانەی ناوی یەکەم، چونکە لەمیانی کۆبوونەوەکانیاندا تەنیا ناوی یەکەمی یەکتریان دەهێنا.. بەکورتیش ئەلدریك و واربۆرگ و هاوبەشەکانی چەند پڕۆژە یاسایەکی نوێیان ئامادە کرد و دواتر خرایە بەردەم کۆنگرێسەوە، لیژنەی پێکهێنراو بە سەرۆکایەتیی ئەلدریك لەژێر

ناونیشانی چەند پێشنیازێکەوە خستیانە بەردەم کۆنگرێس.. ئەم پرۆژە یاسایانە لە ساڵی ١٩١٣دا لەژێر ناونیشانی یاسای یەدەگی فیدراڵیی ساڵی ١٩١٣ دەنگیان لەسەر درا و زۆرینەی هاووڵاتیانی ئاسایی باوەڕیان وابوو ئەو پرۆژە یاسایانە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان دانراوە و ئابووریی گەلی خستووەتە نێو دەستی حکومەتەوە.

ئەمەیش تەواو دوورە لە ڕاستی.. ئەو یاسایانە ڕێگەیان بە خاوەن بانکەکانی ئەورووپا و ئەمریکا دەدا دەست بەسەر توانا و سێکتەرە داراییەکانی هەردوو کیشوەردا بگرن، ئەمەیش ڕێگەی بۆ خۆشکردن ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی خۆش بکەن کە تاکە ئامرازی سەرهەڵدانی شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ی ڕووسیا بوو.

ئۆرگانی یەدەگی فیدراڵی لە ساڵی ١٩١٤دا لە ١٢ بانك پێکهاتبوو، بە ١٣٤ ملیۆن دۆلار قەواڵە و کۆمپیاڵەکانی یەدەگی فیدراڵییان کڕی.. ڕاپۆرتەکەی کۆنگرێس لە ڕێکەوتی ٢٩/٥/ ١٩٤٦دا ئاماژە بەوە دەکات یەدەگی فیدراڵی گەیشتووەتە ٥ ملیۆن دۆلار.. هەروەها لە ساڵی ١٩٤٦دا گەیشتووەتە ٤٥ ملیۆن دۆلار. بەمشێوەیە دەبینین خاوەن بانکەکان لە کردە داراییەکانی سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا نزیکەی ٤٠ ملیۆن دۆلاریان وەدەستهێناوە.

زۆرینەی هاووڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکان وادەزانن ئۆرگانی یەدەگی فیدراڵی سوود بە هەموو گەل دەگەیەنێ، پێشیان وایە پارێزگەری لە بەرژەوەندیی ئەو کەسانە دەکات کە پارە لە بانکەکان دادەنێن، چونکە هەرگیز لێناگەڕێ ئەو بانکانە مایەپووچ ببن.. هەروەها لەو باوەڕەدان قازانجەکانی یەدەگەکە دەچێتەوە خەزێنە..

بەلام ئەمریکییەکان لەمەدا بەهەڵەدا چوون، ڕاستە ئۆرگانی یەدەگی فیدراڵی لە بنەڕەتەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئەمریکییەکان دامەزراوە، بەلام ئەو پرۆژە یاسایانەی لە ساڵی ١٩١٠ لە دوورگەی جیکیلی جۆرجیا دانراون و کۆنگریسی ئەمریکی لە ساڵی ١٩١٣دا دەنگی لەسەر داون و پەسندی کردوون، لە بەرژەوەندی گشت گەلی ئەمریکیدا نەبوون، بەڵکو لە بەرژەوەندیی چەند خاوەن بانکێکی ئەمریکیی بوون، ئەوانیش پێوەندییان لەگەڵ ئەو لایەنە ئەورووپیانەدا هەیە کە بەردەوام لە هەوڵی کۆنترۆلکردنی جیهاندان.

ئامارەکان دەری دەخەن لەو کاتەی ئەم پرۆژە یاسایە لە ساڵی ١٩١٣دا تێپەڕێندراوە، لە ئەمریکا زیاتر لە ١٤,٠٠٠ بانك مایەپووچ بوون، ئەمەیش بووەتە هۆی ئەوەی ملیۆنان ملیۆن دۆلاری ئەو کەسانە لەنێو بچێ کە پارەیان لەو بانکانەدا سپاردووە.

## بەشی حەوتەم

# ڕووداوەکانی پێش شۆڕشی ڕووسی

هێرشەکەی ساڵی ١٨١٢ی ناپلیۆن بۆ سەر ڕووسیا وەك زەمین لەرزەیەکی تۆقێنەر ڕووسیای هەژاند، ئیدی دوای ئەم هێرشە ئەو وڵاتە وەك جاران نەمایەوە، بەڵکو برینێکی سارێژ نەبووی لە جەستەیدا دروستبوو.. قەیسەر ئەلیکساندەری یەکەم ئەرکی دووبارە ڕێکخستنەوەی وڵاتەکەی گرتە ئەستۆ، بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجەش، چەند یاسایەکی دەرکرد و ئەو بەند و یاسا نادادپەروەرانەی ڕەتکردنەوە کەوا لە ساڵی ١٧٧٢ بەسەر جوولەکەکانی ئەوێ سەپێندرابوون و تایبەت بوون بە نیشتەجێکردنیان لە چەند شوێنێکی دیاریکراو. هەروەها قەیسەر هەوڵێکی تاقەتپڕووکێنی دا بۆ ئەوەی وەها لە جوولەکەکان بکات لە کشتوکاڵ و چەندان کایەی دیکەدا کار بکەن و هانی دان بەتەواوی تێکەڵی جڤاکی ڕووسی ببن.

ئەسکەندەری یەکەم لە ساڵی ١٨٥٢ مرد، نیکۆلای یەکەم جێگەی گرتەوە، بەڵام ناوبراو بەو دزە کردنە خێرایەی جوولەکە بۆ نێو ئابووریی ڕووسیا ڕازی نەبوو، حکوومەتەکەشی لەهەنبەر ئەو پێداگرییە ئاسوودە نەبوو کە جوولەکەکان لەپێناو پاراستنی کەلتوور و زمان و پۆشاکی تایبەت بە خۆیان دەیاننواند.

بەمشێوەیە و وەك هەوڵێكی ناوبراو بۆ تواندنەوەی ڕەگەز و نەژادی جوولەكە لەنێو جڤاكی ڕووسیدا نیكۆلای یەكەم لە ساڵی ١٨٣٤دا چەند یاسایەكی دەركرد، سەرجەم یاسایەكانیش جوولەكەكانیان ناچار دەكرد منداڵانیان بنێرنە خوێندنگە حكوومییەكانەوە، ئەمەیش بۆ سڕینەوەی ئەو چەوساندنەوە ئایینییە بوو كە هەر لە سەردەمی منداڵییەوە بەگوێیاندا دەچرپێندرێ.

بەڵام دەرئەنجامەكە تەواو پێچەوانە كەوتەوە، چونكە فێربوون بۆ منداڵانی جوولەكە بووە خوێندنی بەزۆر، بەڵام بۆ منداڵانی ڕووسیی ناجوولەكە بەزۆر نەبوو، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی جوولەكەكانی ڕووسیا لە هەموو گەل و پێكهاتەیەكی دیكە ڕۆشنبیرتر بن!

قەیسەر ئەلیكساندەری دووەم لە ساڵی ١٨٨٥دا عەرشی ڕووسیای وەدەستهێنا، ناوبراو ئەو كەسەیە كە بنجامین دزرائیلی بە لێبوردەترین پاشای ڕووسیای لە قەڵەم دابوو.. ئەلیكساندەر ژیانی خۆی بۆ چاكتركردنی بارودۆخی ژیانی جووتیاران و چینی زەحمەتكێش و جووەكان تەرخان كردبوو. لە ساڵی ١٨٦١دا (٢٣) ملیۆن كۆیلەی ئازاد كرد.. ئەو ژمارە زۆرەش كۆیلەی تەواو بوون و گشت تایبەتمەندییەكانی كۆیلەیەتییان بەسەردا بڕابوو، كردەكانی كڕین و فرۆشتنی زەوی و زارەكان بەسەریاندا دەچەسپا و لە سەروەرێكەوە دەفرۆشرانە سەروەرێكی دیكە.

زۆرێك لە جووەكان چوونە زانكۆی جۆراوجۆر، بەڵام دوای دەرچوونییان ڕووبەڕووی تەنگوچەڵەمە و گرفتی توند دەبوونەوە.. جا بۆ سڕینەوەی ئەو نادادپەروەری و ستەمە، قەیسەر فەرمانی دەركرد جووەكان لە پۆست و كاروبارەكانی نێو حكوومەتدا وەربگیرێن و

ڕێگەشیان پێ بدرێ لە هەر شوێنێکی ڕووسیا بیانەوێ نیشتەجێ بن.. لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٨٧٩شدا جووەکان دکتۆر و پەرستار و دکتۆری ددان و پیاوانی کار و پیشەکانیان لێ هەڵکەوت، ڕێگەشیان پێ درابوو لە هەر شوێنێکی ڕووسیا بە ئارەزووی خۆیان نیشتەجێ بن.

لەگەڵ ئەمەیشدا، سەرکردە جووەکانی بزووتنەوەی شۆڕشی جیهانی لەسەر ئامادەکاری بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی جیهانی بەردەوام بوون.. کۆمەڵە و گرووپە تیرۆرستییەکەیان قەسابخانە دوای قەسابخانەیان دەنایەوە و تێدەکۆشان پاڵپشتی ئەو ڕۆشنبیرانەی ڕووسیا وەدەستبێنن کە ئەوانیان ڕەت دەکردەوە، لەلایەکی دیکە هەوڵی بەردەوامیان دەدا بیرۆکەی یاخیبوون و شۆڕش بخەنە مێشکی جەماوەری کارگەرەوە.. لە ساڵی ١٨٦٦دا یەکەمین هەوڵی تیرۆرکردنی قەیسەر ئەلیکساندەری دووەمیان خستە گەڕ، بەلام ناوبراو بە موعجیزە لە هەردوو هەوڵ و پیلانی کوشتنەکەدا بە سەلامەتی دەرچوو.. جووەکان دەستبەردار نەبوون و ئەمجارە لە ساڵی ١٨٨١دا لەماڵێکی جوولەکە بە ناوی هسیا هلفمان لە هەوڵی سێیەمی تیرۆرکردنیدا ئەلیکساندەریان لەنێوبرد.

ئەوجا لەو کاتەی هێزە شۆڕشگێڕەکان لە نێوەخۆدا بە گشت ئامراز و هۆکارێکی ڕێتێچوو حکوومەتی ڕووسییان ڕووگیر دەکرد، هێزە نهێنییەکان لە مەڵبەند و پێگەکانی خۆیاندا لە ئینگلترا و سویسرا و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا تێدەکۆشان ڕووسیا لە جەنگی بریتانی تێوەبگلێنن، چونکە لە جەنگێکی وەهادا هیچ کام لەو دوو ئیمپراتۆریایە نەیاندەتوانی هیچ دەستکەوتێکی بەرچاو وەدەستبێنن.. دەرئەنجامەکەشی ئەوە دەبێت هەردوو وڵات لە ڕووی مادییەوە لاواز

دەبن و دەبنە نێچیرێکی ساناى پیلان و چالاکییەکانی داهاتووى شۆڕش.

پرۆفیسۆر گۆلدوین سمیسی مامۆستاى مێژووى هاوچەرخ لە زانکۆى ئۆکسفۆرد لە ژمارەى تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٨١ ى گۆڤارى سەدەى نۆزدەیەمدا، نووسیویەتی: من دواجار کە لە ئینگلترا بووم، لەسەر لێوارى جەنگی دژ بە ڕووسیا بووین.. جەنگەکەش سەرانسەرى ئیمپراتۆریایەکەى تێوەگلاند.. بەرژەوەندییەکانی جوولەکە لە ئەورووپادا واى دەخواست ڕۆژنامەى ڤییەننا وەك هۆکارێك بەکاربێنێ، گۆڤارەکەش ئەوپەڕى هەوڵی خۆى خستبووە گەڕ و دنەى دەداین بچینە نێو جەنگەکەوە.

تیرۆرکردنی باباى بچکۆلەى ڕووسییەکان (قەیسەرى ڕووسی) بووە هۆى تووڕەبوونێکی بەرفراوان، لە زۆر شوێنی ڕووسیادا دژ بە دانیشتووانی جوولەکە کارى توندوتیژى کران.. حکوومەتی ڕووسیش بۆ ڕازیکردنی دڵی کەسە ڕەسمییەکانی ڕووس یاسایە توندوتیژەکانی ئایارى خستە وارى کرداریییەوە، ئەو کەسانە گوتبوویان: ئەگەر سیاسەتە نەرم و لێبوردەکەى ئەلیکساندەرى دووەم بۆ ڕازیکردن و هێنانەکایەى بەرژەوەندییەکانی جوولەکە بەس نەبووە، ئیدى لەمڕۆ بەدواوە جگە لە کۆنترۆڵکردنی تەواوى ڕووسیا هیچ شتێکی دیکە ڕازییان ناکات.. بەمشێوەیە و بۆ جارى دووەم گەلی جوولەکە بوونە قوربانیی ئەو تاوانکارانەى خۆیان وەك ڕێبەرانی جوو ناساندبوو.

شاندێکی جوولەکە بە سەرۆکایەتیی بارۆن گینزبێرگ لە ٢٣ى ئایارى ساڵی ١٨٨٢دا داواى بینینی قەیسەر ئەلیکساندەرى سێیەمیان کردبوو بۆ ئەوەى لەهەنبەر یاسایەکاندا ناڕەزایی دەربڕن..

قەیسەریش بەڵێنی پێڕەوکردنی ڕێکارێکی سەرانسەری دابوو لە مەسەلەکەدا، بەتایبەتیش ئەوەی پێوەندیی بە قەیرانی نێوان جوولەکە و نا جوولەکەکانی نێو ئیمپراتۆریای ڕووسیاوە هەیە.. لە سێی ئەیلوولدا ئەم ڕاگەیەندراوەی بڵاوکردەوە: ماوەیەکە حکوومەت ئەوپەڕی گرنگیی خۆی بە جوولەکە و گرفتەکانیان داوە، هەروەها ڕەچاوی دۆخە ترازیدییەکەی دانیشتووانە گەشەسەندووەکەی مەسیحییەکانی کردووە کە بەهۆی مەسەلە پێڕەوکراوەکانی نێو کار و دارایی جووەکانەوە دووچاری بوونەتەوە.. لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا جووەکان هەر تەنیا بە کۆنترۆڵکردنی بازرگانییەکان و گشت کاروبارەکان دەستیان هەڵنەگرتووە، بەڵکو زەوییەکی زۆریشیان لێیان کڕیوە و کێڵانی بەشێکی زۆری زەوییەکانیشیان خستووەتە ژێر دەستی خۆیانەوە... ژمارەیەکی کەمی جووەکان نەبێت، بەشی هەرە زۆریان بەشێوەیەکی گشتی نەك هەر هەوڵی خۆیان بۆ دەوڵەمەندبوون و سوودگەیاندن بە حکوومەت تەرخان نەکردووە، بەڵکو بە فروفێڵە پێچاوپێچەکانیان گەلی ڕووسیشیان لەخشتە بردووە.. خەڵکی هەژار لە دەست ئەم ڕەفتارەیان کەوتوونەتە نێو چەرمەسەری و نەهامەتییەوە، ناڕەزایی هاووڵاتیان گەیشتووەتە ئاستێکی بەرز، ئەمەیش لەو کارە توندوتیژانەدا بەدیارکەوتووە کە گەل دژ بە جوولەکە نواندوویانە.. حکوومەت هەوڵی بێ وچانی خستە گەڕ جووەکان لە چەوسانەوە و قەسابخانە خوێناوییەکان ڕزگار بکات، بەڵام لەژێر گوشارێکی زۆر گەورەدا تەنیا ئەوەی لەدەست دێ چەند یاسایەکی توندوتیژ پێڕەو بکات، بۆئەوەی گەل لە دەست چەوسانەوە و کارە بەدخوازەکانی جوولەکە بهێنێتە دەرەوە.

پەسندکردنی یاسایەکانی ئایار هەر تەنیا تۆڵەی کوژرانی قەیسەر ئەلیکساندەری دووەم نییە، بەڵکو دەرئەنجامی ئاگادارکردنەوەی حکومەتی ڕووسییە لەلایەن کەسانی بواری ئابوورییەوە، ئامانجیش لەو ئاگادارکردنەوەیە دانانی سنوورێکە بۆ چالاکییە ناڕەوایەکانی جوولەکان، چونکە هەڕەشەی وێرانکردنی ڕووسیا دەکەن، گەرچی ئەوان ٤,٢٪ دانیشتووانی ئیمپراتۆریایەکە پێکدەهێنن.

تیۆدۆر هێرتزل جوولەکەی ئەڵمانی کاتێک سیاسەتە ناسامییەکانی کارل ڕیتەری بە جووەکان ڕادەگەیاند، گومانی بەنێو جووەکاندا بلاو دەکردەوە و دەیگوت بەخێرایی بەنێو گەلی ئەڵمانیدا بلاو دەبێتەوە..هێرتزل پێشنیازی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی جوولەکەی کرد بەناوی ( بزووتنەوەی گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل بەناوی پارێزگەرانی جوولەکە).. ئەمەیش سەرەتای سەرهەڵدانی بزاڤی زایۆنیزم بوو.

دوای ئەوەی قەیسەر ئەلیکساندەری سێیەم حکومی خۆی بۆ سەرزەنشتکردنی جوولەکە دەرکرد و بەرپرسیارییەتیی دۆخی هەراوزەنا و و بێسەروبەری و تێکدانی ئابووریی ئیمپراتۆریای خستە ئەستۆیانەوە، چەند سەرکردەیەکی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی، پارتی شۆڕشگێڕی سۆسیالستییان دامەزراند..ئەرکی ڕێکخستنی ئەو پارتەش درایە پیاوێکی توندوتیژی بێبەزەیی بەناوی گێرشۆنی.. هەروەها ڕێکخستنی کەرتە شەڕکەر و چەکدارەکەش خرایە ئەستۆی یەفنۆ ئەرنفی بەرگدروو.. سەرکردەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی جەختیان لەوە دەکردەوە و بەردەوام دەیانگوت پێویستە کەسانی نا جوولەکەش بێنە ڕیزی بزووتنەوەکەوە.

لەگەڵ دروستکردنی شپرزەیی و شلەژانی کرێکاری و هێنانەکایەی دۆخێکی خراپ لەنێو چینەکانی جڤاکی ڕووسیدا، پارتە شۆڕشگێڕەکان لەنێوان ساڵی ۱۹۰۰ و ۱۹۰٦دا گرفت و تەنگوچەڵەمەی ئایینییان دەخولقاند تا گەیاندییانە ئاستی هەڵچوون و تەقینەوە.. ترۆپکی ئەو تەنگوچەڵەمە و گرفتانەش زەمینەی هاتنە کایەی چەند ڕووداوێکی کوشتن و تیرۆرکردنی بەکۆمەڵ بوو.. لە ساڵی ۱۹۰۵دا تەقینەوەکە وەك شۆڕشێك ڕووی دا.

ئەو کەسییەتییە ڕەسمییانەی بەشی تیرۆری پارتی شۆڕشگێڕ تیرۆری کردن، بۆگۆلیبۆفی وەزیری پەروەردە بوو و لە ساڵی ۱۹۰۱دا لەنێویان برد. ئەم ڕووداوەش وەك پیشاندانی توورەیی جووەکان بووە لەهەنبەر ئەو سیاسەتە پەروەردەییەی یاسایەکانی ئایار لەخۆی گرتبوو، چونکە ژمارەی ئەو جوولەکانەی دیاری کردبوو کە ڕێگەیان پێ دەدرا بچنە خوێندنگە و زانکۆیەکانی دەوڵەتەوە.

لە ساڵی ۱۹۰۲دا سیباگینی وەزیری ناوەخۆ تیرۆر کرا، ئەمەیش دیسانەوە وەك توورەیی جوولەکە بوو لەهەنبەر یاسایەکانی ئایاردا کە نەیدەهێشت جووەکان لە دەرەوەی گەڕەك و کۆمەڵگە تایبەتەکانی خۆیاندا نیشتەجێ ببن.

لە ساڵی ۱۹۰۳دا بۆگدانۆڤیچی حاکمی یۆفا تیرۆر کرا.. لە ساڵی ۱۹۰٤ دا ڤیشیلیف ڤۆنی بیلیفی سەرۆکوەزیران کوژرا. لە ساڵی ۱۹۰۵دا یەکەمین چەخماخەی شۆڕشی گشتی لە ڕووسیا داگیرسا، دۆق سێرگیۆسی خاڵی قەیسەر لە ۱۷ ڤێبرایر کوژرا.. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۰۵دا جەنەڕاڵ دۆبراسۆ شۆڕشگێڕەکانی چەوساندەوە، بەڵام لە ساڵی ۱۹۰٦دا تیرۆریان کرد.

دوای ئـەوەی قەیـسـەر جووڵەکـەکانی سەرزەنشـتکرد و تۆبـاڵی سـەرهەڵدانی دۆخـە خراپەکـەی ڕووسـیای خسـتە ئەسـتۆیان، بـارۆن گینزبێـرگ چـەند ڕێنماییـەکی پێگەیشـت بـۆ ئـەوەی لـەپێناو هەڵوەشـاندنەوەی ئیمپراتۆریـای ڕووسـیا هـەوڵ و کۆششـی خـۆی بخانەگەڕ.. بەشێکی پیلانەکەش دروستکردنی پشێوی و بێسەروبەریی نێو ڕیزەکانی سوپای ڕووسیا بوو لە خۆرهەڵاتی دووردا بەهۆی تێکدانی هێڵەکانی هاتووچوو لـە سیبیریاوە دۆخەکەیان دروستکرد.. ئەمـەیش بووە هـۆی ئـەوەی یارمـەتی و پێداویستی نەگاتـە سـوپای وشکایی و دەریایی ڕووسیا.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەفسەرێکی دەریاوانیی ڕووسی فـەرمانی بـە کەشـتییەکانی کـرد، کەشـتیگەلێکی ڕاوچـیی بریتـانی لـە دەریـای باکووردا وەبەر گوللە بدەن.. کاردانەوەی میللیـی هەنبـەر ئـەو ڕووداوە زۆر توندوتیژ بوو، ڕووسیایان گەیاندە دۆخێکی نزیك لە مایەپووچـی.. ئابلۆقەشیان خستە سەر بازرگـانی و ئاڵوێرەکـانی ڕووسـیا.. لـە سـاڵی ١٩٠٤ و دوای تێوەگلاندنی ڕووسیا لە جەنگی هەنبەر یابان، دەسـتگەی ڕۆچیڵد بەڵێنەکانی خۆی شکاند، یارمەتیی داراییی پێشکێشـی ڕووسـیا نـەکرد، لـە هـەمان کاتیشـدا کۆمپانیـای کۆهن-لۆب و هاوبەشـانی لـە نیویۆرکدا قەرزێکی زۆریان بەخشییە یابان.

لـە چـاپی سـاڵی ١٩٤٧ و لـە بـەرگی دووەم و لاپـەڕە ٧٦ی ئینسکلۆپیدیای بریتانیدا هاتووە: وەزیری ڕووسی بۆ وەدەستهێنانی پارەوپوول ئەوپەڕی توانای خۆی خستبووە گەڕ.. حکوومەتی ڕووسـی لەگەڵ خانەوادەی ڕۆچیلد کەوتە دانوستان بۆ ئـەوەی قـەرزێکی زۆری دەستکەوێ.. هەردوو لا ڕێککەوتنامەیـەکی مەبدەئیان مۆرکرد، بـەڵام

ڕۆچیلدییەکان بە وەزیری دارایی ڕووسیایان ڕاگەیاند ئەگەر توندوتیژی و چەوساندنەوەکانی دژ بە جوولەکە ڕانەگرن، ئەوا بنەماڵەکە ناچار دەبێت لە گرێبەستەکە پاشگەز بێتەوە.. پێداویستییە بێ چەندوچۆنەکەی خەزێنەی ڕووسی یەکێك بوو لەو هۆیانەی بووە هۆی هێنانەکایەی هاوپەیمانیی فەرەنسی– ڕووسی، هەروەك چۆن پەیماننامەی بسمارك بۆ بێلایەنیی هاوبەش کۆتایی پێ هێندرا.

دەستگەی یەعقووب شێف لە نیویۆرك هەر لە ساڵی ١٨٩٧ەوە پارەوپووڵی بۆ تیرۆرستەکانی ڕووسیا دابین دەکرد.. لە ساڵی ١٩٠٤شدا پارەی بۆ ئەو شۆڕشە تەرخان کرد کە لە ساڵی دواتردا هەڵگیرسا. هەروەها پارمەتیدەری ڕێکخستنی هەڵمەتێکی جیهانی بوو بۆ ئەوەی شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ پارەی بۆ تەرخان بکرێ، ئەم شۆڕشەش یەکەمین دەرفەتی بە دەستگەی یەعقووب و هاوبەشەکانی ڕەخساند بیرۆلۆژی تایبەت بە دکتاتۆرییەت بخەنە واری کردارییەوە.

ئەلیکساندەر ئۆلیانۆف لە کودەتایەك بەشداریکرد کە ئامانجی تیرۆرکردنی قەیسەر ئەلیسکاندەری سێیەم بوو.. بەڵام کودەتایەکە شکستی هێنا، ئەلیکساندەر ئۆلیانۆف دەستگیرکرا و حوکمی کوشتنی بەسەردا درا..ئەمەیش هۆیەك بوو بۆ ئەوەی ڤلادیمێری برای خۆی بۆ پرسی شۆڕ تەرخان بکات، ناوبراو بووە ئەستێرەیەکی درەوشاوە و لە توندوتیژی و دەستهەڵاتدا پێگەیەکی بەرزی داگیرکرد، تا بووە سەرۆکی پارتی بەلشەفی، ناویشی لەخۆنا (لینین).. دواتر بووە دەستهەڵاتداری ڕەها و یەکەمی یەکییەتیی کۆمارە سۆسیالیستەکانی سۆڤییەتی.

لینین لە زانکۆ خوێندبووی.. خوێندکارانی جوولەکە باوەڕیان پێی هێنابوو کاتی ئەوە هاتووە تەختی چینی دەستەلاتدار ژێر و ژوور بکات بۆ ئەوەی جەماوەر خۆی حوکمی خۆی بکات.

لینین وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاسمانی ڕۆشنبیرە بیرمەندەکان درەوشایەوە، کاتێکیش تەمەنی سی ساڵ دەبێت دەچێتە ریزی پارتی شۆڕشگێڕەوە.. لینین لە ساڵی ١٨٩٥دا دەچێتە سویسرا، ئەو کات تەمەنی ٢٥ ساڵ دەبێت، بۆ ئەوەی بلیخانۆف ببینێ کە لە ڕووسیا هەڵاتبوو.

لینین و بیلخانۆفی ناجوولەکە لە سویسرادا چوونە ریزی ڤیرازاسۆلیچ و ب. ئەکسلرۆد و تەمووزس تسدیرباوم، ئەوانەش هەر هەموویان جوولەکە بوون، کۆمەڵەیەکی مارکسییان بەشێوەیەکی جیهانی پێکهێنا و ناویان لێ نا کۆمەڵەی ڕزگارکردنی کرێکاران.

هەوڵە شۆڕشگێڕییە لەبارچووەکەی ساڵی ١٩٠٥ باوەڕیان بە لینین هێنا تاکە ڕێگەی سەرهەڵدانی شۆڕشێکی سەرکەوتوو، ڕێکخستنی لیژنەیەکی نێودەوڵەتییە بۆ ئەوەی ئەرکی ئامادەکردنی پلانێك بگرێتە ئەستۆ.. بەمشێوەیە لینین کۆمنترنی دامەزراند، ئەمەیش لیژنەیەکی مەرکەزیی نێودەوڵەتییە بۆ پیلاندانانی شۆڕشگێڕانە.

دوای ئەوەی ڕا و بۆچوونی لینین لەسەر سیاسەتە تایبەتەکانی جێگیر بوو، لەگەڵ مارتۆف گەڕانەوە ڕووسیا بۆ ئەوەی هەڵمەتێکی پارەکۆکردنەوە ڕێکبخەن، ئەو هەڵمەتەش پێکهاتبوو لە کردەکانی هەڕەشە و دزینی پارەی نێو بانکەکان و چەندان کاری دیکەی ناڕەوا.. لینین پاساوێکی بۆ ئەمە هەبوو و دەیگوت: زۆر لۆژیکییە پارەی ئەو خەڵکە ببردرێ کەوا بۆ سەرنگونکردنی حکوومەتەکەیان هەوڵ خراوەتە

گەڕ.. لینین سووربوو لەسەر ئەوەی یەکێك لە بەرنامەکانی مەشقکردن بە کەسانی تازە هەلکەوتووی نێو پارتەکەی چۆنییەتیی دزینی پارەی بانکەکان و تێکدان و ڕووخاندنی بنکەکانی پۆلیس و پاکتاوکردنی ناپاك و سیخوڕەکانیان بێت.

ڕاستییەکەی چەند سەرکردەیەکی یەکەمی کۆمۆنیستەکان بە چینی کرێکارانەوە پەیوەستبوون.. زۆربەشیان ڕۆشنبیری زۆر باش و هەلکەوتوو بوون.. لە ساڵی ١٨٩٥دا زنجیرەیەك ئاشووب و شپرزەییان نایەوە، هەندێك لەو ئاشووبیانە بوونە کاری تێکدەرانە.. بەمشێوەیە بنەمایەکی سەرەکیی پیلاندانانی شۆڕگێڕییان دانا بۆ ئەوەی ڕووداوە بچووکەکان بکەنە کاری تێکدەرانە و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەخۆی نێوان گەل و پۆلیس بهێننە ئاراوە.

لینین و مارتۆف و چەند شۆڕشگێڕێکی دیکە دەستگیرکران و خرانە زیندانەوە، لینین لە ساڵی ١٨٩٧ ماوەی دەستگیربوونەکەی تەواو بوو. لینین و ژنە جوولەکەکەی و دایکی چوونە دوورخراوگە.. لینین و مارتۆف و بۆتریسۆف لە ماوەی نەفیکرانەکەشیاندا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن لەدوای دوورخرانەوەیان ڕۆژنامەیەك دەربکەن، ئەو ڕۆژنامەیە کۆکەرەوەی بیرمەندان و وزە ئەقلییەکانی نێو هێزە شۆڕشگێڕەکان بێت کە تا ئەو کاتیش بەسەر چەند پارتێکی جۆراوجۆردا دابەش ببوون.

دوای ئەوەی لینین لە ساڵی ١٩٠٠دا ماوەی حوکمەکەی تەواوکرد، ڕۆژنامەی ئەبسکرا واتا (چەخماخە)ی دەرکرد.. ژنەکەی لینین سکرتێری دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە بوو.. ماوەیەك ڕۆژنامەکە لە میونخی ئەڵمانیا لە چاپ دەدرا، بەهۆی تۆڕێکی نهێنیی سەر بە

ماسۆنییەکانی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلاتەوە چەند دانەیەکی بە قاچاغ دەبردرایە رووسیا و چەند ولاتێکی دیکە.

رۆژنامەکە داوای بەرێوەچوونی کۆنگرەیەکی دەکرد بۆ ئەوەی کۆمەلە و گرووپە هەمەچەشنەکانی مارکسی یەکبخرێن و مەلبەند و پێگەی سەرەکیشیان لە برۆکسل بێت. لەو کۆنگرەیەدا دیموکراسییە سۆسیالیستەکانی رووسیا و دیموکراسییە سۆسیالیستەکانی پۆلەندای سەر بە رۆزا لۆکسمبۆرگ و کۆمەلەی رزگارکردنی کار و کۆمەلەی ماکسیمالییەکان بەشداربن.. بەلام پۆلیسی بەلجیکی چەند رێوشوێنێکی دژی گرتەبەر، ئەمەیش وای لە ئەندامان کرد بەرەو لەندەن بچن.. ئەو کۆنگرەیە گرنگییەکی مێژوویی هەیە، چونکە لەنێویدا جیابوونەوەیەکی باوەری لەنێوان نووسەرانی رۆژنامەی (چەخماخە) رووی دا، لینین بووە رێبەری کۆمەلەی بەلشەفیکی و زۆرینەیان پێکدەهێنا، مارتۆفیش بووە رێبەری کۆمەلەی مەنشەفیکی کەمینە.

مەنشەفیکییەکان لە سالی ١٩٠٥ و دوای رووداوەکانی یەکشەممەی خوێناوی کە تۆبالەکەی خرایە ئەستۆی قەیسەرەوە، لە رووسیا شۆرشەکەیان بەرپاکرد.. بەلام ئەوانەی بەدوای راستییەکاندا چووبوون، بەلگەی تەواویان دەستکەوتبوو رووداوەکە بە ئامانجی وروژاندنی تووڕەیی و رقی دژ بە قەیسەر لەنێو ریزی کرێکارانی نا جوولەکە، پێشوەخت نەخشە و پیلانی بۆ کێشراوە و لەلایەن چەند کۆمەلەیەکی تیرۆرستییەوە جێبەجێ کراوە.. ئەو رووداوە رێگەی بۆ بزووتنەوەی شۆرشگێری خۆشکرد پشت بە هەزاران ژن و پیاوی نا

جوولەکە ببەستن کە تا ئەو ڕۆژە پڕ لە کارەساتەش پشتگیری قەیسەریان دەکرد و بە باوکی بچووك ناویان دەهێنا.

لە ٢ی کانوونی دووەمدا لە کارگە زەبەلاحەکانی بۆتیلۆفی پوترسبۆرگدا چەند شڵەژانێکی کرێکاری سەریان هەڵدا و تیایدا داوای مانگرتنی گشتی کرا.. بەڵام باوکە گابوون گوتی بە گفتوگۆی ڕاستەخۆ لەگەڵ قەیسەر گرفتەکان چارە دەکات.. لە ڕۆژی یەکشەممەی ٢٢ی کانوونی دووەمدا باوکە گابۆن ڕێپێوانێکی گەورە و ئاشتییانەی ڕێکخست، تیایدا هەزاران کرێکار بە ژن و منداڵەکانیانەوە بەشداربوون.. ڕێپێوانەکە بەرەو دەرگە و دەروازەکانی قەیسەر ملی نا.. بەپێی چەند ڕاپۆرتێکی ڕاست و دروست ڕێپێوانەکە زۆر ڕێکوپێك و سیستماتیك بوو.. بەشدارانی ڕێپێوانەکە چەند لافیتەیەکیان هەڵگرتبوو کە دروشمی پشتگیریکردنی قەیسەریان لەسەر نووسرابوو.. لەبەردەم دەروازەکانی کۆشکەکەدا و بەبێ هیچ جۆرە هۆشداری و ئاگادارییەکی پێشوەختە، چەند دەستدرێژێکی چڕی گوللە کران و وەك داس کرێکارانیان دوورییەوە و ئاشووب و هەراوزەنا لەنێو ڕێپێوانەکەدا پەیدابوو.. سەتان کرێکار لەگەڵ خانەوادەکانیان خەڵتانی خوێن کران و گۆڕەپانی بەردەم کۆشکەکە ئاشووبێکی گەورە و ترازیدی تێکەوت.. لەو ڕۆژییەوە ئەو ڕووداوە بە (٢٢)ی کانوونی دووەمی خوێناوی ناسراوە.. نیکۆلای دووەم بەرپرسی دۆخەکە بوو.. ئەو کات نەك هەر لەنێو کۆشکەکەدا، بەڵکو لە شارەکەشدا نەبووە.. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو ئەفسەرێکی پاسەوان فەرمانی تەقەکردنی بە سەربازەکان دابوو.. ڕێشی تێدەچێ ئەو ئەفسەرە فەرمانی سەرۆکە تیرۆستەکانی خۆی جێبەجێ کردبێ.. ئەو کردەوەیە وەك چەخماخەی بزوێنەری

داینەمۆ بوو، دوای ئەمەش گڕی ئاگری شۆڕش گشت شوێنێکی گرتەوە.

بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کێ بەرپرسی ئەو ڕووداوە بووە، دەرئەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی دەیان هەزار لەو کرێکارانەی پشتگیری قەیسەریان دەکرد بچنە ڕیزی پارتی سۆسیالستیی شۆڕشگێڕییەوە و ئاگرەکە شارەکانی دیکەشی گرتەوە.. قەیسەر ویستی شۆڕشەکە کپ بکات، لە سەرەتای مانگی شوباتەوە فەرمانی کرد لەلایەن لیژنەی شیدلۆفسکییەوە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە بکرێ.. لە مانگی ئابدا ڕایگەیاند ئامادەکارییەکان بۆ پێکهێنانی ئەنجوومەنێکی نوێنەرایەتیی یاسادانانی دیموکراسییانە بەردەوامن، دواتر ئەو ئەنجوومەنە بە (دۆما) ناسرا.. پێشنیاز کرا لێبوردنێکی سەرانسەری بۆ زیندانە سیاسییەکان دەربکرێ.. لەژێر کاریگەریی ئەو لێبوردنەشەوە، لینین و بەلشەفیکییەکان لە تشرینی یەکەمدا گەڕانەوە ڕووسیا.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەوڵ و کۆششەوە قەیسەر نەیتوانی ڕێگە لە فراوانبوونی پانتایی شۆڕشەکە بگرێ.

یەکییەتیی کرێکارانی هێڵی ئاسنینی سەر بە مەنشەفیکەکان لە ٢٠ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٠٥دا مانگرتنی گشتییان ڕاگەیاند.. لە ٢٥ی هەمان مانگدا مانگرتنەکە فراوانبوو و مۆسکۆ و سمۆلنسک و کیرسک و چەندان وڵاتی دیکەشی گرتەوە.. لە ٢٦ی هەمان مانگدا حکوومەتی شۆڕشگێڕیی پیترسبۆرگ پێکهات.. ئەو حکوومەتە لەژێر دەستەڵات و هەژموونی مەنشەفیکەکانی نێو پارتی کاری سۆسیالیستی دیموکراتیی ڕووسیدا بوو، گەرچی پارتی سۆسیالستی نوێنەر بوو.. یەکەمین سەرۆکێکیشی مەنشەفیک سبۆردفیسک بوو. بەڵام زۆر بەخێرایی گۆڕدرا

و جۆرجی نۆساری لە شوێن دانرا. جۆرجیش لەسەر دەستی ترۆتسکی لادرا و ناوبراو لە ٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٥دا بووە سەرۆك. لە ١٦ی کانوونی یەکەمدا هێزە سەربازییەکان ترۆتسکی و ٢٠٠ ئەندامی حکوومەتە شۆڕشگێڕییەکەیان دەستگیرکرد.. لەنێو ئەو گیراوانەدا تاکە یەك بەلشەفیکی گرنگ و بەناوبانگی تیادا نەبوو.

بەڵام شۆڕش کۆتایی نەهات.. بەڵکو لە ٢٠ی کانوونی یەکەمدا جوولەکەیەك بەناوی بارفۆس دەستی بەسەر دەستهەڵاتی بەڕێوەبردنی شۆڕشی نوێدا گرت، لە پیترسبۆرگدا داوای مانگرتنێکی گشتیی کرد، ٩٠,٠٠٠ کرێکار وەڵامی داواکارییەکەیان دایەوە.. لە ڕۆژی دواتریشدا ١٥٠,٠٠٠ کرێکار لە مۆسکۆ مانیان گرت.. لە ٢٠ی دیسێمبەردا هەندێك یەکە و ئەفسەر گەڕانەوە کە هێشتا لایەنگری قەیسەر بوون و بەشێوەیەکی زۆر سەیر دەستهەڵاتیان گرتەوە دەست.. بەمشێوەیە سنوورێکیان بۆ شۆڕش دانا.. قەیسەر نیکۆلا بەڵێنەکەی خۆی گەیاندە سەر و دۆما دامەزرێندرا و ئەنجوومەنی یاسادانان هەڵبژێردرا.

لە ساڵی ١٩٠٧دا کۆنگرەی پێنجەمی پارتی کاری سۆسیالستیی دیموکراسی رووسی لە لەندەن بەڕێوەچوو.. ئەو کۆنگرەیە داوای کرد لێکۆڵینەوە سەبارەت بە لەبارچوونی شۆڕشەکە بکرێ.. لینین هۆی شکستەکەی خستە پاڵ نەبوونی هاوکاریی نێوان مەنشەفیك و ڕێبەرەکانی دیکەی شۆڕش، هەروەها داوای سیاسەت و کاری یەکگرتووانەی کرد.

مارتۆف گورزی خۆی لە لینین وەشاندەوە و بەوە تۆمەتباری کرد لە پێشکێشکردنی ئەو یارمەتییە کەمتەرخەم بووە کە بۆ سەرخستنی شۆڕشەکە پێویست بوو.. بەتایبەتیش بەوە تۆمەتباری

کرد پارمەتیی مادیی لێ بڕیون و دەستی بەسەردا گرتووە.. ئەوەی مارتۆف و ڕێبەرانی دیکەی جوولەکەی وەك ئیبراهاموّڤیچ و ڕۆزا لۆکسمبۆرگی هەراسان دەکرد، ئەوە بوو لینین توانیبووی بۆ ئامادەبوونی ئەو هەموو نوێنەرانەی کۆنگرەکە پارەوپوولی پێویست دەستەبەربکات ، بەوەش تاوانباریان کرد لە ڕێگەی دزی و تالانی و ڕفاندن و ساختەکارییەوە پارەوپوول بۆ پارتە بەلشەفیکییەکەی دابین دەکات.. هەروەها سەرکۆنەشیان کرد لەوەی ڕەتی کردووەتەوە بەشێکی بەرچاوی پارە تالانییەکانی ژێر دەستی خۆی بۆ ڕێکخراوی یەکییەتیی مەرکەزی بنووسێت.

ئەندامان و هەڵسوڕێنەرانی کۆنگرەکە لە کۆتاییدا هاوڕابوون لەسەر زەروورەتی بەرقەرارکردنی پێوەندی و هاوکارییەکی پتەوتری نێوان سەرکردە شۆڕشگێڕەکان و بڕیاریان دا ئەو کەسانە هەڵبژێرن کە ڕۆژنامەکەیان بۆ دەردەکەن، گرنگییەکی زۆریان بە پڕوپاگەندە دا، هەروەها جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کۆی ئەو بابەت و نووسینانەی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکرێنەوە دەبێ لە چوارچێوەی سیاسەتی ڕۆژنامەکە بێت، چونکە ڕۆژنامەکە بە هێڵ و ڕێبازی پارتەکە پابەندە.

بەلشەفیکییەکان لە ساڵی ١٩٠٨دا ڕۆژنامەی خۆیان بەناوی (پرۆلیتاریا) دەرکرد.. مەنشەفیکەکانیش سۆستالی دیموکراسییان دەرکرد.. ترۆتسکیش بڵاوکراوەیەکی نیمچە سەربەخۆی دەرکرد و ناوی لێنا ( پراڤدا).

لینین لە ساڵی ١٩٠٩دا پشتگیریی بێمەرجی دوو سەرکردەی جوولەکەی بەدەستهێنا، ئەوانیش زینۆڤییێڤ و کامینییێڤ بوون.. ئەوانە

بەترۆیکا واتا (سێینە یان سێکوچکە) دەناسران.. هاوڕێیەتییەکەشیان تا مردنی لینین لە ساڵی ١٩٢٤ هەر بەردەوام بوو.

لینین بڕیاری دا ئازایەتی و ئاستی متمانەکردن بە ستالینی قوتابیی نوێی تاقی بکاتەوە، هەروەها ویستیشی بە سەرکردە و ڕێبەرەکانی دیکەش پیشان بدات لە ڕووی داراییەوە سەریەخۆیە.. بۆ ڕاپەڕاندنی کارێکی وەها دووسەرەش ستالینی ڕاسپارد بانکی تیفلیس ببڕێ..ستالینیش لەو ئەرکەدا هاوبەشێکی ئەرمەنی بەناوی بترۆیان هەڵبژارد، دواتر ناوەکەی گۆڕا و بووە کامۆ.. بۆسەیەکیان بۆ گالێسکەی بانکەکە دانایەوە و بترۆیان مووشەکێکی تێگرت هەموو شتەکانی نێو گالێسکەکەی تەقاندەوە، هیچ شتێکیش بە سەلامەتی و ساغی نەمایەوە تەنیا سندووقێکی پتەو نەبێت، سندووقەکەش ٢٥٠,٠٠٠ ڕۆبڵی تیادا بوو.. لەو ڕووداوەدا ٣٠ کەس کوژران.. بەمشێوەیە ستالین توانای سەرکردەیی پێویستی سەلماند.

لە کۆتایی شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥دا، نیکۆلای دووەم دەستی بە ریفۆرمێکی ریشەیی کرد، لەسەر ئەوەش سووربوو پاشایەتیی ڕەهای ڕووسی وەك ئەوەی ئینگلیزەکان بێت و بیکاتە پاشایەتییەکی دەستووریی.. ئەنجوومەنی دوما دەستی بە کارەکانی کرد، پیتەر ئۆکاسیفیچ ستۆلینی سەرۆکوەزیران یەکێك بوو لە گەورە ریفۆرمخوازەکان، هەروەها یاسایەکانی ستۆلین دەرچوون کە مافی شارستانییان بەخشییە ئەو جووتیارانەی ڕێژەی ٨٥٪ تێکڕای گەلی ڕووسیان پێکدەهێنا.. ریفۆرمە کشتوکاڵییەکانیشی بووە هۆی دەستەبەرکردنی یارمەتیی پێویستی دارایی بۆ جووتیاران، بەشێوەیەك جووتیار دەیتوانی خۆی زەوییەکەی خۆی بکڕێتەوە.. باوەڕی ناوبراو

بەرەو ئەو ئاراستەیە دەچوو کە تاکە هۆکاری دژایەتیکردن و بەرەنگاربوونەوەی بانگەشەکارانی ڕێبازی کۆمۆنیستی لە ژیاندا، ماندان و پاڵپشتیکردنی بیرۆکەی بەکاربردنی تاکەکەسییە.

غەم و بەرتەماییی ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکانیش داگیرکردن و وەدەستهێنانی دەستهەڵات بوو، هەرگیز ریفۆرمەکانیان بەلاوە گرنگ نەبوو.. لە ساڵی ١٩٠٦دا کۆمەڵەیەکی تیرۆرستی هەوڵی تیرۆرکردنی ستۆلینیان دا،ماڵەکەیان بە بۆمب وێرانکرد.. چەندان پیلانی دیکە بۆ ڕزگاربوون لە دەست ئەو سەرۆکوەزیرانە هۆنرانەوە کە گەلی ڕووسی هەرگیز خەونی بە کەسێکی لەو باشتری نەدەبینی. لە شەوێکی ئەنگوستەچاوی سێپتێمبەری ساڵی ١٩١١، گەورەترین وەزیری ریفۆرمێستی بێ هاوتای ڕووسیا لەو کاتەی لە هۆڵێکی شانۆیی شاری کییڤدا خەریکی تەماشاکردنی شانۆگەرییەك بوو، تیرۆرکرا.. بکوژەکەش پارێزەرێکی جوولەکە بوو بەناوی مۆردخای بۆرگۆف.

حکوومەتی ڕووسی هەوڵیدا دوای تیرۆرکرانی وەزیری ناوبراو بەرنامە ریفۆرمییەکانی پێڕەو بکات.. لە ساڵی ١٩١٢دا دوو یاسای دەستەبەرکردنی کرێکارانی پیشەسازی، قەرەبووی نەخۆشی و ئەو ڕووداوانەی دەکرد کە بەسەر کرێکاراندا دەهاتن، ڕێژەی قەرەبووکردنەوەکانیش بەمجۆرە بوون: قەرەبووکردنەوە بە ڕێژەی دوو لەسەر سێ کرێی ئاسایی بۆ نەخۆشی و سێ چاریەکیش بۆ ڕووداوەکان.. هەروەها بۆ یەکەمجاریش مافی ڕەوایی و یاسایی درایە ڕۆژنامەی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان.. خوێندنگە حکوومییەکان گەشەیان سەند و ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەو جۆرە قوتابخانانە کرانەوە.. هەروەها چاو بە یاسای هەڵبژاردنەکاندا گێڕدرایەوە، بۆ

ئەوەی هەڵبژاردنێکی ئازادانەتر و پاکتر بەڕێوەبچێ.. لە ساڵی ١٩١٢دا حکوومەتی قەیسەر لێبووردنێکی گشتی بۆ زیندانییەکان دەرکرد.. هەر لەگەڵ ئازادبوونیشیان لە زیندان، زیندانییەکان بۆ ڕووخاندنی حکوومەتی ڕووسی دەستیان بە پیلانگێڕی و پیلاندانان کرد. هەروەها تیرۆرستەکان داوای پاکتاوکردنی خانەوادەی پاشایان دەکرد.. بەڵام ریفۆرمەکان باوەڕیان بە زۆرینەی گەل هێنابوو.. لەو کاتیدا پرسی شۆڕش وەك مەسەلەیەکی مردوو دەهاتە بەرچاو، لەبەرئەوە شۆڕشگێڕەکان هەوڵەکانیان لەسەر چەند وڵاتێکی دیکەدا چڕ کردەوە، بەتایبەتیش لەسەر ئیسپانیا و پورتوگال.

ئۆرگان و ئامرازەکانی پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستی تەمێکی سووریان بڵاو دەکردەوە.. هەروەها هەڵمەتێکی نەخشەبۆکێشراوی ناوزڕاندن ڕێك وەك ئەوەی لە فەرەنسا و ئینگلترای بەر لە شۆڕش بەرپایان کرد، لە ڕووسیاش دەستپێکرد.. بەمشێوەیە مرۆڤی ئاسایی، وەك دڕندە و ئەیەیستت لە قەیسەر و ئەرستۆکراتەکانی ڕووسییان دەنواڕی و پێیان وابوو جووتیاران دەکەنە کۆیلە و ژنە لاوەکانیان لێ زەوت دەکەن و لە کاتی گەشت و گەڕانی نێو گوندەکانیان لەسەر پشتی ئەسپەکانەوە بە ڕم و تیرەکانیان ورگی منداڵانیان هەڵدەدڕن.. جابۆ ئەوەی بیسەلمێنین دوا قەیسەر کەسێکی ریفۆرمیست بووە، ئەوا گوتە و قسەکانی برترام وۆڵف دەهێنینەوە کە دوژمنێکی سەرسەختی قەیسەر و شۆڕشگێڕیش بوو.. وۆڵف لە لاپەڕە ٣٦٠ی پەرتووکەکەیدا بەناوی ( سێ کەس شۆڕشیان دروستکرد) نووسیویەتی: لەنێوان ساڵانی ١٩٠٧ و ١٩١٤ دا و لەژێر سایەی یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵیی ستۆلیندا، ٢،٠٠٠،٠٠٠ جووتیار لە گوندەکاندا بوونەتە خاوەن زەوی..

ئەم بزووتنەوەیە ڕیفۆرمیستییە تەنانەت لە ساڵەکانی جەنگیشدا واتا ١٩١٤- ١٩١٧ بەردەوام بوو. لە ١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٦دا ژمارەی سوودمەندان گەیشتە ٦,٢٠٠,٠٠٠ جووتیار.. لینین گەیشتە ئەو باوەڕەی ئەگەر شۆڕش دوو دەیە دوا بکەوێ، ڕیفۆرمە کشتوکاڵییەکان ڕوخساری گوندی ڕووسی دەگۆڕن و ئیدی هێزە شۆڕشگێڕەکان ناتوانن باوەڕ و متمانە وەدەستبێنن.. لینین ڕاستی دەکرد.. چونکە کاتێك لە ساڵی ١٩١٧دا داوای لە جووتیاران کرد دەست بەسەر زەوییەکانی خۆیاندا بگرن، ئەوان خاوەنی سێ چاریەکی موڵك و زەوییەکانی خۆیان بوون.

بۆ بەدبەختی ڕاسپۆتینیش گوشاری بەدخوازانەی لەسەر ژن و پیاوانی نێو دەرباری ئیمپراتۆری دەکرد.. ژنە ئیمپراتۆریش زۆر بە خراپی کەوتبووە ژێر کاریگەریی ڕاسپۆتینەوە، چونکە ڕاسپۆتین تاکە کەسێك بوو توانیبووی خوێنبەربوونی کوڕە بچکۆلەکەی ڕابگرێ.

ڕوون و ڕەوانە ڕاسپۆتین هێزی دەروونیی موگناتیسییانەی هەبووە، ئەمەیش مەسەلەیەك بوو هەموو گەلی ڕووسی دەیانزانی.. پێدەچێ توانیبێتی ژنە ئیمپراتۆر بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، بۆ ئەوەی قەیسەر ناچار بکات خواستەکانی ڕاسپۆتین بهێنێتەدی، ڕاستییەکەی ڕاسپۆتین بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ حوکمی ڕووسیای دەکرد، ئەمەیش بووە هۆی ڕق و بێزاریی گەلی ڕووسی.

ئەوەش سەلمێندراوە ڕاسپۆتین چەند ژن و پیاوێکی هێنایە نێو دەربار و کۆشکەوە کە ڕێوڕەسم و سرووتی بتپەرستانەیان پێڕەو دەکرد، ڕێك وەك ئەوەی لە بالیە ڕۆیال و پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ١٧٨٩دا بەڕێوەدەچوو. ئەو سرووت و ڕێوڕەسمانە لەسەر بنەمایەکی زۆر پووچ داڕێژرابوون و پێیان وابوو ڕووحەکان تەنیا

لەو کاتەدا ڕزگار دەبن کە گلۆر ببنەوە خەرەندی قووڵی تاوان و گوناهەوە!.. ڕاسپۆتین تێکدەرانی هێنایە نێو کۆشك و دەرباری ئیمپراتۆرییەوە، ئەمەیش ڕێگەی بۆیان خۆشکرد بە نهێنیی کەسییەتییە گەورەکان بزانن و دواتریش هەڕەشەیان لێ بکەن بۆ ئەوەی ئەو کەسەییەتییانە فەرمانی سەرکردە تێکدەرەکانیان جێبەجێ بکەن.

***

## بەشی هەشتەم

# شۆڕشی ڕووسیا لە سالی (١٩١٧)

لە مانگی کانوونی دووەمی سالی ١٩١٠ دا، نۆزدە سەرکردەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهان لە لەندەن کۆبوونەوە.. دواتر ئەو کۆبوونەوەیە ناوی لێنرا کۆڕبەندی لیژنەی مەرکەزی.

بەشدارانی نێو کۆبوونەوەکە بڕیاریان دا ڕۆژنامەی " سۆسیتال دیموکراسیا" بکەنە ڕۆژنامەی گشتیی پارتەکە.. ڕێبەرانی بەلشەفیک لینین و زینۆفییێڤیان وەك نووسەرانی ڕۆژنامەکە هەلبژارد، مەنشەفیکەکانیش (مارتۆڤ و دان) یان وەك نوێنەری خۆیان لە ڕۆژنامەکە دانا.. هەروەها (کامینییێڤ) لە دەرکردن و نووسینی ڕۆژنامەی پراڤدا وەك یارمەتیدەری ترۆتسکی دەستنیشان کرا.. لەسەر ئەندامەکان پێویستبوو لەپێناو بانگەشەکردن بۆ ڕێباز و ئایدۆلۆژییە شۆڕشگێڕییە ئەیتەیستییەکان چالاکی بنوێنن.

ژنە ئیمپراتۆری نەمسا لە سالی ١٨٩٨دا تیرۆر کرا، شا هۆمبێرت لە سالی ١٩٠٠ و سەرۆك ماکینلی لە سالی ١٩٠١ و گراندۆق ڕجیوسی ڕووسی لە سالی ١٩٠٥ و پاشای پورتوگال و جێنشینەکەشی لە سالی ١٩٠٨دا تیرۆر کران.

سەرکردەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی لە ژنێف کۆبوونەوە و بڕیاریان دا و گوتیان زۆر پێویستە شا کارلۆسی پورتوگال

لابیریٚ بۆ ئەوەی کۆمار لەو وڵاتەدا دابمەزرێندریٚ؛ لەبەرئەوە لە ساڵی ۱۹۰۷ فەرمانی تیرۆرکردنیان دەرکرد. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۰۷دا مێگالهایسی سەرۆکی (کۆڕپەندی مەزنی خۆرهەڵاتی ماسۆنییەکان) لە پورتوگال، چووە پاریس بۆ ئەوەی لەبەردەم ئەنجوومەنەکانی ماسۆنیدا گوتارێك پێشکێش بکات.. بابەتی وانەکەی پورتوگال، هەوڵی ڕووخاندنی پاشایەتی و پێویستیی دامەزراندنی سیستمێکی کۆماری بوو.. دوای ئەم وانەیە بە چەند هەفتەیەك، هەریەکە لە شا کارلۆس و کوڕە جێنشینەکەشی تیرۆر کران.

فیرگۆنی گوتاربێژی کۆڕپەندی مەزنی ماسۆنییەکانی خۆرهەڵات لە ۱۲ی شوباتی ساڵی ۱۹۱۱دا لە ئیسپانیا گوتی:" دەزانن چ هەستێکی قووڵی شانازی باڵی بەسەرماندا کێشا کاتێك شۆڕشی پورتوگالی ڕاگەیەندرا؟ چونکە لەماوەی چەند کاتژمێرێکی کەمدا، عەرشی پاشایەتی ڕووخێندرا و گەل سەرکەوت و کۆمار ڕاگەیەندرا..ئەمە بۆ ئەو کەسانەی تازە دەستیان پێکردبوو وەك هەورە تریشقەیەکی نێو ئاسمانێکی ساف بوو. لەلآم ئێمە، ئەی برایانم، ئێمە دەزانین دەزانین برایانمان لە پورتوگال چ ڕێکخستنێکی سەرسوڕهێنەریان هەیە، هەروەها دەشزانین گوڕوتاویان سارد نابێتەوە و هەرگیز لە کارەکانیان وچان نادەن.. ئێمە نهێنیی ئەو ڕووداوە شکۆدارە دەزانین".

سەرکردەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی و بەرپرسە باڵآیەکانی ماسۆنیی ئەورووپی لە ساڵی ۱۹۱۲ لە سویسرا کۆبوونەوە.. لەو کۆنگرەیەدا بڕیاریان دا بۆ زەمینەسازی لەپێناو جەنگی یەکەمی جیهانی ئەرشیدۆق فرانسیس فردیناند تیرۆر بکەن.. لە ۱۵ی

سیپتێمبەری ساڵی ١٩١٢دا گۆڤاری ڕیڤیو ئەنتەرناسیونال دی سۆستیە سیکرێت کە ( م. جۆین) سەرنووسەری بوو، لە لاپەڕە ٧٨٧-٧٨٨دا ئەم وشانەی نووسیبوو: ڕەنگە ڕۆژێك تیشك بخرێتە سەر ئەم گوتەیەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بەرپرسێکی گەورەی ماسۆنییەکان لە سویسرا گوتبووی، لە کاتی تاوتوێکردنی پرسی جێنشینی عەرشی نەمسا ئەو بەرپرسە گوتبووی: ئەرشیدۆق پیاوێکی زیرەکە، ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە حوکمی بەسەردا دراوە و لەسەر پلیکانەی عەرەشەکەدا دەمرێ.

لەمیانی دادگەییکردنی ئەو بکوژانەی لە ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٤دا جێنشینی عەرشی نەمسا و ژنەکەیان کوشت، تیشك خرایە سەر ئەم گوتەیە.. ئەو کارەی لە سەرایێڤۆدا بەڕێوەبرا، بووە چەخماخەی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی.. ئەو ڕاپۆرتە کورتەی ڤالڕوس سەبارەت بە دادگەییکردنەکە نووسیبووی بەڵگەیەکی سەلمێنەرە.. ئەو ڕاپۆرتە دەیسەلمێنێ خاوەن بانکە جیهانییەکان (ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵاتی ماسۆنییەکانیان) بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی بەکارهێنابوو، هەروەك چۆن لەنێوان ساڵانی ١٧٨٧ و ١٧٨٩ بۆ تەقاندنەوەی شۆڕشی فەرەنسی بەکاریان هێنابوو.. لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ سەرۆکی دادگەی سەربازی کابرینۆڤیکی بانگکردە دادگە، ناوبراو بۆمبی یەکەمی بۆ ئۆتومبێلەکەی ئەرشیدۆق هاوێشتبوو.

**سەرۆکی دادگە گوتبووی:** باسی هۆی زیاترم بۆبکە.. پێش هەولەکەت دەتزانی تانکۆزێك و سیگانۆڤیچ لە ماسۆنییەکانن؟.. ئایا وەك ماسۆنییەکی ڕیزی ئەو ناوبراوانە کاریگەریی بەسەرتەوە هەبوو؟

**کابرینۆڤیك:** بەڵێ.

**سەرۆك:** ئایا لەوانەوە فەرمانی تیرۆرکردنەکەت بۆ هات؟

**کابرینۆڤیك:** فەرمانی تیرۆرکردنم لە کەس وەرنەگرتووە.. تاکە شتێك ماسۆنییەت کردبێتی ئەوەبوو ورەی بەرز دەکردمەوە.. لە ماسۆنییەتدا کوشتن ڕێگەپێدراوە.. سیگانۆڤیك پێی گوتم ماسۆنییەت ماوەی زیاتر لە ساڵێکە فەرمانی کوشتنی ئەرشیدۆق فردیناندی دەرکردووە.

جگە لەمانەیش بەڵگەیەکی دیکەش هەیە کەوا کۆنت زیرنینی هاوڕێی گیانی بە گیانیی ئەرشیدۆق پێشکێشی کردووە و گوتوویەتی: ئەرشیدۆق دەیزانی ئان و ساتی تیرۆرکردنی نزیکبووەتەوە، پێش جەنگ پێی گوتم ماسۆنییە ئازادەکان بڕیاری تیرۆرکردنیان داوە.

سەرکردە شۆڕشگێرەکانی دوای سەرکەوتن لە هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی هەوڵیان دا باوەڕ بە کرێکاران و سەربازان بهێنن کە ئەو جەنگە جەنگی سەرمایەدارییە.. تۆبالی گشت پرسێکی ئاڵۆزیشیان خستە ئەستۆی حکوومەتەکانەوە.

ڕووسیا چەند ساڵێکی کەم بوو لە جەنگی شەکەتکاری هەنبەر یابان هاتبووە دەرەوە، ئەمەیش وایکرد کەشێکی کەشێکی پڕ لە گومان و دوودڵی لە دەروونی کرێکارانی ڕووسیدا زۆر بەئاسانی دروست بکرێ، چونکە سوپای ئیمپراتۆریای ڕووسی لە ماوەی نێوان ١٩١٤-١٩١٦دا تا کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٧ لەنێو ڕیزی سەربازیی هێزی چەکداردا لە نزیکەی ٢,٠٠٠,٠٠٠ قوربانی دابوو و باشترینی گەنجەکانی خۆی لەدەستدابوو.

لینین و مارتۆڤ له سویسرا بوون، سویسراش وڵاتێکی بێلایەن بوو و گشت نەخشە و پیلان و کودەتایەکی جیهانی لەوێوە هەڵدەچنرا.. ترۆتسکی ئەرکی ڕێکخستنی سەتان لەو شۆڕشگێڕە ڕووسیانەی گرتبووە ئەستۆ کە وەك پەناهەندە ڕوویان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کردبوو.. سەرکردەکانی مەنشەفیك لە ڕووسیا چالاکییە تیرۆرستییەکانیان دەستپێکردبوو.. لە ساڵی ١٩١٧شدا دەرفەتیان بۆ ڕەخسا.. چەند کردەیەك بەشێوەیەکی زۆر کارامە بەڕێوەچوون و بوونە هۆی تێکدانی ئامێرەکانی پێوەندیکردن و مەڵبەندەکانی گواستنەوە و گەیاندن و ناردنی کۆمەك و پێداویستییەکان.. ئەم ڕووداوەش لە پیترسبۆرگ بووە هۆی کەمبوونەوەیەکی مەترسیداری مادە خۆراکییەکان.. ئەمە لە کاتێکدا ڕووی دا شارەکە بەهۆی ئەو کرێکارە پیشەسازییانەی ڕوویان تێکردبوو بەدەست زۆربوونی ژمارەی دانیشتووانەوە دەیناڵاند، چوونکە لە ئەرك و ئۆپەراسیۆنە جەنگییەکاندا زۆر پێویستیان بەو کرێکارانە هەبوو.

مانگی شوباتی ساڵی ١٩١٧ مانگێکی شووم بوو، بەپێی سیستمی کەم بەکارهێنان و پاشکەوتکردنی خۆراك ڕەفتار دەکرا.. لە مانگی ئاداردا نیگەرانییەکی گەورە بڵاوبوویەوە.. ڕیزی ئەو هاووڵاتییانەی داوای نانیان دەکرد بەردەوام لە درێژبووندا بوو.. لە ئاداردا شەقامەکان پڕ بوون لە خەڵکی بێکار.. قەیسەریش هێشتاکە لە بەرەکانی جەنگدا سەربازەکانی بەسەر دەکردەوە.

سەرکردەکانی مەنشەفیك لە ٧ی ئاداردا وەك ناڕەزاییەك لەهەنبەر کەمیی نان، جووەکانیان ڕێکخست بۆ ئەوەی لە شەقامەکاندا خۆپیشاندانێکی ژنانە ڕێکبخەن.

ژنان لە ٨ی ئاداردا خۆپیشاندانە گەورەکەیان بەڕێوەبرد.. دوای ئەمە شۆڕشگێڕەکان هاتنە نێو مەسەلەکەوە.. چەند کۆمەڵەیەکی هەڵبژێردراویش لە چەند شوێنێکی جیاجیادا چەند خۆپیشاندانێکی لاوەکییان ڕێکدەخست.. هەروەها دەستەوتاقمە بەدخوازەکان لە چەند شوێنێکدا بەدیارکەوتن، سروودی شۆڕشگێڕییان دەگوت و ئاڵای سووریان بەرز دەکردەوە.. لە چوار ڕێیانی نیڤسکی برۆسبکت و کەناڵی سانت کاتریندا، پۆلیس و سەرباز بەبێ هیچ زیانێکی جەستەیی و خوێنرشتنێك بڵاوەیان بە خۆپیشاندەران کرد.. پێدەچوو فەرمانەکان بەشێوەیەك درابنە سەربازەکان دیسانەوە نەگلێنە نێو ڕووداوێکی هاوشێوەی ڕۆژی یەکشەممەی خوێناویی ساڵی ١٩٠٥.

لە ٩ی ئاداردا ناوچەی نێوان نیڤسکی و برۆسبکت و سانت کاترین تا دەگاتە وێستگەی نیکۆلای پڕ بوو لە جەماوەری خۆپیشاندەر و بەهۆی فیتنەچی و کەسانی هاندەرەوە جەماوەر لە جاران بوێرتربیوو.. سوارچاکانی قۆزاق ئەرکی خاوێنکردنەوەی شەقامەکانیان گرتە ئەستۆ.. ئەو سوارچاکانە تەنیا پشتە شمشێریان بەکاردێنا، هیچ چەکێکی ئاگرینیش بەکار نەهات.. ئەو نەرمی و لێبوردەییە سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی تووڕەکرد، بۆیێ ڕێنمایی کەسانی هاندەریان کرد هەوڵی زیاتر بخەنە گەڕ بۆئەوەی ڕووبەڕووبونەوەیەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان گەل لەلایەك و پۆلیس و سەرباز لەلایەکی دیکە دروست ببێت.. شۆڕشگێڕەکان شەوێ چەك و ڕەشاشەکانیان لە چەند شوێنێکی نێو شارەکەدا شاردەوە.

لە مانگی ئاداردا، ڕووداوێکی ناخۆش هاتە پێشێ.. جەماوەرێکی زۆر لەبەردەم وێستگەی نیکۆلایدا کۆبیوونەوە.. دەورووبەری کاتژمێر

٢ی دوای نیوەڕۆ، کەسێك لەنێو ئۆتومبێلەکەیدا بە گوڕەپانەکەدا تێپەڕی پاڵتۆیەکی لەبەر بوو بۆ ئەوەی خۆی لە سەرما بپارێزێ.. پیاوەکە کەسێکی زۆر بێ ئارام بوو، فەرمانی بە شوفێرەکەدا بەنێو خەڵکدا تێپەڕێ.. ئەمەیش هەڵەیەك بوو دەماری کەسانی خۆپیشاندەری گرت و تووڕەی کردن.

پیاوەکە لە ئۆتومبێلەکەیەوە ڕاکێشرایەوە دەرەوە و خەڵك بەریوونە گیانی.. کاتێکیش توانی لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستێ، بەرەو ئۆتومبێلەکەی چوو ، بەشێك لە جەماوەر کەوتنە دوای، کەسێك بۆرییەکی سرەواندە تەپڵی سەری.. ئەو کردەوەیە حەزی بینینی خوێنی لە جەماوەردا بزاوت، لە شەقامی نیڤسکییەوە بەپرتاو چوون پەنجەرەکانیان دەشکاند و کاری تێکدەریان دەکرد.. ئیدی شەڕ دەستیپێکرد و ئاشووب بڵاوبوویەوە.. سەرکردە شۆڕشگێڕەکانیش بەپێی پیلانە داڕێژراوەکەیان، لە شوێنە نهێنییەکانی خۆیانەوە خەڵکیان دایە بەر گوللە.. ئیدی جەماوەر شێت و هار بوو هێرشیان بۆ پۆلیس برد و بەوە تۆمەتباریان کرد سەرەتا ئەوان لە تەقەکردن دەستپێشخەر بوون، لە بەرانبەر هەر پیاوێکی خۆیاندا پۆلیسکێیان سەردەبڕی.. دواتریش زیندانییەکان ئازاد کران، بۆ ئەوەی لەو هەڵمەتە خوێناوییەدا بەشدار بن.. بەمشێوەیە هەلومەرجی گونجاویان بۆ حوکمی تیرۆر و تۆقاندن خۆشکرد.

ئازادکردنی زیندانی و تاوانکاران لە ١١ی مارسدا دۆخێکی پڕ بێسەروبەی و تێکدەرانەی هێنایە ئاراوە.. ئەنجوومەنی دۆماش هێشتاکە لە هەوڵی گەمارۆدان و سنووردارکردنی پانتاییی شۆڕشەکەدا بوو.. نامەیەکی بەپەلەیان بۆ قەیسەر نارد و بۆیان نووسیبوو دۆخەکە

زۆر مەترسیدارە، بە وردی دۆخە پڕ ئاشووب و بێسەرویەرەکەیان بۆ باسکردبوو.. بەلام شانە کۆمۆنیستییەکانی نێو بواری پێوەندییەکان نامەیەکی دیکەیان بۆی نووسیبوو.. جا کاتێك قەیسەر نامە ساختەکە دەخوێنێتەوە، فەرمانی هەلوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی دۆما دەردەکات.. بەمشێوەیە خۆی لە پشتگیریی زۆرینەی ئەو ئەندامانە بێبەش دەکات کە سەر بەخۆی بوون و پالپشتییان لێی دەکرد.

هەندێك یەکەی سەربازی لە ۱۲ی مارسدا ڕاپەڕین و سەربازەکان ئەفسەرەکانی خۆیانیان کوشت.. کتوپڕ پاسەوان و پارێزەرانی قەلای سانت پترسبۆرگ و سانت پۆل خۆیان ڕادەست کرد، زۆرینەی سەربازەکانیش چوونە ڕیزی شۆڕشەکەوە.

لەگەل خۆ ڕادەستکردنی پارێزەران و پاسەوانانی هەردوو قەلا، لیژنەیەکی ۱۲ کەسی لە دۆما پێکهات.. ئەم حکوومەتە هەرێمییە بەردەوام بوو تاکوو بەلشەفییکەکانی سەر بە لینین لە نۆڤێمبەری سالی ۱۹۱۷ ڕووخاندیان. سەرکردە شۆڕشگێڕەکان ئەرکی ڕێکخستنی حکوومەتی شۆڕشگێڕیی پترسبۆرگیان گرتە ئەستۆ، ڕێگەشیان بە حکوومەتی هەرێمی دا لە کار و دەستهەلات بەردەوام بێت، چونکە نوێنەرایەتیی دەستهەلاتێکی ڕەوا دەکات.

لینین ئەرکی لاوازکردنی هەژموونی ڕێبەرە جوولەکە شۆڕشگێڕەکانی لە ڕووسیا گرتە ئەستۆ، هەروەها بەلێنی دا سوپای ڕووسیا لە جەنگی دژ بە ئەلمانیا بکشێنێتەوە، بەو مەرجەی حکوومەتی ئەلمانی لە ڕووخاندنی حکوومەتە هەرێمییەکە و کۆنترۆلکردنی تەواوی سیاسەت و ئابووریی ڕووسیا یارمەتیی بدات.. دوای ڕێککەوتن لەسەر ئەو مەسەلەیە، لینین و مارتۆف و ڕادیك و

تیمێکی ٣٠ کەسیی بەلشەفیکەکان بەهۆی فارگۆنێکی داخراوی شەمەندەفەرێکەوە بە نهێنی گەڕانەوە ڕووسیا و لە ٣ی نیساندا گەیشتنە پترسبۆرگ.

کاتێك حکوومەتە هەرێمییەکە لێبوردنێکی گشتی بێ مەرجی بۆ گشت زیندانییە سیاسییەکان دەرکرد، بەدەستی خۆی بەڵگەنامەی مردنی خۆی واژۆ کرد، لێبوردنەکە ئەو کەسانەشی دەگرتەوە کەوا بۆ سیبیریا دوور خرابوونەوە، هەروەها ئەو کەسانەش لێی بێبەش نەبوون کە پەنایان بردبووە بەر وڵاتانی دیکە.. ئەم لێبوردنە ڕێگەی بۆ نزیکەی ٩٠,٠٠٠ شۆڕشگێڕی توندڕەوی ڕووسی خۆشکرد بێنە نێو ڕووسیاوە، زۆربەشیان کەسانی شارەزا و مەشقدیدە بوون.. لینین و ترۆتسکی ئەم ژمارە زۆرەیان لەنێو پارتی بەلشەفیکدا ڕێکخست.

هەرکە لینین گەڕایەوە ڕووسیا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو حکوومەتە هەرێمییەی فەرمانی لێبوردنی بۆ خۆی و شوێنکەوتەکانی دەرکردبوو، دەستی بە بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن کرد.. مەنشەفیکەکان لە سەرەتای نیساندا دەستیان بەسەر حکوومەتی شۆڕشگێڕی واتا ئەنجوومەنی کرێکاراندا گرت.. لەڕووی گرنگییەوەش چەپی (سۆسیالستی شۆڕشگێڕی) دوای ئەوان دەهاتن.. بەڵام بەلشەفیکەکان کەمینە بوون.. سیاسەتی حکوومەتە هەرێمییەکەش بەردەوام بە ئاراستەی جەنگکردن دژ بە ئەڵمانیا بوو، چونکە زۆرینەی ڕووسەکان هەڵپە و بەرتەمایی ڕەشی نازیزمی ئەڵمانییان بە مەترسییەکی ڕاستەوخۆی هەنبەر سەروەرییەکەیان دەزانی.. (چیدن)یش کە لەدوای مارتۆف سەرۆکایەتیی حکوومەتە شۆڕشگێڕەکەی پترسبۆرگی وەرگرت، بەهەموو هێز و توانایەوە

لایەنگری ئەو بیرۆکەیە بوو.. هەروەها (سکۆپۆلیف)ی جێگری سەرۆکیش حەزی لێبوو جەنگەکە درێژە بکێشێ، چونکە پێی وابوو شۆڕشگێڕەکان لە دۆخی بەردەوامبوونیان لە جەنگ و شکستهێنان بە سوپای ئەڵمانی، دەتوانن دژ بە حکومەتە شکستخواردووەکان یارمەتیی کۆمەڵە شۆڕشگێڕەکانی نێو ئەڵمانیا و پۆڵەندا بدەن.

تاکە ئامانجی لینین لەو کاتیدا، وەدەستهێنانی سەرۆکایەتی بوو، ناوبراو هێرشێکی توندی کردە سەر سیاسەتی حکوومەتە هەرێمییەکە، هەروەها ئەندامەکانی بە بەکرێگیراوی بۆرژوازی تۆمەتبار دەکرد، بە ئاشکرا داوای ڕووخاندنی دەکرد.. لە هەمان کاتیشدا نەیویست دژی حکوومەتی شۆڕشگێڕی مەنشەفیك بوەستێتەوە، بۆیێ ڕێنمایی بۆ هاندەرە بەلشەفیکەکان دەرکرد داوا لە کرێکارانی کارخانەکان و سەربازە پاسەوانەکانی چەند شوێنێکی تایبەت بکەن حکوومەتە هەرێمییەکە بڕووخێنن.

ترۆتسکی یەکێك بوو لەو هەزاران شۆڕشگێڕەی دوای لێبووردنەکە گەڕابوویەوە ڕووسیا، لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا سەتان لەو شۆڕشگێڕانەی هێنابوویەوە کە لە ڕووسیاوە پەنایان بردبووە بەر ئەمریکا و کەنەدا.. زۆرینەی ئەو کەسانەش جوولەکەی دەورووبەری خۆرهەلاتی نیویۆرك بوون.

ئەو کەسانە یارمەتیی لینینیان دا دەستهەلات بگرێتە دەست.. زۆرینەی ئەو کەسانەش دوای تەواوبوونی ئەرکەکانیان بە مردن و دوورخستنەوە حوکمیان لەسەر دەدرا.. هێندەی پێنەچوو ئەندامانی کۆنگرەی یەکەمی جیهانی یان کوژران یانیش خرانە زیندان و دوورخراوگە !

بۆ سەلماندنی ئەو ڕۆڵەی پارە گۆڕەوە جیهانییەکان بۆ بەرژەوەندیی لینین لە شۆڕشی ڕووسیادا گێڕایان، دەبینین لە پەرتووکی سپی کە لە سالی١٩١٩ دا لە بریتانیا بە ڕەزامەندی وەرگرتن لە پاشا دەرچووە، ئەو سووخۆر و پارەگۆڕەوە جیهانییانەی لەمیانی بەڕێوەبەرانی بانکەکانی ئینگلترا کار دەکەن، حکوومەتی بریتانیایان ڕازی کردووە بەلگەنامە ڕەسەنەکە بکێشێتەوە، دانەیەکی دیکەی لە شوێن دابنرێ کە گشت شتێکی تیادا لابراوە ئاماژە بە جوولەکان بکات.

**فرانسوا کوتی لە بلاوکراوەی فیگارۆدا کە لە ڕێکەوتی ٢٠ی شوباتی سالی ١٩٣٢دا دەرچووە، نووسیویەتی:**

ئەو یارمەتی و دیارییانەی یەعقووب شێف پێشکێشی بزووتنەوە ئاژاوەگێڕەکان و شۆڕشگێڕەکانی ڕووسیا و ولاتانی دیکەی دەکات، وەك چاوتێری و دەست و دلکراوەییەکی تاکەکەسی نییە.. بەلکو لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەپارەی شێف ڕێکخراوێکی تیرۆرستیی ڕووسی دامەزراوە، ئەرکەکەی بریتییە لە تیرۆرکردنی وەزیر و دەستەلاتدار و بەڕێوەبەرانی پۆلیس و هتد.

ئەو نوورانییانەی بۆ وەدیهێنانی هەلپە و تەماعە نهێنییە دکتاتۆرییەکانیان کۆمۆنیزم و نازیزم بەکاردێنن، کار و بزاوتی شۆڕشگێڕانە دابەش دەکەنە سەر سێ قۆناغ یان بزووتنەوە:

١) ئەگەر بتوانن و دەرفەتیان بۆ بڕەخسێ، حکوومەتە هەنووکەییە بەرقەرارەکان بە چەند ئامراز و هۆکارێکی دەستووری دەگۆڕن و دەیانکەنە دەولەتێکی سۆسیالیستی.

٢) بەهۆی بزاوتی شۆڕشگێڕییەوە دەوڵەتی سۆسیالیستی دەکەن دکتاتۆریەتێکی جیهانی.

٣) بە پاکتاوکردن و لەنێوبردنی گشت ئەو کەسانەی دەبنە تەگەرەی بەردەمیان، دکتاتۆریەتی کرێکاری دەگۆڕن و دەیکەنە حوکمڕانی و دەستهەڵاتێکی ڕەها.

جوولەکە ڕووسییەکان دوای ساڵی ١٩١٨ دابەش بوونە سەر دوو بەش: بەشی یەکەم ئەو شۆڕشگێڕانەی خۆیان بە بیردۆزەکانی مارکسەوە هەڵواسیبوو، لەپێناو دروستکردنی یەکییەتییەکی جیهانی لە کۆمارە سۆسیالستییەکان هەوڵی خۆیان خستبووە گەڕ و بە (ترۆتسکییەکان) ناسرا بوون.. بەشەکەی دیکەش هیواخوازی گەڕانەوە بوون بۆ فەڵەستین ( ئەوانە زایۆنیزمەکان) بوون. خاتوو ب. باسکرفیل لە لاپەڕە ١١٧و ١١٨ پەرتووکەکەی خۆیدا بە ناوی (جوولەکەی پۆڵەندی) نووسیویەتی:" زایۆنیزمی سیاسی ئامانجی گۆڕینی زایۆنیزمەکانە بۆ کەسانی سۆسیالستی پێش ئەوەی بەرەو فەڵەستین کۆچ بکەن، ئەمەیش بۆ زەمینەسازیی دروستکردنی حکوومەتێکی سۆسیالیستییە.. لە هەمان کاتیشدا دەیانەوێ ئەو حکوومەتە ئەورووپییانە ژێر و ژوور بکەن کەوا بەپێی ڕێبازەکانی ئەوان ڕەفتار ناکەن.. بەرنامەکەیان بۆ ڕێکخستنی مانگرتنەکان و کارە تیرۆرستییەکان، پڕە لە هزری سۆسیالیستی".

بەلشەفییەکان لە ساڵی ١٩١٨دا ناوی خۆیان گۆڕی و کردیانە (پارتی کاری دیموکراسیی ڕووسی)، دواتریش بە پارتی کۆمۆنیستی ناسران و بارەگایان گواستەوە مۆسکۆ.

ئەو پارتە یەدەگە شۆڕشگێڕییەی جوولەکەکان ڕێبەرایەتیان دەکرد بەوە ڕازی نەبوو لینین ببێتە پیاوی یەکەمی ڕووسیا، لەبەرئەوە هەردوو کۆمەڵە و گرووپ لە ٣٠ ئابی ساڵی ١٩١٨دا هەوڵیان دا تیرۆری بکەن، لەو هەوڵەدا لینین بریندار بوو و یۆرتزکیش کە خودی لینین وەک سەرکردەی ڕێکخراوی شیکا دایینابوو، کوژرا.. لینین ئەو ڕووداوەی کردە پاساوی بەڕێوەبردنی چەندان کاری تیرۆرستی بەرفراوان و بێ وەستان، هێرشەکانی شەو بەشێوەیەکی بێ وچان دەکران، تەنانەت ئەو کەسەی شەو دەچووە سەر پێخەف، نەیدەزانی ئاخۆ بۆ بەیانی بە زیندوویی دەمێنێتەوە یان نا!.. دالفید شۆپ لە پەرتووکەکەی خۆیدا کە پشتگیریی لە مارکسیەتی لینین دەکات، دەنووسێ:" لە دۆزینەوەی بەڵگە و شایەتەکان و پۆلینکردنی خەڵکیدا هێندە خۆیان سەرقاڵ نەدەکرد و هێرش و هەڵمەتی ڕەشبگیری درێژەی هەبوو.. بەندکراوەکان بەرەو بنکەی پۆلیسی کۆنی تەنیشت کۆشکی زستانە دەبران، لەوێش دەدرانە بەر ڕەگبار.

کوشتن و ئەشکەنجەدان و بڕینەوەی دەست و پێ و دەستدرێژیی سێکسی بناغەیەکی فشۆڵی کۆماری سۆڤییەتیی سۆسیالیستی بوو.

ملیۆنان هاوولاتیی ڕووسی مردن، مەزەندەش دەکرێ نزیکەی دوازدە ملیۆن کەسی دیکەش بەهۆی سوغرەکێشیی تا مەرگەوە لەرمانی خزمەتکردنی دەوڵەتیان بەسەردا سەپێندرا، ئازادیشیان بەچاوی خۆیان نەدەبینیەوە، کاتێکیش دەمردن تەرمەکانیان لە بەندیخانەکان دەهێنرایە دەرەوە.

## بەشی نۆیەم

# وروژاندن و دنەدانی سیاسییانە

کەمێك دوای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی و ڕێك لە مانگی ئابی ساڵی ١٩١٤، کۆمەڵێك لە دەوڵەمەندە گەورەکان داوایان لە ئەندازیارێك کرد یەکێك لە کۆشکە کۆنەکان بکاتە یانەیەکی تایبەت.. ئەو دەوڵەمەندانە سووربوون لەسەر ئەوەی ناوەکانیان بەنهێنی بمێنێتەوە، چونکە دەیانویست لە هەنبەر ئەو ئەفسەرانەی لەپێناو نیشتماندا ژیانیان دەخەنە مەترسییەوە، گوزارشت لەوپەڕی ڕێز و سوپاسی خۆیان بکەن.. ئەو یانەیەش گشت هۆکارەکانی دڵخۆشکردن و کات بەسەربردن و ڕابواردنی تیادا بوو، تەنیا تایبەت بوو بەو ئەفسەرانەی لە بەرەی جەنگ دەگەڕانەوە، بۆ ئەوەی مۆڵەتە سەربازییەکەیان لە لەندەن بەسەر ببەن.. بەڵام ئەندامە نوێیەکان، لە ڕێگەی یەکێك لە برایانی ئەفسەرەوە بە یانەکە دەناسێندران، لەوێشدا گفتوگۆ لەنێوان میوانان و بەرپرسێکدا ساز دەکرا.. جا ئەگەر بەرپرسەکە بگەیشتبایە ئەو باوەڕەی کە دەکرێ ئەندامە تازەکە متمانەی پێ بکرێ، بۆی ڕوون دەکردەوە کاروباری نێو یانەکە چۆن بەڕێوەدەچێ.. بۆیێ ئەو ئەفسەرەی داواکاری ئەندامییەتیی پێشکێش کردبایە دەبوایە سوێند بە شەرەفی خۆی بخوات ناوی هیچ کەسێکی نێو یانەکە نەهێنێ کە لەکاتی هاتنە ژوورەوە یان چوونە دەرەوەدا دەیبینین.. دواتر بۆ ئەو

میوانە ڕوون دەکرایەوە چۆن و بەچ شێوەیەك چاوی بە بەناوبانگترین خانمانی کۆمەڵگەی لەندەن دەکەوێ، خانمەکانیش دەمامکیان بە ڕووخسارەوەیە، بۆیێ نابێ هەوڵ بدات بزانێ کێن.. خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت یەکێکیانی ناسییەوە، بەڵێنەکەی پاراستنی ئەو نهێنییەش دەگرێتەوە.

دوای تەواوبوونی ئەو هەنگاوە سەرەتاییانە، ئەفسەرەکە دەبرایە ژوورە تایبەتەکەی خۆی کە بەباشترین شێوە و نوێترین مۆدیل ئامادەکرابوو.. داواش لە میوانەکە دەکرا بە ماڵی خۆی بزانێ.. هەروەها پێشی ڕادەگەیەندرا خانمێك دێتە لای کە ملوانکەیەکی لەملە، ملوانکەکەش هەمان ژمارەی ژوورەکەی لەسەرە.. خۆ ئەگەر دوای ناسینی حەزی کرد لەگەڵی بچێتە ژووری نانخواردن، ئەوا ئارەزووی خۆیەتی و ئازادە.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٦دا نامەیەك گەیشتە کەسییەتییەکی گرنگی بواری سیاسەت، لە نامەکە داوای لێ کرابوو، چوونکە لەوێ چەند زانیارییەکی زۆر گرنگی پێ دەدرێ، بۆیێ بە ئوتومبێلە تایبەتەکەی خۆی دەچێت و داوا لە شوفێرەکەی دەکات چاوەڕوان بێت، دواتر دەچێتە ژوورەوە، لەوێشدا بەرپرسان دەیبەنە سەر پێخەفێکی زۆر جوان و ڕازاوە و بەتەنیا جێی دەهێڵن.. هێندەی پێناچی ژنێکی گەنج دێتە سەر پێخەفەکە، هەرکە بینی هێندەی نەمابوو لە خۆ بچێت، چونکە ژنەکەی خۆی بوو کە چەندان ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو، کارەکەشی پێشوازیکردنی ئەو ئەفسەرانە بوو کە ماوەیەکی زۆر مۆڵەتیان وەرگرتبوو! ..بەڕاستی هەڵوێستەکە زۆر ناخۆش و ڕووگیرانە بوو، چونکە ژنەکە نەیدەزانی ئەو نەخشە و پیلانە

چییه هەردووکیانی لەو شوێنەدا بەیەکتری گەیاندووە، هەروەها هیچ زانیارییەکی نهێنیشی نییە ئاشکرایان بکات، بەڵکو باوەڕی وابوو ڕێکەوتێکی خراپ هەردووکیانی لەو شوێنەدا کۆکردووەتەوە، مێردەکە زانی ڕۆڵی ژنەکەی لە یانەکەدا چییە، بەلام وەك بڵێی مردوو بێت زاری لێکنەکردەوە و لێوەکانی تەواو وشك هەڵگەڕابوون، چونکە بەرپرسێکی حکوومەت بوو و نەیدەتوانی بەرگەی ئابڕووچوون بگرێ!

هەموو ئەندامەکانی یانەکە بە ژن و پیاوەوە سیخوڕییان بەسەر یەکترییەوە دەکرد، هەواڵ و زانیارییەکانی یەکتریان بۆ سەرکردەکانیان دەگێڕایەوە، ئەو زمان لێدانە (ئیخباری) دەبووە زانیاری و لە پەڕتووکێك بەناوی (پەڕتووکی ڕەش) تۆمار دەکرا و دەنووسرا.. لە پەڕتووکەکەدا کەموکورتی و لەنگی و بێ ئابڕووییە تایبەتەکان و خاڵە لاوازەکانی تاکەکان نووسرابوون.. هەروەها باروودۆخی ئابووری و خانەوادەیی و وابەستەبوونیان بە خزموخوێشان و هاوڕێیان تۆمار کرابوون.. هەروەها پێوەندی و کاریگەرییەکانیان بەسەر پیاوە بەناوبانگ و گەورەکانی سیاسەت و کەسە مەزنەکانی بواری پیشەسازی و پیاوانی ئاینییەوە تیشکی خرابوویە سەر.

لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٦دا ئەندام پارلەمانێکی ئینگلیزی ویستی مەسەلەی ئەو یانە شووشەییە ئاشکرا بکات و ڕاستییەکانی بخاتە بەرچاوی خەڵك، سێ ئەفسەر سکالایان تۆمار کردبوو کە دوای ئەوەی بوونەتە ئەندام، یانەکە لە هەوڵدایە زانیارییان لێ دەربێنێ، هەروەها لە سکالایەکەیاندا نووسیبوویان یانەکە بووەتە لانەی سیخوڕی و زانیاریی گرنگ بۆ دوژمن دەنێرێ.. لەم سەرکێشییەدا خانمێکی ئوستڕالی و شوفێرەکەی و ژمارەیەك لە ژنان و کچانی بەرپرسە

حکوومییەکانیش بەشداربوون.. بەڵام ئەو هەوڵەی ئاشکراکردنی یانەکە فروقەپی لێ کرا، چونکە سیاسەتی حکوومەت وەهابوو لەو کاتەی سوپا ڕوویەڕووی هێرشێکی بێئامان و بێبەزەییانەی دەریایی و وشکایی و ئاسمانی ببوویەوە، نهێنییەکانی یانەکە فروقەپی لێ بکرێ، نەوەك ئابڕووچوونێکی وەها گەورە ببێتە هۆی تراژیدیایەکی نیشتمانی.. لەو کاتیدا ڕۆژنامەوانیی (ڕزگاریخوان) هێرشی توندی دەکردە سەر سەرۆکوەزیران و تۆمەتباری دەکرد بەوەی کەسانی ناشایستەی لە پێگە و پۆستە حکوومییەکان داناوە و لە سەردەمی پێش جەنگەوە چەند پێوەندییەکی فراوانی لەگەڵ پیشەساز و پارەدەرانی ئەڵمانیدا هەیە و هەواداری قەیسەریشە.. بەوەش تۆمەتباری کردبوو ناتوانێ ڕێکاری یەکلاکەرەوە و بڕیاری خێرا دەربکات.. هەروەها دەستەواژەی (چاوەڕێ بکە و ئەسکویت دەبینیت)ی وەك نموونەیەك هێنابوویەوە.

هەندێك ئابڕووچوونی تایبەت بە پێوەندیی چەند بەرپرسێکی باڵا بە یانە شووشەییەکە بووە هۆی دەستلەکارکێشانەوەی حکوومەت.. ئیمپراتۆری بریتانیش بە هۆی ئەو دۆخەوە زۆر ناچار بوو لەنێوەڕاست و جەرگەی جەنگێکی مەزندا سوارچاکەکانی بگۆڕێ.. کاتێکیش بەڕێز ئەسکویت لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٦دا دەستی لەکار کێشایەوە، وەزارەتێکی ئیئتیلافی بەدوا داهات کە لەلایەن دافید لوید جۆرجەوە سەرۆکایەتیی دەکرا و وینستۆن چەرچڵ لە ئەندامە بەرجەستە و بەناوبانگەکانی بوون.

لە نووسییە ڕەسمییەکانەوە زاندرا ئەو سێ ئەفسەرەی سکاڵایان دژ بە یانە وەرزشییەکە پێشکێش کردبوو، لە گەرمەی شەڕ و لەنێو جەنگدا کوژران، ڕووداوی وەهاش لەنێو جەنگدا بە شتێکی ئاسایی

وەردەگیرێــت.. لەلایــەکی دیکەشــەوە خانمــە ئوســترالییەکە و شوفێرەکەی بە تۆمەتی بەرگریکردن لـە شـاژن دەستگیرکران.. دواتر ڕاگەیاندرا ئەندامێکی پەرلەمانیش بەهۆی ئابڕووچوونەکەی پارلەمانەوە لە ژیانی گشتی دوورکەوتووەتەوە.. دوای چەند هەفتەیەکیش من لە پۆسـتی هــەوالگریی پاشـایەتی دوورخرامــەوە و وەك ئەفســەرێکی دەریـاوانی لــە هێـزی ژێرئاوگـەرەکانی بریتانیـدا دامـەزرێنرام.. ٢٣٪ ئەفسـەران و پیاوانمـان لەدەسـت دا، مـن یـەکێك بـووم لـەو کەسـانەی قەدەر ویستی بمێنمەوە.

دوای ماوەیـەکی دووورودرێـژی دوای جـەنگ و پـاش ئـەوەی خـۆم لێکۆڵینەوەم لـە مێـژووی هاوچـەرخ و بەراوردکارییـە ئاینییـەکان کرد، ئەوسـا گرنگیـی سیاسـەتی زایـۆنیزمم لەهەنبـەر ئـەو کەسـانەدا بـۆ ڕوونبوویەوە کەوا پیلانی کۆنترۆڵکردنی تـەواوی ئابوورییـەکانی جیهـان دادەڕێژن.. ئەم ڕووداوانەش خۆیان شایەتحاڵی خۆیانن:

کاتێــك جــەنگی یەکــەمی جیهــانی هەڵگیرســا، ئەســکویت سەرۆکوەزیران بوو و دژی زایۆنیزمیش بوو.. پارەدەرانی نێونەتـەوەیی بڕیاریان دا حکوومەتەکەی لابدەن و حکوومەتێکی ئیئتیلافی لـە شـوێن دابنێن، بەو مەرجەی لوید جۆرج و وینستۆن چەرچل دەستێکی بالایـان تیادا هەبێت.. داڤید لوید جۆرج ئاوقاتێکی بزووتنەوەی زایۆنیزم بـوو و لەلایەن خانەوادەی ڕۆچیلدەوە پیلانـی بـۆ دانرابـوو و پـارەوپووڵی بـۆ تـەرخانکرابوو.. بـەلام وینسـتۆن چەرچـل هـەر لـەو کاتـەی هاتـە نێـو گۆڕەپانی سیاسییەوە لایەنگرێکی زایۆنیزمی سیاسی بوو.

پـارەدەرانی نێونەتـەوەیی لـە سـاڵی ١٩١٧دا لـە هـەمان کاتـدا پشتگیرییان لە هەردوو بزووتنەوەی بەلشەفیکی و نـازیزم دەکـرد.. زۆر

بێمانایە ئەنجوومەنی نوێنەرانی بریتانی ئاگاداری ئەو مەسەلە و ڕووداوانە نەبووبێت، بەتایبەت کاتێك حکوومەت هەستیکرد ناچارە خۆی هەڵقورتێنێتە نێو ئازادکردنی ترۆتسکی و هاوڕێیانی، دوای ئەوەی لە هالیفکسەوە دەستگیرکران و بەنیاز بوون لە نیویۆرکەوە بچنە ڕووسیا.

بەڵام سەبارەت بە سیاسەتی بریتانیا کە لە ساڵی ١٩١٦ لە هەنبەر ڕووسیا گرتیبەبەر، تاکە پاساویان ئەوەبوو حکوومەتی بریتانی دەیزانی یارمەتیی دارایی و سەربازی لەلایەن ئەمریکاوە پێشکێش نەکراوە، تاکو حکوومەتی ڕووسی بڕووخێ.. ئەم شیکردنەوەیە زۆر پووچ و بێمانا دێتە بەرچاو، بەڵام ئەم ڕاستییانەی خوارەوە بەڵگەی دروستییەکەی دەسەلمێنن:

شۆڕشی ڕووسی لە شوباتی ساڵی ١٩١٧دا هەڵگیرسا و قەیسەری پێنجەم لە ئاداری هەمان ساڵدا و ڕاستەوخۆ دوای ئەو ڕووداوە لادرا، یەعقووب شێف هاوبەشی دەستگەی کۆهن-لۆب لە نیویۆرك، گرێبەندە داراییە سەپێندراوەکانی سەر هاوپەیمانانی لادا، هەروەها فەرمانی بە مۆرتیمری کوڕی کرد برووسکەیەك بۆ سێر ئەرنست کاسل بنێرێ، لە برووسکەکەدا هاتبوو: بەهۆی ئەو کارانەی بەمدواییانە لە ئەڵمانیا بەڕێوەدەبرێن، هەروەها ئەو پێشهاتانەی لە ڕووسیا سەریان هەڵداوە، بەردەوام نابین لە ئابلۆقەی دارایی سەر حکوومەتەکانی هاوپەیمان.

حکوومەتی بریتانی لە پێنجی نیسانی هەمان ساڵدا ئارسەر جیمس بلفۆڕی وەزیری دەرەوەی نارده ویلایەت یەکگرتووەکان، بۆ ئەوەی پێوەندی بە نوێنەری بانکە ئەمریکییەکان بکات و بەشێوەیەکی

ڕەسمی پێیان ڕابگەیەنێ حکوومەتی بریتانی باوەش بۆ پرۆژەکەیان دەکاتەوە کە تایبەتە بە زایۆنیزم، بەو مەرجەی بەڵێن بدەن ئەمریکا بخەنە نێو هاوپەیمانییەوە.. بەمشێوەیە ئەمریکا هاتە نێو جەنگەکەوە، یەکەمین تیپە ئەمریکییەکان لە ٧ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٧دا لە فرەنسا دابەزین. لۆرد ڕۆچیلد لە ١٨ی تەمووزدا ئەمەی بۆ بەلفۆر نووسی:

ئازیزم بەڕێز بەلفۆر.. لە کۆتاییدا توانیم ئەو شێوە دارشتنەت بۆ بنێرم کە داواتکردبوو، ئەگەر لە حکوومەتی خاوەنشکۆ و جەنابت بەتایبەت وەڵامێکم دەستکەوێ، لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتدا کە بەشێوەیەکی زۆر تایبەت بۆ ئەم مەبەستە ڕێکدەخرێ، ئەمە بە یەکییەتیی زایۆنیزم ڕادەگەیەنم..

**لە دەقە سەرەتاییەکەی یەکەمدا ئەم خاڵانە هاتبوون:**

١)حکوومەتی خاوەنشکۆ بە بنەمای زەرووڕەتی دووبارە دامەزراندنەوەی فەلەستین- وەك نیشمانێکی نەتەوەییی جووەکان- ڕازییە.

٢) حکوومەتەکەی خاوەنشکۆ سەبارەت بەو ڕێگە و ئامرازانەی بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجە پێویستن ئەوپەڕی وزە و توانای خۆی دەخاتەگەڕ و لەگەڵ ڕێکخراوی زایۆنیزم دەکەوینە گفتوگۆ.

بەمشێوەیە حکوومەتی بریتانی- بە نوێنەرایەتیی مستەر بەلفۆر- بەبێ هیچ کۆت و مەرجێك ملکەچی مەرجەکانی لۆرد ڕۆچیلد و هاوڕێ ڕێبەرەکانی ڕێکخراوی زایۆنیزم بوو.. پێوەندیی ئەو حکوومەتەش بەو جۆرە کەسانەوە، لە ڕازیبوون بە داواکارییەکانی دیکەیان بەدیاردەکەوێ، بەتایبەتیش داواکارییەکەیان بۆ دامەزراندنی

ریدینگ وەك سەرۆكی نێردەی ئابووریی بریتانی لە ویلایەتە یەكگرتووەكاندا، لە كاتێكدا خودی ئەم ریدینگ ناوە تەنیا سێر رۆفوس ئیسحاق بوو؛ كە ناوی بە ئابڕووچوونە بەناوبانگەكەی ماركۆنییەوە لكا.. باوەڕهێنانیش بە حكوومەتی بریتانی بۆ ئەوەی لەو پۆستە هەستیارەی دابنێ، بووە ئەرك و غەمی خودی رۆچیلد و هاوڕێیە سەركردە جوولەكانی وەك سێر هێربێرت صامۆئیل (كە دواتر بووە مەندووبی سامیی بریتانیا لە فەلەستین) و سێر ئەلفرێد مۆند (كە دواتر ناونیشانی لۆرد)ی پێ بەخشرا.

لۆرد ریدینگ چەند دانوستانێكی داراییی گرنگی لەگەڵ حكوومەتی ئەمریكیدا بەڕێوەبرد، ئەمتوانی نهێنییەكەی ئاشكرا بكەم.. بەڵام دەرئەنجامەكانی ئەو دانوستانانە بریتی بوو لە دووبارە رێكخستنەوەی بانكی ئینگلترا لەسەر چەند بنەمایەكی نوێ -دوای ساڵی ١٩١٩- و بەرقەراركردنی هەندێك پێوەندیی نهێنیی دارایی.. ئەمەی خوارەوە چەند پەرەگرافێكی نامەیەكە و ( یەعقووب شیف) لە ئەیلوولی ساڵی ١٩١٧ بۆ رێبەرێكی زایۆنیزمی ناردووە و ناوی (فریدمان) بوو: ئێستە من تەواو باوەڕم بەوە هێناوە، بووەتە شتێكی زۆر كردەیی و رێتێچوو بریتانیا و ئەمریكا و فەرەنسا لە كشت هەلومەرجێكدا یارمەتیمان بدەن، بۆ ئەوەی كۆچێكی بەردەوام و بەرفراوان بۆ گەلەكەمان رێكبخەین، بۆئەوەی بەرەو فەلەستین كۆچ بكەنەوە و تیایدا سەقامگیر بین.. دواتریش زۆر كردەییە دەستەبەری لە وڵاتانی گەورە وەربگرین بۆ ئەوەی گەلەكەمان سەربەخۆیی وەدەستبێنێ.. ئەمەیش لەو كاتەدا دەبێت كە ژمارەمان لە فەلەستیندا بگاتە رێژەیەكی پێویست، بۆ ئەوەی پاساوی ئەو داواكارییەمان هەبێت.

نامەیەکی دیکە هەیە نێوەڕۆکەکەی زۆر لەم نامەیەی سەرەوە مەترسیدارترە.. لە ٢٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٧دا لویس مارشاڵی نوێنەری دەستگەی کۆهن- لۆب بۆ ماکس سینیۆری زایۆنیی نووسیوە و تیایدا هاتووە: ماجۆر لیۆنیل دی ڕۆچیلد لە ڕێکخستنی جوولەکەی بریتانیدا بۆمی نووسیوە بەڵێنی بەلفۆر و ڕازی بوونی وڵاتانی زلهێز لەسەری، کردارێکی زۆر باڵای دیبلۆماسییە.. زایۆنیزمیش تەنیا کارێکی کاتیی نێو پلانێکی دوورمەودایە و تەنیا عەنبارێکی ڕازاوە و دڵڕفێنی چەکە و بەهێزترین چەکی لێ هەڵدەواسرێ.. هەروەها بۆ هێزە نەیارەکانی دەسەلمێنین نارەزاییەکانیان بەفیڕۆ دەچن، کەسانی نارازیش دەکەونە بەر چەندان فشاری ناخۆش و دژوارەوە.

ئەو پلانە دوورمەودایەی لەو نامەیەدا باسی لێوەکراوە، تەنیا ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی پارەدەرە نێودەوڵەتییەکان نیازی کۆنترۆڵکردنی تەواوەتیی ئابووریی جیهان و گشت سەرچاوەیەکی سرووشتی و هێزی مرۆیی و تەواوی گەردوونیان هەیە.

مستەر ئەسکویتی سەرۆکوەزیرانی ئینگلیز، لە ٢٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٥دا ئەم چەند برگە نووسینەی لە پەڕاوی ڕۆژانەیدا تۆمارکردووە: هەر ئێستە یادداشتنامەیەکم بەناونیشانی (ئایندەی فەڵەستین) لە هێربرت صامۆئیلەوە بەدەست گەیشتووە، ئەو پێی وایە دەتوانین سێ یان چوار ملیۆن جوولەکەی ئەورووپی لەو وڵاتەدا نیشتەجێ بکەین، ئەم بیرۆکەیەم وەك دەقێکی نوێی چیرۆکەکانی جەنگی خاچپەرستی هاتە بەرچاو.. ددان بەوەدا دەنێم ڕقم لەو پێشنیازانە دەبێتەوە کە بەرپرسیاریەتیی زیاتر دەخاتە سەر بەرپرسیاریەتییەکانمان.

ئەم دەستەواژانەی سەرەوە، بەلگەی تەواومان دەدەنە دەست کە مستەر ئەسکویت مەیلی بەلای زایۆنیزم نەچووە.. بێگومان لەو کانیشەوە چارەنووسی ئەسکویت و وەزارتەکانی بڕیاریان لەسەر درا.

زایۆنیزمەکان ماوەیەکی دووروودرێژ بوو پیشەسازییە جەنگییەکانیان ئینگلتراوایان خستبووە ژێر دەستی خۆیان.. کاتێکیش پیلانگێڕی و کودەتایەکە بڕیاری دژایەتیکردنی سیستەمی ئەسکویتی دژ بە زایۆنیزمی دا، کتوپڕ ئینگلترا خۆی لەنێو جەنگێك و لەبەردەم قەیرانێکی توندی پیشەسازیی کیمیاییدا دۆزییەوە کە بناغەی دروستکردنی فیشەك و تەقەمەنیی جەنگییە.. قەیرانەکە کارخانەکانی تۆپیشی گرتەوە و ناچار بوون دەست بە بەرهەمەکانییانەوە بگرن و سیاسەتی کەمخەرجی پێڕەو بکەن.. بێگومان گەلی بریتانیش تۆباڵەکەی خستە ئەستۆی حکوومەت.

سەرپەرشتیاری بەرهەمهێنانی کیمیایی لە ئینگلترا، سێر فریدریك ناسان بوو.. بۆ دەربازبوون لە قەیرانی بەرهەمهێنانی مادە کیمیاییەکانیش ئەرك و جێبەجێکردنی ڕێنماییەکان خرایە ئەستۆی کارگەکانی برۆنەر و مۆند، بۆ ئەم مەبەستەش پارەیەکی زەبەلاحی حکوومی تەرخان کرا.. بەلاّم خاوەنانی ئەم دوو کارخانەیە- بەڕێزان برۆنەر و مۆند جوولەکە بوون- و کارگەیەکی زەبەلاحیان لە سیلڤەر تاون دامەزراند.. هەرچەندە بە پارەی حکوومەتیش دامەزرا، بەلاّم کاتێك دەستی بە بەرهەمهێنان کرد، هۆکارەکانی پڕوپاگەندە و ڕۆژنامەوانیی سەر بە سووخۆرانی زایۆنیزم بوون و ستایشێکی بێپایانی برۆنەر و مۆندیان کرد و بەشێوەیەکی گەرموگوڕ ئەو کارە مەزنەیان دایە پاڵ ئەوان و سەرمایەدارانی جوولەکە و دەیانگوت لەو

کاتەی مەترسی لە چواردەوری بریتانیادا وریبوو، هەر ئەوان پاڵپشتیی بەرهەمهێنانی سەربازیی بریتانی بوون.. بەمشێوە ئەو ناوبراوانە بە ڕوخسارێکی جێبەجێکار پیشان دران، هەرچی تۆباڵیشە خرایە ئەستۆی حکوومەتەوە.. بەڵام هێندەی نەبرد کارگەی سیلفەر تاون کتوپڕ تەقییەوە، لەو تەقینەوە ڕێکخراو و بەئەنقەستەشدا چل کەس مردن و هەشتسەد ماڵ ڕووخان.. لە ئەنجامدا بەرهەمی کیمیاییانەی جەنگی سەرلەنوێ دووچاری پاشەکشە بوویەوە، دووبارە قەیرانەکە پەنجەی هەڕوگیفی لە وەزارەتەکانی ئەسکویت ڕادەوەشاندەوە.. پاڵەوانە ساختە و کارتۆنییەکانیش هیچ تۆباڵێکیان نەخرایە ئەستۆ و لە گشت سەرزەنشتێك پارێزراو بوون و بەردەوام بەشان و باڵایاندا هەڵدەدرا.. دەبێ ئەوەش بهێنینە بەرباس کە سێر ئەلفرێد مۆندی ناوبراو وەك نێردراوێکی پاشا سەرپەرشتیی کاروبارە کیمیاییەکانی دەکرد، دواتر خۆی لە فەڵەستیندا بووە سەرۆکی ئاژانسی جوولەکە.

ئینگلترا پابەندی یارمەتیدانی ڕووسیای هاوپەیمانی بوو، تفەنگ و فیشەکی بۆ دەنارد.. بەڵام لەگەڵ دەرئەنجامی ئەو کەموکورتییەی نێو بواری پیشەسازیی چەك و مادە کیمیاییەکانەوە، سوپای ڕووسیا لەبەرەی خۆرهەڵاتدا زەبری کوشندەی بەرکەوت، چونکە چەك و فیشەکی پێنەدەگەیشت.. ڕۆژنامەکان ڕایانگەیاند سەربازانی ڕووسی بە دار و بەرچیغ و مشتەکۆڵە شەڕیان دەکرد، دواتریش بە دەستی سەربازانی ئەڵمانی دەکوژران.. پرۆفیسۆر بێرنارد بارز نامەیەك بۆ لوید جۆرج دەنێرێ و تیایدا بە ڕوونی باس لەوە دەکات چەك و فیشەك بە ئەنقەست لە ڕووسیای قەیسەری بڕدراوە، تاکو زەمینەی گونجاو بۆ شۆڕش برەخسێندرێ.. نامەکەی بارز لە ساڵی ١٩١٥دا نووسراوە و

تیایدا هاتووە: لەسەرم پێویستە ڕاوبۆچوونی تەواو دروستی خۆم دەربڕم و بڵێم شکستی بەڕێزان فیکەر- ماکسیم و هاوبەشانیان لە بەرامەمکردنی چەك بۆ ڕووسیا- کە دەبووایە بەر لە پێنج مانگ بگاتە ئەو وڵاتە- کۆسپوتەگەرەی دەخستە بەردەم پێوەندیی نێوان هەردوو وڵات، بەتایبەتیش هاوکاری و پاڵپشتیکردنی یەکتری لە جەنگی مەنووکەییدا.. بێگومان هەواڵی تەواو دروستم پێگەیشتووە هیچ جۆرە پارمەتییەکی ئینگلترا نەگەیشتووەتە ڕووسیا.

(لوید) وەزیری دارایی و بەرپرسی پڕچەککردن و دەستەبەرکردنی تفاق و کەرەستەی دیکەی جەنگ بوو.. بەڵام بەڕێزان فیکەر- ماکسیم و هاوبەشەکانیان، لەژێر ئاڵای سێر ئەرنست کاسیلی بریکاری کاروبارەکانی دەستگەی کۆهن- لۆب لە نیویۆرك بوون، خودی ئەرنستیش وابەستەی خانەوادەی ڕۆچیلد و پارەدەرانی نێودەوڵەتیی ئینگلترا و فەرەنسا و ئەڵمانیا بوو.

ئەوجا بۆ ئەوەی بیسەلمێنین بەڕێزان فیکەر- ماکسیم و هاوبەشەکانیان لەوکاتیدا لەژێر کاریگەریی دەستگەی کۆهن- لۆب بوون، گوتەکەی بۆریز بەرازیل دەهێنینەوە: لە ٤ی شوباتی ساڵی ١٩١٦دا پارتی شۆڕشگێڕی ڕووسیی لە ئەمریکا کۆبوونەوەیەکی کرد و ٦٢ نوێنەری نێردراو بەشدارییان تیادا کرد.. تیایدا تاوتوێی ئەو ڕاپۆرتە نهێنییانە کرا کە لە ڕووسیاوە هاتوون و گەیشتوونەتە دەست پارتەکە، ڕاپۆرتەکان باس لەوە دەکەن کاتەکە گونجاوە.. هەروەها کەسانی نێو کۆبوونەوەکە دڵنیا کرانەوە کە لەلایەن کەسانێکی هاوسۆزی پرسی ڕزگارکردنی گەلی ڕووسییەوە گشت پارمەتییەك پێشکێش دەکرێ.. لەمبارەیەوە ناوی یەعقووب شێف چەندان جار

هاته نێو ناوان.. ئەم یەعقووب شیفەش لەو کاتیدا لەنێو نیویۆرك ئەندامێکی مەزنی دەستگەی کۆهین- لۆب بوو.. له کۆی شێست و دوو ئەندامی نێو کۆبوونەوەکەی شوباتی ساڵی ١٩١٦ دا نزیکەی پەنجا ئەندام بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەشدارییان لەشۆڕشی ساڵی ١٩٠٥ی ڕووسیادا کردبوو. جارێکی دیکەش لەسەریان پێویست بوو بۆ خەباتی شۆڕشگێڕی دنه بدرێن، بەڵام یەعقووب شێف پیلانی بۆ ئەوە دانابوو بەرهەمی شۆڕشەکه له لینین زەوت بکات.

کاتێکیش ئەنجوومەنی پارلەمانی ئەم نامەیەی (بارن)یان تاوتوێکرد کەوا ئاراستەی لوید جۆرج کرابوو، هەواڵەکان دەیانگوت لوید جۆرج بەرگریی لە سیاسەتی حکوومەتەکەی کردووە، دەبێ خێر و چاکه نواندن لەنێو وڵاتەوە دەستپێبکات، چونکه هێزه بریتانیەکانمان له فرەنسا دەجەنگن، بۆ هەر تیپێکیش تەنیا دوو ڕەشاشیان هەیە.. جا پێش ئەوەی چەك و تفاق بۆ ڕووسیا بنێردرێ، پێویسته سەربازەکانی خۆمان پڕچەك بکەین.. دەڵێن لۆرد کچنەر بەمشێوەیە وەڵامی لوید جۆرجی دابوویەوە: کاتێك دەبینم له پڕچەککردنی ڕووسیا شکستمان هێناوە، ئەوا چوار ڕەشاش بۆ هەر تیپێك بە دەستبڵاوی دەزانم و - ئاخر پێشتریش بەڵێنمان بەڕووسیا داوە- هەر ئەم هۆیەش بوو وایکرد هەر شەش سەربازی ڕووسی تاکه یەك تفەنگیان بەرکەوێ.

پیلانگێڕه جیهانییەکان ئەم قسەیەی کچنەریان بە دەرفەت زانی، فەرمانیان بە بەکرێگیراوانیان کرد هەوڵی لەکەدارکردن و ناوزڕاندنی بخەنە گەڕ.. هەواڵەکه له گشت جیهاندا بڵاوبووەوە و بەکرێگیراوەکان دەیانگوت: کچنەر چوار ڕەشاش بۆ هەر تیپێك به دەستبڵاوی دەزانێ و دەڵێ سەربازانی بریتانیا لە فرەنسا پێویستیان پێی نییە.. ئەم

ناوزڕاندنە تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت بەردەوامە، لە ژیاننامەی داڤید لوید جۆرجدا باسکراوە کە بەمدووابییانە دەرچووە، هەروەها لەهەمان ژیاننامەی پاکنووسکراودا و لە گۆڤاری هەفتانەی تۆرینتۆ ستاریشدا نیشکی خرابووە سەر.. من ڕاستیی هەنبەر ئەو ڕووداوە گرنگە مێژوویەم بۆ سەرنووسەری گۆڤاری ناوبراو نارد، ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی ئەو ڕاستکردنەوەیەی من داوای لێ دەکەم کارێکی دینامیکیە و چارەسەر ناکرێ، هەروەها گوتی نامەکەی منی گەیاندووەتە دەیلی ستار.. پێویستیش نییە بڵێم ڕاستییەکە هەرگیز بلاو نەکراوەتەوە.

ئینسکلۆپیدیای زانیاریی جوولەکە سەبارەت بە زایۆنیزم دەڵێ: جەنگی جیهانی بووە هۆی ئەوەی بە ناچاری مەڵبەندی ڕێکخراوی زایۆنیزم لە بەرلینەوە بگوازرێتەوە نیویۆرک.. تەواوی دەستەلاتەکانیش دراوەتە دەست لیژنەی کتوپڕی یەدەگی زایۆنی و نێل. دی. براندیسی دادوەری ئەمریکی سەرۆکی لیژنەکەیە.

یەعقووب دی هاس لە پەڕتووکەکەیدا بەناوی (لویس دیمبتر براندیس) نووسیویەتی:" بەلام نووسینگەی زایۆنی بۆ کۆچ، چەندان لقی لێ بووەتەوە و هێندە فراوان بووە گشت ئەو کەرتە جەنگییانەشی گرتووەتەوە کەوا هاوپەیمانان داگیریان کردووە، تورکیا و سووریا و فەلەستین و ئوردن و بەغداشی گرتووەتەوە.. ڕاستییەکەشی تاکە یەك قرش لەو ملیۆنانەی نووسینگەکە وەری گرتن بە فیڕۆ نەڕۆیشتن، بەلکو بۆ پێوەندی و سپاردن دەستی بە بەکارهێنانی نووسینگەکانی کاروباری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد، دواتریش نووسینگەکانی کۆچ سەرکەوتنێکی گەورەیان وەدەستهێنا، دەکرا پشتی پێ ببەسترێ.. تەنانەت وەزارەتی دارایی ئەمریکا پشتی پێی

بەست و بۆ گەیاندنی پارەپووڵ و ئەو نامانە پشتی پێ بەست کە حکوومەت نەیتوانی بە سەرکەوتوویی بیانگەیەنێ.. باڵیۆزخانەکانی پایتەختە ئەوروپییەکان بەپێی داواکاریی ئەمینداری نهێنیی دەستەی جێبەجێکاری ڕێکخراوی زایۆنی لە نیویۆرك، پارەی کاشیان دا".

فرای لە لاپەڕە ١مى پەڕتووکەکەی خۆیدا بەناونیشانی ( ئاوەکان دەڕژێنە خۆرهەڵات) نووسیویەتی:

لەو کاتییەوە، کاریگەرییان لە بازنە و پێگە سیاسییەکانی ئەمریکا و ئەوروپا و بەتایبەت لە نووسینگەی کۆچدا زیاتر و زیاتر بەدیارکەوت، چونکە نووسینگەی کۆچ دەیتوانی پارەوپووڵ و زانیاری بگەیەنێتە لایەنە تێکدەرەکانی نێو خاکی دوژمنەوە.

دوای ئەمە، دەبینین ئەنجوومەنە مەزنەکانی خۆرهەڵات جارێکی دیکە دەگەڕێنەوە نێو گۆڕەپانەکان، بۆ نموونە ئەرزیرگەر لە لاپەڕە ١٤٥ و ١٤٦ی پەڕتووکی (ئەزموونەکانم لە جەنگی جیهانیدا) نووسیویەتی: لە ١٦ی ئاداری ساڵی ١٩١٦دا هاوپەیمانیی ئیسرائیلی ٧٠٠,٠٠٠ فرەنکی دایە ئەنجوومەنی خۆرهەڵاتی مەزن لە پاریس، هەروەها دەشتوانین لەنێو دۆسییەکانی ئەنجوومەنەکە لە ڕۆمادا بیسەلمێنین دوو ملیۆن لیرەی ئیتاڵی لە ١٨ی ئاداری ساڵی ١٩١٦دا دراوەتە ئەنجوومەنەکە.. هێندەش کاڵفام نیم پێم وابێ هاوپەیمانیی ئیسرائیلی بە ئامانجی ناردنی ملیۆن لیرە بۆ یارمەتیدانی جووەکانی ئیتاڵیا، تەنیا سوێندخۆرانی بەکارهێنابێ.

ئەی ئێن فیلد لە پەڕتووکەکەی خۆیدا بەناونیشانی (ئەم هەموو شتانە)دا کاتێك سەبارەت بە ڕووداوەکانی دوای جیاکردنەوەی کۆمیت

له عێراق دەدوێ، له لاپەڕە ١٠٤ دا نووسیویەتی: کاریگەریی جووڵەکە لەسەر سیاسەتی بریتانیا ڕوون و ئاشکرایە، بەتایبەت دوای بەدیارکەوتنی بەڕێز لوید جۆرج.

هەروەها نێڵ فرای لە لاپەڕە ٥٥ی پەرتووکەکەیدا ( ئاوەکان دەڕژێنە خۆرهەلآت) نووسیویەتی: یەکەمین کۆبوونەوەی ڕەسمیی لیژنەی سیاسەتی زایۆنی لە ١٧ی شوباتی ساڵی ١٩١٧دا له ماڵی دکتۆر موسا گاستەر بەڕێوەچوو.. لەو کۆبوونەوەیەدا زۆر بە دووروودرێژی گفتوگۆ لەسەر ئەو بەرنامەیەی زایۆنی کرا کەوا وەك بنەمای دانوستانی ڕەسمی بەکاردەهێندرێ و چارەنووسی فەڵەستین و ئەرمینیا و ناوچەی نێوان دوو ڕووبار (عێراق) و مەملەکەتی حیجاز دەگرێتەوە.

بەلآم جی. ئێم. ئێن. جیفریس لە لاپەڕە ١٢٩ئەو پەرتووکەی وەك بەڵگە هێنامانەوە، چەند زانیارییەکی دیکەی دەخاتە سەر: وردەکارییەکانی ئەو کۆبوونەوەیە بە کۆدی نهێنی گەیەندرانە ڕێکخستنی زایۆنیزمی نێو ویلایەتە یەککگرتووەکان.. لەمڕۆ بەدواوەش ڕێکخستنی زایۆنی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەست لە دارشتنی سیاسەتی بریتانی وەردەدات و پرسە نێوخۆییەکانی بریتانیاش ئاراستە دەکات.

جا بۆئەوەی بەشێوەیەکی هەستپێکراو ئاستی دەستهەلآت و کۆنترۆڵی پارەدەرانی نێودەوڵەتی بەسەر پرسەکانی حکوومەتی بریتانی بخەینە بەرچاو، گوتەکەی صمۆئیل لاندمان دەهێنینەوە، ناوبراو دەڵێ: دوای ئەوەی سێر مارك سایکس و وایزمان و سۆکۆلۆف ڕێککەوتن، بڕیار درا نامەیەکی نهێنی بۆ دادوەر براندیسی سەرۆکی لیژنەی لە ناکاوی یەدەگی زایۆنی لە نیویۆرك بنێردرێ و تیایدا پێی

ڕابگەیەنـدرێ حکوومـەتی بریتـانی لەبەرانبـەر هاوسـۆزییەکی کـارای جوولەکـە و پشـتگیریکردنیان لـە پرسـی هاوپـەیمانان لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئامادەیە یارمەتیی جوولەکە بدات بۆ ئـەوەی فەڵەستین وەدەستبێنن، بـەو مەرجـەی شـەپۆڵ و ڕەوتێکـی بـەهێز بهێنێتە ئاراوە پاڵپشتیی بەشداریکردنی ئەمریکا بکات لە جەنگدا.. ئەو نامەیەش بە کۆدی نهێنـی و بـەهۆی نووسـینگەی وەزارەتـی دەرەوەی بریتانیاوە ناردرا، هەروەها چەند نامەیەکی دیکـەی نهێنـی لـە ڕێگـەی ژەنەڕاڵ ماکدۆنۆوە بـۆ سـەرکردە زایۆنییـەکانی نێـو ڕووسیا نـاردرا.. دکتـۆر وایزمـانیش (یـەکێك لـە دامەزرێنـەرانی دەسـتگەی زایـۆنیزمی سیاسی) توانی لە ڕێگەی حکوومەتەوە لێخۆشبوون لە خزمەتی شەش گەنجی زایۆنی دەستەبەر بکات، بۆئـەوەی بەشێوەیەکی کـارا لـەپێناو پرسی زایۆنیدا چالاکی بنوێنن.. چونکە لـەو کـاتی خزمـەتی سـەربازی زۆرەملێ بوو، تەنیا ئەو کەسانەش چاویان لێ پۆشرا کە کار و چالاکیی گرنگیـی نیشـتمانییان بـەڕێوەدەبرد، نـەدەبوو لەبـەرەکانی پێشـەوەی جەنگدا خزمەتی سەربازی پێشکێش بکـەن.. مـن بیرمـە کاتێك دکتـۆر وایزمـان نامەیـەکی بـۆ ژەنـەڕاڵ ماکـدۆنۆی (بەڕێوەبـەری کـردە سەربازییەکان) نووسی و تیایدا داوای یارمەتیی دەکرد بۆ ئەوەی لیۆن سیمۆن و هاری ساشر و سمۆن مـارکس و هابـا مسـۆن و تولکۆسکی و منـیش لـە خزمـەتی سـەربازی ببـوردرێین.. هـەروەك چـۆن دکتـۆر وایزمـانیش داوای کـرد، مـن لـە نووسـینگەی جەنگییـەوە گوازرامـەوە وەزارەتی ڕاگەیاندن و دواتریش لە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٦ بۆ نووسینگەی زایۆنی گوازرامەوە.. لەو کاتیەوە و بـۆ مـاوەی چـەندان ساڵ من زایۆنیزمم بە هاوپـەیمانی حکوومـەتی بریتـانی زانیـوە.. هیچ

ئەنگوچەڵمەیەکییش لە وەدەستهێنانی پاسپۆرت یان هاتووچووی هەر کەسێك دروست نەدەبوو، ئەگەر نووسینگەکەی ئێمە پشتگیریی کردبایە.. بۆ نموونە من ناسنامەیەکم واژۆ کرد خاوەنەکەی عوسمانییەکی جوولەکە بوو، نووسینگەی نیشتمانیی بریتانی پەسندی کرد و وەك هاوڕێیەك ڕەفتاری لەگەڵ هەلگرەکەی کرد نەك وەك دوژمنێك، چونکە وەها باوبوو وەك دوژمنێك ڕەفتار لەگەڵ لووبیی تورك دەکرا.

شرۆڤەکردنی ژیانی دزرائیلی ئەوەی ڕوونکردووەتەوە ناوبراو لە لەندەن چەندان شەوی یەکشەممانی لەلای خانەوادەی ڕۆچیڵد بەسەر بردووە.. هەروەها ئەوەشی خستووەتە بەرچاو لەو کاتەی دەستگەی کۆهن- لۆب لە نیویۆرکدا پارەی بۆ شۆڕشی جوولەکەی نێو ڕووسیا دەنارد، ڕۆچیڵدییە لەندەنییەکان لەو شارەدا بەڕێوەبەری کاری قەیسەر بوون.. هەروەها دەشزانین خانەوادەی ڕۆچیڵد لە لەندەن لەگەڵ پارتی ڕزگاریخوازدا بوون و لەنێوان سالانی ١٨٤٠- ١٩١٧ ڕۆژنامەوانیی ڕزگاریخوازانی سەر بە بنەماڵەی ڕۆچیڵد بوو ، دژی ڕووسەکان بوو. هەروەها دزرائیلیش ڕایگەیاندووە سەرکردە سیاسی و داراییەکان لە ئەڵمانیا بە کەسانی دژبەر دەزانندران، چونکە ڕێگەیان بە پارەدەرانی نێو دەوڵەتی نەدابوو بە ئارەزووی خۆیان چییان بوێ بیکەن.. نوێنەری بنەماڵەی ڕۆچیڵد لە ئەڵمانیا بارۆن فۆن بلیشریدری بەرلینی و خانەوادەی واربرگ بوون لە هامبۆرگ.. لە ڕووسیاشدا بنەماڵەی ویتشتاین لە ئەوروپا یارمەتیی بنەماڵەی گینزبرگیان دا لە سانت پترسبۆرگ بۆ ئەوەی لەو ولاتەدا گرنگی بە بەرژەوەندییەکانی ڕۆچیڵد بدەن. هەروەها پیاوێکی دیکەش هەیە لەپێناو بەرژەوەندیی

پارەدەرە نێودەوڵەتییەکاندا چالاکییەکی بێوێنەی نواندووە و ناوی ئوتۆ کاهن بووە.

ناوبراو لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی تیایاندا ژیاوە توانیویەتی لەپشت ئاڵای نیشتمانیدا زۆرێك لە ڕاستییەکانی هەنبەر ئامانجەکانی خۆی وەك شۆڕشگێڕێکی جیهانی بشارێتەوە، لە هەر وڵاتێکیشدا ژیابێت وەك هاوڵاتییەکی شەیدا و عاشقی وڵاتەکە خۆی نواندووە.. بەڕێز ئۆتۆ کاهن لە ئەڵمانیا ژیاوە، دواتر وەك پۆل واربرگ چووەتە ویلایەتە یەکگرتووەکان. وەك ناوبراویش بووەتە دەستگەی کۆهین– لۆب.. ڕاستەوخۆش دوای گەیشتنی بە ئەمریکا لەلای سپایر و هاوبەشەکانی کاری نووسەریی دەستکەوت، ئەمەیش بۆ ئەوە بوو وا بکات شتەکان بە ئاسایی بێنە بەرچاو.. دواتریش نەوەیەکی بەڕێز ولفی وەك هاوژین خواست، بەڕێز ولفیش یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی دەستگەی کۆهن– لۆب و هاوبەشەکانی.. کاتێکیش خاتوو کاهن لە ساڵی ۱۹۳۱دا سەردانی مۆسکۆی کرد، لە لایەن حکوومەتی ڕووسییەوە بە ڕەسمی پێشوازی لێکرا و لەسەر شەرەفی ئەودا خوان و داوەتێکی گەورە و چەندان پێشوازیی جۆراوجۆریان بۆ ڕێکخست.. کاتێکیش بە سەر ڕێگە و شەقامەکاندا ڕەتبوو، سوپای سوور بەڕیز وەستابوون و پێشوازییان لێی دەکرد.

لە ۲ی ئەپریلی ساڵی ۱۹۳٤دا گوتارێك لە دەیلی هێراڵد بڵاوبوویەوە و بەڕێز هانین سوافار نووسیبووی و تیایدا هاتبوو: ماوەی چەندان ساڵە (ئوتۆ کاهن)ی ملیۆنێر دەناسم.. لەو کاتەدا ناسیم کە نیشتمانپەروەرێکی ئەڵمانی بوو، هەروەها لەو کاتەش ناسیم کە بووە نیشتمانپەروەرێکی ئەمریکی.. کاتێکیش ویستی بچێتە نێو

ئەنجوومەنی گشتیی بریتانییەوە زۆر ئاسایی بوو بچێتە نێو پارتی نیشتمانییەوە.. هەروەها دەیتوانی ببێتە سەرۆکی یەکییەتیی گشتیی قسەکەر بە زمانی ئینگلیزی، بەلاّم چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی بە رێکەوت ئاشکرابوون، چونکە بەلگە کەوتە بەردەست و ڕوونبوویەوە ماڵەکەی لانەی بەکرێگیراوانی سۆڤییەتییە، وەك: نینا سمۆرۆدین و کلێر و شاریدان و لویس بریانت و مارگرێت هارسۆن.

لە هاوینی ساڵی ١٩١٧دا لە ستۆکهۆڵمی سوید نوێنەرانی بەرژەوەندییە بانکییەکانی بریتانیا و ئەڵمانیا و فرەنسا و ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆبوونەوە.. هەروەها بەڕێز برۆتۆ بۆیۆفی وەزیری نێوەخۆی ڕووسیش تیایدا بەشداربوو، بەڕێز واربرگیش لە هامبۆرگ یەکێك بوو لە ئامادەبووانی نێو کۆبوونەوەکە.. ئەوەی دوایی برای پۆل واربۆرگی هاوبەشی دەستگەی کوهن- لۆب و هاوبەشانی نیویۆرك بوو و ڕەشنووسی یاسای سیستمی یەدەگی فیدراڵیی ساڵی ١٩١٠ی نووسی.. شاندی گشت ولاّتانی نێو جەنگیش بەشداربوون، بۆ ئەوەی بریاری پاڵپشتیکردنی مادیی بۆ لینین و ترۆتسکی دەربچێت و لە هەمان کاتیشدا حکوومەتی سۆڤیەتیی لەنێو ببەن، لە کۆتاییشدا بریار دەردەچێ و دەستگەی کوهن-لۆب لە نیویۆرکدا ٥٠ ملیۆن دۆلار دەخاتە بەردەستی لینین و ترۆتسکی.

ئەفسەرانی هەواڵگریی نهێنیی بریتانی و ئەمریکی سەبارەت بەو ڕاستییانە چەند ڕاپۆرتێکیان بۆ حکوومەتەکانیان نارد.. ئەی ئێن کرۆمیی ئەفسەر لەکاتی بەرپەرچدانەوەی جەماوەری شۆڕشگێڕ کوژرا کە لە سانت پترسبۆرگدا هێرشیان دەکردە سەر کونسلگەری بریتانی، ڕووداوەکەش بەمجۆرە بوو: ئەفسەری ناوبراو دەیویست شۆڕشگێران

لە شوێنی کۆبوونەوەکە دووربخاتەوە، بۆ ئەوەی کەسانی نێو کۆبوونەوەکە بتوانن بەڵگەنامەکانی تایبەت بە مەسەلەکە و چەندان کاروباری دیکە بسووتێنن، بەڵام شۆڕشگێڕان کوشتیان.

دواتریش حکوومەتی ئەمریکی چەند ڕاپۆرتێکی بۆ حکوومەتی بریتانی نارد کە لەلایەن ئەفسەرانی هەواڵگریی خۆیەوە بەدەستی گەیشتبوون.. هەروەها بەڕێز ئۆدنندایکی وەزیری زەوییە نزمەکان لە پترۆگراد- کە دوای مردنی کۆماندۆ کروومی، لە ڕووسیا پیاوی بەرژەوەندییەکانی بریتانی بوو - هۆشداری دایە حکوومەتی بریتانی.. هۆشدارییەکەش وەك بەشێك لە کاغەزێکی سپیی تایبەت بە شۆڕشی بەلشەفی لە نیسانی ساڵی ١٩١٩دا لەلایەن کینگز پرێنتەر بلاو کرایەوە.

پلانەکەی یەعقووب شێفیش سەبارەت بە ڕێگەدان بە ترۆتسکی و دارودەستە چەتەکەی بۆ گەڕانەوە لە نیویۆرك بەرەو سانت پترسبۆرگ، لەو کاتەدا شکستی هێنا کە کەسانی ڕەسمیی حکوومەتی کەنەدی لە هالفاکسی هەرێمی وفاسکۆشیادا لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەیان بەرەو ڕووسیا، دەستبەسەری کردن.. لێرەدا هەژموون و دەستەهڵاتی پارەدەرانی نێودەوڵەتی، واتا ئەوانەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ناڕەزاییان پێشکێشی حکوومەتە پێوەندیدارەکان کرد کاراییی خۆی سەلماند، چونکە ترۆتسکی و گشت ئەندامانی چەتە شۆڕشگێڕەکانی ئازادکران، ڕێگەشیان پێ درا بە سەلامەتی لە کەرت و ناوچە باش پارێزراوەکانی بریتانیدا بپەڕنەوە.

بەڵگەیەکی دیکەی وابەستەیی و پێوەندیی سیاسییە بریتانییەکان بە شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ی ڕووسیاوە هەیە و دکتۆر پترۆفسکی

وەدەستیهێناون، بەڵگەکە تیشک دەخاتە سەر گەمە و سیناریۆیەکەی سێر بچانانی بالیۆزی بریتانی.. پترۆفسکی سەلماندوویەتی گەرچی حکومەتی لوید جۆرج دەیزانی لەپشت پەردەوە چی دەگوزەرێ، بەڵام یارمەتیی ترۆتسکی و سەرکردە شۆڕشگێڕەکانی داوە، بگەنە ڕووسیا.. لە هەمان کاتیشدا سەرکردایەتیی باڵای ئەڵمانیا یارمەتیی پارەدەرانی نێودەوڵەتیی داوە بۆئەوەی لینین و دارودەستە چەتەکەی لە سویسراوە بگەیەننە پترۆگراد.. بۆ ئەم مەبەستەش فارگۆنێکی تایبەت بۆ لینین و شوێنکەوتەکانی تەرخان کراوە بۆ ئەوەی لە سەفەرەکەیاندا بەنێو خاکی ئەڵمانیا بیانگەیەننە جێگەی مەبەست.

بەڕێز پترۆفسکی ڕوونی دەکاتەوە میلیۆکۆف- کەوا لە ساڵی ١٩١٧دا وەك وەزیری کاروباری دەرەوە لە حکومەتی ڕووسیا دامەزراوە- هەر خۆیشی سەبارەت بە کودەتایەکە چووەتە نێو دانوستانەوە، لە دانوستانەکەدا هەردوو دەوڵەتی شەڕکەری دژ بەیەك ( ئەڵمانیا و بریتانیا) تیایدا بەشداربوون.

زانراوە وەك پاداشتێك لەهەنبەر ئەو هاوکارییەی ژەنەراڵ ستانی ئەڵمانی پێشکێشی کردبوو، حکومەتی بریتانی لەسەر داوای میلیۆکۆف ڕازی بوو ئێم. ئێم لیتفینۆف ئازاد بکات، ناویراو وەك سیخوڕێکی ئەڵمانی لەلایەن ئەفسەرانی سەر بە هەواڵگریی بریتانی دەستگیرکرابوو.. بەڵام ئاشنابوون بە کەسییەتیی لیتفینۆف زۆر گرنگە، ناویراو ناوی تەواوی فینکلنستان بووە.. کاتێکیش تەڤلی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی بووە، ناوی خۆی گۆڕیوە و بووەتە مایرۆواڵاش.. کاتێکش پێوەندییەکەی لەگەڵ پارتی بەلشەفی و لینین پتەو بوو، جارێکی دیکە بەناوی ماکسیم لیتفینۆف دەرکەوتەوە..

ماکسیم هەمان بلیتنفینۆفی سیخوڕی ئەڵمانی بوو، هەر هەمان کەسیش بوو لە کاتی بەخشینی کاغەزی دراویی جۆری پێنجسەد ڕۆبلی کە ستالین بەهۆی دزینی بانکی تیفلیسەوە دەستی کەوتبوو، دەستگیرکرا.

هەر ڕاستەوخۆش دوای ئازادبوونی، لیتفینۆف گەڕایەوە ڕووسیا، یارمەتیی حکوومەتی کاتیی کیرننسکی و دواتریش بزووتنەوەی مەنشەفیکی سۆفییەتیی دا.. دواتریش لە ساڵی ١٩٢٠-١٩٢٩ پۆستی یارمەتیدەری ستالینی بۆ کاروبارە دەرەکییەکانی وەرگرت. لە ساڵی ١٩٢٥یشدا وەك ئەندامی لیژنەی مەرکەزیی پارتی کۆمۆنیستی دانرا.. توانای لیتنفۆف بۆ تیرۆرکردن و وەرگرتنی پارەوپووڵی دزراو و کارکردن وەك سیخوڕ و سەرۆك چەتەیەکی نێو دەوڵەتی و ڕابەری چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی نێو ولاتان، بوونە هۆی ئەوەی زۆربەی ولاتانی جیهان وەك سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاسایش لە نەتەوە یەککگرتووەکاندا پێشوازیی لێبکەن و پەسندی بکەن!!.. ئەمەیش ڕاستییەك ڕوون دەکاتەوە کە نوورانییەکان بەشێوەیەکی ڕووکەش هەژموونیان بەسەر کەسانی دەستهەڵاتداری نێو نەتەوە یەککگرتووەکاندا هەیە!

بەمشێوەیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە حکوومەتی ئینتیلافی بریتانی کە لە دیسێمبەری ساڵی ١٩١٦دا دەستهەڵاتی لە ئەسکویتی سەرۆکوەزیران وەرگرت، هیچ شتێکی نەکرد تاکو ڕێگە لە پیلانەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی ڕووسی بگرێ کە لەلایەن پارەدەرانی نێودەوڵەتییەوە نەخشەی بۆ کێشرابوو، گەرچی دەشیزانی سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە دەبێتە هۆی کێشانەوەی سوپای ڕووسی لە بەرەکانی

جەنگدا.. بەڵگەش بۆ ئەوەی زایۆنییەکان لە بریتانیا و ئەمریکادا بۆ ڕووخاندنی ئیمپراتۆریای ڕووسی ڕێککەوتوون ئەوەیە لینین لە نۆڤێمبەری ساڵی ١٩١٧دا دەستهەڵاتە دکتاتۆرییەکەی خۆی ڕاگەیاند، لە هەمان کاتیشدا لوید جۆرجیش ڕایگەیاند سیاسەتی حکوومەتی بریتانی ئەوەیە پاڵپشتی لە دامەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی جوولەکە لە فەڵەستیندا بکات.. ئەمەیش دەیسەلمێنێ گەرچی ڕووسیا هاوپەیمانی بریتانیا بووە، بەڵام کاتێک پارەدەرانی نێودەوڵەتی ڕووسیایان لە مەیدانی جەنگ هێناوەتە دەرەوە لوید جۆرج هیچ ڕق و کینەیەکی لەهەنبەریاندا لە دڵ نەگرتووە.

سووخۆرەکان گرنگیدانی خۆیان ئاراستەی فەڵەستین کرد، بۆ ئەوەی ببێتە مەڵبەندێکی گونجاوی جوگرافیی جێبەجێکردنی پیلانە گشتییەکەیان کە بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی جیهان.. جگە لەمانەیش، دەیانزانی بەناوبانگترین جیۆلۆجییە جیهانییەکان، ئاشکرایان کردووە چەند ناوچەیەکی بەرفراوان هەن سامانێکی زۆری کانزاییان تیادایە و دەکەونە ناوچەی دەوروبەری دەریای مردوو.. لەبەرئەوە ئەو کەسانە بڕیاریان دا زایۆنیزمی سیاسی بگرنەبەر، بۆئەوەی دەوڵەتانی جیهان ناچار بکەن ددان بە نیشتمانێکی نەتەوەیی جوولەکە دابنێن لە فەڵەستین، بەشێوەیەک دەوڵەتێکی سەربەخۆیان هەبێت و بتوانن بە پارە و هەژموونی خۆیان کۆنترۆڵی بکەن.. جا ئەگەر پیلانەکەیان بۆ هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانی ئامانجە دوورمەودایەکانی پێکا، ئەوساکە لەپێناو فراوانترکردنی سنووری هەژموون و فەرمڕەوییەکەیان دەوڵەتە سەربەخۆیەکەیان بەکاردێنن، بۆ ئەوەی

گشت گەلێك بگرێتەوە.. كاتێكیش ئەمە دێتەدی، دەتوانن ڕێبەرەكەیان وەك پاشای گەردوون و خواوەندی سەرزەوی دابنێن.

دوای دەرچوونی بەڵێنی بەلفۆریش كە هەریەكە لە بریتانیا و فرەنسا و ولایەتە یەكگرتووەكان پشتگیرییان لێ كرد، چەند فەرمانێك بۆ لۆرد للنبی دەرچوو توركەكان لە ئاسیای بچووكدا وەدەربنێ و خاكی پیرۆزیش داگیر بكات.. هەروەها نیازەكانی پشت ڕادەستكردنی فەڵەستینی بۆ جوولەكە ئاشكرا نەكرد، هەتا عەرەبەكان بەتەواوی یارمەتیی لۆرد للنبیان دا ئامانجەكانی وەدی بهێنێ!

هەستی گشتی لەو كاتیدا ئەوەبوو فەڵەستین بووە پارێزراو (محمیە)یەكی بریتانی.. بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەی فەڵەستین داگیركرا، سووخۆرانی جیهانی داوایان لە حكوومەتی بریتانی و هاوپەیمانان كرد لیژنەیەكی زایۆنی لە فەڵەستین پێكبهێنێ و نوێنەرە سیاسییەكانیان تیایدا بكرێنە ئەندام، بەو مەرجەی ئەركی ئەو نێردەیە پێشكێشكردنی ئامۆژگاری بێت بە ژەنەڕاڵ كلایتۆنی حاكمی سەربازیی فەڵەستین، هەروەها وەك هۆكارێكی پێوەندی لەنێوان جوولەكە و سەركردایەتی سەربازی كار بكەن.. ئەو لیژنەیە ڕێك لە ڕێكەوتی ٨ی ئاداری ساڵی ١٩١٨دا دەستبەركاربوو، ئەندامەكانیشی ئەمانە بوون:

– كۆلۆنیل نورمسبای گۆر– كە دواتر بە لۆرد هارلیك دەناسرا– بەڕێوەبەری بانكی میدلایند و بانكی ستانداردی باشووری ئەفریقیا بوو.

– كۆلۆنێل جیمس دی ڕۆچیڵد، كوڕی ئەدمۆن دی ڕۆچیڵد، سەرۆكی لقی فرەنسای خانەوادەی ڕۆچیڵد و دامەزرێنەری ژمارەیەكی زۆری نشینگە جوولەكەكانی فەڵەستین بوو.. دواتریش ناوبراو لە ساڵانی نێوان ١٩٢٩ و ١٩٤٥ بووە ئەندامێكی ئەنجوومەنی گشتیی

بریتانی، پاشان چەرچڵ لە حکوومەتە کرێکارییە ئیئتلافییەکەدا کردییە وەزیری کاروباری پاڕلەمانی.

– جێدار (ملازم) ئەدوین صامۆئیل کە لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا وەك بەڕێوەبەری چاودێریی حکوومەتی بریتانی دامەزرا.. کاتێکیش ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ دامەزرا، کرایە بەڕێوەبەری ئێستگەی ئیسرائیل.

– مستەر ئیسرائیل سیف، بەڕێوەبەری کۆمپانیایە زەبەلاحەکانی مارکس و سپێنسەری بریتانی.. هەروەها پێوەندیی توندۆڵی لەگەڵ سووخۆرانی نێودەوڵەتیدا هەبوو.

– لیۆن سیمۆن، دواتر پلەی سوارچاکی وەدەستهێنا، بووە بەڕێوەبەری بەرپرسی نووسینگە گشتییەکانی پۆستە لە بریتانیا.. گشت ئامێرەکانی تەلەفۆن و سەرجەم جۆرەکانی پێوەندیی بێتەلی کۆنترۆڵ کرد.

– ئەندامەکانی دیکەی لیژنەکە بریتی بوون لە: دکتۆر ئیلدەر، جۆزێف کارین و حاییم وایزمان، هەرهەمووشیان هاوڕێی نزیکی زایۆنییە دەوڵەمەندەکانی نێو ئەمریکا بوون. سێر ستورز دەڵێ: پێش ئەوەی کۆنگرەی ئاشتی ببەسترێ و تەنانەت پێش کۆتاییهاتنی جەنگ، ئەو لیژنەیە ناردرایە فەڵەستین بۆئەوەی کەش و زەمینەیەکی لەبار بۆ دامەزراندنی نیشتمانی نەتەوەیی بۆ جوولەکەکان برەخسێنی و هاوکاران و یارمەتیدەرانیان بجوولێنن یارمەتیی مادییان بدەن.

# بەشی دەیەم

# پەیماننامەی فرسای

پەیماننامەی فرسای یەکێك بوو لەو بەلگەنامە ستەمکار و نادادپەروەرانەی نوێنەرانی ولاتانی بەناو پێشکەوتوو و مەدەنی واژۆیان کرد.. ئەم ستەمە بووە هۆی ئەوەی گەلی ئەلمانی جەنگێکی دیکەی جیهانی هەلگیرسێنن و جەنگەکە ببێتە نەهامەتییەك کەس نەتوانێ خۆی لێ ببوێرێ.

سەرەتا پێویستە درك بە راستیی ئەو هەلومەرجانە بکەین کە لە تشرینی دووەمی سالی ١٩١٨دا چوار دەوری واژۆکردنی ئاگربەستیان تەنیبوو، چونکە سەرکردایەتیی بالای ئەلمانی لەبەر مەترسیی شکستهێنانی هێزەکەی داوای ئەو ئاگربەستەی نەکرد، بەپێچەوانەوە هێزەکانی ئەلمانیا لە گۆرەپانی جەنگدا دووچاری هیچ جۆرە شکستێك نەببوون.. بەلام سەرکردایەتیی بالای ئەلمانی داوای ئاگربەستەکەی کرد بۆ ئەوەی بتوانێ رووبەرووی هەلگیرسانی شۆرشی کۆمۆنیستیی ولاتەکەی ببێتەوە.. چونکە رۆزا لۆکسمبۆرگ و رێکخستنەکەی کە جووەکان کۆنترۆلیان کردبوو، پیلانیان دەگێرا هاوشێوەی شۆرشەکەی لینین لە رووسیا، لە ئەلمانیاش شۆرش بکەن.

بەلام ئەو هۆیانەی وای کرد سەرکردایەتیی بالای ئەلمانی لە مەترسیی بەرەی ناوخۆیی دلنیا بێتەوە بەمشێوەیە بوو:

شانە نوسـتووە شۆڕشـگێڕەکانی ڕۆزا لۆکسـمبۆرگ توانیـان دزە بکەنـە نێـو کەشـتیگەلی دەریـایی ئەڵمانییـەوە، لـە سـاڵی ١٩١٨ چالاکییەکەیان توندتر بـوو و چەند پڕوپاگەندەیەکیان بـڵاو کـردەوە گوایە سەرکردە ئەڵمانییـەکان بڕیاریـان داوە کەشتییە جەنگییـەکان و کەشـتیوانەکانیش لـە جـەنگێکی هاویەشـی دژ بـە کەشـتیگەلەکانی ئـەمریکا و بریتانیـادا بکەنـە قوربـانی، دەنگۆیـەکی دیکەشـیان بـڵاو کردەوە گوایە ئـەو کردەیـە ئامـانجی پەکخسـتن و ئیفلیجکردنـی هێـزە هاوپەیمانەکانە، بەشێوەیەك ڕێگە بۆ سەروەرانی ئەڵمانییەکانی جـەنگ خۆش بکـات بـەبێ هـیچ بەرهەڵسـتییەك کـەناراوەکانی بریتانیـا داگـیر بکـەن.. ئـەو شـانە کۆمۆنیسـتییانە لـەپێناو سـەرهەڵدانی یـاخیبوون، پاڵپشت و هاندەری چەند پڕوپاگەندە و دنەدانێك بـوون ، بـەردەوامیش دەیانچرپاند هێرشەکە وەکات شکست دێنێت، چونکە زانایـانی بریتـانی توانیویانە چەکێکی نهێنی و نوێی کیمیـایی ئامـادە بکـەن، چـەکەکەش توانا بە هاوپەیمانان دەبەخشێ کەشتییەکانیان بسـووتێنن و بـە گـڕی ئاگر چوار دەوریان بتەنن، ئاگر و گەرمی و کەمبوونەوەی ئۆکسجینیش دەبێتــە هــۆی کــوژرانی گشــت بوونــەوەرێکی زینــدوو.. دواتــریش تێکـدەرەکان جــەختیان لەسـەر ئــەوە دەکـردەوە تاکـە هۆکـاری دەربازبوون لەو مەترسییە، شۆڕشە لەپێناو کۆتاییهێنان بە جەنگ.. لە ٢ی تشـرینی دووەمـی سـاڵی ١٩١٨دا سـەربازانی دەریـاوانیی ئـەڵمانی یاخی بوون.. لە ٧ی تشرینی دووەمیش یەکەیەکی گەورەی ژێرئاوکـەر کە بەرەو بەرەی خۆرئاوا دەچوو، ڕایکرد، چـونکە پێیـان گوترابـوو بۆ داگیرکردنی بریتانیا وەك سەری ڕم بەکاردەهێندرێن.

لەو کاتیدا، ئاشووب و پشێوی ببووە هۆی پەککەوتنی ژمارەیەکی زۆری مەڵبەندەکانی پیشەسازیی ئەڵمانی، هەروەها تێکدەرەکان دەیانویست ورە و مۆراڵی گشتی دابەزێنن، باروبۆخەکە وەها تێکچوو کار گەیشتە ئەوەی قەیسەر لە ٩ی تشرینی دووەمدا واز لە عەرشی دەستهەڵات بێنێ.

دوای سازشەکەی قەیسەر پارتی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی حکومەتێکی کۆماریان پێکهێنا و لە ١١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨دا ئاگربەستەکەی مۆرکرد.. بەڵام پشێوی و ئاشووب هەر بەردەوام بوو، ئەمجارە دژی سۆسیالیستەکان توندوتیژییەکی زیاتری بەخۆیەوە بینی، ئانەوەی ئەو پشێوییەش بەهۆی چەند شانەیەکی کۆمۆنیستیی بوو کە ڕۆزا لۆکسمبۆرگ کارتە گەورە و گرنگەکەی خۆی تیادا بەکارهێنا و مەرجی لەسەر حکومەتی ئەڵمانیا دانا لەبەرانبەر کۆتایی هێنان بە ئاشووب و پشێوییەکە سوپا هەڵوەشێنێتەوە.. ئەم کارەش لەبەردەم سەرکردایەتیی باڵای ئەڵمانیا بووە لەمپەر و نەیانتوانی سوپایە ڕێکوپێکەکەیان بۆ ڕێگەگرتن لەو شۆڕشەدا بەکاربێنن کەوا لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٨ ڕاگەیەندرا.

دوای شکستهێنان و ڕووخانی شۆڕشە یەهوودییەکەی ڕۆزا لۆکسمبۆرگ، گەلی ئاریی ئەڵمانی بەڵێنی دا تۆڵە لە گەلی جوولەکە بکاتەوە، بۆیێ هەزاران جوولەکەیان کوشت، هەروەها شەوانە ژن و پیاو و گەورە و بچووك دەستگیر دەکران و دەدرانە بەر دەستدرێژی گوولله.. ڕۆزا و کارل لیبکنیشتی یارمەتیدەریشی دەستگیرکران و ئەفسەرێکی ئەڵمانی وەك بڵێی ئاو بخواتەوە مێشکیانی بە گوللە پرژاند.

جا بۆ ئەوەی ئاستی ڕقوکینەکە بەرزتر بکەنەوە و ئاگری دوژمنایەتیی دژ بە جوولەکە هەڵگیرسێنن، ئەو کەسانە بە ئەنقەست بەرپرسیاریەتیی شکستە سەربازییەکەیان دەخستە ئەستۆی جوولەکەکان، هەروەها پڕوپاگەندەشیان کرد و دەیانگوت جوولەکە بەرپرسی بەندەکانی پەیماننامەی ستەمکارانەی فرسان.. لە لایەکی دیکەوە بە کێشانی وێنەی بریتانیاو فەرەنسا و ویلایەتە یەککگرتووەکان وەك دەوڵەتانی خۆپەرستی سەرمایەداریی ژێر کاریگەریی پارەدەرانی جیهانی، پڕوپاگەندەی تایبەت بە ئاراستە و خەتی نیشتمانیی سۆسیالیستی لە ئەڵمانیا دوو هێندە کرایەوە، بەمشێوەیە ڕێگەیان بۆ پەیدابوونی هێتلەر خۆشکرد.

(لینین)یش ڕاستەوخۆ دوای واژۆکردنی پەیماننامەکە ڕایگەیاند ئەرکی یەکەمیان بریتییە لە هێنانەکایەی جیهانێکی کۆمۆنیستی کە کۆنترۆڵی گشت وڵاتانی جیهان دەکات و سنوورەکەی دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی پانی ٣٥ و ٣٦ی نیوەگۆی باکووری گۆی زەوی.. هەروەها ڕاشیگەیاند لە چوارچێوەی ئەو سنوورەدا هەوڵی شۆڕشگێڕانە دەخاتەگەڕ و گرنگترین وڵاتیش ئیسپانیا و ئیتاڵیا و یۆنان و هەندێك ناوچەی ئاسیای بچووك دەبن، فەڵەستین و هەندێك ناوچەی جۆراوجۆری چین و ئەو ناوچانەش دەگرێتەوە کە سنوورەکانی کەنەدا و ویلایەتە یەککگرتووەکان لەخۆ دەگرێ.

ئەم پلانەی لینین لە نێوەندە سەربازییەکاندا بە پلانی گایە باکوورییەکان ناودەبرێ، چونکە ئەو گیاندارە باکوورییانە بە وەستانیان بەشێوەیەکی بازنەیی و ئاراستەکردنی قۆچە تیژەکانیان بەرەو ورچ و گورگە هێرشبەرەکانەوە، توانیویانە ژیانی خۆیان بپارێزن

و لــە ژیانــدا بمێننــەوە.. دواتــر لیـنین هۆیـەکانی وازهێنـان لـە ڕۆزا لۆکسمبۆرگ دەهێنێتەوە، چوونکە توانیویـەتی هێـزە سۆڤییەتییەکان ڕێکبخاتــەوە بــۆ ئــەوەی لــە ســاڵانی ۱۹۱۹ و ۱۹۲۱ دژی هێرشــە دوژمنکارییەکانی وڵاتانی سەرمایەداری بوەستنەوە. لینین لە کۆنگرەی سێیەمی نێونەتـەوەیی سـاڵی ۱۹۱۲ بـۆی ڕوونبوویـەوە ئیسپانیا بـۆ دامەزرانـدن و هێنانەکایـەی دەسـتهەڵاتێکی کرێکـاری دەبێتـە وڵاتـی دووەم، هـەروەها سـەرکۆنەی ڕۆزا لۆکسمبۆرگیشـی کـردووە چـونکە ئاگری ڕق و دوژمنایەتی دژ بەسامییەتی لە ئـەڵمانیا هەڵگیرساندووە.. ئەوساکە کۆنگرەکە کارل ڕادیکسی نارد بۆ ئەوەی لە ئەڵمانیا هەڵمەتـە کۆمۆنیسـتییەکە هەڵسـووڕێنێ، چـەند ڕێنماییەکیشـی بـۆ دەرچـوو بۆئەوەی دەست بە ڕێکخسـتن و مەشقکردن بـە پـارتی نـاوبراو بکـات، بەڵام ئاگادار کرایەوە تا ئەو کاتەی فەرمانی لە کۆمنتێرن ( یەکییـەتیی جیهـانی پارتــە کۆمۆنیسـتیەکان)ەوە بـۆ دێـت، هـیچ هـەنگاوێکی شۆڕشگێڕی هەڵنەهێنێت.

پـارەدەرانی نێودەوڵـەتی کـۆنگرەی ئاشـتییان کـۆنترۆڵکرد و بـە پەیماننامــەی فرسـای کۆتـایی هـات.. بەڵگـەی ئەمـەیش زۆر ڕوون و ئاشکرایە، چونکە سەرۆکی شاندی ئەمریکی هـەر خـودی واریـۆرگ بـوو کە بەتەواوی لە بەشـی پێشـوودا تیشـکمان خسـتە سـەری، نـاوبراو لـە ئـەمریکا نوێنـەری سـەرەکیی کۆمەڵـە سـووخۆرەکانی جیهـانی بـوو.. هەروەها ماکس واربۆرگی خوشکیشی سەرۆکی شاندی ئەڵمانی بوو.

کۆنــت دی ســانت ئــولایر دەڵــێ: ئەوانــەی لــە دەرەوەی بەڵگەنامەکانــەوە بـەدوای ڕاسـتییەکاندا دەگـەڕێن، دەزانـن سـەرۆك نیلسۆن لەو کاتەدا وەك سەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرا کە بانکە مەزنەکەی

نیویۆرك پارەی پێشکێش کرد، خودی (کۆهن-لۆب) لەژێر فەرمان و ڕێنماییەکانی ئەو بانکە هەڵدەستا و دادەنیشت.

دکتۆر دیلۆنیش ڕوونی دەکاتەوە جووەکان بوون کۆنگرەی ئاشتییان بەو ئاقارەدا برد و فرسای پاریسیشیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی بەرنامەکەیان بە وردی بهێننە دی، هەر وەهاش دەرچوو.

سەبارەت بە ڕەشنووسی ڕاسپێرییەکەی (انتداب) بریتانیاش بۆسەر فەڵەستین، لەلایەن پرۆفیسۆر فیلکس فرانکفۆرتەری جوولەکەی بەناوبانگی ئەمریکییەوە پلانی بۆ دارێژرا، ناوبراو دواتر و لە سەردەمی دەستەهەڵاتی ڕۆزفلتدا بووە ڕاوێژکاری یەکەمی کۆشکی سپی.. لەمەیشدا هەر یەکە لە سێر هێربرت صامۆئیل و دکتۆر فیویل و مستەر ساشار و مستەر لاندمان و مستەر بن کۆهن و مستەر لۆسیان وۆلف پارمەتییان دا و کاریگەرییەکی زۆری بەسەر مستەر داڤید لوید جۆرجەوە هەبووە و دەڵێن گشت نهێنییە دەرەکییەکانی بریتانیای زانیوە.

کاتێکیش گفتوگۆیە سەرەتاییەکانی کۆنگرەکە دەستیپێکرد، ڕاوێژکاری تایبەتی بەڕێز کلیمانسۆ -سەرۆکوەزیرانی فەرەنسا- مسیۆ ماندیل بوو.. ڕاستییەکەی ئەمەیش تەنیا ناوێکی خوازراوی ئەندامێکی بنەماڵەی ڕۆچیڵد بوو.. هەروەها مستەر هێنری مۆرگنزاویش هەبوو، ناوبراو ئەندامێکی شاندە ئەمریکییەکە بوو و باوکی ئەو پیاوە بوو دواتر بووە سکرتێری دارایی سەرۆك ڕۆزفلت.. هەروەها مستەر ئۆسکارلا ستراوسیش لەو گفتوگۆیانەدا ئامادە بوو، ئەو پیاوە بەوە ناسرابوو زۆر لایەنگری و غەمخۆری پیلانەکەی پارەدەرەکان بوو و لە دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلانیشدا ڕۆڵێکی باڵای هەبوو.

هەر سەبارەت بەو پەیماننامەیە، بەڕێز لووسیان وۆلف لە لاپەڕە ٤٠٨ی لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە مێژووی جوولەکە نووسیویەتی: کۆمەڵەیەکی بچووکی بەرجەستە و ناوداری جوولەکە هەبوون واژۆیان لەسەر پەیماننامەی ئاشتیدا کردبوو، ئەوەی لەجیاتی فەرەنسا واژۆی لەسەر پەیماننامەکە کرد، لویز کلوتز بوو کە دواتر لە مەسەلەیەکی دارایی گلا و لەبەرچاوان نەما. هەروەها لەجیات ئیتالیاش بارۆن سۆمینۆ و لەبری هندیش بەڕێز ئەدوین مۆنتاگ واژۆیان کرد.

ئەمەی خوارەوە دەقی وتەی چەند گەورە بیرمەندێکی خۆرئاوایە و ڕاگەیەندراوێکە و پێویستی بە هیچ لێکدانەوەیەك نییە:

هارۆلد نیکلسۆنی مێژوونووس و دیبلۆماسی بەناوبانگی ئینگلیزی لە پەڕتووکە قەبارە گەورەکەیدا بەناوی دروستکردنی ئاشتیی ١٩١٩-١٩٤٤ لە لاپەڕە ٢٤٤ دا نووسیویەتی: لووسیان وۆلف ڕووبەڕوو داوای لێکردووە ڕا و بۆچوونەکانی وەربگرێ کە پێی وایە دەبێ جوولەکەکان بەشێوەیەکی جیهانی بپارێزرێن، لە هەمان کاتیشدا لە گشت دەوڵەتێکدا گشت مافێکی هاوڵاتیبوونیان هەبێت.

هەروەها جۆرج باتووی نووسەری فەرەنسی لە لەلاپەڕە ٣٨ی پەڕتووکەکەی خۆیدا بەناوی (گرفتی جوولەکە) نووسیویەتی: بەرپرسیاریەتییەکە دەکەوێتە ئەستۆی ئەو جوولەکانەی چوار دەوری لوید جۆرج و ویلسۆن و کلیمانسۆیان گرتووە.

ئێستەیش بەرەو هەنگاریا دەچین و لە کۆتاییی جەنگی یەکەمی جیهانی دەدوێین و دەبینین بیلاکۆن لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا بەزۆر دەستهەڵاتی گرتووەتە دەست، دواتریش هەوڵی داوە بیروبۆچوونەکانی لووسیان وولف پێڕەو بکات.. بەڵام دەستهەڵاتە دکتاتۆرییەکەی سێ

مانگ زیاتری نەخایاند، دەیان هەزار مەسیحیی کوشت و دەستیان بەسەر موڵك وماڵیاندا گرت.. ئەو قەسابخانە و مەرگەساتە ڕووبەڕووی کرێکار و سەرباز و بازرگان و خاوەنزەوییەکانیش کرایەوە.. جیاوازیش لەنێوان ژن و پیاو و پیاوی ئاینیی و پیاوی ئاسایی نەکرا.. لەمبارەیەوە گۆڤاری نیوئەنتەرناسیونالْ لە ساڵی ١٩١٩ دا لە پەڕتووکە ساڵانەییەکەی خۆیدا نووسیویەتی: زۆرینەی حکوومەتەکەی بیلاکۆن ئەو جووانە بوون پێگە و پۆستی ئیدارییان وەرگرتبوو.. کۆمۆنیستەکان لەگەڵ ئەو سۆسیالیستانە ڕێککەوتن کە زیاتر بە پارتی کرێکاران و کۆمەڵەی یەکیەتییەکانی کرێکاران دەچوون. لەگەڵ ئەمەشدا بیلاکۆن پارمەتیدەرەکانی خۆی لە ڕیزی ئەو کەسانەدا هەڵنەبژارد، بەڵکو لەنێو جووەکاندا هەڵی بژاردن، بەمەش دەستهەڵاتێکی بیرۆکراسییانەی یەهوودی پێکهێنا.

مێژوو بۆمانی دەگێڕێتەوە بیلاکۆن دوای سێ مانگ لە تێکدەری و وێرانکاری و دەستدرێژی و کوشتنی بەکۆمەڵ، لە دەستهەڵات لادرا.. بەڵام لەجیات سزادان، ڕەوانەی نەخۆشخانەی ئەقڵی کرا.. دواتریش لەلایەن ئەو کۆمەڵە بەهێزەوە ئازادکرا کەوا لەپێناو بەرژەوەندیی ئەودا کاری دەکرد.. دواتر بیلاکۆن گەڕایەوە ڕووسیا، بۆئەوەی ببێتە سەرۆکی ڕێکخراوی تیرۆرستیی چیکیا، ئەو ڕێکخراوەش لەهەنبەر ئۆکرانییەکاندا ترس و تۆقاندنی نواند بۆ ئەوەی ملکەچی دەستهەڵاتەکەی ستالینیان بکات و لە بەرانبەر فەرمانی دەستپێکردنی بەرنامەیەکی بەکۆمەڵی کشتوکاڵیی ناوبراودا نەرمی بنوێنن و لاملی نەکەن. لە ئەنجامی ئەو ترس و تۆقاندنەدا پێنج ملیۆن کرێکار لە برسان مردن، چونکە یاسایە کشتوکاڵییەکەیان جێبەجێ نەکرد،

هەروەها زیاتر لە پێنج ملیۆن کرێکار ناچارکران لە سیبیریا سوغرەکێشی بکەن.. کاتێکیش ستالین لە ساڵی ١٩٣٦دا ویستی لە ئیسپانیا دکتاتۆریەتی کۆمۆنیستی بهێنێتەدی ، بیلاکۆنی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ( دەستهەلاتی ترس و تۆقاندن) لەو ولاتەدا هەڵسووڕێنێ.

با بگەڕێینەوە کۆنگرەی فرسای ، بۆ ئەوەی چەند نیمەنێکی دیکەی هەژموون و دەستهەلاتی پارەدەرانی نێودەوڵەتی ببینین کە لە ڕووداوێکی بەنێوبانگی نێو گفتوگۆیە سەرەتاییەکانی کۆنگرەکە بەجوانی دەبینرێ.. بەڕووکەش ئەو گفتوگۆیانە بەرەو سیاسەتێك دەچوو بە دڵی پارەدەرەکان نەبوو، چوونکە لەلایەن یەعقووب شێفەوە و لە نیویۆرکەوە برووسکەیەکی دوو هەزار وشەیی بۆ سەرۆك ویلسۆن ناردرا کە ئەو کات لەنێو کۆنگرەکەی پاریسدا بوو، نێوەڕۆکی برووسکەکە چەند ڕێنماییەك بوون و بۆ سەرۆك نووسرابوون و تایبەت بوون بە ڕەفتارەکانی هەنبەر پرسی فەلەستین و چارەنووسی ڕاسپێری (أنتداب) و قەرەبووکردنەوەی ئەڵمانی و پرسی سلیسیا و ناوچەی سار و (دالآن و تەنگەبەرەی) دانزینگ.. برووسکەکە ڕێکەوتی ٢٨ی ئایاری ساڵی ١٩١٩ی لەسەر بوو و شێف بەناوی یەکییەتیی نەتەوە ئازادکراوەکانەوە ناردبووی.

سەرۆك ویلسۆن دوای وەرگرتنی برووسکەکە کتوپڕ هەڵویستی خۆی گۆڕی و دانوستانەکان بە ئاقارێکی دیکەدا چوون.. لەمبارەوە کۆنت دی سانت ئولایر گوتوویەتی: ئەو دەقانەی لەنێو پەیماننامەی فرسای بوون و تایبەت بوون بە پێنج پرسی سەرەکی، لەلایەن یەعقووب شێف و هاوکار و هاوتاوازەکانی دانران.

دوای ئەوەی دەوڵەتانی هاوپەیمان دنە دران بۆ ئەوەی فەڵەستین بکرێتە پارێزراوێکی بریتانی، پارەدەرانی جیهانی بە بەکرێگیراوەکانیان ڕاگەیاند بەندەکانی پەیماننامەکە زۆر توند و تیژ دەبێت، بەشێوەیەك گەلی ئەڵمانی ناتوانێ بۆ ماوەیەکی زۆر بەرگەی بگرێ، ئەمەیش بەشێك بوو لەو پلانەی ئامانجی زیانترکردنی ڕقوکینەی ئەڵمانەکان بوو دژ بە گەلی ئینگلیز و فەرەنسی و ئەمریکی و جوولەکەکان، بۆئەوەی سەرلەنوێ بۆ جەنگی وەرگرتنەوەی مافەکانیان ئامادەبن.

هەر ڕاستەوخۆش دوای واژۆکردنی پەیماننامەی فرسای، جەنگە ساختەکەی سەرمایەداری دژ بە بەلشەفیکەکان هەلگیرسا.. ئەو جەنگە ڕێگەی بۆ لینین هەموارکرد دەستبەرداری یارمەتیدانی شۆڕی کۆمۆنیستیی ئەڵمانیا بێت و بۆ پاراستنی ئەو دەستکەوتانەی لە ڕووسیا وەدەستی هێنابوون، داوای خۆڕاگری و یەکگرتوویی بکات.. لە لایەکی دیکەشەوە ئەو جەنگە هەرگیز مەترسی بۆ سەر دکتاتۆرییەتەکەی لینین دروست نەدەکرد. کاتێکیش لە ساڵی ١٩٢١دا کۆتایی هات، دەرئەنجامەکەی ناوبانگێکی گەورە و فراوانی بەلشەفیکەکان بوو، لە بەرانبەریشدا دەوڵەتی سەرمایەداری زیانێکی گەورەی بەرکەوت.. ئەم دەرئەنجامە ڕێگەی بۆ بەکرێگیراوانی پارەدەرە نێودەوڵەتییەکان خۆشکرد لەژێر پەردەی ئاشتییەکی بەردەوامی جیهانیدا دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکان وەك ئەندام بخەنە نێو کۆمەڵەی گەلانەوە.

بریتانیا یەکەمین دەوڵەت بوو حەز و ویستی پارەدەرە نێودەوڵەتییەکانی وەدەیهێنا و ددانی بە دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکان دانا.. دواتریش فەرەنسا لە ساڵی ١٩٢٤ و پاشانیش ویلایەتە

یەکگرتووەکان ددانیان پێدانا، ڕۆزفلت لە ساڵی ١٩٢٣دا ددانی بە دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکان دانا. بەمشێوەیە کۆمەڵەی گەلانیش ددانی بە دەوڵەتە کۆمۆنیستییەکاندا نا.. لەو ڕۆژییەوە کۆمەڵەی گەلان بووە گەمەی دەستی ستالین، بەکرێگیراوانیشی توانییان سیاسەتەکانی دابڕێژنەوە و کۆنتڕۆڵی چالاکییەکانی بکەن.. هەرکە دەوڵەتانی کۆمۆنیستیش چوونە نێو کۆمەڵەی گەلانەوە، ئەندامانی ئەنجوومەنی مەزنی ماسۆنی ڕۆڵیان تیادا وەرگرت.

لێرەدا ئاماژە بە (ێکهام ستیدە)ی نووسەری ڕۆژنامەی تایمزی ئینگلیزی دەکەین، ناوبراو لە گشت کەسێکی دیکە زیاتر ئاگاداری کاروبارە جیهانییەکان بوو و لە چەندان بۆنەدا تیشکی خستووەتە سەر ئەو ڕاستییەی پیاوانی بواری بانکی و پارەدەرانی نێودەوڵەتی دەست لە کاروبارە نێودەوڵەتییەکان وەردەدەن.. هەروەها لە دوای واژۆکردنی پەیماننامەی فرسای ئەم دەستەواژە دیاریکراوەی نووسیوە: من سوورم لەسەر ئەوەی بزوێنەرانی یەکەم یەعقووب شێف و واربۆرگ و چەندان خاوەن بانکی دیکەی نێودەوڵەتی بوون، ئەمانە زۆر حەزیان لێبوو یارمەتیی بەلشەفیکە جوولەکان وەدەستبێنن، بۆ ئەوەی بواری کاری جووە ئەڵمانییەکان لە ڕووسیا دەستەبەر بکەن.

هەروەها ئەو نووسینەی لیۆماکس بە نموونە دەهێنینەوە کە لە ژمارەی ئابی ساڵی ١٩١٩ ی ڕۆژنامەی ناشیونال ڕیفیۆدا بڵاوی کردبووە و تیایدا نووسیبووی: ئەو دەستهەڵاتەی حوکمڕانیی داونینگ ستریت (واتا بریتانیا) دەکات هەر جۆرێك بێت، پارێزکار بێت یان توندڕۆ، پاڵپشتیی لە ئیئتلافەکە بکات یان پشتگیری بەلشەفیکەکان بێت، ئەوا لە گشت هەلومەرجێکدا دەکەوێتە دەست جوولەکە

جیهانییەکانەوە.. لێرەوە نهێنیی ئەو دەستە شاراوانە ڕوون دەبێتەوە کە هیچ لێکدانەوەیەکی هۆشیارانە لەهەنبەریاندا وەدەرنەکەوتن.

کاتێک وینستۆن چەرچڵ لە مارسی ساڵی ١٩٢١دا سەردانی فەلەستینی کرد، داوای بینینی شاندی سەرکردە مۆسڵمانەکانی کرد.. کاتێکیش چاوی پێیان کەوت، ترسی خۆیان لە ئامانجەکەی زایۆنیزمی سیاسی پیشان دا کە بریتییە لە دەستبەسەرداگرتنی فەلەستین و زەوتکردنی زەوییەکانی لە بەرژەوەندیی جووەکان، بۆیان ڕوون کردەوە عەرەبەکان ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ لەسەری دەژیێن (( ئەمە ڕێك بەوە دەچێت بگوترێ مسرییەکان ماوەی هەزار ساڵە لە میسردا دەژیێن، ئەمە خاکی فەلەستینییەکانە لەدێرزەمانەوە لەسەریدا دەژیێن و وەك هەر وڵاتێکی دیکەی ئێمە، بە هاتنی عەرەب چوونەتە نێو ئیسلام و بە زمانی عەرەبی ئاخاوتوون)) و داوایان لێی کرد هەژموون و دەستهەلاتی خۆی بۆ نەهێشتنی ئەو ستەمە بخاتە گەڕ.. دەگێڕنەوە چەرچڵ پێی گوتوون:" ئێوە داوا دەکەن دەستبەرداری پەیماننامەی بەلفۆڕ بم و کۆچی یەهوودییەکان ڕابگرم.. ئەمەیش لە هێز و دەستهەلاتی مندا نییە، هەر پێشم خۆش نییە.. ئێمە پێمان وایە لەپێناو بەرژەوەندیی جیهان و جوولەکە و ئیمپراتۆریای بریتانی و خودی عەرەبەکانیشدا، نیازی بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەمان هەیە".

کاتێك چەرچڵ بەمشێوەیە وەڵامی داونەتەوە، بێگومان بیری لە هەڕەشەکەی حاییم وازیمان کردووەتەوە کە لە ساڵی ١٩٢٠دا بەشێوەیەکی ڕەسمی بڵاوی کردووەتەوە و تیایدا گوتوویەتی: پێتان خۆش بێت یان نا، ئێمە لێرە لە فەلەستین سەقامگیر و نیشتەجێ دەبین.. تاکە شتێك لە دەستتان بێت خێراکردن یان هێواشکردنەوەی

کۆچەکەمانە، بەڵام هەر چۆنێك بێت بۆ خۆتان باشترە یارمەتیمان بدەن و نەبنە هۆی ئەوەی توانا بنیادنەرەکانمان ببنە توانای وێرانکاری و جیهان تێکوپێك بدەین.

دەبێ لەو هەڕەشەیەی وایزمان بفکرین و لە هەمان کاتیشدا ترك بەو ڕاگەیەندراوە بکەین کە لەلایەن یەکێك لە پارەدەرانی نێودەوڵەتییەوە لە کۆبوونەوەیەکی زایۆنییەکاندا دەرچوو کەوا لە ساڵی ۱۹۱۹دا لە بۆدابێست بەڕێوەچووبوو. کۆنت ئولایر قسەکانی ناوبراو هێنایەوە کاتێك سەبارەت بە ئەگەرەکانی دروستبوونی حکوومەتێکی جیهانی دەئاخاوت و دەیگوت: لەپێناو وەدیهێنانی جیهانێکی نوێ ( کە ئەو کەسانە چاوەڕێی وەدیهاتنی دەکەن)، ڕێکخراوەکەمان بەڵگەی کارایی و چالاکییەکەی لە هەردوو کردەی شۆڕش و بنیادنانەدا پێشکێش کردووە و بریتییە لە دروستکردنی کۆمەڵەی گەلان کە ڕاستییەکەی کار و چالاکییەکی ئێمە بوو.. بزووتنەوەی بەلشەفیکی پاڵنەری یەکەمی پێکدەهێنێت، کۆمەڵەی گەلانیش چەرخی ئەو ئامێرەیە کە لە یەك کاتدا هێزی بزووێنەر و ئاراستەکاریشی هەیە.. باشە ئەدی لە کۆتاییدا چی ڕوو دەدات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە پێشوەخت لە ئەرك و کردەکەی ئێمەدا دەستنیشان کراوە.. ئەویش دامەزراندنی یەك حکوومەتی جیهانییە.

دوای هەشت ساڵ لە تەواوکردنی ئەم بەشەدا شتێکی گرنگم وەگیرکەوت، ئەویش لە ڕێگەی هەواڵگریی نهێنیی کەنەدییەوە بوو، ئەم هەواڵگرییە ڕاپۆرتی کۆنگرەیەکی نائاسایی لیژنەی لەناکاوی حاخامەکانی ئەورووپای گواستووەتەوە کەوا لە ۱۲ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۵۲ لە بۆدابێست بەڕێوەچووە.

راپۆرتەکە بریتییە لە دەقی گوتاری نێو کۆنگرەکە و لەلایەن حاخام ئیمانۆیل رابینۆڤیچەوە خوێندراوەتەوە:

سلاوتان لێبێ ئەی رۆڵەکانم، بانگی ئەم کۆبوونەوەیە تایبەتەم کردوون، بۆ ئەوەی بە هێڵە سەرەکییەکانی رێبازە نوێیەکەمان ئاشناتان بکەم، ئەویش رێباز و بەرنامەیەکی تایبەتە بە جەنگی داهاتوو. وەك دەزانن، پلانە بنەڕەتییەکەمان پێویستی بەوە بوو ماوەی بیست ساڵ دوای بخەین، بۆ ئەوەی بتوانین لەو ماوەیەدا ئەو دەستکەوتانە پتەو بکەین کە بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانییەوە وەدەستمان هێناون، بەڵام چەند رێکار و رێنماییەکی نوێ دەرچوون و بۆ ئێمە ناردراون و داوا دەکەن پێنج ساڵی ئەم مۆڵەتە بیست ساڵییە کەم بکرێتەوە..

دەبێ پێتان رابگەیەنم ئەو ئامانجەی ماوەی سێ هەزار ساڵە و تا ئێستە کاری لەسەر دەکەین، ئێستە کەوتووەتە دەستمان، بۆیێ لەسەرمان پێویستە لە کۆتاییدا بەروبوومەکەی بڕنینەوە و هەوڵەکانمان چڕتر بکەینەوە و ئەوپەڕی بلیمەتی و شارەزایی بۆ کۆ بکەینەوە. ئێستە دەتوانم دڵنیاتان بکەمەوە چەند ساڵێکی کەمی ماوە گەلەکەمان پێگەی یەکەمینی خۆی لە جیهاندا وەرگرێتەوە، ئەمەیش مافێکی سروشتی خۆیەتی و ماوەی چەندان ئەوەی دووروودرێژە لێی زەوت کراوە، بەمەیش کاروبار و پرسەکان دەچنە سەر رەوتی سروشتیی خۆیان و جوولەکە دووبارە دەبێتەوە سەرۆك و سەروەر. (چەپڵە رێزانێکی بە گوڕ).

ئێستە سەبارەت بە رێنماییەکانی تایبەت بە جەنگی داهاتوو بیرۆکەیەکتان پێدەبەخشم: ئێوە ئەو بەرنامە و رێبازە سەرکەوتووەتان

لەبیرە کە سالی ١٩٣٠ پێڕەومان کرد و بە تەواوی سەرکەوتنی وەدەستهێنا، هەڵمەتی سەرانسەریی پڕوپاگەندە توانی ڕقوکینە لە ئەڵمانیا دژ بە خۆرئاوا و دژی سامییەکان بوروژێنێ، دواتریش وروژاندنی ڕقوکینە لە خۆرئاوا دژ بە گەلی ئەڵمانی بەهۆی دوژمنایەتیی ئەڵمانی لە هەنبەر سامییەکانەوە سەرکەوتنی وەدەستهێنا.

ئەمە هێڵی سەرەکیی بەرنامە و ڕێبازی هەنووکەییمانە و ئێستە جێبەجێی دەکەین، ئێمە لە خۆرهەڵاتدا هەڵمەتێك دژ بە خۆرئاوا و لە خۆرئاواش دژ بە خۆرهەلات بەڕێوە دەبەین، دژایەتیی ئەو گەل و نەتەوانەش دەکەین کە بەبێلایەنی دەوەستن و ناچاریان دەکەین خۆیان بەلای بلۆك و سەربازگەیەکدا بدەن، ڕێگەش نادەین هیچ کەسێك ڕووبەڕوومان بوەستێتەوە بەتایبەت ئەگەر ویستی ئاستی توندیی ئەم ململانێیە دابەزێنێتە خوارەوە و هێوری بکاتەوە.

بێگومان دوا ئامانجیشمان لەم پلانەدا جەنگی سێیەمی جیهانییە کە شوێنەوار و وێرانکارییەکانی لە گشت جەنگەکانی پێشوو زۆرترە، هەوڵیش دەخەینە گەڕ ئیسرائیل لەم جەنگەدا بێلایەن بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لە شوێنەوار و کاریگەرییەکانی بە دوور بێت، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە بارەگەیەکی لیژنەکانی نێوبژیوانی و ڕاوێژکاری و چاودێری و ... هتد کە ئەوکات ئەرکی سەرپەرشتیکردنی پرسی گەلانی دەخرێتە سەرشان، ئەم جەنگە لە ململانێی مێژوویی دژ بە جوییم دوا جەنگەمان دەبێت، ئەوسا شوناسی ڕاستینی خۆمان ئاشکرا دەکەین و ڕووی شاراوەی خۆمان بۆ جیهان وەدەردەخەین.

لە دوای جەنگی سێیەمی جیهانی هیچ ئایینێك نامێنێ، هەروەها پیاوانی ئایینیش لە گۆڕێدا نامێنن، چونکە بوونی ئایینەکان و پیاوانی

ئایینی بۆسەر ئێمە مەترسین و دەتوانن سەروەربوونی داهاتوومان بەسەر جیهاندا لەنێو ببەن، چونکە ئەو هێزە رووحییەی ئایین لە دەروونی باوەڕداراندا زیندووی دەکاتەوە، دواتر بوێریی ئەوەشیان لە دەروونیدا دەژێنێتەوە دژمان بوەستنەوە، ئێمە رێورەسم و نەریتە رووکەشەکانی ئایینی جولەکە دەپارێزین، ئەمەیش تەنیا بۆ یەك مەبەست، ئەویش پاراستنی ئەو بەستەرەی تاکەکانی گەلەکەمان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و لێناگەرێین هیچ بیانییەك بەهۆی ژن و ژنخوازی و هتد بێتە نێو ئایینەکەمانەوە.

لەوانەشە لەپێناو دوا ئامانجماندا هەمان کردەی بە ئازار دووبارە بکەینەوە کە لە رۆژگاری هێتلەردا کردمان، واتا ئێمە خۆمان دژ بە چەند کۆمەڵە و تاکەکانی گەلەکەمان چەند رووداوێکی چەوساندنەوە رێکدەخەین، بە واتایەکی دیکە چەند رۆڵەیەکی گەلەکەمان لە چەند رووداوێکدا دەکەینە قوربانی، خودی ئەو رووداوانەش خۆمان دەیانوروژێنین و لە پشت پەردەوە ئاراستەیان دەکەین، بۆ ئەوەی لەلایەك بۆ راکێشانی سەرنج و پاڵپشتیی گەلانی ئەورووپا و ئەمریکا و تەواوی جیهان پاساوی پێویستمان بکەوێتە دەست، لەلایەکی دیکەشەوە هەروەها بۆ پاساوهێنانەوەیە لەهەنبەر ئەو دادگەییانەی دوای جەنگ بەرپێوەیان دەبەین،دادگەییەکەش بۆ لە سێدارەدانی ئەو سەرکردە و رێبەرە سەربازییانەیە کە دژ بەیەك دەجەنگن، هەروەك چۆن لە دادگەییەکانی نۆرمبرگ کردمان.

لەوانەیە قوربانیدان بە چەند هەزار کەسێك لە رۆڵەکانی گەلەکەمان زۆر گەورە و ترازیدی بێت، بەتایبەت کاتێك ئێمە خۆمان کار بۆ لەنێوبردنیان بکەین بۆ ئەوەی تۆمەتەکە بخەینە پاڵ خەڵکی

دیکەوە، لەوانەیە قوربانییەکە زۆر گەورە بێت، بەڵام نابێ لەپێناو ئامانجەکەمان: (سەرکردایەتیکردن و سەروەربوون بەسەر جیهاندا) سڵ لە هیچ قوربانییەکی گەورە و بچووک بکەینەوە.

جا بۆ ئەوەی دڵنیابینەوە لەوەی دەتوانین جیهان کۆنترۆڵ بکەین، کەمێك بنوارنە داهێنانەکانی پیاوی سپی، چۆن بەلای ئەو کردوومانەتە چەکێکی کوشندە.. رادیۆ و چاپخانە و ئێمە بووینەتە گوزارشتکار و دەربڕی حەزەکانی خۆمان، هەروەها کارخانەی پیشەسازییە قورسەکانیش چەك بۆ ئاسیا و ئەفریقیا دەنێرن بۆ ئەوەی گەلانی ئەو ناوچانە دژ بە پیاوی سپیی دروستکەری ئەو چەکانە بوەستنەوە... بشزانن ئێمە بەرنامەی خاڵی چوارەممان لە واشنتۆندا پێشخستووە، بۆ ئەوەی پێشخستنی پیشەسازییانەی ناوچە جۆراوجۆرەکان جیهانیش بگرێتەوە، بەشێوەیەك پیاوی سپی بکەوێتە بەر ڕەحمەتی کۆمەڵە زۆر و زەوەندەکانی گەلە ڕەشپێستەکان، کە دوای ئەوەی جەنگی ناوەکی کشتوکاڵ و پیشەسازییەکەی وێران دەکات لە ڕووی تەکنۆلۆژییەوە بەسەریدا زاڵ دەبێت.

بەم ڕوانینە سەرکەوتنی کۆتایی لەبەر چاوتاندا دەدرەوشێتەوە، بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆتان و بە مکوڕی و لێبڕاوانە کار بکەن، تا لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژە دادێ ئیسرائیل ئەرکە سەرەکییەکەی خۆی ئاشکرا دەکات، ئەویش ئەوەیە ببێتە ڕۆشناییەك جیهان ڕووناك بکاتەوە، ((نوورانی واتا هەڵگری ڕۆشنایی)).

ئەم گوتارە بۆچوون و زانیارییەکانی پێشووم پشتڕاست دەکەنەوە، واتا هێزە نهێنییانەی دوژمنایەتیی هەنبەر سامییەکان و لە هەمان کاتیشدا ڕقوکینە و دوژمنایەتیی هەنبەر کۆمۆنیزمیان ورووژاند،

بەشێوەیەك خزمەتی ئامانجەکانیان بکات.. هەروەها ئەو گوتارەی سەرەوە دەیسەلمێنێ نوورانییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە شاراوەکانیان کۆمۆنیزم و نازیزم و فاشیزمیان بەکارهێناوە.. هەروەها دیموکراسییەتی مەسیحیش دژ بە کۆمۆنیزم بەکاردێنن بۆ ئەوەی بگەنە قۆناغی دواتری پیلانە دوورمەودایەکەیان، ئەویش جەنگی سێیەمی جیهانییە.

پارەدەرانی نێودەوڵەتی بە خۆشاردنەوەیان لەپشت بەندەکانی پەیماننامەی فرسای توانیویانە بەسەر دووبارە بنیادنانەوەی سوپای ئەڵمانی و چاککردنەوەی ئابووری دەوڵەتاندا زاڵبن.. دواتریش لەگەڵ سەرکردایەتیی باڵای ئەڵمانیدا رێککەوتن، لەو رێککەوتنەدا جەخت لەوە کرلوەتەوە رووسەکان بەنهێنی گشت چەك و تفاقێکی شەڕ بدەنە ژەنەراڵەکانی ئەڵمانی بۆ ئەوەی سوپایەکی نوێ و هاوچەرخی چەندان ملیۆنی دروست بکەنەوە.. هەروەها لەسەر ئەوەش رێککەوتوون دکتاتۆری سۆڤییەتی گشت ئاسانکارییەکیان بخاتە بەردەست، بۆ ئەوەی مەشق بە گشت ئەفسەرانی ئەڵمانی بکرێ.

بەمشێوەیە دوای ئەوەی پارەدەرانی نێودەوڵەتی پارەیان بۆ ئەو پرۆژە گەورە و زەبەلاحە تەرخانکرد، بەندەکانی رێککەوتنامەکە کەوتنە واری جێبەجێکردنەوە... ئەوجا توانییان لە وڵاتە کۆمۆنیستەکان و فاشستییەکانیشدا هێزێکی زەبەلاحی سەربازی و ئابووری بنیاد بنێن.. هەروەها توانییان هەلومەرج بۆ سەرکردایەتیی ئەڵمانی برەخسێنن بۆ ئەوەی بەندەکانی پەیماننامەی فرسای بخاتە ژێر پێی، بەتایبەت ئەو کۆتوبەندە سەربازییانەی بەسەریاندا سەپێندرابوو.

جا لە ڕێگەی کارخانەکانی چەك و فیشەك و تەقەمەنیی کۆمۆنیستیی پشت چیایەکانی ئۆرالەوە، چەك و تفاق و گشت پێداویستییەکانی دامودەستگە ئەڵمانییەکان فەراهەم کران.. ئەم نەخشە و پیلانگێڕییەش تەنیا نیشاندەری نیازێکی شاراوەی ئەو پارەدەرە نێودەوڵەتییانە بوو بۆ ئەوەی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانی هەڵگیرسێنن.. هەروەها ئەو وڵاتانەی بە هاوپەیمانیش ناو دەبران لە ڕووداوەکانی پشت پەردە بەدوور نەبوون، بەڵکو وردودرشتی مەسەلەکانیان دەزانی.. من خۆم لە کاتی ئامادەبوونم لە کۆنگرەی چەکداماڵینی دەریاییدا کە لە ساڵی ١٩٣٠ لە لەندەن بەسترا، هەستم بەو ڕاستییە کرد، ئەمەیش بەڵگەیەکی دیکەی ڕاستگۆییی دیزرائیلییە کاتێك گوتی: حکوومەتە هەڵبژێردراوەکان حوکم ناکەن.

ڕاستییەکەی ئەو قۆناغە مێژووییە زۆر ئاڵۆزە و بۆ هاووڵاتیانی ئاسایی ئاسان نییە تێی بگەن.

چونکە کۆمۆنیزم و نازیزم چەندان سیفەتی هاوبەشیان لەنێواندا هەیە: هەردووکیان بنەمایەکی ئەیتەیستییان هەیە و نکۆڵی لە بوونی خودا دەکەن.. هەردووکیشیان پاڵپشتی لە هەڵگیرسانی جەنگ ڕقوکینە و هێز دەکەن.. بنەما و ڕێبازەکانیان دژ بە بنەمایەکانی مەسیحییە کە بریتین لە ئاشتی و خۆشەویستی و پەروەردە.. لەبەر ئەوە سەرکردە بالآیەکانی هەردوو لا ڕۆدەچنە نێو ئەیتەیستی و مادەیەکی دەستی بەکرێگیراوانی ئەهریمەن.. هەردوو بیروڕاش بە شێوەیەك لە شێوەکانی ئەنجوومەنی ماسۆنی لە خۆرهەلأتی مەزن بەکاردەهێنن، بۆ ئەوەی خەڵك لە ئایینەکانی خۆیان دووربخەنەوە.

لێکۆڵینەوەیەکی شیکردنەوەیی لە ساڵانی ١٩١٤ و ١٩٤٣دا بۆی ڕوونکردینەوە کۆمەڵەی سوودخۆرە جیهانیەکان گشت هەوڵ و کۆششەکانی خۆیان لەو قۆناغەدا لەسەر وەدیهێنانی ئەم ئامانجانە چڕکردووەتەوە:

-خۆشکردنی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانی، ئەمەیش ڕێگە بۆ دروستکردنی کەشێکی گونجاوی کاری شۆڕشگێڕی خۆش دەکات و ڕێگەیان بۆ هەموار دەکات بەتەواوی دەست بەسەر ئیمپراتۆریای ڕووسیادا بگرن.

- گۆڕینی سەرۆکە دەستەهەڵاتدارەکانی ئەورووپا، پێش ئەوەی هەر کۆمەڵەیەکیان هەژموون و دەستەهەڵاتی خۆیان بسەپێنن و حوکمێکی ڕەها بگرنە دەست.

- ناچارکردنی هەردوو حکوومەتی بریتانیا و فەرەنسا بۆ ڕازیبوون لەسەر دروستکردنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکە لە فەڵەستیندا.

حکوومەتی بریتانی ناچارکرا یارمەتیی پارەدەرانی نێودەوڵەتی بدات بۆ ئەوەی لە جێبەجێکردنی پیلانی سەرخستنی شۆڕشی بەلشەفیکی هاوکاریان بێت، لە بەرانبەرشدا بریتانیا لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەجەنگدا یارمەتیی بدرێ.. دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییەی کەشتیی لویزیانا لەپێناو پاساوهێنانەوە بۆ سیاسەتی ئەمریکی لەهەنبەر جەنگدا بە ئەنقەست نقوم کرا، ڕێک وەک ڕووداوی بیرڵ هاربۆر بووە پاساوی ئەمریکا بۆ چوونە نێو جەنگی دووەمی جیهانی.. (( ئەو بەڵگەنامانەی بریتانیا لە ساڵی نەوەدەکاندا ئاشکرای کردن، دەریانخست خودی بریتانییەکان دنەی یابانییەکانیان دا هێرش

بکەنــە ســەر ئــەمریکا، مەســەلەی دنەدانەکــەش بەمشــێوەیە بــوو: کەشتییەکی جەنگیی بریتانی کە ئالآی ئەمریکای لەسەر بوو، کۆدێکی ئەمریکی بەکارهێنا، بریتانییەکانیش دەزانن یابانییەکان توانیویانە ئەو کۆدە شی بکەنەوە کە بۆ ئالوگۆڕکردنی چەند نامەیەکی ساختە و درۆزنانــە بــەکارهاتبوو، لــە نامــە ســاختەکاندا جــەخت لەســەر ئــەوە کرابوویــەوە ئــەمریکا بڕیاری یــەکجاری خۆی داوە هێرش بکاتــە سەر یابان، لەبەرئەوە یابانییەکان ویستیان پێشوەخت دەست بوەشێنن.. هــەروەها دەشــڵێن ســەرۆکی ئــەمریکا پێشــوەخت ئاگــای لــە نیــازی یابانییــەکان هــەبووە بــۆ هێرشــکردنە ســەر بــێرڵ هــاربۆر، بــەڵام مەســەلەکەی پشــتگوێ خســتووە چــونکە حــەزی لێبــووە پاســاوێکی دەستکەوێ تا بچێتە نێو جەنگەوە !)).

لــە دەقــە ئەســڵیەکەی تایبــەت بــە ئینتیــدابی بریتــانی بــۆ ســەر فەڵەستین هاتووە:

(( فەڵەســتین بکرێتــە نیشــتمانێکی نەتــەوەیی یەهوودییــەکان.. بــەڵام ئــەم دەســتەواژەیە لــە دوا ســاتدا گــۆڕدراوە و کراوەتــە: بــۆ دامەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکەکان لە فەڵەستیندا.. ئەمەیش لەپێناو شاردنەوەی بەرتەمایی نهێنیی زایۆنیزم بووە.

هەروەك چۆن زایۆنییەکان بەرتەمایی داگیرکردنی فەڵەستینیان شــاردووەتەوە، ڕاســتیی ئــەو ســامانە کانزاییــە زۆرزەوەندانەشــیان خستووەتە پشتی پەردەوە کە دەکەونە کەنارەکانی دەریای مردوو، هەتا فرەنسا و بریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕاسپێرییەکەیان ( الانتداب) ڕانەگەیاند، زایۆنییەکان هەرگیز ئەو مەسەلەیەشیان ئاشکرا نەکرد.

بەمشێوەیە سووخۆرە نێودەوڵەتییەکان زایۆنیزمیان بەکارهێنا، بۆئەوەی بەرژەفتی سەروەریی دەوڵەتێك بکەن کە هەڵبەندێکی مامناوەندی جوگرافیی هەیە، بۆ ئەوەی هەژموون و دەستهەلاتی خۆیان بەسەر ولاتانی دیکەشدا پێڕەو بکەن، هەروەك چۆن هەژموون و دەستهەلاتیان بەسەر یەکییەتیی سۆڤییەتیشدا سەپاند.

# بەشی پانزەیەم

## ستالین

ستالین ژنی دووەمی هێنا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، چونکە بە ژنە جوولەکەیەکی جوان گەیشت بەناوی ڕۆزا کاگنۆڤیچ.. دەڵێن گوایە کاتێك نادیای ژنی دووەمی خۆی کوشت، ئەو خەریکبوو لەگەڵی جووت دەبوو.. زۆربەی بیروڕایەکان لەسەر ئەوە کۆکن خۆکوشتنی نادیا هەر تەنیا بەهۆی سەربردە عەشقبازییەکانی ستالینەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی داخ و کەسەرە گەورەکەی نێو دڵیشییەوە بووە، چونکە ستالینی مێردی لە کوشتن و لەنێوبردنی ژمارەیەکی زۆری ئەو نەیارانەیدا زۆر توندوتیژ بووە کە ژنەکە بە برای ئایینیی دەزانین و ستالینیش بە کەسانی لادەری هەژمار دەکردن.

برای ڕۆزا- لازار کاگنۆڤیچ- هاوڕێیەکی نزیکی ستالین بوو، بۆیێ کردییە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بۆلیتبیرۆ، تا مردنی ستالینیش هەر لە پۆستەکەی خۆیدا مابوویەوە.. کاتێك لازار کێلگە نەوتییەکانی بازینی پێشخست و ئۆتۆستراد مۆسکۆی دامەزراند، توانای خۆی لە سەرپەرشتیکردنی پیشەسازییە قورسەکاندا سەلماند.. میخائیل لە ١٥ی تەمووزی ساڵی ١٩٥١دا سفیتلانای کچی ستالینی خواست.. کاتێك ئەو ژن و مێردایەتییە بڕیاری لەسەر درا، کچەی ناوبراو شوودار بوو.. هیچ شتێکیشی سەبارەت بە مێردی یەکەمی نەزانی، هەرئەوەندە

نەبێت یەکسەر وەك كۆسپی سەر ڕێگە لادرا، ڕێك وەك ئەو كاتەی ستالین ڕێزای ژنی دووەمی خواست و ژنی دووەمی لەنێو برد، یانیش ژنەکە بەدەستی خۆی، خۆی لەنێوبرد.

مۆلۆتۆڤی جێگریشی بێجگە لە هێنانی ژنی دووەم، ژنە جوولەکەیەکی خواست کە خوشکی سام کاربی سەرمایەداری گەورەی ئەمریکی و خاوەنی کۆمپانیای زەبەلاحی کارب ئێکسپۆرتینگی بواری هاوردەکردن بوو. دواتر لە ساڵی ١٩٥١دا کچی مۆلۆتۆڤ درایە ڤاسیلیی کوڕی ستالین . بەمشێوەیە دەبینین مەکتەبی سیاسیی پارتی کۆمۆنیستی تا ئاستێك لە دەستی خانەوادەی ستالین و کەسە نزیکەکانییەوە بوو.

ستالین گەیشتە ئەو باوەڕەی بچێتە نێو ڕیزی چینی باڵای پارتی شۆڕشگێڕی ڕووسییەوە، چونکە زۆربەی سەرکردە باڵاکان لە قۆناغەکانی یەکەمی شۆڕشی کۆمۆنستیدا لەنێو زیندانەکاندا بوون.. ستالینیش لە سەردەمی دەستەڵاتی لینیندا بۆ هیچ پلە و پۆستێك بەرز نەکرایەوە، بەڵام لە دوا قۆناغی دەستەڵات و حوکمڕانیی لینیندا، ڕیزی پێشەوەی داگیر دەکرد.. ئەوسا ململانێ کەوتە نێوان ستالین و ترۆتسکی و چەندان جوولەکەی دیکەی نەیار.. ململانێیەکە بە وەرگرتنی دەستەڵات کۆتایی هات و تا مردنیشی لە شوێن و پێگەکەی خۆیدا مایەوە.

ترۆتسکی لە ساڵی ١٩٢٧دا دژ بە ستالین ڕاپەڕی، بەوەش تۆمەتباری دەکرد گوایە لە ئایدۆلۆژیای مارکسی لایداوە و خولیای پێکهێنانی حوکمێکی دکتاتۆریی ئیستعماریی تۆتالیتاریی هەیە و دەیەوێ وەك ئەلتەرناتیڤی یەکیەتییە ڕەسەنەکەی کۆمارە

سۆسیالیستەکانی سۆڤییەت بیهێنێتە ئاراوە.. ئەوجا ستالین دەستی بە هەڵمەتێکی پاکتاوکردن کرد و چەند ملیۆن کەسێکی لەنێوبرد، چەندان ملیۆنیشی ڕەوانەی دوورخراوگە و زیندانەکانی سوغرەکێشی کێشی کرد.. کۆتاییی زۆربەی سەرکردەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لە ئەنتەرناسیونالی یەکەمەوە بەمجۆرە بوو و تا ئەیانکوشتبان یان دەستگیریان نەکردبان، وازیان لێیان نەدەهێنا.. لەو سەرکردانەی ستالین لە کۆڵ خۆی کردنەوە ئەمانە بوون: ترۆتسکی، زینۆڤییێڤ، کامینییێڤ، مارتینۆڤ، وزاسۆلیش، دۆش و بارفۆس، واکسلرۆد، ورادیك، بۆرتزکی، سفیردلۆڤ، دان، لیبر، مارتۆڤ.. لە کەسە نزیکەکانی خۆیشی تەنیا لازار کاگنۆڤیچ و زاوایەکەی و ڕێزای ژنی مانەوە.

ستالینیش هەر لەسەر سیاسەتی لینین ڕۆیشت کە بریتی بوو لە دامەزراندنی جیهانێکی کۆمۆنیستیی نێوان هێڵی ٣٥ و ٤٥ی نیوە گۆی باکووری گۆی زەوی.

پلانی ستالین ئەوەبوو هێزە چەکدارەکانی خۆی ئەخاتە نێو جەنگی دژ بە دەوڵەتانی دیکە، هەروەها کار لەسەر هەڵگیرساندنی شۆڕشەکانی باشووری یەکییەتیی سۆڤییەت - نێوان هێڵی ٣٥ و ٤٥- بکات.. ئەم سیاسەتە زۆر زوو بەرهەمی دا، چونکە لە کاتی مردنی ستالیندا کۆمۆنیزم دەستی بەسەر نیوەی ناوچەی ناوبراودا گرتبوو، هەروەها نیوەی دانیشتووانی گۆی زەوی کەوتبوونە ژێر کاریگەریی کۆمۆنیستییەوە.

(( باسی ئەو سەرکوتکاری و چەوسانەوە و ڕاگواستنە دەکەین کە لەهەنبەر موسڵمانەکانی نێو کۆمارە ئیسلامییەکانی ژێر دەستهەڵاتی ڕووسیا بەڕێوەچوو، بۆنەوەی ئایین و زمان و کەلتوورەکەیان

بسڕێتەوە.. ئەمەش پێچەوانەی ئەو شۆڕشە سۆسیالیستانە بوو کە لە نیوەی سەدەی ڕابردوودا جڤاک و کۆمەڵگەکانی وێران کردین و ئێستەیشی لەگەڵدا بێت باجی مەرگەسات و نەهامەتییەکانی دەدەینەوە ! !)).

هەروەها ستالین لەسەر پلانی دووەمی لینین ڕۆیشت، پلانەکەش ئەوەبوو لە کردەی وەرچەرخاندن و گۆڕینی وڵاتان بۆ دەوڵەتی کۆمۆنیستی، لە ئیسپانیاوە دەستپێبکات. چونکە ئەمە فەرەنسا و بریتانیا دەوروژێنێ بەسەر کۆمۆنیزمدا زاڵبن، دواتریش ئەڵمانیا دەکەوێتە نێوان بەرداشەوە..ئەگەر ڕووداوێکیش ڕوویدات نەیەڵێ ئیسپانیا بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی کۆمۆنیستییەوە، ئەوا ڕووداوێکی وەها بۆ هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی دووەمی، جیهانی دەبێتە هۆکارێکی یارمەتیدەر.

کاتێکیش ستالین خۆی بۆ شۆڕشی ئیسپانیا ئامادە دەکرد، لە جەنگە ئابوورییەکەدا بەشدارییەکی کارای هەبوو کە لەدوای واژۆکردنی ئاگربەستی ساڵی ١٩١٨ وە بەرداشەکەی دەخولێندرایەوە، چونکە چەند چینێکی زۆر دەوڵەمەند بەهۆی بەشداری نەکردنیان لە جەنگی جیهانییەوە، لەدوای جەنگەکەدا بەشێوەیەکی ناڕەوا دەوڵەمەندتر بوون، هەروەها گەلانی وڵاتە هاوپەیمانەکان لە دوو ساڵی دوای جەنگەکەدا لە خۆشگوزەرانیدا دەژیان.. بەلام بەر لەوەی وەبەرهێنەرانی لووتکە بتوانن بە پارەکانیان وەبەرهێنان بکەن، پارەیەکی زۆر لە بازاڕدا کێشرایەوە، هەروەها متمانەی بانکەکان دیاری کران، کردەی داواکردنەوەی قەرزەکان تەشەنەی دەسەند.. ئەمە تراژیدیا و کارەساتە بچووکەکە بوو کە جیهان لە ساڵانی نێوان ١٩٢٣ و

١٩٢٥دا تێیکەوت و سەرەتای کارەساتێکی گەورە بوو هێزە نهێنییەکان بەشێوەیەك پلانیان بۆ دانابوو لە ساڵی ١٩٢٠دا بێتە ئاراوە.

ئەم کارەساتە گەورەیە دوای گۆڕانی سیاسەتی دارایی ساڵی ١٩٢٥ بوو، دیسانەوە خۆشگوزەرانی بە هەنگاوی گەورە و تا ئاستی دەوڵەمەندبوونی ناڕەوا لە ئەمریکا و بریتانیا و کەنەدا و ئوستراڵیا سەری هەڵدایەوە.. ئەوساکە و پێش کۆتاییهاتنی ساڵی ١٩٢٩، گورزێکی کوشندەی کتوپڕ وەشێندرا..گەورەترین تراژیدیای ئابووری هاتە ئاراوە کە جیهان لە سەرانسەری مێژووی خۆیدا ڕووداوی لەو چەشنەی بەخۆیەوە نەبینیبوو.. دەرئەنجامی ئەو مەرگەساتە ئەوە بوو ملیۆنان خەڵك بۆ نانێك بە ئاسماندا دەچوون و بەدوای پاروە نانێکدا هەڵوەدا بوون.. هەزاران کەس خۆیان کوشت.. ئەوکات ئۆباڵەکە خرایە ئەستۆی خراپیی بەڕێوەبردن و ئەو دەستهەڵاتەی وای لە دەیان ملیۆن کەس کرد بکەونە نێو هەژارییەکی کوشندەوە، ٣٠٠ کەسی ملیۆنێریش داهاتەکانیان گەیشتە ڕێژەی چەندان تریلیۆن.

ستالینیش لە ساڵی ١٩٢٥ پیلانە پێنجینەییە پیشەسازییەکەی خستە واری جێبەجێکردنەوە، ئەمەیش-وەك خۆی دەیگوت- بۆ چاکترکردنی بارودۆخی نێوخۆیی وڵاتانی کۆمۆنیستییە.. پلانەکە بریتی بوو لە سوود وەرگرتن لە سەرچاوە سرووشتییەکان و بە پیشەسازیکردن و چاکترکردنی ئامرازە کشتوکاڵییەکان و نوێکردنەوەی پیشەسازی.. ئەم پلانە پێنجینەییە لە ڕێگەی قەرزبەخشینێکەوە بەشدارییەکی کارا و بەهێزی لە چاکترکردنی ئابووریی ڕووسیا و

بنیادنانەوەی هێزی سەربازیی ڕووسی و ئەڵمانیاشدا کرد و لەلایەن سووخۆرانی نێودەوڵەتییەوە پارەپووڵی بۆ تەرخان کرا.

هەنگاوی دواتری ستالین دامەزراندنی کێلگە هەرەوەزییەکان بوو.. گەلی ڕووسی ماوەی چەندان سەدە لەنێو ئەو زەوییانەدا کەمتر لە کۆیلە دەژیان کە دەرەبەگەکان قۆرغیان کردبوو، دواتریش لینین بەڵێنی بە جووتیاران دا ژیانێکی باشتریان بۆ دەستەبەر بکات، ئەوسا زیاتر لە دوو ملیۆن خانەوادەی جووتیاران لە دەرەبەگەکانی خۆیان دوور کەوتنەوە و زەوییەکان دابەش کران، هەموویان بوونە خاوەن زەویی سەربەخۆ.. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٦دا ژمارەی خانەوادەکان بۆ ٦,٢٠٠,٠٠٠ خانەوادە بەرز بوویەوە.

بەڵام بەدبەختی یەخەی ئەو کەسانەی بەرنەدەدا، چوونکە سووخۆرانی نێو دەوڵەتی دەیانویست ئەو قەرزانەی خۆیان وەرگرنەوە کە بۆ پلانی کشتوکاڵی و بنیادنانەوەی سوپای ئەڵمانی بەخشیبوویان، لەبەرئەوە سووربوون لەسەر ئەوەی هەناردە و هاوردەکانی کۆمۆنیستی کۆنترۆڵ بکەن، هەروەها داوایانکرد کێلگە هەرەوەزییەکان وەك تاکە ئامرازی زیادکردنی بەرهەمی کشتوکاڵی دابمەزرێنرێن.

مێژوو ئەو ڕاستییەی تۆمارکردووە کاتێك ستالین بەهێز و زۆرەملێ پرۆژەی کێلگە هەرەوەزییەکانی جێبەجێ کرد چی ڕووی دا، زیاتر لە پێنج ملیۆن جووتیار ڕووبەڕووی سێدارە کرانەوە، یانیش لە برسان مردن، هەر لەبەرئەوەی ڕەتیان کردەوە پرۆژەکە جێبەجێ بکەن یان دژی وەستابوونەوە.. هەروەها زیاتر لە پێنج ملیۆنی دیکەش ڕاگوێزرانە سیبیریا و لەوێ سزغرەیان پێ دەکرا.. لەوانەش زیاتر، ئەوەبوو گەنمی جووتیاران لەلایەن ستالینەوە دەستی بەسەردا گیرا و

فرۆشرایە سووخۆرە نێودەوڵەتییەکان، بۆ ئەوەی بخرێتە سەر ئەو ڕێژە گەنمەی ئەو کەسانە لە وڵاتانی دیکەدا کڕیبوویان.. مەبەستیش لەو کردەیە پیلانگێڕی بوو دژ بە گەنمی ئەمریکی و کەنەدی، بۆ ئەوەی بازاڕی بشکێ و بازاڕی ساغکردنەوەی گەنمەکە نەمێنێ یانیش بە ئارەزوو و بەرژەوەندیی خۆیان گەمە بە نرخەکان بکەن.. هەروەها سووخۆرەکان گوزرێکی دیکەشیان لە گۆشت و ئاژەڵی کەنەدی و ئەمریکی وەشاند، هەستان ڕێژەیەکی یەکجار زۆر گۆشتی بەستوو و قوتووبەندکراویان لە ئەرژەنتین و چەند وڵاتێکی دیکەی بەرهەمهێنەری گۆشت کڕی.

سووخۆران لەنێوان سالآنی ١٩٢٠ و ١٩٢٩دا کرێباری کەشتیی گشت وڵاتانیان داشکاند، تەنیا بریتانیا و کەنەدا و ئەمریکای نەگرتەوە.. لە ئەنجامی ئەو چەتەگەرییە بازرگانییە دەریاییشەدا، کەشتیی ئەو سێ وڵاتە نەیانتوانی لە نرخی کرێباردا کێبڕکێ لەگەڵ کەشتییەکانی دیکەدا بکەن، بۆیی هەزاران کەشتیی بازرگانی لە کەنار و بەندرەکاندا لەنگەریان گرت و کردەی هەناردەکردن بەشێوەیەك پەکی کەوت کە لە مێژوودا هاوشێوەی نەبووە.

لەو کاتەی ئاستی هەناردەکردن لە وڵاتانی هاوپەیماندا بەشێوەیەکی سەیر دادەبەزی، کردەی هاوردەکردن لەئەڵمانیا و یابان و وڵاتانی ئەورووپای نێوەڕاستدا بەرز دەبوویەوە... بەمشێوەیە بارودۆخی وڵاتانی هاوپەیمان بەرەو خراپتر دەچوو.. بۆ نموونە لە کەنەدا لە هەر هەشت کەسی خاوەن دەرامەت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پشتیان بە کردەی هەناردەکردن دەبەست.. خۆ ئەگەر ئاستی هەناردەکردن دابەزێ، ڕاستەوخۆ نزمبوونەوە و پاشەکشەی

بازرگانی بەدوادا دێت.. چونکە توانای کڕینی پێنج کەس لە هەشت کەسی خاوەن دەرامەت دادەبەزێ.. ئەمەش کار لە هەموو ئەو کەسانە دەکات کە وەك هۆکارێکی بژێوی پەیداکردن پشت بە خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەکان دەبەستن.. جا ئەگەر ئەو دابەزینەی ئاستی کرێ هەر لە نرخی خۆیدا مایەوە یان هەناردەکردن وەستا، ئەوا پاشەکشەکردنی بازرگانی دەبێتە قەیران و بەرەو کارەسات دەچێت.

جا بۆ ئەوەی داڕێژەرانی نەخشە و پیلانی کودەتای جیهانی لە گۆڕیوونەوەی پەیکەریی ئابووریی ولاتانی هاوپەیمان دڵنیاببنەوە، بازاڕی جیهانییان پڕ لە کرد لە گەنم و گۆشت، نرخەکەنیشیان هێندە کەم بوو لە تێچووی بەرهەمهێنانی نێو کەنەدا و ئەمریکا و ئوستراڵیا زۆر کەمتر بوو.. دەرئەنجامی ئەو کردەیەش ئەوە بوو عەنبارەکانی گەنمی نێو ولاتانی هاوپەیمان لەسەری دەڕژایەوە و نەیاندەتوانی بیفرۆشن، لە هەمان کاتیشدا گەلانی نێو چەند دەوڵەتێك لەبەر نەبوونی نان و گۆشت لە برسان دەمردن.. بریتانیا بە خزمەتگوزارییەکانی ئەو دیو دەریایەکانەوە دەیتوانی جیاوازە گەورەکەی نێوان ئاستی هەناردە و هاوردەکردن پارسەنگ بداتەوە، چونکە نزیکەی ٨٥ ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی قازانج دەکرد.. بەلام کاتێك کێبڕکێییەکی زۆر نادادپەروەرانە نەیهێشت ئەو ڕێژە دەرامەتەش وەدەستبێنێ، گورزێکی کوشندەی بەرکەوت.. لە هەمان کاتیشدا سووخۆرانی نێو دەوڵەتی ئەو قەیرانە دەستکردە ئابوورییەیان قۆستەوە بۆ ئەوەی لەنێو ولاتانی کۆمۆنوێڵسدا کەشێکی پڕ لە بێنە بەردە و ناکۆکی بهێننە ئاراوە بەو ئامانجەی ئیمپراتۆریای بریتانی لاواز بکەن و دواتریش هەڵی بوەشێننەوە.

ئەو جەنگە ئابوورییە چی بوو؟.. پاشەکشەکردن و بێ بازاڕییەکی کوشندەی بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵی وڵاتانی هاوپەیمان و سەرمایەداری گرتەوە، لە هەمان کاتیشدا زیاسبوونێکی زۆر و فراوانبوونێکی گەورەی چالاکییەکیانی وڵاتانی کۆمۆنیستی و وڵاتانی هاوپەیمانی تەوەرەیی لێ کەوتەوە..

بەمشێوەیە دۆخە نێودەوڵەتییەکەی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانیان دەرەخساند لەو کاتەی خۆیان دەیانویست.

## بەشی دوانزەیەم

# شۆڕشی ئیسپانی

بابا ئەنیوسینسی سێیەم لە سەدەی سێزدەیەمی زاینیدا لەپێناو دەستگیرکردن و لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئەو زەندیقانە دادگەکانی پشکنینی دامەزراند کە خۆیان بە کەسانی دیندار پیشان دەدا ( ڕاستییەکەی بۆ ئەشکەنجەدانێکی دڕندەیی موسڵمانان و جوولەکە بوو! !).. پێش ئەو نۆخە ئیسپانیا ڕێزی لە جوولەکەکان دەگرت و بەشێوەیەکی زۆر دۆستانە ڕەفتاری لەگەڵ دەکردن.. لێرەوە دەبینین گشت تاوانەکانی سوودخۆرە خوانەناسەکان و بەکرێگیراوانیان لە ئیسپانیا و چەندان وڵاتی دیکە بە جووەکانەوە دەلکێنران.. کار و چالاکییەکانی دادگەکانی پشکنین لە ڕۆژگاری ئیزابیلا و فردیناند واتا لەنێوان ساڵانی ١٤٧٥ و ١٥٠٤ بەردەوام بوو.

کاتێکیش حوکمڕانیی تورکوّمادا بەرپابوو، دادگەکانی پشکنین بینیان شانە و خانە نووستووەکانی هەڵگەڕاوە و تێکدەران بەشێوەیەکی بەربلاو لە وڵاتدا تەشەنەیان کردووە و ڕێکخستنێکی زۆر ورد و سیستماتیکیان هەیە.. ئەوسا ئیسپانیاش ڕێچکەی وڵاتانی دیکەی ئەورووپی گرت و جووەکانی لە خاکی خۆی وەدەرنا، ئەمەیش توندڕۆیانی دنەدا دژ بە جووەکان چەند کار و کردەیەکی توندوتیژانەی جەماوەری بکەن، چەند قەسابخانەیەکی پڕ لە تراژیدیا دروستبوون کە

دەستهەلاتی کەنیسە لە ڕۆما شەرمەزاری کردن و بەشێوەیەکی ئاشکرا هێرشی کردە سەریان.

لە سەدەی حەڤدەیەم و دوای دووبارە ڕێکخستنەوەی پیاوانی بانکیی جیهانی، بەکرێگیراوەکانیان گەڕانەوە و دزەیان کردە نێو بەڕێوەبەرایەتیی خەزێنەی ئیسپانی، ئەو کەسانە لە سەردەمی هەردوو شۆڕشی فەرەنسی و ئینگلیزیدا چالاکییەکی بەرفرەیان هەبوو.. بەم هەوڵی خۆیان خستەگەڕ ئابووریی ئیسپانیا بەرەو دارمان و لاوازکردن ببەن و خودی وڵاتەکەش بکەنە لانەی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان.

زۆر گرنگە سەرەداوەکانی ئەو کودەتایە سیاسییە بدۆزینەوە کە لەنێوان ساڵانی ١٨٣٩ و ١٩٣٩ دارێژران، بۆئەوەی وێنەیەکی ڕوونی شێوازی کاری شۆڕشگێڕانەمان بێتە بەرچاو کە خۆی لە سێ قۆناغی زۆر گرنگدا دەبینێتەوە:

١)دزەکردنی تاکەکانی پارتی شۆڕشگێڕی بۆ نێو پۆست و پێگە گرنگەکانی حکوومەت و مەڵبەندەکانی خزمەتگوزاریی گشتی و هێزە چەکدارەکان و ڕێکخستنەکانی کرێکاران، لەپێناو خۆ ئامادەکردن بۆ ڕووخاندنی حکوومەت لە ناوەوە لەو کاتەی دەرفەت دەڕەخسێ و فەرمان دەردەچێت.

٢) وابەستەکردنی پارتی شۆڕشگێڕی بە پارتی سۆسیالستی یان پارتی چەپڕەو، لەپێناو ڕووخاندنی حکوومەت، جا ئەگەر پاشایەتی بێت یانیش کۆماری.

٣)بەڕێوەبردنی چەند چالاکییەکی تێکدەرانە لەپێناو خولقاندنی ئاشووب و وروژاندنی ڕای گشتی لەهەنبەر حکوومەتی بەرەی میللیی مونتەلیفە، بۆ ئەوەی شکست بێنن، ئەمەیش ڕێگە بۆ بەرپابوونی

حکومەتێکی دکتاتۆریی پرۆلیتاری خۆش دەکات کە هەر لەگەڵ لەدایکبوونیدا کردەکانی پاکتاوکردن دەستپێبکات، دواتریش دکتاتۆریەتی تۆتالیتاری بەدیار دەکەوێ.. رێك هەر ئەمەیش لە ساڵی ١٩١٧دا لە رووسیا رووی دا.

ئێستە بابزانین چۆن ئەو سێ قۆناغە لە ئیسپانیا جێبەجێ کران، کە لەلایەن لینین و دواتریش ستالینەوە بە ئامانج گیرا بوون.

بەکرێگیراوانی کارڵ مارکس لە ئیسپانیا یەکەمین مانگرتنی گشتییان لەساڵی ١٨٦٥دا رێکیان خست.. لەساڵی ١٨٦٨دا رێبەرانی بزووتنەوەی شۆرشگێریی جیهانی (سینۆر فانیلی) یان ناردە ئیسپانیا، بۆ ئەوەی کار و چالاکیی ئەنارکیستەکان لەگەڵ مارکسییەکان رێکبخات.. سینۆر فانێلی هاورێیەکی دڵسۆزی باخۆنین بوو، خودی باخۆنینیش پێوەندییەکی پتەوی بە مارکس و ئەنگلسەوە هەبوو.. بەڵام باخۆنین پێوەندییە پتەوەکەی لەگەڵ مارکسدا نەما، چونکە لە ساڵی ١٨٧٠دا دژ بە سیاسەتی مارکس وەستایەوە، بۆیێ لە ئینتەرناسیۆناڵی یەکەم ( کۆنگرەی یەکەم)ی رێبەرانی بزووتنەوەی شۆرشگێریی جیهانی وەدەرنرا.

هەریەکە لە باخۆنین و فانیلی بەجیا چالاکییەکانی خۆیان بەرێوەدەبرد، باخۆنین توانی کاریگەری لەسەر سەرکردە شۆرشگێرەکانی ئیسپانی بکات و لە ساڵی ١٨٧٠ هاوپەیمانییەکی سۆسیالستیی دیموکراسی دامەزرێنی، حکوومەتیش بریاری قەدەغەکردنی ئەو رێکخستنەی دەرکرد، بەلام بە نهێنی لە کار و چالاکییەکانی خۆی بەردەوام بوو.

لە هەمان کاتیشدا ( ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلآت) لەنێو ئیسپانیادا ڕێکخستنی بەهێزی پێکهێنابوو.

لەو کۆنگرە گشتییەی لە زارگۆزا بەسترا، باڵی ئیسپانیای مارکسیزمی نێو دەوڵەتی بە هاوپەیمانیکردن لەگەڵ بزووتنەوەی ئانارکیستەکان ڕازی بوو.. دوای ئەو هاوپەیمانییە هەردوو لا ڕێککەوتن هەوڵ و کۆششەکانیان ڕێك بخەن، بۆ ئەوەی چینە کرێکارییەکان یەکبخەن و هاوپەیمانییەکی بەرفراوان پێکبهێنن، دواتر ئەو هاوپەیمانییە بە (کامۆرا) ناسرا.. لە ساڵی ١٨٧٣دا چالاکییەکانی خۆی بە هەڵگیرساندنی شۆڕش و دامەزراندنی کۆماری یەکەمی ئیسپانی دەستپێکرد.

وەك جارانیش، ئەو چالاکییە شۆڕشگێڕییە سەردەمێکی پڕ لە تۆقین و بڵاوبوونەوەی ئاشووب و بێسەروبەریی فراوانی لەگەڵ خۆیدا هێنا.. ئەو کردار و ڕەفتارە پڕ لە ئاشووب و ئانارکیستییانە وای لە ژەنەڕاڵ بافیا کرد جموجۆڵە کودەتاییەکەی ئاگریدات.. ئەوسا کاری شۆڕشگێڕی دووبارە گەڕایەوە دۆخی نهێنی، بەڵام زۆری نەخایاند، چونکە زۆر بەخێرایی ئەندامانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی پشتگیریی خۆیان بۆ سەرکردەکانی بزووتنەوەی میانڕۆی ڕزگاریخواز دەربڕی، بۆیێ دیسانەوە گەڕانەوە نێو گۆڕەپانی سیاسی.. ئەوسا ئاگری ململانێی نێوان لایەنگرانی نەوەکانی پاشا دۆن کارۆلز و لایەنگرانی نەوەکانی ئێزابێلا خۆش دەکرد.. ئەو ململانێیەش لە ساڵی ١٨٧٦دا بە شکستهێنانی لایەنگرانی نەوەکانی کارۆلز کۆتایی هات.

لەو کاتیدا بزووتنەوە کرێکارییەکان لە ترۆپکی خۆیاندا بوون، زۆربەشیان لەپێناو ئامانجێکی پیرۆز و جوان لە خەباتدا بوون و

دەیانویست دادپەروەری بۆ کرێکاران بهێننەدی.. زۆربەی کرێکارانیش سیاسەتە توندڕۆیەکەی بزووتنەوەی ڕەتکردنەوەی چەپڕۆییان ڕەت دەکردەوە، بۆیێ خۆیان لەنێو یەکێتیی کرێکاراندا ڕێکخست.. بەڵام دوای ئەوەی شۆڕشگێڕە توندڕۆیەکان دزەیان کردە نێو یەکێتییەکەوە و لەناوەوە دەستیان بە پاکتاو کرد، سەرکردە میانڕۆیەکانی ئەو یەکێتییە زۆر بەخێرایی کەوتنە دەرەوەی یەکێتییەکە.. چالاکی و کارە پاکتاوییەکان تا ساڵی ١٨٨٨ بەردەوام بوون، کاتێك بابلۆ ئیگلیسیاس دامەزراندنی یەکێتیی گشتیی کرێکارانی ڕاگەیاند، بۆئەوەی زۆرترین ژمارەی میانڕۆیەکان بگرێتە خۆی.. ئەو یەکێتییە گشتییە لە ئیسپانیا بە U.G.T دەناسرا و بەبێ پاڵپشتیی حکوومەت مایەوە تا ئەو کاتەی حکوومەتەکەی یەکێتیی ئیبری ڕاگەیەندرا کە گشت توندڕۆیەکان و کەسانی نێو ڕیزی بزووتنەوەکانی ڕەتکردنەوەی ئانارکیستی لە خۆگرتبوو.

دواتریش لە ساڵی ١٩١٠دا یەکێتییە توندڕۆیەکانی کرێکاران یەکێتییەکی گشتیی سەندیکاییان ڕاگەیاند و لە ئیسپانیا بە C.N.T ناسرا، ئەو یەکێتییە گشتییە سەندیکاییە و چەندان سەندیکای دیکە تا ساڵی ١٩١٣ خەریکی کار و چالاکییەکانیان بوون و ئیدی ئەو سەندیکایانەیش بەهۆی مانگرتنە یەك لەدوای یەکەکانەوە هەڵپەسێردران.. حکوومەتیش هاوکاری و ڕەزامەندی پێشکێشی بزووتنەوە کرێکارییەکان دەکرد و پاڵپشتیی لە داواکارییە بە کۆمەڵەکان دەکرد، بەڵام توندڕۆیەکان وردەوردە لەپێناو مەبەستە تایبەتەکانیان بەخراپ سوودیان لەو سەندیکایانە وەردەگرت و ئامانجەکانی خۆیانیان پێ دەهێنانەدی.. لەبەرئەوە حکوومەت گشت

سـەندیکایەکانی هەڵوەشـاندەوە و دووبـارە کرێکـاران بـێ پشتوپەنا مانەوە.

شۆڕشگێڕە توندڕۆیەکانیش دووبارە گەڕانەوە بۆنەوەی بە خراپ سوود لـە دۆخـە نوێیەکـەی کرێکاران وەربگرن و کار و ڕەفتارەکانی خۆیان لە ڕابردوو توندوتیژتر و مەترسیدارتر ئاراستە بکەن..وردە وردە چالاکییەکانیان دژ بە گشت پارتـە سیاسییەکان و خـودی دەوڵـەتیش بـەرەو فراوانـی دەبـرد.. لـە سـاڵی ١٩١٦دا ڕێکخسـتنی یەکییـەتیی توندڕۆی سەندیکایەکان بەناوی G.R.T ڕێکخرایەوە و ناوی دوو ڕێبەر کەوتـە سـەر زاران، ئـەوانیش: بیسـتاتا و سـیگۆی بـوون، ئـەو دووانـە توانیبوویان لە شاری بەرشەلۆنەدا کاری سەندیکایی یەکبخەن.

ئـەوەی یارمەتیـدەری سـەرکەوتنی ڕێکخسـتنە توندڕۆیـەکانی سەندیکایی بوو، ئەو ستەم و نادادپەروەییە بـوو کە لـە کـاتی جەنگی یەکەم و ماوەی دوای ئەو جەنگـە دەرهـەقی کرێکـاران پێڕەو دەکرا.. چـونکە ئیسـپانیا لـە ڕۆژگـاری جەنگـدا دەوڵـەتێکی بێلایـەن بـوو پـارەوپوولێکی زۆری وەدەسـتهێنابوو، بـەڵام کرێکـاران بەشـێوەیەکی گشتی لە گەشەسەندەکەی وڵاتەکەیاندا بەشدار نەبوون، بۆیێ بەلێشاو ڕوویـان لـەو ڕێکخسـتنە توندڕۆیانـە دەکـرد کـە هـەوڵی وەدیهێنـانی دەستکەوتەکانیان و نەهێشتنی ستەمی خستبووە گەڕ.. لە هـەمان کاتیشدا هەندێك سەرکردەی میانڕۆ لە چالاکییەکانیان بەردەوام بوون و توانیان لە ساڵی١٩٢٠ یەکییەتییەکی ئازادی سەندیکایی دامەزرێنن.

لە مـاوەی دوای ئـەو سـاڵە کـە تـا سـاڵی ١٩٢٣ بـەردەوام بـوو، ململانێی نێوان بزووتنەوە چەپڕەوە سەندیکاییەکان توندتر بـوو.. ئـەو وڵاتـە چـەندان مـانگرتنی خـۆجێیی و گشـتی و کـاری توندتیـژی و

تێرلێرکردنی بەرفراوانی سەرکردە کرێکارییەکانی بەخۆیەوە بینی، ئەمەیش بە ئامانجی لاوازکردنی بەرەی دوژمنەکانیان بوو.. کۆی ئەو تاوانە قێزەونانەش بەناوی ئازادییەوە کران، تا گەیشتە دۆخی ئاشووب و هەراوزەنایەکی تەواو.. ئەوساکە پاشای ئیسپانیا داوای لە ژەنەڕاڵ بریمۆدی ڕیفێرای ئەفسەری ئاسایشی وڵاتەکەی کرد دۆخەکە بوەستێنێ و لە گشت هەنگاوێکی سەربازیش سەرپشکی کردبوو بۆ ئەوەی نەیەڵێ کۆمۆنیستەکان شۆڕشێکی دیکە هەڵگیرسێنن.

یەکەمین دەرئەنجامی دەستهەڵاتی دکتاتۆریی دی ڕیفێرا ئەوەبوو بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە کۆتایی بە جەنگی ئیسپانیا- مەغریب هێنا.. کەسییەتیی ژەنەڕاڵ فرانکۆش لەمیانی ئەو جەنگەوە پێکهاتبوو و وردەوردە جەماوەری زیاتر و بەرفراوانتر دەبوو.. ناوبراو توانی بە دادپەروەری و ویستی لێبڕاوانەی خۆیەوە خۆشەویستی و سەرسامی و هاوڕێیەتیی گەلی مەغریب وەدەستبێنێ! هەرچەندە شت سەبارەت بە دی ڕیفێرا گوتران، بەلام جێگەی خۆیەتی دادپەروەر بین و بڵێین ناوبراو توانی سیستم بۆ وڵات بگەڕێنێتەوە، هەروەها دوای ئەوەی لەگەڵ ئابالیرۆ هاوکاریی کرد، توانی باروودۆخی کرێکاران باشتر بکات و چەندان ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتیشی هێنایە ئاراوە.. بەلام ئەو چالاکی و ماندووبوونە زۆرە ژەنەڕال دی ڕیفێرای بێهێزکرد و لە ساڵی ١٩٢٩ تەندروستیی بەتەواوی تێکچوو.. هەرئەمەیشە بووەتە هۆی ئەوەی وەك هەندێك کەس مەزەندەیان کردووە ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٠ بکەوێتە نێو هەڵە و سەرچیغ ڕۆیشتنەوە، چونکە لەو ساڵەدا دوو ڕێبەری بزووتنەوەی سۆسیالستیی واتا بستیرۆ و سابووری هەڵبژارد وەك ئەوەی هەستی بە باری گرانی سەرشانی خۆی کردبێ و ویستبێتی

پارەکە سووکتر بکات، داوای لەو دوو ڕێبەرە کرد تۆرگانی هەڵبژاردنی ئەو نەتەوەیە ڕێکبخەنەوە، بۆ ئەوەی گەل بتوانێ بڕیار لەسەر چارەنووسی خۆی بدات و لەنێوان پاشایەتی و کۆماریدا یەکێکیان هەڵبژێرێ.. هۆی هەڵبژاردنی ئەو دوو کەسە نەزانراوە و وەك ڕووداوێکی بێ لێکدانەوە دەمێنێتەوە.. بیسترۆ و سابووریش وەك دوو سەرکردەی شۆڕشگێڕ ڕەفتاریان کرد، تۆرگانی هەڵبژاردنیان ئابلۆقە دا و بەشێوەیەك ئامادەیان کرد هەڵبژاردنی حکوومەتێکی سۆسیالیستی ببێتە شتێکی حەتمی.. ساختەکارییەکی زۆر لەنێو دەنگداندا بڵاوبوویەوە، بەشێوەیەك تەنیا شاری مەدرید ٤٠ هەزار دەنگی ساختەی لێ کۆکرایەوە.

ئەنجوومەنی خۆرهەڵاتی مەزن لە ئیسپانیادا یەکییەتییەکی تایبەتی ڕێکخستبوو ناوی لێنابوو یەکییەتیی سەربازییانەی برایانە، ئامانجیشی ڕووخاندنی سیستمی پاشایەتی بوو.. توانیشی لە کۆی ٢٣ ژەنەڕاڵی ئیسپانیدا بەڵێن لە ٢١ کەسیان وەربگرێ، بۆ ئەوەی لە دامەزراندنی حکوومەتێکی کۆماریدا یارمەتیی بدەن.. ژەنەڕاڵ (مولا)ی سەرۆکی هێزی ئاسایشی نێوخۆیی لە ئیسپانیا لە پەرتووکەکەی خۆیدا بەناوی (Tempestad Calma Intriga Y Crisis) ئەو زانیارییانەی خستووەتە بەرچاوان و تیایدا پێمانی ڕادەگەیەنێ ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵات لەو کاتەی ژەنەڕاڵەکان پشتگیری و پەیوەستبوونی خۆیان لە هەنبەری ڕادەگەیەنن، ملیۆن و نیوێك بیزێتای خستە بەردەمیان، تاکوو ئەگەر بزووتنەوەی کۆماری شکستی هێنا، بتوانن بەو پارەیە ڕابکەن.. فرانکۆش یەکێك بوو لەو ژەنەڕاڵانەی تەفلی یەکییەتیی برایانەی سەربازی نەبوو.. گوتەکانی ژەنەڕاڵ مولا

جەخت لەوە دەکەنەوە ژەنەڕاڵێکی دیکەی نێو ڕیزەکانی یەکییەتیی برایانەی سەربازی، ژەنەڕاڵ کانو لۆبیز بوو، ناوبراو لە گوتەیەکی خۆیدا لە پارلەمانی ئیسپانیا ( کۆرتس) گوتبووی: ماسۆنییەت هەر لە ساڵی ١٩٢٥ەوە لەژێر دروشمی یەکییەتیی برایانەی سەربازییەوە زۆرینەی گەورە ئەفسەرانی سوپای کۆکردوونەتەوە.

یەکێك لەو کەسانەی وەك ئەندام چووبوونە نێو ئەو یەکییەتییە، کابانیلاس و سانگۆرگۆ و گوید و مولا و لۆبیز و ئۆشاو و کیبۆ دی لانا و چەندانی دیکە بوون.

لۆبیز درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێ: دووجار فەرمان بۆ ئەو ژەنەڕاڵانە دەرچوو، جارێکیان لە ساڵی ١٩٢٩ بوو تاکوو ئەو دکتاتۆریەتە بڕووخێنن کە دی ڕێفێرا سەرۆکایەتیی دەکرد، جارێکی دیکەش لە ساڵی ١٩٣١دا فەرمانیان پێ کرا پاشایەتی بڕووخێنن، ژەنەڕاڵەکانیش بە موو لە فەرمانەکانیان لانەدا و بە دڵ و داو جێبەجێیان کرد.

ژەنەڕاڵ مولا گێڕاویەتییەوە چۆن خۆی و زۆرینەی ژەنەڕاڵەکانی دیکە ئەو پەیمان و بەڵێنەیان شکاندووە کە پێشتر بە ئەنجومەنەکەیان دابوو، کاتێك بۆیان ڕوونبوویەوە زۆر بەسادەیی لەخشتە براون و بۆ جێبەجێکردنی چەند نەخشە و پیلانێکی نهێنیی ستالین لەپێناو گۆڕینی ئیسپانیا بەرەو دکتاتۆریەتی کۆمۆنیستی، بەکارهێنراون.

گۆڤارێکی فەرەنسی لە ڕاپۆرتێکی خۆی لە ساڵی ١٩٣٢ بڵاوی کردبوویەوە چۆن ستالین بەڵێنی دووسەت هەزار دۆلاری وەك بەشداریکردن لە تەرخانکردنی گوژمەی مەڵبەندەکانی مەشقی شۆڕشگێڕان لە ئیسپانیا داوە.. هەروەها چەند دەرخستەیەك کە لە

سالی ۱۹۲۱دا پێشکێشکی کۆنگرەی نێودەوڵەتیی کۆمۆنیستی کراوە، ڕوونیان کردووەتەوە ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکانی دووسەت و چل هەزار جونەیە –دراوی ئینگلیزی– یان وەرگرتووە، هەروەها بۆ کڕینی چەك و تفاقیش دوو ملیۆن و نیو بیزیتایان خراوەتە بەر دەست.. ژەنەڕاڵ مولا گوتوویەتی لە سالی ۱۹۳۸دا دووسەت سەکردەی شۆڕشگێڕ لە ڕووسیاوە گەیشتنە ئیسپانیا، هەموشیان لە دەستگەی لینین لە مۆسکۆدا مەشقیان بینیوە.

هەر لە سالی ۱۹۳۰ و تا ڕێکەوتی دەستپێکردنی کردەکانی هەلبژاردن، هەلمەتی ناوزڕاندن و لەکەدارکردنی پاشای ئیسپانیا و خانەوادەکەی دەستی پێکردبوو.. یەکێك لە درۆیە پووچەکانیشیان ئەوە بوو پاشا ڕۆژانە خوێنی سەربازێکی ڕشتووە بۆ ئەوەی میری ئەستووریا بە زیندوویەتی بمێنێتەوە، چونکە دووچاری خوێنبەربوون ببوویەوە.. هەروەها پاشا تۆمەتی داوێنپیسیی خرایە پاڵ، هەروەك چۆن بوختان بە ئیمپراتۆری ڕووسیا کرا بەوەی عاشقی ڕاسپۆتین بووە.

جا دوای ئەوەی کردەکانی ساختەکاری تەواوبوون و سندووقەکانی دەنگدانی گوندییەکانی لایەنگری پاشایەتی بەتاڵ کران و ئەنجامی هەلبژاردنەکان لە بەرژەوەندیی حکومەتی کۆماری ڕاگەیەندرا، پاشا فۆنسۆی سێزدەیەم دوا ڕاگەیەندراوی خۆی بۆ گەل بلاوکردەوە و تیایدا گوتی: ئەو هەلبژاردنەی ئەمڕۆ یەکشەممە بەڕێوەچوو سەلماندی من وەك جاران گەلەکەم خۆشمی ناوێ و ڕێزم لێناگرێ.. بەلام هێشتاکە هەر باوەڕم وەهایە ئەم بارودۆخە گۆڕانی بەسەردا دێت، چونکە من بەردەوام لەپێناو ئیسپانیا تێکۆشاوم و بە

دڵسۆزییەوە قوربانیم بۆی داوە.. لەوانەیە پاشا هەندێك هەڵە و کەموکورتی لێ بوەشێتەوە، بێگومانیشم لە هەڵە و کەموکورتی بەدەر نەبووم، بەڵام گەلەکەم بەردەوام و بەبێ هیچ ڕق و کینەیەك لە هەڵەی خەڵکیان بووریوە.. من کە کەسێکی ئیسپانی و پاشای گشت ئیسپانییەکانم، دەمتوانی بەدژی هەموو ئەو کەسانەی بەرهەڵستییەك دەنوێنن، گشت توانایەکانی خۆم بۆ پاراستنی مافە پاشایەتییەکانم بەکاربێنم.. بەڵام پێم باشتر بوو دەستبەرداری عەرشی دەستهەڵات بم، لە ترسی ئەوەی نەوەك وڵاتەکەم دابەش ببێت و ئیسپانییەکان لە شەڕێکی نێوخۆییدا دەستیان بچێتە خوێنی برایەکانیان.. لەو کاتەی من وڵات جێدەهێڵم، سوورم لەسەر ئەوەی هێشتا باوەڕم بەو مافە هەیە کە لەمیانی مێژووەوە بۆم دەستەبەرکراوە و ڕۆژێك لە ڕۆژان بەدوایدا دەچم و پشتگوێی ناخەم.. هەروەها من کە ئێستە دەستبەرداری گشت توانا و دەستهەڵاتەکانی ئێستەم دەبم- باوەڕم وەهایە ئەمە لە بەرژەوەندیی وڵات دەبێت و با گەلیش بەرپرسی خۆی بێت- لە خوا دەپاڕێمەوە گشت ئیسپانییەك، وەك من ئەو ئەرکەی خۆی جێبەجێ بکات کە خۆشەویستیی بۆ ئیسپانیا بەسەریدا دەسەپێنێ.

تا ئەو کاتی، پیلانگێڕەکان هەنگاوی یەکەمی نەخشەکەیان هەڵێنابوو، خەرکی هەنگاوی دووەم بوون.. گشت ئەندامانی حکوومەتە نوێیەکە بەکرێگیراوی سووخۆران نەبوون، بەڵکو ژمارەیەکی زۆریان کەسانی دڵسۆز بوون، بەڵام هەر هەموویان بێ دەستهەڵات و کەمتوانا بوون.. دەستهەڵاتی ڕاستینیش لە دەستی بەکرێگیراوی کۆمۆنیستەکان و ئەو ئانارکیستانە بوو کە خۆیان بۆ هەنگاو و قۆناغی دواتر ئامادە

دەکرد، ئەویش دامەزراندنی دکتاتۆرییەتی پرۆلیتاری بوو.. بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجەش لەسەر دوو پەت گەمەیان دەکرد، هەندێ شانە و خانەی کۆمۆنیستی بە حکوومەتیان دەگوت هەندێك هەڵ بکات، هەندێك خانەی دیکەی دەرەوەی حکوومەتیش هێرشیان دەکردە سەر حکوومەت چوونکە کەوتووەتە نێو هەڵەوە و بە کاڵفام و گەندەڵیان ناو دەبرد.. لێرەدا بەکرێگیراوانی مۆسکۆ سڵیان لە هیچ جۆرە تاوانێك نەکردەوە، بۆئەوەی خەڵك دنە بدەن نەك هەر بە دکتاتۆریەتی پرۆلیتاری ڕازی بن، بەڵکو لەپێناو پاراستنی وڵات و ئاسایشی نێوخۆیی، داوای پێکهێنانی ئەو جۆرە دکتاتۆرییەتە بکەن.

ژەنەڕاڵ دی ڕێفیرا، لارگۆ کابا لیرۆ و گرووپەکەی بەکارهێنا، بۆئەوەی ئاستی توندیی ململانێی نێوان کرێکاران و خاوەنکارەکان دابەزێنێت.. بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەی حکوومەتی کرێکاری هاتە ئارلوە، کابا لیرۆ خۆی ئاشکرا کرد و لە ساڵی ١٩٣٥دا بەڕاشکاوی ڕایگەیاند کە توانیویەتی دەیان هەزار خانە و شانەی کۆمۆنیستی لە سەرانسەری ئیسپانیادا دروست بکات.. هەر ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی لە کۆنگرەی گشتیی پانزەیەمی لیژنەی جێبەجێکاری نێونەتەوەیی کۆمۆنیستی بە چەپڵەڕێزانەوە پێشوازییەکی گەرم لە شاندی ئیسپانی بکرێ و ستایشی شاندەکە بکرێ لەوەی زەمینەسازییەکانی هەڵگیرساندنی شۆڕش بەشێوەیەکی زۆر خێرا و گونجاو و ڕێك و بەپێی پیلانە شۆڕشگێڕییەکەی تایبەت بە ئیسپانیا بەڕێوەچووە.. لە کۆنگرەی دوانزەیەمی ئەنتەرناسیۆناڵی کۆمۆنیستیدا بەمشێوەیە ڕێز لە شاندەکە گیرا و ستایش کرا: ئێمە بەتایبەت لە ئیسپانیا بەدرێژایی چەند مانگێك تێبینیی بەڕێوەچوونی چالاکیی شۆڕشگێڕانە و مانگرتنی بەردەواممان

کرد کە وڵاتەکە پێشتر هەرگیز هەلومەرجی لەمجۆرەی بەخۆیەوە نەبینیبوو.. ئەم ململانێیە کرێکارییە تەنیا هەنگاوێکی سەرەکیی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئیسپانییە.

ئەوەی پاشان لە ئیسپانیادا ڕووی دا زۆرێك لە دەمامکەکانی کودەتا و پیلانگێڕییەکەی داماڵی، بەتایبەت ئەو ڕووداو و پێشهاتەی لەنێو خودی ڕێکخستنی کۆمۆنستیدا ڕووی دا.. جا هەروەك پەندە کۆنەکەی دەڵێ: کاتێك ناکۆکی دەکەوێتە نێوان دزەکانەوە، ڕاستی بەدیاردەکەوێ، ئەوا ڕێك لە ئیسپانیا ئەو ڕاستییە خۆی دووبارە کردەوە.. چونکە هەرسێ ڕێبەری بزووتنەوەی کۆمۆنیستی واتا مۆرین و سێرگس و نین، خوێندنە شۆڕشگێڕییەکەیان لە دەستگەی لینین لە مۆسکۆ تەواو کردبوو و بۆ ڕێبەرایەتیکردنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی گەڕانەوە.

مۆرین، دوای چەندان ساڵ لە ژیانێکی پڕ لە هەراوزەنا و چالاکیی شۆڕشگێڕانە، لە ساڵی ١٩٢٦دا پەرتووکەکەی خۆی بەناوی (Hacia la Segunda Revolution) نووسی و دژایەتیی خۆی لەهەنبەر ستالین ڕاگەیاند، چونکە بە بۆچوونی مۆرین، ستالین لە بیروباوەڕی مارکسییانە لای داوە.. هەروەها مۆرین ستالینی بەوە تاوانبارکرد کە هێزە کۆمۆنیستییەکان بۆ مەرامە تایبەتەکانی خۆی بەکاردێنێ بۆ ئەوەی دەستهەڵاتێکی دکتاتۆرانەی ئیستعماری بێنێتەکایەوە.

بەمشێوەیە ململانێی نێوان ستالین لەلایەك و هەرسێ گەنج – مۆرین و سێرگس و نین– سەری هەڵدا.. ئەو سێ کەسەش لە کۆکردنەوەی کرێکاران و دواتریش کۆنترۆڵکردنیان کارامەییەکی گەورەیان خستەڕوو، ستالینیش بڕیاری دا لەنێویان بەرێ دوای ئەوەی

تا سەرەتای جەنگی نێوخۆیی ئەرکەکانی سەرشانیان بەتەواوی راپەڕاند.. فەرمانی ستالین بۆ لەنێوبردنی ئەو سێ کەسە بەجۆرێك بوو مردنەکەیان وەك شەهیدبوونێکی قارەمانانە لەپێناو کۆمۆنیزمدا بخاتە بەرچاوی گەل، کۆمۆنیستەکان شوێنی مۆرینیان بە فرانکۆ پیشان دا، دوای ئەوەی حوکمیشی لەسەر درا، لەنێوبرا.. سەبارەت بە سێرگسیش راپۆرتەکان ئاماژەیان بەوە کردبوو بە دەستی خودی کۆمۆنیستەکان کوژراوە.. (نین)یش لە ڕووداوێکی لێڵ و تەماویدا کوژرا.. دواتریش بە خەڵك و جەماوەریان ڕاگەیاند تەنیا دوژمنانی کۆمۆنیستی ئەو کەسانەیان کوشتووە.

بەڵام ئەو ململانێیە هەروا بەبێ دەرئەنجام و ئاشکرانەبوون تێنەپەڕی.. بەڵکو کۆمۆنیستەکان یەکتریان ئاشکرا دەکرد و ڕاستیی خۆیان دەخستە بەر چاو و گوێی خەڵك.. یەکێك لەو ئابڕووچوونەش نووسینەکەی سێرگسە، ناوبراو نووسیویەتی: کۆمۆنیزم لە ساڵی ١٩٣٦ ەوە لە شۆڕشگێڕیی نێونەتەوەییەوە بووەتە نەتەوەپەرستی و هێزی زەبەلاحی سەربازی پێکدەهێنێت و چەندان پارتی نێو وڵاتانی جۆراوجۆر لە خزمەتیدان، ئەو دەوڵەتە بەهێزەش گوژمە و پارەوپووڵ بۆ ئەو پارتانە دابین دەکات.. چونکە دوای ساڵی ١٩٣٦ ستالینییەکان پارتی سۆسیالیستی یەکگرتوویان دامەزراند کە کۆنگرەی سێیەمی ئەنتەرناسیونالی کۆمۆنیستی چاودێریی دەکرد.. ئامانجیش لەمە دامەزراندن و دروستکردنی هێزێکی نوێی ڕەفتار فاشییانە بوو، بۆ ئەوەی بتوانێ فەرەنسا ئابلۆقە بدات، چونکە شیمانەیان کردبوو فەرەنسا لەو جەنگەی زەمینەسازیی بۆ دەکرێ لەوانەیە ببێتە هاوپەیمانی ڕووسیا.

مۆرین لە شوێنێکی دیکەدا نووسیویەتی سیاسەتی ئینگلیز لەمێژەمانەوە ئەوەبووە دوژمنەکانی دابڕووخێنێ، تاکو دواتر وەك پارێزەرێك خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ و ڕابوون و هەڵسانەوەی دووبارەیان ئەستەم بێت.. ئێمە دەزانین ئیسپانیا بە پلەی یەکەم قوربانیی بریتانیا و بە پلەی دووەمیش قوربانیی فەرەنسایە.. خۆ ئەگەر ئیسپانیا بەرەو ئینگلترا خواری کردەوە، ئەوا فەرەنسا زیاتر دەیچەوسێنێتەوە.. جا لەبەرئەوەی فەرەنسا و ئینگلترا هەردووکیان دەوڵەتی سەرمایەدارین، ئەوا نابنە هاوپەیمانێکی سرووشتیی ئیسپانیا.. لەبەرئەوە ڕەوت و ئاراستەی لۆژیکی لە ئیسپانیا ئەوەبوو ڕووی خۆی بەرەو پورتوگال و ئەڵمانیاو ئیتاڵیا و ڕووسیا وەرسوڕێنێ، چونکە ئەو جۆرە بەرەیە وا لە فەرەنسا و ئینگلترا دەکات بۆ ئەو ببنە دوو وڵاتی بێلایەن.

سێرگس لە شوێنێکی دیکەدا ڕوونی دەکاتەوە چۆن گرلبوونەوەی چەپڕەوان لە ئیسپانیا توانیویانە لە ڕۆژنامەگەریی جیهانیدا پڕوپاگەندەی خۆیان بەشێوەیەکی بەرفراوان پەخش بکەن، لە کاتێکدا فرانکۆ لەلایەن ڕۆژنامەگەرییەوە زۆر بە کەمی ناوری لێ دراوەتەوە.. سێرگس نووسیویەتی: هیچ کەسێك لە مێژوودا وەك ستالین نەیتوانیوە ڕێگەی چەپەڵ و نامەردانە بگرێتەبەر، چونکە ناوبراو و داردەستەکەی لەپشت کۆنگرەی نێونەتەوەیی سێیەمی کۆمۆنیستیدا بەردەوام و بەبێ ڕەچاوکردنی ڕاستی و ڕاستگۆیی، پڕوپاگەندەی ناڕاست و درۆو دەلەسەیان بڵاو دەکردەوە.. ئەوان لەو پڕوپاگەندە بێبنەمایانەدا شێوازی دووبارەکردنەوە و گاڵتەپێکردنیان بەکاردەهێنا تا ئەو شێواز و ڕەوتە بۆ ئەوان بووە شتێکی میکانیکی..

خۆ وەنەبێ ئەو شێوازەیان تەنیا لە سنوور و چوارچێوەی نێوخۆیی بەکارهێنابێ،بەڵکو بیرۆکراتییەتی سۆڤییەتی بەشێوەیەکی نێونەتەوەیی گەشەی پێدا.. هەر لەگەڵ ئەوەی ڕۆژنامەی ئەزڤستیا لە فلنتیا درۆیەکی کردبایە، یەکسەر ڕۆژنامەکانی پاریس و ستۆکهۆلم و برۆکسل و لەندەن و نیویۆرك و ملبۆرن و بیۆنس ئایریس ڕاستەوخۆ لێیان وەردەگرتەوە و پەخشیان دەکردەوە.. بەمشێوەیە ملیۆنان ڕۆژنامەی پڕ لە درۆودەلەسەی سەرلێشێوێنەر بڵاو دەبوویەوە.. ئەو ڕۆشنبیرانەش کە دژی فاشیزم بوون زانیاری و ڕۆشنبیرییەکی فراوانیان لەبەردەمدا نەدەمایەوە و باوەڕیان بە ڕۆژنامەگەری دەکرد، چونکە تاکە هۆکاری وەرگرتنی زانیارییەکان بوو.. لێرەوە مرۆڤ هەست دەکات جیهانی ئەمڕۆ بەدەست کردەیەکی زەبەلاحی شێواندنی ( تضليل) ئەخلاقی دەناڵێنێ.. هەر ئەمەیشە وادەکات بە دڵنیاییەوە -کە جێگەی داخە- باوەڕ بە قسەکانی ترۆتسکی بکەم، کاتێك پروپاگەندەی کۆمنترینی ستالینی بە ( نەخۆشیی سێکسیی)ی بزووتنەوەی کرێکاری لە قەڵەم دا.

قسەکانی سێرگ و مۆرین دوای جیابوونەوەیان لە مۆسکۆ، ڕێك وەك نووسینی نێو بڵاوکراوە پاپاییەکەیە کە پاپا بیۆسی یانزەیەم لە ئاداری ساڵی ۱۹۳۷دا فەرمانی بڵاوکردنەوەی دا و لە بەشێکی ئەو بڵاوکراوەیەدا هاتووە: لێکدانەوەیەکی دیکە بۆ ئەو بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنە بەرفراوانەی حزبە کۆمۆنیستییەکان هەیە.. بەڕاستی پروپاگەندەیەکی ئەهریمەنانەیە و جیهان پێشتر هەرگیز شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینیوە.. چونکە هەر هەموویان لە یەك مەڵبەندی سەرەکیدا ڕێکدەخرێن و بەڕێوەدەبرێن، بە سەرانسەری جیهانیشدا بڵاو

دەبنەوە بەشێوەیەك لە گەڵ هەموو کەسێکدا بگونجێ.. هەروەها هەژموونیشی بەسەر سەرچاوە زەبەلاحەکانی داراییشەوە هەیە و بەردەوام لەژێر دەستی خۆیدا دەیانهێڵێتەوە، ئەمەیش دەرفەتی کۆنترۆڵکردنی جۆرەها ڕێکخراو و کۆنگرەی نێودەوڵەتی و ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی بۆ دەڕەخسێنێ.. ئەم پڕوپاگەندەیە سوود لە ڕۆژنامە و گۆڤار و سینەما و شانۆ و ئێستگە و خوێندنگە و تەنانەت زانکۆیەکانیش وەردەگرێ.. وردەوردەش دەتوانێ بچێتە نێو نەقڵی تاکە جۆراوجۆرەکانی سەرجەم چین و توێژەکانەوە.. هەروەها لایەن و ڕێگەیەکی دیکەی ئاسانی بلاّبوونەوەی کۆمۆنیزم هەیە، ئەویش دەمکوتکردن و ئابلۆقەدانی کەرتێکی زۆری ڕۆژنامەگەریی جیهانییە.. ئێمە دەڵێین تەنگەبەرکردن و ئابلۆقەدان، هەروەها ڕۆژنامەگەری بەردەوام بەهەڵپە و هەڵوەداییەوە بەدوای هەواڵدا دەگەڕێ بۆئەوەی لاپەڕەکانی خۆی پێ پڕبکاتەوە، و چاو لە هیچ هەواڵێکی ورد و درشت ناپۆشێ، چ جای ڕێکخستنێکی جیهانیی وەك کۆمۆنیزمی ڕووسی. ئەم بێدەنگی و قروقەپ لێکردنە لەلایەك بۆ کورتبینیی هەنبەر ڕەهەندە سیاسییەکان دەگەڕێتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی هەبوونی چەندان هێزی بەدخوازەوەیە کە ئێستە و ماوەیەکی دووردرێژە کار بۆ خاپوورکردنی جڤاك دەکەن.. ئێستە ئێمە بە چاوی خۆمان دەرەنجامە پڕ لە تراژیدیایەکانی ئەو پڕوپاگەندانە دەبینین.. ئەم تەشەنەکردنە بەربلاّوەی کۆمۆنیستی و شانازیکردنی ڕاشکاوانەی پاڵەوانەکانی بە وێرانکردنی کەلتووری مەسیحی و لە ڕەگەوە دەرکێشانی گشت یادەوەرییەکی لە دڵی خەڵکدا و بەتایبەت لە دەروونی لاواندا.. لە ئیسپانیاشدا هاتووەتە پێشێ، چونکە دەستیان بە هەر کەنیسە و

دێرێك ڕاگەیشتبێ، ئاتاریان لەسەر پاتاری نەهێشتووە و لەگەڵ زەوی تەختیان کردووە، هەروەها گشت نما و شوێنەوارێکی ئایینی مەسیحییان سڕیوەتەوە.. بیردۆز و پیلانەکەیان هەر بە کوشتنی مەترانەکان و هەزاران ڕاهیب و ژنان و پیاوانی نێو ئەو ئایینە نەوەستاون، بەڵکو دەستیان لەو کەسانەش وەشاندووە کە ژیانیان لە قەبێر خزمەتکردنی کرێکاران و هەژاران کردووە، زۆرینەی قوربانییەکانیان خەڵکی ئاسایی نێو ڕیزی جەماوەر و گشت چین و توێژەکان بووە.. هەموویان بە ڕقێکی دڕندانە و هۆڤانەی ئەوتۆ لەنێوبراون هەرگیز باوەڕ ناکرێ لە سەردەمێکی ئاوا پێشکەوتوودا ڕووی دابێ.. هیچ پیاوێکی ئاقڵ و سیاسییەکی بەرپرس ناتوانێ نکۆڵی لەوە بکات ئەوەی لە ئیسپانیا دەگوزەرێ لەوانەیە سبەی یان دوو سبەی لە هەر وڵاتێکی دیکەی مەدەنیشدا دووبارە ببێتەوە.. ئەگەر بیرۆکەی خودا لە دڵی مرۆڤەکاندا بسڕێتەوە، هەر ڕووداوی لەم جۆرە دێنەپێشێ، چونکە لە دوخێکی وەهادا هیچ شتێك ناتوانێ لە دەستبردن بۆ قێزەونترین تاوانی هۆڤانە دووریان بخاتەوە.

## بەشی سێزدەیەم

# جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا

ژەنەڕاڵ مولا دەڵێ: دوای ئەوەی حکومەتی سۆسیالیستی لە ئیسپانیا جڵەوی دەستهەڵاتی گرتە دەست و پاشا لە وڵات هەڵات، حکومەتەکە بەرەو بیرۆکەی چوونە نێو ئەنجومەنی مەزنی خۆرهەڵاتی ماسۆنییەکان دەچوو.. بەرپرسان و کەسانی ڕەسمی بیریان کردەوە ئەوان بە داواکاریی چوونە نێو ئەو ئەنجوومەنانە، لە مەترسیی ئەو ستەمە بەدوور دەبن کە زۆرینەی ماسۆنییەکانی نێو حکومەت لەهەنبەر خەڵکیدا پێڕەویان دەکرد، لە هەمان کاتیشدا باوەڕبوونیان بە دەستهەڵاتی کۆماری دەسەلمێنن، بەمەیش لە وێرانبوون و فەوتانێکی بێ چەندوچۆن قوتار دەبن.

چەرچڵ نووسیویەتی: یارمەتیی کۆمۆنیستەکان دراوە بۆ ئەوەی حوکمڕانییەکی کۆماری پێکبهێنن، لەپێناو ئەوەی بتوانن جارێکی دیکە ئاشووب و هەراوزەنای ئابووری و سیاسی بنێنەوە و تا دۆخەکە دەگاتە ئاستێك وەها لە سەرۆك و سەرکردەکان بکرێ لۆژێکییانە بە گوێی هاوولاتییانی نێو جڤاکە پڕ لە ئاشووب و شپرزەییەکاندا بچرپێنن تاکە

ڕێگـەی گەڕاندنـەوە و بەرقەرابوونـەوەی یاسـا و ڕەواندنـەوەی تـەمی تۆخە ناهەموارەکە، تەنیا بە دکتاتۆریەتی پرۆلیتاری دەبێت.

هـەنگاوی لۆژیکییانـەی دوای ڕووخانـدنی سیسـتمی پاشـایەتی، هێرشی چڕوپڕ بوو بۆسەر ئەو ئایینەی گەل باوەڕی پێی هـەبوو، بۆیێ دوای دروستکردنی هەزاران گەنج و تـولازی خوانـەناس و بەلشـەفیی دژ بە بەهایە کۆمەلایەتییەکان، عەلمانییەتیان هێنایە نێو خوێندنگەکان و هەڵمەتێکی بەرفراوانیان دژ بە دەستهەلاتی باوکسالاری و دەسـتهەلاتی کەنیسـە بـەڕێوەبرد.. تـەنیا چـاوەنواڕی دەرفـەتی گونجـاو بـوون، بۆئەوەی ئەو جەماوەرە دنە بدەن هێزی زۆرەملێ دژ بە یاسا و سیستم بەکاربێنن.

کۆبونەوەیەکی نێو یانـەی ئـەتینیۆی مەدریـدی بـۆ شـرۆڤەکردنی بەرنامەی داهـاتووی سیاسـی بـەڕێوەبرا و لەسـەر ئـەم هەشـت خالـەی خوارەوە ڕێککەوتن:

١)بەرپاکردنی دکتاتۆریەتێکی کۆماری.

٢) ڕاوەدوونان و سزادانی بێ خۆگنخاندنی هەموو ئەو کەسانەی لـەژێر سایەی ئەو دکتاتۆریەتەدا هەر کارێکی ناڕەوا دەکەن.

٣) هەلوەشاندنەوەی پاسەوانی نیشتمانی و سوپا و پـۆلیس و دانـانی سوپای کۆماری لە شـوێنیان کـە لـە چـینی کرێکـاران و ئەنـدامانی یانە کۆمارییەکاندا هەلبژێدراون.

٤) دەستگرتن بەسەر موڵك و مالی دەستگە و دامەزراوە ئایینییەکان.

٥) خۆمالیکردنی زەوییەکان.

٦) لەنێوبردنی ئەو ئاژانسە ڕۆژنامەوانییانەی دژی سیسـتمی کۆمـاریی دکتاتۆرین.

٧) سوود وەرگرتن و قۆستنەوەی خوێندنگەکان بۆ خزمەتگوزارییە گشتییەکان لەگەڵ چەند هەیکەلێکی دیکە.
٨) دواخستنی پێکهێنانی پارلەمان.

بەرجەستەترین ڕێبەری سیاسیی ئەو کات ئازانای خاوەن بیری ئازادیخواز، بریتۆی سۆسیالیستی، کابالیرۆی کۆمۆنیست بوون.. ئازانا وەها خۆی نیشان دا پشتگیری لەو پێشنیازە توندڕۆیانە ناکات و گاڵتەی پێکرد، بەڵام بە نهێنی پشتگیریی لە گشت خاڵەکان دەکرد، چونکە هەر لەگەڵ ئەوەی هەڵبژێردرا، موو بەموو هەمووی جێبەجێ کردن.

دوای ڕێککەوتن لەسەر ئەو هەشت خاڵە، ئەنجوومەنی دامەزرێنەرانەی یاسادانان هەڵبژێردرا.. جا لەژێر دروشمی یاسا پارێزگەری لە گەل دەکات، دکتاتۆرییەتێکی بێ بەزەیی بەرپابوو و هیچ نما و ڕوخسارێکی دیموکراسییانەی تیادا نەدەبیندرا تەنیا ناوەکەی نەبێت، ئەویش کۆماری کرێکاری بوو.. دواتر شۆڕشگێڕێکی مەشقدیدە بەناوی جیمینزا ڕەشنووسی دەستووری دانا.. بەڵام ئیزانا هەموو هەوڵ و گرنگیدانی خۆی لەسەر لەنێوبردنی کەنیسە و پاکتاوکردنی پیاوانی ئایینیدا چڕکردەوە.. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢دا ڕابیتەی ئەیتەیستی دامەزراند، بە پارەی گەل داهاتی بۆ گۆڤارەکەیان- سن دیۆس ( ئەوانەی نکوڵی لە خواوەندیی دەکەن) دابین کرد.. لەژێر ناوی دیموکراسییەت گەیشتنە سەرجەم ئامانجەکانیان! ! گەل لە ڕێگەی چەند سەرکردەیەکەوە ڕایانگەیاند: ئێمە ئێستە لەدەست هەژموونی کەنیسە و ئەو پیاوە ئایینییانە دەربازبووین کە لەگەڵ دەرەبەگ و پاشایانی داپڵۆسێنەر هاوپەیمان بوون و پەنجەیان تێکهەڵکێشابوو..

پاشان قۆناغی دواتری نەخشە و پیلانەکە هات ئەویش دروستکردنی کەشێکی پڕ لە هەراوزەنا و شپرزەیی و بێسەروبەری و کاری تێکدەرانە بوو، چالاکیی شۆڕشگێڕانە لە کەتالۆنیا بەڕێوە دەچوو.. سەرەتا ژەنەراڵ بریمۆ توانی سەرکوتی بکات، بەلام چالاکی و خەباتی شۆڕشگێڕی دیسانەوە سەری هەڵدایەوە.. پەیامنێری (مۆرنینگ پۆست)ی لەندەنی، لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٣دا نووسیبووی: عەنبارە زەبەلاحەکانی بۆمب و چەك و فیشەك لە گشت شوێنێکی ئیسپانیا دۆزرانەوە.. هەروەها پۆلیس دڵنیابوویەوە لەوەی پارەیەکی قەبە بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش خەرجکراوە.. هەروەها لەکاتی پشکنینیشدا ڕوونبوویەوە ئەوانەی دەستگیرکرابوون پارەیەکی زۆریان پێ بوو.

لە ساڵی ١٩٢٤ و دوای شۆڕشەکەی کەتالۆنیا هەندێك ئەفسەر بە فرۆشتنی چەك تاوانبارکران، ئەمە بووە هۆی ئەوەی شۆڕش لە ئستووریا سەرهەڵبدات.

ئەوسا فرانکۆ هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ سوپای ئیسپانی ڕێکبخاتەوە و ئاستێك بۆ هەراوزەناو پشێوییەکە دابنێ.. بەلام لەلایەن دەستهەلات و لایەنە پێوەندیدارەکانی حکوومەتەوە، بەپێی پێویست یارمەتی نەدرا.. لێرەدا دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە ڕێکخستنی نهێنیی پارتی کۆمۆنیست زۆر تۆکمە بووە، چونکە لەیەك کاتدا و لە چەندان شوێنی دوور لەیەکتری شار و گوندەکان، زیاتر لە سێسەت کەنیسە سووتێندران.. هەروەها تیرۆر و تۆقاندن زۆر تەشەنەی سەند، تا کوشتن بووە پیشەیەکی زۆر ڕوون و هەرزان، بەشێوەیەك دەتواندرا بە ٥٠ بیزتا (کەمێك زیاتر لە نیو دۆلاری ئەمریکی) هەر دوژمنێکی

شۆڕش بکوژرابایە.. بەمشێوەیە بەکرێگیراوانی مۆسکۆ هەلومەرجە پڕ لە پشێوی و ئاشووبەکەی نێو ئیسپانیایان قۆزتەوە، بۆ ئەوەی پیلانەکەی لینین جێبەجێ بکەن کە تایبەت بوو بەو ولاتە.. کوشتن و پەلبڕین و دەستدرێژیی سێکسی و سووتاندن و خوێنڕشتن و کوشتن، هەرهەموویان چەند هۆکارێك بوون کۆمۆنیزم بۆ گەیشتن بە دەستهەلات بەکاری هێنان.

بەمشێوەیە بارودۆخی ئیسپانیا لە خراپ بەرەو خراپترین چوو، هێشتا سەرەتای سالی ١٩٣٦ دانەهاتبوو هەلچوون و شپرزەیی و ئاشووب سەرانسەری ئەو ولاتەی گرتەوە.. ئەوسا ئەنجوومەنی یاسادانانی دامەزرێنەر هەلوەشایەوە و ١٦ی مانگی شوبات وەك وادەی هەلبژاردنی گشتی دیاری کرا.. تا وادەی هەلبژاردنیش داهات، جیل رۆبلز و کالفۆ سۆتیلۆ هەلمەتێکی دژ بە کۆمۆنیزمیان دەستپێکرد، بەلام هەلمەت و ڕیکلامی بەلشەفییەکان لە ڕێگەی بلاوکراوەیەك بەناوی- هاوڕێیانی ڕووسیا- بەڕێوە دەچوو..

لەو سەروبەندەدا لارگۆ کالبیرۆی کۆمۆنیست، بەهۆی شکستخواردنی لە جێبەجێکردنی هەولێکی کودەتایی لە زیندان بوو.. مستەر ئەدوارد کنوبلەر چاوپێکەوتنێکی بەناونیشانی پەیامنێرێك لە ئیسپانیاوە، چاوپێکەوتنێکی لەگەل سازدا، تیایدا نووسیویەتی: ٢٦٥ کورسی وەدەستدەهێنین، بەشێوەیەکی ڕیشەیی سیستمی دەستهەلاتەکە دەگۆڕین.. ئەو پێنج سالە تێناپەڕن ئێمە خۆمان بۆ دوا ئامانجمان ئامادەکردووە، ئەویش یەکییەتیی کۆمارەکانی ئیبریە.. ئەوسا نیمچە دوورگەی ئیبیری دەبێتە تاکە نیشتمانی هەمووومان.. من هیوادارم پورتوگال بە ڕێگەی ئاشتییانە تەقلی واقیعەکە بێت، دەنا

ناچــار دەبــین – بەتایبــەت ئەگــەر دۆخەکــە وەهــا بخــوازێ– هێــز بــەکاربێنین.. دەشــتوانیت لــەمیانی میللــەی پەنجــەرەی زیندانــەوە دەســتهەڵاتداری داهــاتووی ئیســپانیا ببینیــت.. لیــنین ڕایگەیانــدووە ئیسپانیا دووەم دەوڵەتی سۆڤییەتییە لە ئەورووپا، ئەم پێشبینییەشی وەڕاســت دەگــەڕێ، منــیش دەبمــە لینینــی دووەمــی وەدیهێنــانی ئــەو مەبەستە.

دوای هەڵبژاردنێکی تەواو لایەنگرانە کە ئیسپانیا لـە مێژووەکەیدا هاوشــێوەکەی بەخۆیــەوە نــەبینیبوو، ســەرۆك زامــۆرا نووســیویەتی: بــەرەی میللــی بــەهۆی سیســتمێکی زۆر خــراپ و نادادەپەروەرانــەی هەڵبژاردنەوە لە ١٦ای شوباتدا گەیشتە دەستهەڵات، هــەر بــەهۆی ئــەو سیستمەشەوە بەرەی میللی زۆرینەی بەدەستهێنا، کەچی ڕاستییەکەی کەمینەیەکی دوور لە بردنەوە بوو ( تێبینیت کردووە ئەمە دەرئەنجامی گشــت هەڵبژاردنەکانــە، چــونکە تــەنیا بــەهێزترین و پــارەدارترینی ئــەو لایەنانە براوە دەبن کە ڕاگەیاندنێکی زەبەلاحیان هەیە).

بــەڵام لــە دەنگــدانی یەکەمــدا دەرئەنجامــەکان لــە بەرژەوەنــدیی بــەرەی میللیــدا نــەبوون، چــونکە لــە کــۆی ٤٦٥ دەنگــدا ٢٠٠ دەنگــی وەدەستهێنا.. بەم ڕێژە دەنگەش نەیتوانی حکوومەت پێکبهێنێ، بۆیێ ناچــاربوون لەگــەڵ کەمینــەکانی دیکــەی پارلەمانــدا هاوپەیمانییــەك پێکبهێنن، لەبەرئەوە لەگەڵ باسك و چەندان لایـەنی دیکـە چـوونە نێو هاوپەیمانییــەوە و ئەنجوومــەنێکییان پێکهێنــا بــۆ ئــەوەی ئــەرکی دووبارەکردنەوەی هەڵبژاردنی گشت پارێزگەکان بگرێتە ئەستۆ.. ئەوجا ناوبــانگی هەنــدێك پــاڵێوراوی ڕاســتڕەویان لەکــەدار کــرد و گومــانی خەڵکیشیان وروژاند لەوەی کەسانی بێ توانـا و نەشـارەزان، بەمـەش

تولنیان له سەرکەوتنەکەیان دڵنیابن.. لە ئەنجامی کۆتاییدا ڕێک وەک چۆن کابالیرۆ پێشبینیی کردبوو! ٢٦٥ دەنگیان وەدەستهێنا.. لەگەڵ ئەمەیشدا دەنگەکان بەمشێوەیە دابەشکرانە سەر قەوارەکان:

*پارتــە میانڕۆیــەکان و ڕاســتڕەوەکان ٤,٦١٠,٠٠٠ دەنگیــان وەدەستهێنابوو.

* پارتەکانی بەرەی میللی ٤,٣٥٦,٠٠٠ دەنگیان وەدەستهێنابوو.

بەمشــێوەیە میانڕۆیــەکان و ڕاســتڕەوەکان زیــاتر لــە ٥٥٤,٠٠٠ دەنگیان وەدەستهێنابوو.

خوێنــەر دەتــوانێ درك بــەوە بکــات ســەرکەوتنی بــەرەی میللــی بــەهۆی یــەکبوونی هێــزە چــەپڕەوەکان بەشــێوەیەکی ڕوون و ســەیر هاتووەتە دی، لەو بەرەیەدا لە سۆسیالیستە میانڕۆیەکانەوە بگرە تـا دەگاتــە کۆمۆنیســتی بەلشــەفی، هــەر هــەموویان لــەژێر ئــاڵای یــەك هاوپەیمانیدا یەکیان گرتبوو.

بەمشــێوەیە دەبیــنین چــۆن کۆمۆنیســتە ســتالینییەکان دۆخــی گشتیی ئیسپانیایان ئامادە کردبوو تـا بگەنــە ئــەو دەرئەنجامانــە.. لــە ئۆســییە حکوومییــەکانی مــاوەی پــێش هەڵبــژاردنی شــوباتی ســاڵی ١٩٣٦دا هــاتووە: هــەر لەگــەڵ کۆتاییهــاتنی دکتاتۆریــەتی ســەرۆك دی ڕیبرا لە ساڵی ١٩٣١، یــەك شۆڕش هەڵگیرســاوە و تیایدا ٢,٥٠٠ کــەس کــوژراون، هــەروەها حــەوت ڕاپــەڕین و ٩,٠٠٠ هــەزار مــانگرتن و پێــنج دواخســتنی بودجــە و زیــادبوونی دوو بلیــۆن بیزیتــا لەســەر بانکــە ناوخۆییــــەکان هاتووەتــــە ئــــاراوە، هــــەروەها ١٠٠٠ شــــارەوانی هەڵوەشێنراونەتەوە و ١١٤ ڕۆژنامە وەستاون، وڵات ماوەی دوو ساڵ و نیو لەژێر دەستەڵاتێکی سەربازیدا بووە.

بەڵام لە شەش هەفتەی دوای پێکهێنانی حکوومەتی بەرەی میللی بە سەرۆکایەتیی ئیزاننا و کابالیرۆ و بریتۆ، ئەم ڕووداوانە هاتوونەتە پێشی:

یەکەم: تیرۆکردن و دزی: لە چەق و مەڵبەندەکانی سەرکردایەتیی سیاسیدا ٥٨ ڕووداو، لە دەستگە تایبەتەکان ١٠٧ ڕووداو و لە کەنیسەکاندا ٣٦ ڕووداو، ڕوویان داوە.

دووەم: ئاگرکەوتنەوە: لە سەنتەر و مەڵبەندەکانی سەرکردایەتیی سیاسیدا ١٢ حاڵەت و لە دامودەستگە تایبەتەکان ٦٠ حاڵەت و لە کەنیسەکاندا ١٠٦ حاڵەتی ئاگرکەوتنەوە ڕووی داوە.

سێیەم: کار و کردەوەی تێکدەرانە: ١١ مانگرتنی گشتی، ١٦٩ ڕاپەڕین، ٧٦ حاڵەتی کوشتن، ٣٦٤ بریندار.

کابالیرۆ لە ناوچەی زاراگۆزا گوتارێکی پێشکێش کرد و گوتی: دەبێ ئیسپانیا خاپوور بکەین، بۆ ئەوەی ببێتە هی ئێمە.. لە ڕۆژی تۆڵەکردنەوەشدا داری لەسەر بەردی نایەڵین.. لە شوێنێکی دیکەشدا ڕایگەیاندبوو: پێش هەڵبژاردنەکان دەمانپرسی چیمان دەوێ، بەڵام هەنووکە و دوای هەڵبژاردنەکان، بەهەر ئامرازێك بێت هەرچیمان بوێ دەیبەین.. با ڕاسترۆیەکانیش پێشبینیی هیچ سۆز و بەزەییەکی کرێکاران نەکەن، چونکە ئێمە نایەڵین هیچ دوژمنێك لەبەر دەستمان دەربچێ.

ئازاناش بە ڕوویەکی خۆش و پڕ لە شادییەوە ڕایگەیاند: ئیدی ئیسپانیا هەرگیز وڵاتێکی کاسۆلیکی نییە.

لە ڕاپۆرتێکی هەواڵنێری ڕۆژنامەی تایمزی شوباتی ساڵی ١٩٣٦دا سەبارەت بە بارودۆخی بەرشەلۆنە هاتووە: ئەنجوومەنێکی حکوومی

هۆشداریی داوەتە چەند کەسێکی ڕەسمی بەوەی کە زۆر پێویستە لە مانگی شوباتدا دەستبەرداری پۆستەکانیان ببن، ئەم هۆشدارییەش یەکسەر جێبەجێ کرا.. دوای مانگێک نووسیبووی: ئێستە غەمی گەورەی گشت کۆمۆنیستەکان ئەوەیە دکتاتۆرییەتی پرۆلیتاری بنیاد بنێن.. دوای ماوەیەکی دیکەش نووسیبووی: سۆسیالیزمی ئیسپانی زۆر بەخێرایی بەرەو کۆمۆنیزم هەنگاوی هەڵێنا.. مارکس و لینین لەلایەن گەنجانەوە پشتگیرییەکی گەورەیان لێ دەکرێ و خۆیان بە قوتابییانی ئەوان دەزانن.. ئەو گەنجانە باوەڕیان وایە وەدەستهێنانی دەستهەڵات داواکاری و خواستی شۆڕشگێڕانەی سۆسیالیزمی ئیسپانییە، هەروەها توندوتیژی و کاری توندڕۆیانە، هۆکاری سەرکەوتووانەی وەدەستهێنانی ئەو دەستهەڵاتانەن.. باوەڕیشیان وەهایە تاکە ڕێگەی پاراستنی دەستهەڵات دکتاتۆرییەتی پرۆلیتارییە.. بەمشێوەیە ڕێوڕەسم و ڕێکارەکانی ئەو ڕێبازە ڕووخێنەرە بەشێوەیەکی بەرفراوان تەشنە دەستێنێ.. هەمان ئەو هەواڵنێرە لە ئاداری ساڵی ١٩٣٦دا دیسانەوە نووسیبووی: ئەندام پاڕلەمانەکانی ئیسپانی هەمان سروودی نیشتمانیی ڕووسییان گوتەوە و مشتەکانیان بەرز کردبووەوە و سڵاوی کۆمۆنیستییان کردبوو.

ئێستەیش لە خۆمان دەپرسین: بۆچی گەنجانی ئیسپانی بە کۆمەڵ بوونە کۆمۆنیستی؟

بەدواداچوونەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئیزانا- یەکێک لە سەرکردە شۆڕشگێڕەکان- وەک خاوەن هێزی ئازادیخوازی و باوەڕدار بە سۆسیالیزمێک خۆی پیشان دا کە دژی ئایین ناوەستێتەوە..هەروەها لەهەنبەر ئەو ترس و تۆقاندنەی تێکدەران و کۆمۆنیستەکان

دەیاننواند، ناڕەزایی دەردەبڕی.. بەڵام کاتێك گەیشتە دەستهەڵاتی سیاسی، ئەم وێنەیەی بۆ خۆی کێشابووی بە تەواوی گۆڕا، چونکە دەستهەڵاتەکەی بۆ لەنێوبردنی ئەنجوومەن و گردبوونە ئایینییەکان و قوتابخانە ئایینییەکان بەکاردەهێنا، دواتریش بڕیاری دروستکردنی قوتابخانە عەلمانییەکانی خستە ئەستۆی فرانسیسکۆ.. ئیدی بەمشێوەیە خوێندکاران لەکاتی دەستپێکردنی وانەکانیان سروودی عەلمانییانەیان دەگوتەوە، لەو سروودانەش:

ئێمە ڕۆڵەی شۆڕشین، ئێمە ڕۆڵەی ئازادین.. بە ئێمە خۆری نوێی مرۆڤایەتی هەڵات.

هەروەها لە قوتابخانەکانی بەرشەلۆنەشدا چەند سروودێکیان دەگوتەوە، لەوانە:

بۆمبێك بهاوێژە، مینەکە جوان دابنێوە، بە توندی دەمانچە بگرە دەست، سروودە نیشتمانییەکان بڵێرەوە.. بەچەکەوە تا مەرگ ئامادەبە، بە دەمانچە و دەنەمێتەکەت حکوومەت وێران بکە!!

چەند سروودێکی دیکەی هاوشێوەش هەن کە لە ڕادیۆی مۆسکۆدا بە زمانی ئینگلیزی پەخش دەکران و لەنێوان ساڵانی ١٩٢٧ و ١٩٣٨ ئاراستەی کۆمۆنیستە ئینگلیزەکان دەکران، بەمشێوەیە سەرنووسەران و کەسانی بەرپرسی ڕۆژنامە بریتانی و ئەمریکییەکان ڕەتیان کردەوە ڕاستییەکان بلاوبکەنەوە، چونکە بەشێوەیەکی هێندە سەیر بلاو ببوونەوە کەس نەیدەتوانی باوەڕیان پێ بکات.. لەگەڵ ئەمەیشدا ڕاستییە تاڵەکە لە نامەیەکی فرانسیسکۆ بۆ هاوڕێیەکی ئاشکرابوو، لە نامەکەدا نووسیبووی: جا بۆ ئەوەی خەڵك نەترسێنین و پاساوی داخستنی دەستگەکانمان نەدەینە دەست، بە قوتابخانە

نوێیەکان ناومان دەبردن، نەك بە قوتابخانەکانی فێرکردنی بنەمایەکانی ڕەتکردنەوە و گۆڕانکاری.. هەر چەندە من حەزم لە بەرپاکردنی شۆڕشە، بەڵام لەوکاتیدا تەنیا ئەوەندەم پێ بەس بوو مزری شۆڕشگێری لە مێشکی گەنجاندا بچەسپێنم، بەشێوەیەك دژ بە پۆلیس و پیاوانی ئایینی باوەڕی سەتاسەتیان بە زەرووڕەتی نواندنی توندوتیژی هەبێت و تاکە ئامرازشییان ببێتە بۆمب و ژەهر.

ئەو نامەیە وەك بەڵگەیەك دژی فرانسیسکۆ بەکارهات، کاتێك هێزەکانی فرانکۆ لە سەردەمی جەنگی نێوخۆییدا دەستگیریان کرد.. کاتێکیش بە تۆمەتی ناپاکی حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ فرانسیسکۆ دەرکرد، ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات لە پاریس تەواو هەڵچوو، لەلای گشت ئەنجوومەنەکانی دیکەی جیهان نارەزایی دەربڕی، بەو پاساو و بانگەشەیەی فرانسیسکۆ چالاکیی دژ بە کاسۆلیکی بەڕێوەبردووە.

هەر ئەوەندەش بەسە گوتەکەی لینین بهێنینەوە: باشترینی شۆڕشگێڕەکان ئەو گەنجەیە خۆی لە ڕێبازە ئەخلاقییەکان ڕزگار کردووە.. ئێمەیش دەزانین گوتەکانی لینین لەلای کۆمۆنیستەکان وەك یاسا وەهان. لەبەرئەوە گشت تاکەکانیان کاریان بۆ دروستکردنی نەوەیەکی گەنجان کرد —لە هەردوو ڕەگەزدا— کە باوەڕیان بە بەهایە کۆمەڵایەتی و ئاکارییەکان نەبوو.

هەنگاوە سەرەتاییەکانی بەرنامەی پەروەردەکردنی گەنجانی شۆڕشگێڕ بریتی بوو لە هەڵوەشاندنەوەی پێوەندییەکانی خانەوادەیی و دنەدانی منداڵان دژ بە دەستهەڵاتی باوکانیان تەنانەت پێش ئەوەی بگەنە تەمەنی پێگەیشتن.. ئەو تێکدەرانە وەهایان لە منداڵان گەیاندبوو باوکانیان نەوەیەکی کۆنەپەرستی دواکەوتوون و منداڵانیان

لەسەر درۆ و ئەفسانە پەروەردە دەکەن، رێك وەك سەربردەکەی بابانۆیل و ئەو شوێنەی منداڵی لێ دێتە دەرەوە!

تێکدەرەکان هۆی دواکەوتوویی باوکانیان وەك ئەنجامێکی چەوساندنەوەی سەرمایەداری لێکدابوویەوە، پێشیان وابوو ئەوەی کۆن قوربانیی دابونەریت و رێورەسمە کۆنەپەرستییەکانە.. لێرەوە لەسەر منداڵ پێویست بوو دایبابی لەسەر هزری نوێی هاوچەرخ پەروەردە بکات، هەرگیز رێگەشیان پێ نەدات کۆنترۆڵی بکەن و بە ئارەزووی خۆیان ئاراستەی بکەن.. ئامانج لەو هەڵمەتە رووخێنەرەش پووکاندنەوەی پیرۆزییەکان و یەکییەتیی ژیانی خانەوادەیی بوو.

هەنگاوی دووەمیش بریتیی بوو لە: لادانی هەستی رێزگرتنی منداڵان لە هەنبەر پیاوانی ئاییني.. جا بۆ ئەوەی بگەنە ئەو مەبەستە، پیاوانی ئایینیان وەك توێژێکی کەم ئەقڵ و بێدەستەڵاتی نێو جڤاك وێنا کردبوو، دەیانگوت ئەو پیاوە ئایینییانە خزمەتکاری چینە دەستەڵاتدارەکەن.. منداڵانیانیشیان لەسەر گوتە بەناوبانگەکەی مارکس رادەهێنا کە دەڵێ: ئایین ئەفیوونی گەلانە. چونکە تەنیا لەپێناو چاککردنەوەی رووح مرۆڤ لەسەر ملکەچی و رازیبوون بە هەژاری و نەخۆشی و کاری تاقەتپڕووکێن رادەهێنێ..بەمشێوەیە راهیبەکان لە چاوی گەنجاندا بوونە ئەو گورگانەی خۆیان لە پێستی مەڕدا شاردووەتەوە و وەك ئەو قەلانە دەهاتنە بەرچاویان کە لەسەر نەزانی و کاڵفامیی جەماوەری گەل دەلەوەڕێن.. خۆ ئەگەر راهیبێك لە ئابڕووچوونێك بگلابووایە، ئەوا گشت هۆکارێکی پڕوپاگەندەیان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی بیکەنە بەهانەی تێکشکاندنی سەرتاپای ئایین.

هەر لەو کاتەش ئەو وێنە قێزەونەی پیاوانی ئایین لە مێشکی گەنجان چەسپا، هێرشی ڕاستین بۆ سەر ئایین دەستی پێدەکرد و بەشێوەیەکی زۆر قێزەون و ناشرین گاڵتە بە ئایین دەکرا.. بۆ نموونە دەیانگوت مەسیح کوڕە ناشەرعییەکەی ئەو کچە گەنجە جوولەیە کە یووسفی لەخشتەبرد وەهای تێگەیاند کوڕەکەی دیارییەکی ڕووحی پیرۆزە.. هەروەها وێنای مەسیحیان وەك فێڵبازێك دەکێشا کە بە ئەفسوون و جادوو، لاوازی و کەموکورتییە کەسییەکەی دەشاریتەوە و ناوی لەو ئەفسوونە ناوە پەرجوو.. دەشیانگوت دوانزە قوتابییەکەی مەسیح یارمەتیدەرە بەدخوازەکانی بوون!! بەو ئاستەش نەوەستان، بەڵکو سەربردەکانی مەسیحیان - کە لە منداڵیدا پینەدۆز بووە - بە واتایەکی دیکە بەکاردەهێنا و دەیانگوت بۆ فرۆشتنی عەرەق و مەشرووب لە ئاهەنگەکانی بووککگواستنەوەدا سیحری بەکارهێناوە.. هەروەها مەسیح و گشت شوێنکەوتە کاسۆلیکییەکانیان بە گۆشتخۆرانی مرۆڤ تۆمەتبار دەکرد، لەمەیشدا پشتیان بە دەقێکی تەوراتی دەبەست کە تیایدا دەڵێ: مەسیح سەرزەنشتی شوێنکەوتەکانی کردووە ئەگەر گۆشتەکەی نەخۆن و خوێنەکەی نەنۆشن، نەمریی وەدەستناهێنن!!

نەوجەوانەکانیش لە ڕێگەی پیاسە و هاوڕێیەتییەوە مەشقیان پێ دەکرا، ڕاهێنەرێك لەگەڵ نەوجەوانێك دەبوو و ئازادیخوازیی فێر دەکرد، ئەو نەوجەوانەش دواتر خۆی لە گشت بەهایەك دادەماڵی و بەتەواوی خۆی لە گشت یاسایەك ڕادەپسکاند.. نەوجەوانەکان فێر دەکران تاکە گوناه و تاوانی گەورە گوێڕایەڵ نەبوونە بۆ سەرکردەکانیان، هەروەها

تەنیا دوو تاوانیش هەن لەوانەیە تاکەکەس بیانکات: پشتگوێخستنی ئەرك، ناپاکیکردن لە نهێنییەکانی حزب.

دوای ئەو هەنگاوانەش، قۆناغی بەریککەوتن و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پۆلیس دەستی پێدەکرد.. جا بۆ ئەوەی گەنجانی تازەکار و ئەوانەی تازە مەشقیان بینیوە لەسەر ئەو کردارانە ڕابێن، دەیانخستنە نێو چەند گرووپ و کۆمەڵەیەکەوە کە لەلایەن سەرکردە کۆمۆنیستەکانەوە سەرکردایەتییان دەکرا.. ئەو سەرکردانەش گەنجانیان لەسەر پێشێلکردنی سیستم و یاسا ڕادەهێنا و ناچاریشیان دەکردن بکەونە شەڕەوە بۆ ئەوەی ئاشنای هێز و دەستهەڵاتی جەستەییان بن.. دواتریش دنەیان دەدان تاوانی بچووك بکەن، ئەو تاوانکارییە بچووکانەش هەنگاوی یەکەمی کردنی تاوانی دیکە بوون، دواتریش ڕێگەیان پێ دەدرا زیاتر و زیاتر ئاشنای ڕێکخستنی نهێنییانەی کۆمۆنیستی بن.

کۆمۆنیستەکان چیرۆکەکانی تاوانکاری و تەمسیلییە سێکسییەکانیان وەك بەشێك لە جەنگە دەروونییەکانیان بەکاردێنن.. ئەو نواندنانەش بەشێوەیەکی تایبەت ئامادە کراون بۆ ئەوەی پاڵنەرە بەدخوازە سادییە شاراوەکانی نێو دەروونی منداڵ بوروژێنن.. هەروەها قەڵغانی ئاکاریی هەندێك منداڵی لاواز دەکرد.. تەنانەت خودی گەمەکردنیشیان ببووە دەمانچە و سەرباز و تفەنگ، هەروەها بەشی هەرە زۆری فیلمە سینەماییەکانیش تاوانکاری و تەقەکردنیان تیادابوو.. کۆی ئەم شتانەیش کاریان بۆ وێرانکردن و تێکشکاندنی ڕووحی ئاساییانەی مەسیحییەت دەکرد لە منداڵاندا، وای لێیان دەکرد لەگەڵ دیمەنە توندوتیژەکان و مردنی کتوپڕ و بەکارهێنانی چەك و

نانی شەڕ رابێن.. چەندان پەرتووك و گۆڤاری ڕووتیشیان لە چاپ دەدا و بە نرخێکی هەرزان و بەشێوەیەکی بەرفراوان بلاویان دەکردنەوە.. ئەو چاپەمەنییانەیش بەشێوەیەکی تایبەت بۆ تێکشکاندنی ئەو رەهەند و نما ئەخلاقییانە ئامادەکرابوون کە بەمایە کەلتووری و رۆشنبیرییەکانی مەسیحی برەوی پێیان دابوو.

خەڵك زۆر بە کەمی درکی بە کاریگەریی سینەما دەکرد.. سینەمای نوێ رۆڵێکی نوێ و هاوچەرخی گەورەی لە هەلگەڕانەوەی گەنجان بەرووی ماڵ و خانەوادە و نیشتمان و ئایینەکانیان هەبووە.. هۆڵەکانی سینەما چەندان فیلمی دووروودرێژیان نمایش دەکرد و گشت کارە تاوانکارییانەیان پیشان دەدا، ئەو رۆڵە تاوانکارییانەش لەلایەن ژن و پیاوانی بەدڕەوشت دەگێڕدران، کردەوەکانیشیان هێندە قێزەون و چەپەڵ بوون، ویژدان سزای دەدان و یاسا قەدەغەی دەکردن.. لە کۆتاییەکەشدا تەنیا یەك خولەك بۆ سزادانی ئەو جۆرە کەسانەی نێو فیلمەکان تەرخان دەکرا، یان دەمردن یانیش پیاوانی یاسایی دەستگیریان دەکردن!!.. کاتێکیش فیلمی شۆڕشی مەکسیکی لە شاری گالڤستۆنی تکساسدا نمایش کرا و بەشێوەیەکی ڕاستین وێنەی ڕووداوەکانی شۆڕشەکەی نمایش دەکرد کە تیایدا پیاوان دەکوژران یانیش لە ماڵەکانیان پەلکێشی دەرەوە دەکران و لەسەر دەستی شۆڕشگێڕان سەریان دەپەڕێندرا، ژنانی بینەر لەهۆش خۆیان چوون.. بەلام پیاوەکان بەزۆری ڕشانەوە.. ئەمەیش بووە هۆی قەدەغەکردنی ئەو فیلمە.. بەلام لە ئێستەدا دەبینین فیلمی لەمجۆرە لە ئاهەنگە تایبەتەکاندا پێشکێش دەکرێ و مندالان و نەوجەوانان بەگەرمی داوای دەکەن، هێندەش توندوتیژ و دڵڕەق بوون ئیدی ئەو دیمەنە

خوێناوییانە هیچ کاریگەرییەکیان لێ ناکات و بەبێ هیچ هەراسانبوونێک تەماشای دیمەنەکانی کوشتن و دەستدرێژیی سێکسی دەکەن.. کۆی ئەم نەخشە و پیلانانە ئەو بنەما و ڕێبازە شۆڕشگێڕییە پشتڕاست دەکاتەوە کە دەڵێ ئێمە تەنیا لە ڕێگەی کردەی شۆڕشگێڕانەوە دەتوانین ریفۆرمێکی زۆر گرنگ ومکوڕ وەدی بهێنین.

لەو ولاتانەی هێشتاکە سەرکردە و سەرۆکەکانیان ملکەچی سەرکردەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی نەبوون، چەند ئاژانسێکی تایبەتی فیلمەکان چەند شتێک دابەش دەکەن کە لە خەیاڵیش بەدوورن، وەک دیمەنە ڕووتەکان و لەشفرۆشی و داوێنپیسی، بۆ ئەوەی بە نهێنی پیشانی کۆمەڵە خەڵکێک بدرێن.. ئەو فیلمانە گشت ئەو لادانە سێکسییانە دەخەنەڕوو کە مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوەی بینیوە ( ئێستە ئەو فیلمە پۆرنۆیانە لە کەناڵە ئاسمانییەکان و زەمینییەکانیش پەخش دەکرێن! ) .. ئەم فیلمانە بۆ تێکدانی گەنجان بەکاردەهێنرێن، ئەمەیش دنەیان دەدات بەئاسانی بچنە نێو ڕیزی ڕێکخراوە ڕادیکاڵەکانەوە.

بەمشێوەیە گەنجانی شۆڕشگێڕ پەروەردە دەکرێن.. تاکو ئەگەر دوژمنایەتیی خۆیان لەهەنبەر ئایین و بەهایە کۆمەڵایەتییەکان پیشان بدابووایە ڕەهەندەکانی توندوتیژی و توندڕۆییان لێ بەدی بکرابایە، دەنێردرانە مۆسکۆ. لەوێشدا لەسەر جەنگی شۆڕشگێڕی و جەنگی شەقامەکان ڕادەهێندران.. ئەمەیش لەو مەشقانە جیابوون کە سەرکردە ڕۆشنبیرەکان و کرێکاران دەیانکردن.

جەنگی دەروونیی شۆڕشگێڕانە لە ولاتانی خۆرئاوایی و ئیسپانیاشدا ڕۆڵی خۆی بەسەرکەوتوویی گێڕا و ئامانجەکانی بەتەواوی

مێنایە دی، چونکە مرۆڤ لەو شوێنانەدا گوێبیستی دوا گۆڕانکارییەکانی جیهان و هەواڵی تاوانەکان و ڕووداوی فڕۆکەکان و هاتوو چوو و تیرۆرە مۆڤانەکان دەبوو، دواتریش وەك بڵێی مێشیش میوانی نەبێت دەچوو بە ئاسوودەیی لێی دەخەوت.. خۆ ئەگەر ڕووداوی لەمجۆرە پێش پەنجا ساڵ لەمەوبەر ڕووی بدابووایە خەوی لە چاوان دەتۆراند.

ئەو کارە تیرۆرستییانە بوونە چەند دیاردەیەکی باو و ڕۆژانە ڕوویان دەدا، وای لێهات ئەو ڕووداو و پێشهاتانەی لە ڕابردوودا دووچاری هەڵچوون و شڵەژانیان دەکردین، بەهیچ شێوەیەك کارمان تێنەکەن و بەلامانەوە زۆر ئاسایی بن، خۆ کاتێکیش دەمانبیست فلانە حکوومەت بەهێزی سەربازی ڕووخێندراوە هەر گرنگیشمان پێی نەدەدا، خۆ ئەگەر کەمێك بەلامانەوە گرنگ بووایە، بۆ وەستاندنی ئەو جۆرە دۆخانە هەوڵێکمان دەخستەگەڕ.

کاتێك کۆمۆنیزم بەتەواوی باڵی بەسەر ئیسپانیادا دەکێشا، خەڵك دەیانگوت کۆمۆنیزم لێرە هیچ شتێکی لەدەست نایەت، چونکە زۆرینەی خەڵك گوێیان لەو کەسانە ڕادەگرت کە باسیان لە ئاسایش و سەقامگیرییەکی ساختە دەکرد.. کاتێك دوژمنانی خۆیان دەبینی ڕێك وەك شینەشاهۆ سەریان لەژێر خۆڵ دەنا و وایان دەزانی بەمجۆرە لە بەلا و موسیبەتەکانیان دوور دەبن.. بەڵام دەبێ بزانن بە خۆشاردنەوە و ڕەفتاری شینەشاهۆیانەوە ناتوانن مرۆڤێك لە دەستی بکوژ یان داگیرکەرێك دەرباز بکەن و تەنانەت لە بۆمبێکی مەترسیداریش دووری بخەنەوە.

کاتێك وادەی ڕاپەڕینە شۆڕشگێڕییەکەی ئیسپانیا داهات، دابەشکارانی ئەدەبی ڕووت و وێنەی لەشفرۆشان گوڕوتاوێکیان

هاتەوەبەر، تەنانەت لەبەردەم دەرگەی کەنیسەکان دەوەستان و لەو کاتەی نوێژکەران دەچوونە نێو کەنیسەکە و لێی دەهاتنە دەرەوە، ئەو جۆرە وێنانەیان پێیان نیشان دەدا!!.. بەرگی ئەو بڵاوکراوانە وێنەی راهیبەکانیان لە دۆخێکی زۆر نابڕووبەرانە لەسەربوو.. مەستەر کنۆبلۆی پەیامنێر کە بەڕاستی بە سەرچاوەی تایبەت بە بەسەرهات و ڕووداوەکانی جەنگی نێوخۆی ئیسپانی دادەندرێ، لە پەرتووکەکەی خۆیدا بەناوی ( پەیامنێرێك لە ئیسپانیاوە) دەنووسێ: ماوە ماوە، شاندی پیاوانی ئاینیی پرۆتستانتی، دەهات و بە چەند وشەیەك نارەزایی لەهەنبەر ئەو نووسینانە دەردەبڕی کە دەرهەق بە پیاوانی ئاینیی دەنووسران.. بەڵام بەباشترین شێوە پێشوازییان لێ دەکرا، دواتریش ڕێبەرێکی تایبەت شاندەکەی دەبردە ئەو شوێنەی دەستهەڵاتدارە کۆمۆنیستییەکان دەیانویست.. دوای یەك دوو ڕۆژ و پاش ئەوەی بەتەواوی کاریگەرییان لێ دەکردن، دەگەڕانەوە ماڵەوە.. بەڵام ڕۆژێك شاندێکی پیاوانی ئاینیی چووە پەرتووکخانەیەك و بەدوای هەندێك پەرتووکدا دەگەڕا.. جا پێش ئەوەی فەرمانبەری پەرتووکخانەکە بتوانێ ڕێیان لێ بگرێ، هەندێك ژمارەی گۆڤاری La Traca و Bicharracos کەوتنە بەرچاویان، لەسەر بەرگی ئەو گۆڤارانەشدا وێنەی نابڕووبەرانەی ژن و پیاوانی راهیبی نیمچە ڕووت هەبوو.. هەروەها گۆڤارەکان چەندان وێنەی ڕووت و نا ئەخلاقییان لەنێودا چاپ کرابوو.. شاندەکە وەك ئەوەی جنۆکە دەستی لێیان وەشاندبێ لە پەرتووکخانەکە هاتنە دەرەوە.

دەتوانین بەراوردێك لەنێوان دۆخی ئیسپانیای ساڵەکانی نێوان ١٩٢٣ و ١٩٣٦ و کەنەدای ئێستە بکەین.. ناکۆکییەك لەنێوان ئەو

دانیشتووانانە هەیە کە بەزمانی ئینگلیزی دەپەیڤن لەگەڵ ئەوانەی بە فرەنسی دەئاخڤن.. لە ئیسپانیادا گەلی باسك دەژیەت و بەو زمان و کەلتوور و دابونەریتانە دەناسرێتەوە کە بۆ سەردەمێکی زۆر دێرین دەگەڕێنەوە.. ئەو گەلە بە نەفسبەرزی و فرەدینداری دەناسرێنەوە.. باسکەکان هەروەك کەنەدی وفرەنسییەکان پێیان وایە شایستەی سەربەخۆیی نەتەوەیین.. جا بۆئەوەی ئەو سەربەخۆییەش وەدەستبێنن، بزووتنەوەیەکی جوداییخوازیان بۆ ڕزگارکردنی باسك و جیابوونەوەی لە ئیسپانیا پێکهێناوە.. زۆر ئاساییە بۆ پیلاندانەرانی بزووتنەوەی جیهانی لە ئیسپانیا، دۆخێکی وەها بقۆزنەوە و پشتگوێی نەخەن، چونکە باسکییەکان گەلێکی کاسۆلیکیی فرەدیندارن، کاتێکیش لەپێناو سەربەخۆییدا دەجەنگن باوەڕی تەواویان بە ڕەوایی پرسەکەیان هەیە.. بەلاَم زۆرینەی ئەو گەلە لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجەکانیان، لەگەڵ کۆمۆنیستەکان کاریان کردووە، بەبێ ئەوەی بزانن لەگەڵ کێ هاوپەیمانن.. ئەمەیش لەو کاتەدا ڕووی دا کە کۆمۆنیستەکان دزەیان کردە نێو جڤاکی باسکی و و ڕاستینەی خۆیان شاردەوە، تا بوونە سەرکردەی بزووتنەوە جوداخوازییەکە.. ئەوسا لەژێر دروشمی نیشتمانی و گوڕوتاوی ئایینییەوە گەلی باسکیان بەرەو قەسابخانەی خوێناوی برد.. ئەو سەرکردانە وەك سەرۆك نگوییر و گیرال و نیرجن، لەسەر دوو پەت بازیازێنیان بوو، هەردوو دروشمی خاچی مەسیحی و چەکوش و داسی کۆمۆنیستەکانیان بەیەکتر بەستبوویەوە.. کاتێکیش شۆڕش هەلگیرسا لە جەماوەرەکە دوورکەوتنەوە جەماوەرەکەش بەبێ هیچ پشت و پەنایەك ڕووبەڕووی چارەنووسی خۆی کرایەوە.. جا لەو کاتەی سەتان کەس دەکوژران،

ئـەگوییری سـەرۆکی دەوڵـەتی باسـك و سـەرکردە سـەربازییەکەی لـە نووسینگەکەی بلباو بۆ غەم لێی دانیشتبوون.

له پەڕتووکی ( ستەمی سوور له وڵاتی باسك)دا هاتووه:

کاتێـك ڕۆژی دیـاریکراو داهـات، جوداخـوازانی باسـك لـەو کاتـەی سۆزێکی کوێرانه دنەی دەدان، هەستیان دەکرد بەشێوەیەکی زۆر پتەو لەگـەڵ کۆمۆنیسـتەکان و ئەیتەیسـت و تێکدەرانـدا یـەکیان گرتـووه.. باسـك کەوتـە جەنگـەوه و بەرپرسـیاریەتیی سـەرپەڕاندن و کوشـتنیان گرته ئەستۆ، باوەڕیشیان بـە گشـت هۆکـاره هۆڤانـەکان هـەبوو.. ئـەو کەسانه گوتەی ( بابا بیۆسی یانزەیەم)ی ڕێبـەری ئایینیـان فـەرامۆش کرد که وەك فەرمانێکی گشتی دەرچووبوو و بەسەر گشـت ئەبرەشـییە ڕۆمـــە کاسـۆلیکەکاندا دابـــەش کــرا و تیایـــدا گوتبـــووی: بێگومـــان کۆمۆنیستی هەڵگەڕانەوەیه له ئایین.. هەرگیز و بەهیچ شێوەیەك ڕێگـە بەو کەسـانه نـادرێ کـە حـەز لـە خزمـەتکردنی کـەلتوور و ڕۆشـنبیریی مەسـیحی دەکـەن، بچـن لەگـەڵ کۆمـۆنیزم پەنجـە تێکهەڵکێشـن و هاوکارییان بکەن.

***

# بەشی چواردەیەم

# فرانکۆ

جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا لەساڵی ١٩٣٦دا هەڵگیرسا. کالفۆ سۆتیلۆ لە ئەنجوومەنی یاسادانان ڕایگەیاند: لە ماوەی نێوان شوبات و حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٦، ١١٢ مانگرتنی گشتی، ٢١٨ مانگرتنی بەشۆکی ڕوویان دا، ٢٨٤ تەلار و باڵەخانە و ١٧١ کەنیسە و ٦٩ یانە و ١٠ نووسینگەی ڕۆژنامەوانی سووتێندران و ٢٣٠٠ کردەی تیرۆرکردنیش بەڕێوەبران.

بەهۆی ئەم ڕاگەیاندنەوە، کساریس کویرۆگای سەرۆکوەزیران ئەڵمبازێکی دا و بە توورەییەوە وەڵامی دایەوە: لەو هەڵچوون و گرژییانەی بەهۆی گوتارەکەتەوە دێنە ئاراوە خۆت بەرپرسیاری یەکەمیت.. بەڵام دۆلۆریز ئیباروری کۆمۆنیست لە ئەنجوومەنەکەدا هەڵسایە سەرپێ و بە قیژەوە ئاماژەی بۆ سۆتیلۆ کرد و بەسەریدا نەڕاند: ئەم پیاوە دوا گوتاری خۆی دا.

هەروەهاش دەرچوو، ئەمە دوا گوتاری سۆتێلۆ بوو، چونکە لەماڵەکەی خۆیدا لەلایەن چەند سەربازێکی فەرمانبەرداری کاپتن لۆن ئەنجل مۆرینۆ پەلکێش کرا و ڕاپێچی گۆڕەپانی کەنیسەیەکی نزیکیان کرد و کوشتیان.. ئەو ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی هەندێك ژەنەڕاڵ واز لە ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەلات بێنن و داوا لە فرانکۆ بکەن

سەرکردایەتیی ولات بگرێتە دەست.. دەبێ بزانین دۆلۆریز ئیباروری ژنە شۆفارێکی ستالین بوو، ئەرکەکەشی خراپکردنی ئەفسەرانی سوپا و ڕێکخستن و پیلاندانان بوو بۆ هێرشکردنە سەر هێزە حکوومییەکان..ناوبراو ئەرکە فرە ڕەهەندەکەی بە باشترین شێوە رادەپەڕاند.

دوای تیرۆرکردنی سۆتیلۆ پاسەوانی لەناکاو هێرشیان کردە سەر مالی چەندان کەسایەتیی بەناوبانگی دژ بە کۆمۆنیزم، بەلام زۆریەیان توانیان ڕابکەن چونکە پێشوەخت ئاگادار کرابوونەوە.

لە ڕۆژی هەلبژاردنەکەی سالی ١٩٣٦دا فرانکۆ بە تەلەفۆن پێوەندیی بە ژەنەڕال بۆزاسی سەرکردەی پاسەوانی میللی کرد و هۆشداری دایە کە کۆمۆنیستەکانی هەلبژێدراو بۆ ئەنجوومەنی یاسادانان، بە ئامانجی ڕووخاندنی حکوومەتی کۆماری، هەولی نانەوەی پشێوی و کاری توندوتیژی دەدەن، دواتریش پێوەندیی بە ژەنەڕال مۆلێرۆی وەزیری جەنگ کرد ودۆخە مەترسیدارەکەی بۆ ڕوونکردەوە.. فرانکۆ پێشنیازی کرد ڕێگەی پێ بدرێ حوکمی نەریتی (العرفی) لە ولاتدا ڕابگەیەنێ.. فرانکۆ توانی ڕەزامەندیی زۆریەی سەرکردەکان وەدەستبێنێ بۆ ئەوەی شەپۆلی توندوتیژی و کاری تێکدەرانە ڕابگرێ، تەنیا واژۆی ئەنجوومەنی وەزیران مابوو، بۆ ئەوەی سیستەم و یاسا بگەڕێنێتەوە و ڕێگە لە ڕابوونی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی بگرێ کە دژ بە حکوومەتە کۆمارییەکە هەلسابووە سەر پێ.. بەلام فرانکۆ نەیتوانی واژۆیەکە وەدەستبێنێ، چونکە سەرۆکوەزیران داوای کردبوو لە واژۆکردن لەسەر ئەو بڕیارە لێی ببوورن.. وەلامی فرانکۆش زۆر ڕێك و ڕاشکاو دەبێت و دەلێ: تۆ هۆی

ئەو بارودۆخە خراپەی ئیسپانیایت.. دەبێ هەر خۆیشت هەوڵی ڕزگارکردنی بخەیتەگەڕ.

ئەوسا فەرمان بۆ ژەنەڕاڵ فرانکۆ دەرچوو بچێتە دوورگەکانی کناری.. ئەمەیش وەك نەفیکردنی بوو بۆ دەرەوەی ئیسپانیا.

جا پێش ئەوەی فرانکۆ وڵاتەکەی جێبهێڵێ، لەگەڵ هەردوو ژەنەڕاڵ- مولا و فاریلا- کۆبوویەوە، هەردوو ژەنەڕالیش دڵنیایان کردەوە ژەنەڕاڵەکانی دیکەش کاتێك بە ڕاستییەکە دەزانن، واز لە ئەنجومەنی سەربازییانەی ماسۆنی دەهێنن.

پێش ئەوەی کۆبوونەوەکە کۆتایی بێت، لەسەر شێوازی پێوەندییەکی نهێنی نێوان مۆلا و فرانکۆ ڕێککەوتن.. هەر لەگەڵ ئەوەی فرانکۆ ئیسپانیای جێهێشت و بەرەو دوورگەکانی کناری چوو، بەکرێگیراوانی ستالین دەستیان بە چالاکییەکانی خۆیان کردەوە.

لە ٢٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٦دا، فرانکۆ نامەیەکی دوورودرێژی بۆ وەزیری جەنگ نارد، تیایدا دووبارە لەمەڕ چەند مەترسییەك هۆشداریی پێدابوو.. بەڵام ئەو هۆشدارییانە تەنیا پشتگوێ خران و هیچی دیکە، چوونکە وەزیرە کۆمۆنیستەکانی نێو حکوومەتی کۆماری، سیاسەت و بزاوتەکانی حکوومەتیان بەتەواوی کۆنترۆڵ کردبوو..

تا ئەو کاتەی کالگۆ سۆتیلۆ لە ١٣ی تەمووز کوژرا، فرانکۆ بڕیاری دا دەست بەکار بێت، چەند نامەیەکی کۆدداری بۆ هەندێك ژەنەڕاڵ نارد، مەبەست ئەو ژەنەڕاڵانەیە کە سوێندیان خواردبوو لەپێناو ئیسپانیا بجەنگن تا لە چەنگی کۆمۆنیزم و بەرەی ڕووسیا ڕزگاری دەکەن.. ئەوانەی فرانکۆ پێوەندیی پێوە کردبوون لەمانە پێکهاتبوون: مۆلا و گۆدید و فانجۆل و سانجورجۆ و سالیکویت و

هەندێك ئەفسەری دیکەی دەریاوانیی ئیسپانی بوون.. هەروەها پێوەندی بە بکوێبۆ دی کرد.. فرانکۆ دوای ناردنی نامەکان لە دوورگەکانی کنارییەوە بەرەو تەتوان فڕی، چونکە دەیتوانی متمانە بە هێزە مەغریبییەکان بکات.

فرانکۆ لە ۲۱ تەمووزدا ڕاگەیەندراوێکی بڵاوکردەوە و مەسەلەکەی بە کەمترین وشە ڕوونکردبوویەوە: لەسەر هەمووان پێویستە بچنە نێو ئەو ململانێییەی لەنێوان ڕووسیا و ئیسپانیادا بەرپابووە.. بەمشێوەیە جەنگی نێوخۆیی هەڵگیرسا، وڵات دابەش بووە سەر دوو گرووپ: لایەنگران کە بریتیی بوون لە گشت چین و توێژ و گرووپە چەپڕەوەکان و لەژێر ئاڵای بەرەی میللیدا کۆببوونەوە، هەروەها بەرەی دووەمیش نیشتمانییەکان بوون، ئەوانە کۆی ئەو گرووپانە بوون کە لەژێر ئاڵای فرانکۆدا کۆببوونەوە و گشت پارتە ڕاستڕەوەکانی لەخۆ گرتبوو.. ئەو پڕوپاگەندەیەی لەو کاتیدا بڵاوببوویەوە و خەڵکی ڕەشۆکیی ئیسپانی باوەڕیان پێ کردبوو، ئەوەبوو گوایە گرووپێکی بچووکی ژەنەڕاڵەکان کودەتایەکی سەربازییان ڕێکخستووە بۆ ئەوەی حکوومەتی بەرەی میللیی کۆماریی بکەنە دکتاتۆرییەتێکی سەربازی.

کۆمۆنیستەکان بەسەر دوو گرووپدا دابەش بوون.. یەکەمیان دەیویست وەك مۆدێلەکەی ستالین دکتاتۆرییەتی پرۆلیتاری بکاتە حوکمێکی ڕەها ، گرووپی دووەمیش حەزی لێبوو ئیسپانیا بکاتە بەشێکی دانەبڕاوی ئەو کۆمارە سۆڤییەتییانەی مارکسیزم داوای وەدیهاتنیانی دەکرد.

بەڵام نەتەوەییەکانی ئیسپانی هەندێکیان تەقلی بزووتنەوەی پاشایەتی بوون کە لە ساڵی ۱۸۳۷ەوە هیوای دەخواست پاشایەتی

بگەڕێتەوە و بدرێتەوە دەست ئەوەکانی دژن کارۆلز . تەنیا ئەوانەش بوون یارمەتیی فرانکۆیان دا، چونکە بەرگەی ئەوەیان نەدەگرت بەچاوی خۆیان ببینن کۆمۆنیزم بەسەر ئیسپانیادا حوکمڕانی بکات.. سوپایەکەی فرانکۆ لەتەك پاشایەتیخوازەکاندا پارتی تیپەکانی ئیسپانیشی لە خۆگرت، ئەویش پارتێکی ڕاستڕەوی توندڕۆ بوو کۆمەڵێك کەسی نازیی ئەڵمانیی تیادابوو بۆ لەنێوبردنی دوژمنە چەپڕۆیەکانیان باوەڕیان بە جەنگێکی سەرتاسەری هەبوو.. لەو دۆخە پڕ لە جیابوونەوە و بەش بەش بوونەدا، ئاسایی بوو ڕاستڕۆیەکان گشت چەپڕۆیەکانیان بەو کۆمۆنیستانە تۆمەتبارکردبایە کەوا وەك بەشێك لە پیلانێکی تۆقێنەری کۆنترۆلکردنی دۆخەکە، هەزاران کەسیان کوشت و دەستدرێژییان کردنە سەر.. بەلام هەندێك لایەنی توندڕۆی هاوسەنگەری فرانکۆ بێدەنگ نەبوون، بەهەمانشێوە ڕەفتاریان لەگەل دوژمنەکانیان کردەوە.. ئیدی جەنگە نێوخۆییەکە مرۆڤی هێنایە ئاستێکی زۆر نزمتر لە درندە.. لێرەدا ئۆباڵەکە وەئەستۆی هەموو ئەوانەی جەنگی وەها هەڵدەگیرسێنن.

ئەوەی سەیریش بوو ئەوەبوو پیلانەکەی فرانکۆ و هەوڵەکەی لەپێناو شکستپێهێنانی کۆمۆنیستەکان، شکستی نەخوارد، گەرچی بەدواداچوونەکانی دوای جەنگی نێوخۆیی سەلماندییان کۆمەڵەیەکی زۆری ناپاکەکان بە یارمەتیی بەکرێگیراوانی مۆسکۆ کە ئەندامانی حکوومەتی بەرەی میللیی ئیسپانی بوون، دەزیان کردبووە نێو ڕیزەکانی سوپا و چەند شوێنێکی زۆر هەستیار.

پێش جەنگی نێوخۆیی، جۆلیۆ ڤێریز دیل ڤایۆ لە حکوومەتی کۆمارییەکاندا وەزیری دەرەوە و سەرۆکی گشتیی کاروباری سوپای

ئیسپانی بوو، زۆرینەی هەرە زۆری ئەو کەسانەش سەر بە پارتی کۆمۆنیست بوون، بۆیێ سەربازانیان ناچار کرد بچنە ریزی پارتەکەوە.. بالیۆزی پێشووی کۆماری ئیسپانی لە پاریس لە گۆڤاری نیویۆرك تایمزی ڕێکەوتی ١٩ی ئاياری ساڵی ١٩٣٩ ئەو ڕاستییەی دركاندووە.

بەڵگەیەكی دیكەش هەیە لەسەر زاری ئەندالیكۆ بریتۆی نوێنەری سۆسیالیستەكان دەیهێنینەوە كە لە سەردەمی جەنگی نێوخۆییدا وەزیری بەرگریش بووە، ناوبراو جەنگی دژ بە فرانكۆشی بەڕێوەبردووە.. لە ڕاپۆرتێكدا بەناوی چۆن و بۆچی وەزارەتی بەرگریی نیشتمانیم جێهێشت؟ نووسیویەتی: لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارییەتییەكە زۆر دژوار بوو، چونكە كۆمۆنیستەكان پۆستی زۆر گرنگ و هەستیاریان داگیركردبوو، بەوپەڕی نهێنیشەوە ڕاستی پەیوەستبوون و خودی خۆیان شاردبوویەوە و توانیبوویان دزە بكەنە نێو پارتەكانی دیكەشەوە..با وەك نموونە یەكێكیان باس بكەم كە دكتۆر جوان بوو، ناوبراو لە سەردەمی جەنگی نێوخۆییدا هەژموون ودەستهەلاتێكی بەهێزی هەبوو.. جا لەبەرئەوەی من فەرمانەكانی مۆسكۆم ڕەتكردنەوە، جوان نرجن لەو حكوومەتە وەدەری نام كە لە پێنجی نیسانی ساڵی ١٩٣٨دا سەرۆكایەتیی دەكرد.. هەروەها توانی لە پۆستی وەزیری بەرگریش وەدەرم بنێ، دوای ئەوەی لە یەك كاتدا دوو پیلانی بۆم هەڵچنیبوو.. یەكەمیان لەلایەن هێزی پۆلیسی نهێنیی ڕووسی و پیاوە سەربازییەكانیان لە وڵاتەكەماندا جێبەجێیان كرد، دووەمیش لەلایەن كۆمۆنیزمی ئیسپانییەوە جێبەجێ كرا.. ڕووسەكان فەرمانیان دەردەكرد و كۆمۆنیزمی ئیسپانیش جێبەجێی دەكرد.

ئەو دکتۆر جوانە دەڵێ کۆمۆنیست نەبووە و ڕۆژێك لە ڕۆژانیش وەها نەبووە، بەڵام هەر خۆی فەرمانی دا حەوت هەزار سندووق زێڕی ئیسپانی ڕادەستی ستالین بکرێ.. ئەو سندووقانەش لەلایەن کین و نیف فۆلگلیزەوە برانە سەر ئەو کەشتییەی ئالآی ڕووسی بەسەرەوە دەشەکایەوە.. جۆزیە فیلاسکۆ و ئاتۆرۆ کاندیلا وەك ئەمیندار و پیاوانی جێگەی متمانە یاوەری ئەو کەشتییانە بوون تا گەیشتنە ئۆدێسای ڕووسی. هەموو شتێك بە نهێنی و لەژێر پەردەوە بەڕێوەچوو.. تەنانەت ئەندامانی حکوومەتی بەرەی میللیش ئاگایان لە هیچ نەبوو.. هەروەها هەر لە سەردەمی جواندا سێ کۆمۆنیست لە پۆستەکانی یارمەتیدەری سکرتێریی بەرگری دامەزران، هەر ئەو سێ کەسەش دەستهەڵات و هەژموونی تەواویان بەسەر هێزەکانی وشکایی و دەریایی و ئاسمانیی ئیسپانیدا هەبوو.

گەرچی لارگۆ کابالیرۆ کۆمۆنیست بوو، بەڵام کاتێك ملی نەدایە بەر ئەو فەرمانانەی بۆی دەرچووبوون، کۆمۆنیستەکان گوێیان نەدایە پۆستە سەرۆکایەتییەکەی.. کابالیرۆ هەوڵی دەدا نکۆڵی لە هەڵەکانی بکات، بەڵام بینی کار لە کار ترازاوە و زۆر درەنگە.

لسیۆ ڕۆجەرز لە پەرتووکەکەیدا بەناوی (ئیسپانیا لە گەشتێکی ترازێدیدا) ئاماژە بەوە دەکات چەند بەڵگەنامەیەك سەبارەت بە هەڵگیرسانی شۆڕشێکی بەرفراوان کە بەدڵنیاییەوە دێتە ئاراوە، کەوتبوونە بەردەستی فرانکۆ و ژەنەڕاڵ موولا.. ڕۆجەرز نووسیویەتی: چەند بەڵگەنامە و پیلانێکی کۆمۆنیست و ئانارکیستەکان کەوتوونەتە دەست.. هەمووشیان دەری دەخەن پیلانێکی باش داڕێژراو بۆ

کودەتـاکردن دژی حکوومـەتی مەرکـەزیی مەدریـد و پێکهێنـانی دکتاتۆرییەتی سۆڤییەتی لە ئارادایە.

جێبەجێکردنی پیلانە کۆمۆنیستییەکە سێ جار دوا خراوە، بۆ ئـەوەی هێـزە بـەکرێگیراوەکان بەیـەکجاری خۆیـان ڕێکبخەنـەوە و بەتەواوی خۆیان ئامادە بکەن.

لەسـەر جیهـان پێویستبوو زانیـاریی لەسـەر پیلانەکـەی مۆسکۆ هەبووایە کە بە دژی ئیسپانیا داڕێژرابوو، چونکە ئەو بەڵگەنامانەی دوا فـەرمانی شۆڕشـیان تیـادابوو و لـە کۆمنترنـەوە بـۆ بزووتنـەوەی شۆڕشگێڕیی ئیسپانی ناردرا بوون، لە نیسانی ساڵی ١٩٣٦ ئاشکرا بوون و کەوتنە سەر زاران و دەنگیان دایەوە.

لەو ڕۆژنامەیەدا نووسرابوو:

**دەقی ئەو ڕێنماییانەی ئاراستەی میلیشیای سوور کراون.**

ئەو ڕێنماییانە ئاراستەی میلیشیای سووری ئیسپانی کراون، لە ڕێکخسـتنی مەرکـەزیی ئیسـپانییەوە دەرنەچـوون، بـەڵکو لـە لقـی خزمەتگوزاریـیە تەکنیکییـەکانی سـەر بـە پـارتی کۆمۆنیسـتی فەرەنسییەوە دەرچوون کە لەگەڵ کۆمنترن و نێردەکانی لە فەرەنسا هاوکـاری دەکـەن.. ئـەو بەڵگەنامانـەی ئێسـتە بڵاویـان دەکەینـەوە کەوتوونەتە دەستی حکوومەتی مەرکەزی، باوەڕی تەواویشمان هەیە مسیۆ دالادیری وەزیری جەنگ و بەرگری بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویستی بەرگری و خۆپارێزی، فەرمانی دەرکردووە.

لە دەقەکەدا ئەم خاڵانە هاتوون:

١)بـەهێزکردنی تیمـەکانی بەریەککـەوتن و پاسـەوانی لـە مۆڵگـەکان و دابینکردنـی دەمانچـەی ئۆتۆمـاتیکی بۆیـان.. ئـەو تیمانـە

ئەندامەکانی پارتی کۆمۆنیستین و لەنێو هێزە هەمیشەییەکانی سەربازی و هێزە یەدەگەکاندا خزمەت دەکەن.

٢) پێوەندی لەنێوان تیمەکان و ئەو کەسانە دەکرێ کە هێرش دەکەنە سەر مۆڵگەکان.. هێرشبەرەکان یەك جۆرە پۆشاك لەبەر دەکەن، لەژێر فەرمانی ئەو ئەفسەرانەشمان دەبن کە متمانەی تەواومان پێیان هەیە.

٣) کاتێك جەنگەکە هەڵدەگیرسێ، ئەفسەر و سەربازەکانمان بە نهێنی دەبرێنە مۆڵگەکان.. لەوێشدا لیژنەیەکی تایبەت لە پێشوازییاندا دەبێت و بەپێی پیلانە داڕێژراوەکەش لەگەڵ تیمە لەنێو مۆڵگەکاندا بەهاوبەشی کاردەکەن.

٤) لیژنەی نێو مۆڵگەکان هەردوو ڕۆژ جارێك تابلۆیەك ئامادە دەکەن، لە تابلۆ و لیستەکەدا لایەنە نەیارەکان و بێلایەنەکان و هەواداران و شارەزایان دەگرێتەوە.. کاتێکیش مۆڵگەکان دەکەونە بەردەستمان، زۆر بەخێرایی ئەو کەسانە لەنێو دەبەین کە لە لیستی دوژمنان ناومان نووسیون، بەتایبەتیش ئەفسەر و سەرکردەکان.

٥) هەر ئەندامێکی لیژنەکان لیستی ناوی ئەو کەسانەیان پێ دەدرێ کە پێویستە بەشێوەیەکی تاکەکەسی بکوژرێن.

٦) دوای پاکتاوکردن و لەنێوبردنی دوژمنان، بێلایەنەکانیش دەخرێنە بەردەم ئەزموونێکی زۆر دژوار و توندوتیژەوە، بۆ ئەوەی لە دوودڵییەکان دەرباز بن.

٧) لیژنەی بەرپرسی تایبەت بە بێلایەنەکان، ڕێکاری پێویست دەگرنەبەر بۆئەوەی گرووپە پاسەوانەکانی دەرەوەی مۆڵگەکان

بەپاساوی نەهێشتن و سنووردارکردنی شۆڕشەکە، بێنە نێو مۆڵگەکانەوە.

٨) لیژنەی بەرپرسی بێلایەنەکان لە دە کەس پێکدێن و دەمانچەی جەنگییان پێیە و ئەرکیان لەنێوبردن و پاکتاوکردنی ئەو ئەفسەرە نەیارانەیە کە ناویان لە لیستەکاندا هاتووە.. هەر ژەنەراڵێکیش دوو یارمەتیدەر و سکرتێرێکی هەیە و دەبێ لە ماڵەکانی خۆیاندا بکوژرێن.. ئەو کۆمەڵەیەی ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو کردە گرنگەیان پێ سپێردراوە، نابێ لەبەردەم هیچ کۆسپوتەگەرە و ناخۆشییەك پاشەکشە بکەن، ئەگەر ناچاریش بوو دەبێ ئەو کۆسپوتەگەرانە لابدات و لەنێویان ببات جا لە هەر جۆرە تەمەن و رەگەزێکدا بوون.

٩) بەڵام ئەو ژەنەراڵانەی لە خزمەت خانەشین کراون و لە لیستەکەدا ناویان نووسراوە، دەبێ بەچەند گرووپێکی سێ کەسی لەنێو ببرێن و بەپێی خاڵی هەشتەم و برگەی کۆتایی خاڵەکە، ئەرکەکانی خۆیان راپەرێنن.

١٠) وردەکاری سەبارەت بە چۆنییەتیی داگیرکردنی هەندێك ماڵ و خانوو و تەلار لە شوێنە ستراتیژییەکاندا و پڕچەککردنیان نووسراوە، بەشێوەیەك میلیشیا کۆمۆنیستەکان بتوانن لەو شوێنانەدا بۆسە بۆ هێزە و ئەندامە هەڵاتووەکانی نێو ئەو مۆڵگانە دابنێن.. لە رێنماییەکاندا هاتووە لەو کاتەی ئەفسەرانی میلیشیا پاسەوانی لە ئوتومبێلەکان دەکەن، گرووپە میلیشیاییەکان بە تانك و ئوتومبێلەکانیان بەرەو مەڵبەندە ستراتیژییەکانی وەك چوارڕیانەکان هێرش دەبەن و دەبێ رەشاش هەڵگرن بۆ ئەوەی

ئەیەڵن یارمەتیی سەربازیی لەهەر شارێکەوە بگاتە نێو شارەکانەوە.. دەبێ لە لۆرییەکان بڕێك نارنجۆك بار بکرێ..

١١) کاتێك شۆڕش هەڵدەگیرسێ، دەبێ گرووپە میلیشیاییەکان بە پۆشاکی پاسەوانی میللی و پاسەوانی هێرشییەوە، سەرانی پارتە سیاسییەکان بە پاساوی پاراستن و دوورخستنەوەیان لە مەترسی، دەستگیر بکەن.. دوای دەستگیرکرانیشیان ئەو ئەفسەرە خانەنشینانە لەنێو دەبرێن.. گرووپە یەکپۆشەکان ئەو سەرمایەدارە بەناوبانگانە دەستگیر دەکەن کە ناویان لە لیستی بی بڕیاری گشتێندراوی ژمارە (٣٢)دا هاتووە.

١٢) نابێ توندوتیژی لەهەنبەر ئەو سەرمایەدارانە بنوێندرێ، تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کە هەوڵی بەرگری و بەرهەڵستی دەدەن.. بەڵام دەبێ ناچار بکرێن کۆمپیاڵە و قەواڵە داراییەکان و پارەوپووڵی نێو بانکەکانیان ڕادەست بکەن..دواتریش خۆیان و خانەوادەکانیان لەنێو دەبرێن و نابێ کەسیان بمێننەوە.

١٣) هەمان ڕێگە و ڕێکاری بەکارهاتووی ڕووسی لە ڕەفتارکردن لەگەڵ ئەو ئەندامانەی هێزی چەکدار دەگیرێتە بەر کە پاڵپشتی و هاوسۆزیی خۆیان بۆ ئێمە دەردەبڕن.. سەرەتا سوود لە یارمەتی و خزمەتەکانیان وەردەگرین، دواتریش وەك دوژمنانی سەرخست ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرێ و لەنێو دەبرێن..چونکە بۆ ئەوەی هەوڵەکانمان سەرکەوتن وەدەستبێنن و بەردەوام بن، دەبێ سەربازێکی بێلایەنمان لەو کەسە پێ باشتر بێت کاتێك ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە، ناپاکی لە پاسایە سەربازییەکان دەکات،

چونکە ئەگەر کەسێکی وەها پێشێلکار و ناپاك دەرفەتی بۆ بڕەخسێ تەنیا ناپاکیی لێ دەوەشێتەوە.

١٤) کردەکانی پێوەندی و گواستنەوەی فەرمانەکان بەهۆی ئوتومبێلی بچووك و سوارماتۆڕەکانەوە دەبێت، سوار ماتۆڕەکانیش دەمانچەی جەنگییان هەڵگرتووە.

١٥) دەبێ ڕاپۆرتی زۆر ورد و جێگەی متمانەپێکردن سەبارەت بە ژیانی بێلایەنان و هەواداران ئامادە بکرێن، لە ڕاپۆرتەکاندا تیشك بخرێتە سەر گشت لایەنێکی ژیانیان، تەنانەت مەسەلە خێزانییەکان و ئەو کەسانەی پێوەندی خۆشەویستی و وابەستەییان لەگەڵیاندا هەیە.. ئەو شتانە لەکاتی پێویستدا زۆر سوودمان پێدەگەیەنن.. خۆ ئەگەر ئەندامێکمان یان هەوادارێك و کەسێکی بێلایەن لەهەنبەر فەرمانەکانماندا بێدەستهەڵاتی نواند یان ڕەتیکردەوە، ئەوا دەبێ یەکسەر سکاڵای لەسەر بنووسرێ و بۆ لیژنەی باڵا بەرز بکرێتەوە.

١٦) دەبێ میلیشیایەکان و ئەندامەکانیان بەشێوەیەك ڕێکبخرێن و دابەش بکرێن لە شوێنی نیشتەجێبوونیان یان ئەو گەڕەکە دوورین کە خانەوادەکانیان تیایاندا دەژیەن، چونکە ئەزموونەکانی ڕابردوو فێریان کردووین لە ساتی کۆتاییدا ئەندام و تاکەکانمان بەهۆی سۆزی هەنبەر ئەندامانی خانەوادە و خزموخوێش و ناسیاوانەوە، فەرمانەکانی سەرووی خۆیان ڕەتکردووەتەوە.. هاوڕێیەتییەکانیش لە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی بەپێی پلان دامانڕشتوون، هۆی زۆرێك لە خۆگنخاندن بووە.

١٧) دەبێ ڕەچاوی خاوەن ئەنبارەکانی کەرەستە و پێداویستی و کاڵگە بازرگانییە زۆر گرنگەکانی سەرمایەداری بکرێ.. ئەو ئەنبار و

کۆگەیانە لەلایەن چەند لیژنەیەکی ئیدارییەوە بۆ خزمەتی حکوومەتی کرێکاری ڕێك دەخرێن.

١٨) ئەم بڕگە و خاڵە تیشك دەخاتە سەر پرسی بەکارهێنانی برسییەتی و قاتوقڕی وەك هۆکارێك بۆ لەنێوبردنی خێرای نەیاران.. لە دەقەکەدا هاتووە: لە هەفتەی یەکەمدا و تاکوو لیژنەی دامەزرێنەر بەشێوەیەکی ئاسایی پێکدێت، خۆراك و خواردنەوە لە چینی بۆرژوازی دەبڕدرێ.. ئەو خۆراکە ئەنبارکراوانەی نێو مۆڵکەکانیش کە ناتوانین دەستیان بەسەردا بگرین، دەبێ بە مادەی برافین و مادەکانی دیکەی تێکدەری خۆراك تێکبدرێن.

لەو کاتەوەی ئەو ڕێنماییانە دەرچوون، سەرکردایەتییە شۆڕشگێڕەکان لە گشت دەوڵەتێکدا پلانی پێویستیان بۆ چۆنییەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ پیاوانی پۆلیس و فریاکەوتن داناوە، چونکە ئەزموونەکان سەلماندوویانە ئەندامانی نێو ئەم دوو ڕێکخستنە ڕەسمییە بۆ سەروەرە بۆرژوازییەکانیان بە دڵسۆزیی دەمێننەوە.. پلانەکە ئەم سێ هەنگاوەی خوارەوەی لەخۆگرتبوو:

١) دزەکردنە نێو ئەو دوو هێزە.

٢) تێکدانی ڕێکخستنی ناوخۆی ئەو دوو هێزە.

٣) داوا لە ئەندامانی حزب دەکرێ ئەو شوێنانە بکڕن یان بەکرێی بگرن کە دەڕواننە بنکە و مەڵبەندەکانی پۆلیس و تیمەکانی فریاکەوتن، تاکو لەکاتی ئاڵوگۆڕی ئەندامەکانیان و پاسەوانی گرتن و گەڕان و سووڕانیاندا لەنێوببرێن.. بەمشێوەیە و لەو کاتەی مەفرەزە گەڕۆکەکان دەگۆڕدرێن، وادەی هەڵگیرسانی شۆڕش دادێت.

ئەم زانیارییانە وردەکاریی پێویستیان دیاری کرد بۆ ئەوەی سەرکردایەتییەکانی پارتی کۆمۆنیست بتوانن دەست بەسەر شوێن و سێکتەرە گشتییەکان و بەڕێوبەرایەتییە ڕەسمییەکانی ئیسپانیادا بگرن.. مەبەستیش لەمەدا کۆنترۆلکردنی تەواوی گشت کۆگەکانی مادەی خۆراکی و مۆکارەکانی هاتووچووبوو لە کورتترین ماوەدا.

***

## بەشی پانزەیەم

# حوکمڕانییە تۆقێنەر و تیرۆرستییەکەی شۆڕش

سەرکردە شۆڕشگێڕەکان شانە نووستووەکانی خۆیان بۆ کۆنترۆلکردنی مەڵبەند و شوێنە سەرەکییەکانی نێو بەندیخانە و زیندان و نەخۆشخانەکانی نەخۆشییە ئەقڵییەکان بەکارهێنا، بۆ ئەوەی کەسانی تێکدەری نێو جڤاك بەرهەڵدا بکەن و لەو پێکدادانەدا بەکاریان بێنن کە لەکاتی شۆڕشدا دروست دەبوون، ئەمەیش بۆ تۆقاندنی جەماوەر و خوێنڕێژی بوو، بۆ ئەوەی زەمینەسازی بۆ دەستهەڵات و حوکمڕانییەکی تۆقێنەر و تیرۆرستی خۆش بکەن و توانا بۆ شۆڕشگێڕان بڕەخسێنێ لە کورتترین ماوەدا گەل بخەنە ژێر دەستی خۆیان.

بەمشێوەیە سیاسەتی بەندیخانەی مەدرید زۆر بە ئامۆژگارییەکانی ژەنەڕاڵ کلبیر کاریگەر ببوو، ناوبراو کە خەڵکی کەنەدا بوو بەشێوەیەکی تیۆری لە دەستگەی لینین لە مۆسکۆ ئامادەکرابوو، دواتریش ڕەوانەی ئیسپانیا کرا بۆ ئەوەی لەوێ خزمەتی ستالین بکات و لە جەنگە شۆڕشگێڕییەکاندا مەشقی کرداری ببینێ.

هەر لەگەڵ ئەوەی حکوومەتی بەرەی میللی لە ئاداری ساڵی ١٩٣٦دا دەستبەکار بوو، چەپڕەوانی توندڕۆ پێیان لەسەر دەرکردنی فەرمانی لێبووردنی گشتی داگرت، بۆ ئەوەی هەموو ئەو کەسانە

بگرێتەوە کە لەکاتی شۆڕشی ئستورانی لە کودجی زیندانەکان پەستێندرابوون.. ئیدی سوپایەکی بچکوله - شۆڕشگێرانی ئستووریا- ئازاد کران و لەگەڵ ئەوانیشدا چل هەزار تاوانکاری دیکەش بەریان هەڵدرا، بەو مەرجەی لەگەڵ سوپای لایەنگردا چەك هەڵبگرن.. دوای ئەوەی ئەو تاوانکارانە ئەرکەکانی خۆیان بەتەواوی جێبەجێ کرد، زۆربەیان لەلایەن سەرکردە شۆڕشگێرەکانەوە لەنێوبردران. بەمشێوەیە توانیان باوەڕ بە خەڵك بهێنن کە ئەو کردەوە تیرۆرستییانەی لەکاتی شۆڕشدا کراون، کاری تاوانکارانەی تاکەکەسییانە بوون، نەك بەپێی پیلانێکی پێشوەختەی تۆکمە بووبێت.

ئیدی ئەمە ئەو دۆخە دژوارە بوو ڕووبەڕووی فرانکۆ بوویەوە کاتێ قۆڵی خۆی لێ هەڵماڵی بۆ ئەوەی ئیسپانیا لە ستەمی کۆمۆنیستی ڕزگار بکات.. زۆرێك لە پەڕتووکەکان دەگێڕنەوە چۆن فرانکۆ لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی ژەنەڕاڵەکان توانییان شکست بە نەخشە و پیلانە کۆمۆنیستییەکە بێنن.. هەرلەگەڵ ئەوەی فرانکۆ ڕاگەیەندراوەکەی بڵاو کردەوە، چەند فەرمانێك لە بەرپرسانی کۆمۆنیستیی نێو سکرتاریەتەکانی سوپای وشکایی و دەریایی و ئاسمانییەوە بۆ شانە کۆمۆنیستییەکان دەرچوو، بۆ ئەوەی سەرجەمی ئەو ئەفسەرانە لەنێو ببەن کە لە لیستەکاندا وەك دوژمن ناویان هاتووە.. ئەو فەرمانانە بەوپەڕی وردییەوە جێبەجێ کران، چونکە شانە نووستووەکانی کۆمۆنیستی خۆیان کۆکردبوویەوە کۆنترۆڵی گشت هۆکارەکانی پێوەندی و هاتووچوویان کردبوو هەر لە هۆکارە میکانیکییەکانەوە بگرە تا دەگاتە پێوەندی کردنی تەلەفۆنی و بێتەل.

بەشێکی بەرچاوی ئەفسەرانی ئیسپانیا لە قۆناغەکانی یەکەمی مێژسەکەدا لە چاوترووکانێك و کتوپڕ تیرۆر کران.. هەروەها باخیبووەکان باوەڕیان بە بەرپرسەکان دەهێنا بەوەی فەرمانەکانی حکومەت جێبەجێ دەکەن و ئەو کەسانەیش لەنێو دەبەن کە وەك دوژمن سەلمێندراون.

کاتێك جەنگی نێوخۆیی سەری هەڵدا ڕووداوی وەها ڕوویان دا بەخەیاڵی کەسدا نەدەهاتن.. بۆنموونە دەتبینی دوو کەشتیی جەنگی لە دووری تەنیا چەند مەترێکەوە تەقەیان لە یەکتری دەکرد و یەکتریان دەدایە بەر تۆپ و مەترەلۆز.. جارێکیان تۆپێکی کۆمۆنیستەکان وەبەر پاشکۆی کەشتییەك کەوت، لە هەمان کاتیشدا تۆپی نەیارانی کۆمۆنیستیش وەبەر پاشکۆیەکەی دەکەوتن.. قەسابخانە خوێناوییەکە لە کەشتییەکانەوە گەیشتە سەر کەنار و بەندەرەکان، لەوێشەوە بەرەو شارە نزیکەکان پەلیان هاوێشت.

لەوانەیە هەندێك کەس پاساو بۆ ئەو قەسابخانانە بهێننەوە و دژ بەو کەسانەی دەچوونە ڕیزی فرانکۆوە بە کاری پێویستیان لە قەڵەم بدات، بەڵام کەس ناتوانێ پاساو بۆ ئەو ترس و تۆقاندنە بهێنێتەوە کە کۆمۆنیستەکان دژ بە گەلێکی بێ وەی و بێ چەك پێڕەویان دەکرد.. بەلام واقیع سەلماندی کوژرانی سەتان هەزار کەس خودی سیاسەتەکەی لینین بوو و بەسەر ئەو ولاتەدا پێڕەو کرا.. چونکە لینین سووربوو لەسەرئەوەی کە دەبێ هەوڵی ڕووخاندنی هەر حکومەتێك لە ڕێگەی هێزەوە بێت.. ناوبراو پێی وابوو بۆ کۆنترۆلکردنی خێرا و سەرانسەریی جەماوەر تیرۆر و تۆقاندن دوو هۆکاری سادە و ڕێگەی زۆر کورتن.. ستالینیش گوتوویەتی: سەت بێ تاوان بکوژرێن باشترە

لەوەی یەك نەیار هەڵبێت و ڕزگاری ببێت.. ئەم فەرمانەش بە کەللەڕەقییەکی ئەهریمەنانەوە جێبەجێ کرا.

فیرقەیەك لەو کۆمۆنیستانە لە ١٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٣٦دا بە جلی حکوومییەوە کەیشتنە دێری ژنە ڕاهیبەکانی دۆمینیکانی بەرشەلۆنە.. سەرۆکی فیرقەکە بە سەرۆك دێرەکەی ڕاگەیاند دەستهەڵاتەکان دەترسن کاری توندوتیژانە بگەنە دێرەکە، بۆیێ فەرمانی لەلایە ژنە ڕاهیبەکان بباتە شوێنێکی بێ مەترسی.. ژنە ڕاهیبەکانیش کەمە کەرەستە و پێداویستییەکانی خۆیان کۆکردەوە و بەبێ هیچ ترس و گومانێك لەگەڵ سەربازەکان بەرەو دەوروبەری شار ملی ڕێگەیان گرت، لەوێشدا هەموویان کۆمەڵکوژ کران.. سەرکردەکان وەك ئەوەی نە بایان دیبێ و نەباران گوتیان: پێویستمان بە تەلاری دێرەکە هەبوو، بۆیێ پێش داگیرکردنی نەمانویست بیسووتێنین.

هەروەها سەربردەکەی سەنیۆریش لە گۆرێندایە، ناوبرلو بە نەیارێکی سەرسەختی کۆمۆنیستەکان ناسرابوو.. تیمەکانی پاکتاو و لەنێوبردن لە بەرشەلۆنە سێ جار چوونە سەرماڵەکەی.. کاتێکیش بۆ جاری سێیەم نەیانتوانی شوێنی خۆ حەشاردانەکەی پێ بزانن، هەر هەشت ئەندامی خانەوادەکەیان کوشت!

یەکێك لە درندەترین و توندوتیژترین تاوانێك لەژێر دروشمی ئازادی و یەکسانی و برایەتیدا کرابێت، کوشتنی شانزە کەسی خۆبەخش بوو کە لە نەخۆشخانەیەکی بەرشەلۆنەدا وەك یارمەتیدەری پزیشکی خەریکی کاری خۆبەخشی بوون.. تاکە تاوانی ئەو قوربانییانەش ئەوەبوو سەر بە ڕێکخستنێکی ئایینی بوون و بە

یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵ گشت نەخۆشێك دەکرد بەبێ ئەوەی ڕەچاوی چین و ڕەنگ و ڕێبازەکانیان بکەن.

ئی ئێم گۆدن لە لاپەڕە ٧٢ی پەرتووکەکەیدا ( ململانێ لە ئیسپانیا) نووسیویەتی: دوای سەربڕین و سەرپەڕاندنی زیندووەکان تەرمەکانیشیان دەشێوێندرا.. لە هەفتەی کۆتایی مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٣٦دا تەرمی ژنە ڕاهیبەکانیان لە گۆڕەکانیان دەرهێنران و بە دیواری دێرەکانەوە هەڵیان دەواسین و چەند تابلۆیەکیش بە جەستەکانیانەوە هەڵواسرابوون جنێو و قسەی زۆر ناشرینیان لەسەر نووسرابوو.

من ئامۆزایەکم هەبوو بەناوی تۆم کار، وەك ئەندازیارێك لەنێوان ساڵانی ١٩١٩–١٩٣٨ لە کانەکانی ئیسپانیادا کاری دەکرد، لە مۆلفا کچی بەڕێز کۆکی کونسوڵی ئەمریکای خواست.. تۆم گێڕایەوە کاتێك ئەندامێکی تابووری پێنجەمی کابالیرۆ وەك پارێزگەری مۆلفا هەڵبژێردرا، فەرمانەکان لە مۆسکۆوە دەرچوون، ئەو ئەندامە گشت دەستهەڵاتە ڕەسمییەکانی ڕادەستی کۆمۆنیستەکان کرد.. یەکەمین کارێکی ئەو کۆمۆنیستانەش ئەشکەنجەدان و دواتریش کوشتنی گشت ڕاهیبەکان بوو.. بەڵام ژنە ڕاهیبەکان پۆشاکیان لەبەر دادەڕێندرا و بە ڕووتی ڕووتیان هەڵدەدانە شەقامەکان، بۆئەوەی شۆڕشگێڕەکان خۆیان پێ سەرگەرم بکەن!!

گۆدن گفتوگۆی نێوان خۆی و دوو ژنی ئینگلیزی دەهێنێتەوە بەهۆی ئەوەی خەڵکی بیانی بوون گرفتیان بۆ دروست نەکراوە و بەسەلامەتی دەرچوون.. ئەو دوو ژنە دەڵێن ناچارکراون جەماوەرێکی نۆری ژن و پیاوان ببینن کە وەك دەروێشانی دەمارگیر ڕەفتاریان

دەکرد.. سەرەتا بینیبوویان کۆمەڵێك کۆمۆنیست ڕاهیبێك ئەشکەنجە دەدەن، دواتریش دوای پەڕاندنی پەلوپۆی ڕاهیبەکە جەستە و پەلە براوەکانیان بە پەیکەری مەریەمی پاکیزەوە هەڵواسیبوو.. دواتریش بینیمان خەڵك ڕاهیبێکیان بە زیندوویی لە خاچ دا و بە زیندوویی جەستەیان کوناودەر کرد.

بیرڤانی نووسەری بەناوبانگی فڕەنسی لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٦دا گوتەکانی دیمیترۆڤی هێناوەتەوە کاتێ گوتوویەتی: سەرزەنشتمان دەکەن لەوەی کەنیسە و دێرەکانی ئیسپانیا وێران دەکەین.. جا چییە ئەگەر هەندێك کەنیسە و دێرمان ڕووخاند.. ئاخر ئێمە جیهانە نوێیەکەمان بنیاد دەنێین.

لیژنەیەکی ڕەسمی لە ساڵی ١٩٣٦دا بۆ بەدواداچوون و ئاشکراکردنی ئەو تاوان و کوشتوبڕە هۆڤانەیە پێکهات کە کۆمۆنیستەکان لە ئیسپانیا کردبوویان. ڕوونبوویەوە پارێزکارترین چاودێر، ژمارەی هاوولاتیانی لەنێوچووی بەرشەلۆنەی لەنێوان ساڵانی ١٩٣٦– ١٩٣٧ بە پەنجا هەزار کەس مەزەندەکردووە..بەڵام لە ڤالنسیا ژمارەکە گەیشتە سی هەزار کەس.. جگە لەمانەیش لیژنەکە بۆی ڕوونبوویەوە یەك لە دەی دانیشتووانی مەدرید لەپێناو پێکهێنانی دەوڵەتێکی دیکەی دکتاتۆریدا فەوتێنراون.

هەروەها مارسیل دوترای نووسەری بەناوبانگی فڕەنسی گوتوویەتی: سەرکردایەتیی سەربازیی کۆمۆنیستی لە کاستەر ئوردیالزدا کۆنە پۆلیسێکیان وەرگرتبوو کە پێشتر بەهۆی دزیکردنەوە لە کارەکەی دەرکرابوو.. بەڵام سەرکردەی باڵای پۆلیس لەسەر وێنەگرتن و فرۆشتنی وێنەی ڕووت دەژیا.. هەروەها پۆستی چاودێری

کاروباری گشتی درایە کەسێك منداڵی ناشەرعیی ژنێکی بەناوبانگی بواری لەشفرۆشی و بەرەڵایەکی سەر جادەکان بوو.. ئەو کەسە بە کوڕی دایکی دەناسرا.. پۆستی سەرۆکی دادوەرانیش درایە کرێکارێکی کانەکان و دوو پیاویش یارمەتیدەری بوون هەرەیان لە بەرەی دەرنەدەکرد و هیچیان لە بارەی دادوەری نەدەزانی.. کۆی ئەو کەسانەش زۆر سادی بوون و خۆیان بڕیارەکانی خۆیان بەسەر تۆمەتبارەکاندا جێبەجێ دەکرد و بەمە دڵیان خۆش دەبوو، بۆ نموونە سکی ڤینسنت مۆرایان هەڵدڕی، جوڵی یانکۆشیان لە کوورەپانی گشتیدا لە سێدارە دا، پەلوپۆی فاریزی پاڵەوانی بەناوبانگی پێشبڕکێی ماتۆڕسوارییان پەڕاند، چونکە ڕەتی کردبوویەوە بەهۆی ناپاکییەوە هاوڕێیەکانی بخاتە نێو تەڵەکانیان.

مستەر ئارسەر بریانتیش پێشەکییەکی بۆ لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییانەی تایبەت بە دڕندەیی کۆمۆنیستەکانی ئیسپانیا نووسیوە و ئاماژە بەوە دەکات بەکرێگیراوانی سۆڤییەت توانییان بەجۆرێك کۆنترۆڵی هۆکارەکانی پێوەندی بکەن و بتوانن بە ئارەزوو و لەپێناو بەرژەوەندیی خۆیان ڕاگەیاندن ئاراستە بکەن، هەروەها نەیانهێشت هیچ هەواڵێکی دژ بەوان دزە بکاتە نێو ڕاگەیاندنەکانەوە.. سەبارەت بە فرانکۆ و هێزە چەکدارەکەشی درۆودەلەسەشیان بڵاو دەکردەوە، بەبێ ئەوەی کەس بتوانێ ڕووبەڕوویان بوەستێتەوە.. هەروەها مامۆستای هیچ زانکۆیەك و تاکە یەك شیکەرەوەی کەناڵی بی بی سی بریتانیش هیچ شتێکیان سەبارەت بە ڕاستیی ئەو ڕووداوانە ڕوون نەکردەوە کە بەسەر ژنانی سان مارتن ڤالدیگلازیر هاتبوون و لەسەر دەستی بیست و پێنج پیاوی سەر بە میلیشیایە سوورەکان دووچاری خراپترین

جۆرەکانی سووك و ڕیسواکردن ببوونەوە. تاکە تاوانی ئەو کچانە ئەوە بوو هەستێکی نایینیانەیان هەبوو.. ئەوان گوێیان نەدایە ئەوەی دایك و باوکانی ئەو کەسانە لە زیندان پەستێنراون، لەبەرچاوی دایکانیاندا هەتکیان دەکردن و زۆر بە بێ موبالاتییەوە فەرمانەکانی خۆیانیان بەسەریاندا سەپاند.. ئەو کارە تاوانکارییانە کاری لە ئەقڵی ئەو ژنانە کرد، تەنانەت ئەو کەسانەی لە ژیانیشدا مابوونەوە، گوتبوویان خۆزگەیان خواستبوو جەللادەکانیان بیانکوژن نەك بەو جۆرە هەتکیان بکەن.. خراپترینی ئەو کارە تاوانکارییانەش لەبەرچاوی چاوی منداڵاندا بەڕێوەبرابوون، چونکە لەو کاتەی میلیشیایەکان ژنانیان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکردن و دەستدرێژییان دەکردە سەریان، هەندێك دایك منداڵانیان لە باوەشدا بوو.

لێرەدا دەبێ تیشك بخەینە سەر ئەو دەستەواژەیەی لینین چەندان جار دووبارەی دەکردەوە: هیچ شتێك لەنێو سیاسەتدا بەناوی ئەخلاق بوونی نییە.. بەڵام بەرژەوەندییەکان هەن.. ڕەنگە بەرژەوەندییەکان وابخوازن کار لەگەڵ دڵڕەشێکی بەد ڕەوشت بکەیت و هاوکاری بیت.. تەنیا لەبەرئەوەی بەمجۆرەیە و هیچی دیکە.. لینین لە چەند شوێن و بۆنەیەکی دیکەدا گوتوویەتی: لەسەر شۆڕشگێڕی گەنج پێویستە یەکسەر خۆی لەسەر کوشتن ڕابهێنێ، ئەویش بەهۆی چەند کردەیەکی ڕاستین، وەك لەنێوبردنی ناپاکان و سیخوڕان یان تەقاندنەوەی بنکەی پۆلیس و دزینی پارەی بانك و بەکارهێنانی پارەکە لە شۆڕش و هتد.. نابێ هیچ سڵ لەو هێرشە وێرانکارانە بکەنەوە.. لەوانەیە ئەو کردارانە ببنە هۆی توندڕۆیی ئەمەیش زۆر

ئاساییە، بەڵام ئەو گرفتانەی دەیاننێتەوە دەبنە گرفتی ئایندە نەك گرفتی هەنووکەیی.

منداڵێك بۆمان دەگێڕێتەوە بەر لەوەی ڕاهیبێك بکوژێت، چۆن دەرفەتی بۆ ڕەخساوە گاڵتە بە هەستوسۆزی بکات ، ئەو منداڵە دەبێژێ: شەوێ دەمانبردە لای ئەو گرووپانەی بڕیارمان دابوو لەنێویان ببەین، دواتریش دەمانخستە ڕیزێکی دیکەوە، بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی مەرگی هاوڕێیانی ببینێ.. دواتریش دەمانگەڕاندەوە کۆشکی بێل ئارت.. هەموو شەوێك چاوەنواڕی مەرگی خۆی بوو.. بەڵام مردنی خێرا بۆ ئەو زۆر بوو.. بۆیێ بەرلەوەی بەیەکجاری لەنێوی ببەین، حەوت جار کوشتمان.

مستەر کنۆبلۆ لە لاپەڕە ۸۷ی پەڕتووکەکەی خۆیدا بەناوی ( پەیامنێرێك لە ئیسپانیاوە) سەربردەی دوو گەنجی کۆمۆنیست دەگێڕێتەوە کە لەبەردەم دکتۆرێکدا بە شانازییەوە دەیانگێڕایەوە چۆن دوو ڕاهیبیان کوشتووە.. پێیان ڕاگەیاند چۆن پۆشاکی ڕاهیبانیان پۆشیوە و چوونەتە لای ئەو دوو ڕاهیبە هەشبەسەرانە کە لە ترسی مەرگ لە کانێکی خەڵووزدا کاریان دەکرد، دواتریش هەردووکیان بردوونەتە شوێنێك و داوایان لێکردوون بە دەستانی خۆیان گۆڕی خۆیان هەڵکەنن.. دواتریش بەوپەڕشی دڵخۆشییەوە لە مەرگی هێواشی هەردوو ڕاهیبیان نواڕیوە.

با هەندێك ڕووداوی شاری کالا بگێڕینەوە بۆئەوەی سەبارەت بە بەرهەڵداکردنی تاوانکاران و شێت و شوارەکان قسەکانی پێشوومان پشتڕاست بکەینەوە.. کۆمۆنیستەکان لە ۲۰ تەمووزی ساڵی ۱۹۳٦ لە کالا سەرجەم زیندانییەکانیان بەرهەڵدا کرد.. تا ژمارەیان گەیشتە

هەزار پیاو و دوو هەزار ژن، لە مۆڵگە و بارەگەیەکی شارەکەدا چەك و تفاق درایە هەموویان.. جا دوای ئەوەی بە باشترین شێوە ئەرکی هێرشکردنە سەر مەدریدیان راپەڕاند، ڕەوانەی سیکۆنزا کران و لەوێشدا بۆ ئەوەی بەرگری و بەرهەڵستیی کەسانی دیکە تێکبشکێنن، دوو سەت هاوولاتیان کوشت.. ئەو تاوانکارانە ماوەی شانزە هەفتە هەر لە سیکۆنزا مانەوە هەتا فرانکۆ لەو شارە دەریپەڕاندن.. جاکاتێك فرانکۆ توانی لە سیکۆنزا وەدەریان بنێ، بینی گشت مێینەکانی تەمەن ۱۰-۵۰ساڵی دەستدرێژییان کراوەتە سەر و هەتککراون.. هەندێك لەو ژنانە یان لەو درندە خوێنرێژانە سکیان پڕ بوو یانیش دووچاری نەخۆشیی زۆر پیس ببوونەوە، هەندێکیشیان هەردوو بەلاَ و نەهامەتییان بەسەر هاتبوو.

لە کۆتاییدا ئەو نووسینەی مارسێل دۆتری دەهێنینەوە کە سەبارەت بە شاری کیمبۆزیۆلۆس نووسیویەتی، لەو شارەدا سەت ڕاهیب و پیاوی ئایینی بە کۆمەڵێك شێت و شواری چەقۆ بەدەست بەسترابوونەوە، خوێنەر خۆی دەتوانێ تۆقینی دوای ئەو ڕەفتارە قێزەون و نامرۆڤانەیە بێنێتە بەرچاوی خۆی.

****

## بەشی شانزەیەم

# ئەو ڕووداوانەی بوونە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی

سووخۆرانی نێودەوڵەتی بە نهێنی و بە یارمەتیی ستالین زەمینەی دووبارە پڕچەککردنەوەی ئەڵمانیایان هێنایە ئاراوە، هەرچەندە لە پەیماننامەی فرسایدا چەندان کۆتوبەندی بەسەردا سەپێندرابوو.. جا بۆئەوەی درك بە هۆکارەکانی وەدەرکەوتنی هێتلەر بکەین، دەبێ زانیاریمان لە هەنبەر ئەو کودەتا سیاسییانە هەبێت کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٢٤-١٩٣٤ دارێژران.

ئەگەر کۆمۆنیستە ئەڵمانییەکانی لێ وەدەربنێین، دەبینین زۆرینەی گەلی ئەڵمانی لەسەر ئەم چەند مەسەلەیە کۆك و هاوڕا بوون: ئەگەر ئەو ناپاکییانە نەبووان کە ئەڵمانیای کردە قوربانیی جەنگ، ئەوا ئەڵمانیا لە جەنگدا نەدەدۆڕا.. هەروەها پارەدەران و سووخۆرانی نێودەوڵەتی دۆخی بە ناو دیموکراسیی نێو بریتانیا و فەرەنسا و ویلایەتە یەککگرتووەکانیان قۆستەوە، بۆ ئەوەی شکست بە سوپای ئەڵمانی بهێنن.. پارتی کۆمۆنیستیش بە سەرکردایەتیی جووەکان و بە یارمەتیی پارەدەرانی نێودەوڵەتی، هۆی دروستکردنی پشێوی و ئەو

هەراوزەنا و بێسەروبەرییە بوون کە پێش واژۆکردن لەسەر ئاگربەست هاتە ئاراوە و دوای واژۆکردنەکەش شۆڕش هەڵگیرسا.

هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە لەسەر گشت نیشتمانپەروەرێکی ئەڵمانی پێویستە ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان بخەنە گەڕ بۆ ئەوەی ئەڵمانیای دوای جەنگ بنیاد بنێنەوە و کۆتوبەندە سەربازی و ئابوورییەکانی پەیماننامەی فرسای بەسەر وڵاتەکەیان تێکوپێك بشکێنن.

دیسانەوە ئەگەر کۆمۆنیستەکانی لێ دەربێنین، دەبینین زۆرینەی ڕێبەرە سیاسەکانی ئەڵمان لەسەر زەروورەتی ڕزگارکردنی خۆیان لە ڕێککەوتنە ئابوورییەکان کۆك و هاوڕابوون، چونکە لەلایەن پارەدەران و سووخۆرانی نێودەوڵەتییەوە بەسەریاندا سەپێندرابوو.. ڕێبەرانی ئەڵمانی درکیان بەوە کرد ئەو ڕێککەوتنانە مەترسیی لەسەر سەربەخۆیی وڵات دروست دەکات، چونکە ئەو سوودەی بەپێی ئەو ڕێککەوتنانەوە سەپێندرابوون، دەبوونە هۆی ئەوەی وڵاتەکە بکەوێتە ژێر چنگی ئەوانەی قەرزەکەیان پێ دابوو، ڕێك وەك بریتانیای ساڵی ١٦٩٤ و فەرەنسای ساڵی ١٧٩٠ و ئەمریکای ساڵی ١٧٩١ دەبنە نێچیرێکی چەوری سووخۆرانی جیهانی.. هەموشیان درکیان بەوە کردبوو ئەو قەرزانە دەبنە قەرزاری و بەکۆیلەکردنی گشت تاکەکانی گەل، چونکە دانەوەیان تەنیا بە سەپاندنی باجێکی زۆری سەر هاووڵاتیان مەیسەر دەبێت.

ئەوسا سەرکردەکانی پارتی فاشیست بڕیاریان دا دراوێك لە چاپ بدەن پشت بە قەرز و قوولە نەبەستێ، بەڵکو پشت بە دەرامەتی نەتەوەیی و موڵکە نیشتمانییەکان و سەرچاوە پیشەسازییەکان و

کشتوکاڵ و سامانە سرووشتییەکان و وزەی بەرهەمهێنی گەل بەستێ.. گەلی ئەڵمانی بەشێوەیەکی گشتی هەستیان کرد لەگەڵ گەلانی ئیتالی و ئیسپانی و یابان لە هیوا و خۆزگەکانی وەدیهێنانی ئایندەیەکی سیاسی و ئابووریی ئەو وڵاتانەدا هاوبەشن، بۆیێ هاوپەیمانییەکی تەوەرەییی هاتە ئاراوە و بزووتنەوەی فاشیستی بە سەرۆکایەتیی هێتلەر و مۆسۆلینی و فرانکۆ هاتە کایەوە.

مێژوو هەوڵ و کۆششی مەزنی ئەو سێ کەسەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن بۆ بنیادنانەوەی وڵاتەکانیان و ڕزگارکردنیان لە قەیران و شۆڕش و ئەو جەنگانەی تێی کەوتبوون، هەوڵی بێ وچانیان خستووەتە گەڕ.. ئەوان پیشەسازی و کشتوکاڵیان بەشێوەیەکی زۆر پەرجووانە پێشخست.. کردەی دووبارە بنیادنانەوەی هێزی سەربازیش، بە یارمەتیی بەکرێگیراوانی نوورانییەکان بوو، چونکە دەیانویست وڵاتانی فاشیستی و سەرمایەداری لە جەنگێکی دیکەی جیهانیدا بەشەڕبێنن.

سەرەتا هێتلەر و مۆسۆلینی سیاسەتی فاشیزمێکی میانڕۆیان پێ باش بوو، بڕیاریشیان دا گەندەڵی و خراپەکارییەکان لە ڕەگەوە دەربکێشن و وڵات لە کۆمۆنیزم و کۆمۆنیستەکان پاك بکەنەوە و پیشەسازی و ئابوورییەکەشی بەشێوەکی گشتی لەژێر دەستهەڵات و هەژموونی نوورانییەکان دەربێنن.. بەڵام هەر لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، کەوتنە ژێر کاریگەریی لۆردە نازییەکانی جەنگەوە، ئەو لۆردانەش بانگەشەیان دەکرد تەنیا لە ڕێگەی داگیرکردنی سەربازییەوە ئاشتی و ئاسایشی جیهان سەقامگیر دەبێت

ئیدی سەرکردایەتیی بالآی سەربازی لە ئیتالیا و یاباندا پشتگیریی خۆیان بۆ لایەنگرانی نەخشە و بیردۆزەکانی کارل ریتەر ڕاگەیاند کە ناوبراو لە ساڵی ١٨٤٩دا ڕایگەیاندبوون.. بەڵام فرانکۆ ڕازی نەبوو لەنێو چوارچێوەی نەخشە و پیلانەکەدا بمێنێتەوە، چونکە بیر و باوەڕە ئایینییەکانی ئەو بۆچوونەیان لەلای چێکردبوو هەر ئایدۆلۆژیایەك نکۆڵی لە بوونی خودا بکات لە ڕیزی ئەهریمەنە و هاودەستیەتی.

نازییەکان بێجگە لە داگیرکردنی فەرەنسا و بریتانیا، پیلانی قڕکردنی جوولەکەکانی نێو هەردوو وڵاتیان دارشت، هەروەك چۆن لە وڵاتانی ئەورووپیدا تارومارییان کردبوون.. پیلانەکە پاکتاوکردن و لەنێوبردنی پارەدەرانی نێودەوڵەتی و گەورە سەرمایەداران و دەستگرتن بەسەر موڵك و ماڵەکانیانی گرتبوویەوە.

جا لەو کاتەی هێشتاکە هێتلەر بەدەست ئەشکەنجەی پێش ساڵی ١٩٢٤ی زیندانەوە دەیناڵاند، چونکە بە دوژمنی سەرسەختی لۆردە نازییەکان و پارەدەرانی نێو دەوڵەتی دادەندرا، پەڕتووکی (تێکۆشانم) نووسی، لە دوا لاپەڕەی پەڕتووکەشدا نووسیویەتی: بەمشێوەیە پارتی سۆسیالستیی نیشتمانی هەڵوێستێکی ئەرێنییانەی لەهەنبەر مەسیحییەتدا هەیە، بەڵام کاروبارەکانی ئایین و بیروباوەڕ بۆ کۆمەڵێك کەسانی پسپۆڕ بەجێناهێڵێ.. هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە دژی ڕووحی مادییانەی جوولەکە وەستاوەتەوە کە زۆر بە قووڵی ڕۆچووەتە نێو دەروونی ئێمە و خەڵکانی دیکەشەوە.

هێتلەر بەر لەمە و لە ساڵی ١٩٣٢دا سیاسەتەکانی لەهەنبەر بریتانیادا ڕوونکردبوویەوە، ئاماژەی بەوەش کردبوو مارکس و ستالین

و لینین چەندان جار جەختیان لەسەر ئەوە کردووەتەوە پێش ئەوەی کۆمۆنیزمی جیهانی بگاتە دوا ئامانجی خۆی، دەبێ بریتانیا و ئیمپراتۆریایەکەی وێران بکات.. هیتلەر لە درێژەی گوتەکانی لەو کاتیدا گوتی: ئەگەر پێویست بێت من ئامادەم بەهێز بەرگری لە بریتانیا بکەم.

هیتلەر سەبارەت بە پەیماننامەی فرسای نووسیویەتی: ئەو پەیماننامەیە لە بەرژەوەندیی بریتانیادا نەبوو، بەڵکو لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە بەرژەوەندیی جوولەکە بوو بۆ ئەوەی ئەڵمانیا بخەنە دۆخی وێرانەییەوە.. هەروەها نووسیویەتی: تەنانەت لەنێو بریتانیاشدا، ململانێیەکی بەردەوام لەنێوان نوێنەرانی بەرژەوەندیی بریتانیا و بەرژەوەندییەکانی دیکتاتۆرییەتی جوولەکەی جیهانیدا هەیە.. جا لەو کاتەی بریتانیا بۆ وەرگرتنی پێگە بەرزەکەی لە جیهاندا ئەوپەڕی هێز و توانای خۆی خستبووە گەڕ، دەبینین جوولەکە لەنێو ئەو وڵاتەدا تەنگوچەڵەمە و سەرئێشەیان دەنایەوە، لەبەرئەوە تێکۆشانی دژ بە مەترسیی جیهانییانەی جوولەکە لە بریتانیاوە و هاوکات لە گشت شوێنێکی دیکەی جیهان هاتە ئاراوە.

هیتلەر لەهەنبەر هاوپەیمانی لەگەڵ بریتانیادا هەرگیز ڕا و بۆچوونی خۆی نەگۆڕی.. ئەو دەیزانی مانەوەی ئەڵمانیا وەك هێزێکی مەزن بەندە بە هاوپەیمانی لەگەڵ ئیمپراتۆریای بریتانییەوە.. لەبەرئەوە هەڵمەتی هاوپەیمانان لە ساڵی ١٩٣٦دا دەستیپێکرد، چەند گفتوگۆیەکی نا ڕەسمی لەنێوان دیبلۆماسییەکانی بریتانی و ئەڵمان ڕێکخران.. جا کاتێك گفتوگۆیەکان لەپێناو هاوپەیمانی لەگەڵ بریتانیادا شکستیان خوارد و هیتلەر ئەوپەڕی هێز و کۆششی خۆی بۆ خستبووە

گەڕ، گوتی: بۆ هاوپەیمانی لەگەڵ بریتانیا هەموو قوربانییەك دەدەین.. ئەم هاوپەیمانییە پاڵپشتی بۆ موستەعمەراتەکانمان فەراهەم دەکات، هێزێکی مەزنی دەریاییش دەبێتە هاوسەنگەرمان، هەروەها چوونە نێو کێبڕکێ لەگەڵ پیشەسازیی بریتانیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

شکستهێنان لە پێکهێنانی هاوپەیمانی لەگەڵ بریتانیا، بووە هۆی لاوازبوونی بەرهەڵستیی ئایدۆلۆژیای تۆتالیتاری کە لۆردە جەنگییەکانی نازیزم بانگەشەیان بۆ دەکرد.. هیتلەریش دوای شکستهێنانی گفتوگۆیەکان گەیشتە ئەو باوەڕەی سیاسەتێکی میانڕۆ ناتوانێ سنوورێك بۆ هەژموونی سووخۆرانی نێودەوڵەتی بەسەر سیاسەتی دەرەوەی بریتانی دابنێ.. لەبەرئەوە ناچاربوو ددان بە ڕاست و دروستیی ڕا و بۆچوونەکانی کارل ڕیتەردا بنێ کاتێ گوتبووی: بۆ ئەوەی ئاشتی بەرقەرار بێت و سەربەخۆیی ئابووری بگەڕێتەوە جیهان، سەرەتا دەبێ پارەدەرانی جوولەکە و گشت ئەندامانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی لەنێوببرێن کە کۆمۆنیزم ئاراستە دەکەن و هەژموونیان بەسەریدا هەیە.

لەو گفتوگۆیانەی لە ساڵی ١٩٣٦دا لەنێوان بریتانیا و ئەڵمانیادا بەڕێوەچوون، نوێنەری بریتانیا لۆرد لندندری و نوێنەری ئەڵمانیاش گۆرنگ و خودی هیتلەر بوو.. لەو گفتوگۆیانەدا، گۆرنگ ڕاڤەی وردەکاری و مێژووی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانی کرد و لەمبارەیەوە نووسین و باسی کارل ڕیتەر و کەسانی دیکەی بە نموونە هێنایەوە.. دواتریش بۆ زەرووڕەتی بەکارهێنانی جەنگێکی سەرانسەری دژ بەو ئەقڵییەتە دکتاتۆرییە، هەوڵی خۆیان خستە گەڕ.. هەروەها پلانەکەی ئەڵمانیشیان بۆ باسکرد کە ئامانجی داگیرکردنی

گشت ولاَتانی كۆمۆنيستی و ڕزگاركردنی گەلانيان و لەنێوبردنی گشت ناپاكێكە.. بۆشيان ڕوونكردەوە تاكە ڕێگەی لەنێوبردنی كۆمۆنيزم بە لەنێوبردنی گەلی جوولەكە مەيسەر دەبێت.. ئەو بەلگەنامانەشيان خستە بەردەمی كە پێوەندیی كۆمۆنيستەكان بە گەورە دەوڵەمەندانی جوولەكە دەسەلمێنن، چونكە هەر جوولەكەكان بزووتنەوەكە ئاراستە دەكەن و پارەی پێويستی دەخەنە بەردەم، لە هەمان كاتيشدا پشتگيری لە زايۆنيزمی سياسيش دەكەن و لايەنە ماديیەكەی زايۆنيزميان گرتووەتە ئەستۆ، بۆ ئەوەی بكەنە ئامانجە نهێنییە چاوەڕوانكراوەكەيان، ئەويش ئامادەكارییە بۆ ئەو سەردەمەی مەسيحە ڕزگاركەرەكەيان دەگەڕێتەوە سەر زەوی.

دەشڵێن هێتلەر بەڵێنی داوە دژی پيلانە توندڕۆيەكانی لۆردە نازييەكانی جەنگ بوەستێتەوە و چالاكييەكانی دژ بە كۆمۆنيزم تەنيا لە نێو كيشوەری ئەوروپادا سنووريەند بكات، بەو مەرجەی بريتانيا ببێتە هاوپەيمانی ئەڵمانيا.. بەلاَم لۆرد لندندری گومانی خۆی خستەڕوو لەوەی حكوومەتی بريتانيا لە پيلانی لەنێوبردنی كۆمۆنيزمدا بەشداری بكات و بە كردەی لەنێوبردنی مرۆڤايەتيی دادەنێ.. ئەوسا هێتلەر چارەسەرێكی مامناوەندی خستەڕوو و گوتی ئەڵمانيا بەتەنيا ئەو ئەركە بەجێ دەگەيەنێ، بەو مەرجەی بريتانيا پەيماننامەيەكی لەگەڵ ببەستێ و بەڵێن بدات ماوەی دە ساڵ جەنگ لەنێوان هەردوو ولاَتدا هەڵنەگيرسێ جا ئەگەر هەلومەرج بەهەر شێوەيەك بگۆڕێ.. هێتلەر ڕوونی كردەوە تاكە ڕێگەی سەربەخۆيیی بريتانيا و فەڕەنسا و ئەڵمانيا بە سەربەخۆيیی ئابوورييەوە بەندە، لەسەر ئەو ولاَتانەش پێويستە ئەو قەرزە قورسە لە كۆڵ خۆيان بكەنەوە و خۆيان جڵەوی

ئابوورییەکانیان بگرنە دەست، بۆ ئەوەی ئابووریی جیهانی بگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی.. دواتریش دەریخست ئەو ئامانجەی پارتە سۆسیالستییە نیشتمانییەکەی هەوڵی وەدەیهێنانی دەدات، ئەوەیە چارەسەرێکی ریشەیی راستەوخۆ بۆ هەژموون و بالادەستیی سوودخۆران بەسەر کاروباری نیشتمانی و نێوخۆیی و جیهانی بدۆزێتەوە.. دەڵێن لەو دانیشتنەدا گوتەکەی دزرائیلی بە نموونە هێناوەتەوە کە ناوبراو لە پەرتووکەی خۆیدا بە ناوی (Coningsby) لەسەر زاری کەسایەتییەکی نێو پەرتووکەکەدا دەری بڕیوە: (( کۆننگسبی ئازیز، بەمشێوەیە بۆت ڕوون دەبێتەوە ئەوانەی جیهانیان بەرزەفت کردووە کەسانی زۆر جیاوازن بە هیچ جۆرێك بەو وێنایە ناچن کە کەسانێك کێشاویانە و نازانن چی لە پشت پەردەوە دەگوزەرێ)).

ئیدی گۆرنگ پشتگیری بۆ ڕا و بۆچوونەکەی هێتلەر دەردەبڕێ و ئاماژە بەوە دەکات مێژوو ڕوونی کردووەتەوە چۆن جولەکە دەوڵەمەند و بە هەژموونەکان توانیویانە ئابووری و سیاسەتی ئەو دەوڵەتانە کۆنترۆڵ بکەن کە دزەیان کردووەتە نێویانەوە و بە شێوازی ناڕەوا و ڕێگەی پڕ لە خراپەکاری و تێکدەرانە ئەو ئامانجەیان وەدەستهێناوە.. ئەوسا هرفۆن ڕینترۆب ڕووداو و دۆخی کەنەدای بە نموونە هێناوەتەوە، کاتێك لۆرد لندندری خۆی لەوێ بووە.. ڕوونی کردووەتەوە لیژنەی پاشایەتیی ستیڤن لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە پرسی گومرگەکانی کەنەدا بەڕێوەبردووە و بۆی ڕوون بووەتەوە ئەو وڵاتە ساڵانە سەت ملیۆن دۆلاری لێ دەدزرێ.. ئەم دزییەش بزووتنەوەی جیهانی ڕێکی دەخات و دزە دەکاتە نێو وڵاتەکە و گەندەڵی و خراپەکاری و بەدئەخلاقی بڵاو دەکاتەوە و زۆرێك لە

بەرپرسان و پیاوانی حکوومەت دەخاتە دڵخی کۆیلەیەتییەوە، چونکە دەیانخاتە نێو تەڵەی بەرتیل و بەدئەخلاقییەوە.. هەروەها ڕینترۆب گوتبووی: دۆخی ویلایەتە یەکگرتووەکان چەندان هێندەی کەنەدا خراپترە، جا بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسییە، دەبێ سێسەت پیاوی نەخشەدانەر و تەگبیرکار و ئەقڵی بەڕێوەبەر لەنێو ببرێن کە بۆ وەدیهێنان و جێبەجێکردنی پیلانە دوور مەودایەکانیان، لایەن و گرووپە نەرێیی و تاوانکارەکان ئاراستە دەکەن، ئامانجەکەشیان بریتییە لە بەرزەفتکردنی جیهان بەهۆی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانییەوە.

دەڵێن گۆرنگ گوتوویەتی سووخۆرانی جیهانی پارەیان بۆ شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ی رووسیا تەرخان کردووە، ئەو دەرئەنجامەشی خستووەتە بەر باس کە توانا بەو کەسانە دەبەخشێ بتوانن بیهێننەدی، ئەویش برەودانە بە بڵاوکردنەوەی رقوکینە و دوژمنایەتییەکی بێ وێنەی نێو مێژووی مرۆڤایەتی.

دواتر هێتلەر بۆ لۆرد لندندریی نێردەی بریتانیای باسکردووە چۆن ملیۆنان مەسیحی لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ەوە زۆر دڕندانە سەربڕاون و بەرپرسانی ئەو قەسابخانانەش تەنیا دز و تێکدەرە جیهانییەکانن.

دواتر ئەندامانی نێو کۆبوونەوەکە دوا مەسەلەیان تاوتوێ کرد، ئەویش مەسەلەی هەوڵی ستالین بوو بۆ گۆڕینی ئیسپانیا بەرەو دکتاتۆریەتی کۆمۆنیستی.. بەمشێوەیە و بەهۆی شێوازە نهێنییەکەی خۆپڕچەککردنەوەی ئەڵمانیا و باڵادەستی و هەژموونی ئەنجوومەنی مەزنی خۆرهەڵاتی ماسۆنییە ئازادیخوازەکان بەسەر فەرەنسا و تا دەگاتە شێوازی ڕازیکردن و دنەدانی بریتانیا بۆ خۆپڕچەکنەکردن-

لەو کاتەی دوژمنە سەرسەختەکانی بە باشترین شێوە خۆیان پڕچەك دەکرد-گشت بەندەکانی کودەتا و پیلانگێڕییە جیهانییەکە پەردەیان لەسەر هەڵماڵدرا.. هەروەها ڕوونیش بوویەوە ئەڵمانەکان گەرانەوی سەقامگیری و ئاسایش بە ئەستەم دەزانن ئەگەر کۆمۆنیزم و زایۆنیزم لەنێو نەبرێن، چونکە باوەڕیان وابوو ئەو دوو بزووتنەوەیە خەریکی هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگێکی دیکەن.

لە کۆتاییشدا هێتلەر بە شێوازە گوتارییەکەی خۆی کۆتایی بە گفتوگۆیەکان هێنا، هیواشی خواست لۆرد لندندری تێبکۆشێ باوەڕ بە حکوومەتەکەی بێنێ لەگەڵ ئەڵمانیادا بچێتە نێو هاوپەیمانییە پێشنیازکراوەکە.. دواتریش ڕێك و ڕاست گوتبووی: چونکە من باوەڕم وەهایە ئیمپراتۆریای بریتانی و کەنیسەی کاسۆلیکی، دوو دەستگەی جیهانین، مانەوەشیان بۆ پاراستن و بەرقەراربوونی یاسا و سیستمی ئایندەیی جیهانی پێویستە.

لەوانەیە ئەو قسانەی هێتلەر بەلای ڕای گشتییەوە سەیر و نامۆ بێتە بەرچاو، لەبەرئەوە چەند ڕاستییەکی دیکەی مێژوویی دەهێنینەوە بۆ ئەوەی ئەو قسە و بۆچوونانەی ناوبراو پشتڕاست بکەینەوە:

لۆرد لندندری دوای گفتوگۆیەکان گەڕایەوە لەندەن و ڕاپۆرتێکی پێشکێشی حکوومەتی بریتانی کرد.. لە ٢١ شوباتی ساڵی ١٩٣٦دا نامەیەکی بۆ ڕیبنترۆب نارد و لە پەرەگرافێکی نامەکەیدا نووسیبووی: هێتلەر و گۆرنگ ئەوەیان بیرچووەتەوە ئێمە لێرە لە ئینگلترا بۆ ماوەی چەندان سەدە بەدەست تەشەنەکردنی شۆڕش ناڵاندوومانە.. سەبارەت بە جووەکانیش، ئێمە حەزمان بە لەنێوبردنیان نییە.. جگە لەمانەیش هەست و مەزەندەیەکی مادییانە لەگۆڕێدایە و پێی وایە ئێوە هەوڵ

دەدەن کۆنترۆڵی هێزێکی گەورە بکەن و لەوانەیە ئەو هەوڵەی ئێوە ببێتە هۆی کاردانەوەی ئەو هێزە گەورەیە لە سەرانسەری گۆی زەویدا بێتە ئاراوە.. هەروەها دەشتوانین لە وروژاندنی ئاشووب و نانەوەی پشێوی لە جیهاندا، شوێنپێی هەوڵ و کۆشش و بەشداریکردنی جووڵەکە هەڵگرین.. بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەبینین هەندێکیان لە بەرانبەردا هەڵوێستێکی زۆر یەکلاکەرەوەیان هەیە، هەژموون و پارە و سامانی خۆیان بۆ وەستانەوە بەڕووی ئەو چالاکییە شەڕخواز و لەخشتەبەرەی برایەکانیان خەرج دەکەن.

کاتێك هێتلەر دڵنیابوویەوە بریتانیا لە هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ئەڵمانیا شکستی هێناوە، زیاتر و زیاتر بەرەو ڕاست شکاندییەوە، چونکە باوەڕی وابوو هیچ تاك و گرووپ و نەتەوەیەك بەتەنیا ناتوانێ هەژموون و دەستەهەڵاتی سووخۆرانی جیهانی لە وڵاتانی بەناو دیموکراسی تێکوپێك بشکێنێ، لەبەرئەوەی لەڕووی داراییەوە ئەو وڵاتانەیان تەواو قۆڵبەست کردووە و هەرهەموویان خستوونەتە ژێر قەرزێکی کەمەرشکێنەوە.

جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیا لە تەمووزی ساڵی ١٩٣٦دا هەڵگیرسا، بەکێشبوون و نزیکبوونەوەیەکیش لەنێوان فرانکۆ و هێتلەر و مۆسۆلینی هاتە کایەوە.. بڕیار و نەخشەی فرانکۆ بۆ خەبات لەپێناو دەرپەڕاندنی کۆمۆنیستەکان لە وڵاتەکەیدا وای لە هێتلەر کرد لەڕووی سەربازییەوە سنوورەکانی تۆکمە بکات، چونکە زۆر حەزی لێبوو بزانێ ئاخۆ ستالین لەسەر حیسابی وڵاتانی دیکەی ئەورووپی هیچ هەوڵێکی فراوانکردنی سنوورەکەی دەدات؟ ڕۆژنامەوانیی دژ بە هێتلەریش هەر هەنگاوێکی هێتلەریان بە دوژمنایەتییەکی فاشیستی ناودەبرد.. بەڵام

هێتلەر پاساوی بۆ هەنگاوەکانی خۆی دەهێنایەوە و رایدەگەیاند هەنگاوی خۆپارێزن، لە شوێنێکی دیکەشدا گوتبووی گرنگیدان و بایەخی یەکەمی لەسەر ئەوەیە رێگە لە ستالین بگرێ و نەیەڵێ لە دەوروبەری هێڵی پانیی ٤٠ لە ئەوروپادا ناوچەیەکی هەژموون و دەستهەڵات دامەزرێنێ.. خۆ ئەگەر رێگەی بدابایە، ئەوا ئەڵمانیا و بریتانیا و وڵاتانی دیکەی ئەوروپی دەکەوتنە نێو تەڵەوە..

نازییەکان لەنێو گەلی ئەڵمانیدا دەستیان بە بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیای جێرمانی کرد.. ئەم باوەڕ و ئایدۆلۆژیایە پێی وایە نەژاد و رەچەڵەکی جێرمانی لە هەموو لایەن و نەژادێکی دیکە پێشکەوتووترە و دەبێ بە هێزی سەربازی جیهان بخاتە ژێر دەستی خۆی و دەوڵەتێکی جێرمانی بنیاد بنێ.. یەکێك لە باوەڕە نەگۆڕەکانی ئەو رێبازەش ئەوەیە دەبێ ملکەچی بۆ سەرۆکی دەوڵەتی جێرمانی کوێرانە بێت و بە شێوەیەکیش گفتوگۆی گوماناویی لەبارەوە نەکرێ.

بەمشێوەیە ململانێیی نێوان مەسیحییە فرەدینەدارەکان بە هەردوو باڵی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی، بە دژی دەوڵەت دەستیپێکرد، پیاوانی ئایینی هێرشی توندیان دژ بە نازیزم بەرێوەبرد، راشیانگەیاند نازیزم هەوڵی وێرانکردنی مرۆڤایەتیی خستووەتە گەڕ.. نازییەکانیش وەڵامیان دانەوە و گوتیان: پیاوانی کەنیسە دژی یاسان و لەگەڵ دەستهەڵات یەکیان گرتووە.. ئەوسا پیاوانی ئایینی گوتیان: نازیزم دژ بە پلانی خواوەندییە لە ئافراندنی مرۆڤدا و ئەو پلانەش رەت دەکاتەوە.. نازییەکانیش پیاوانی کەنیسەیان بەوە تۆمەتبارکرد دەست دەخەنە چەند کاروبارێکی دەوڵەتەوە کە بە هیچ شێوەیەك پێوەندیی بەوانەوە نییە.

هێتلەر یاسایەکی توندوتیژی دەرکرد، هۆشداریی دایە پیاوانی ئایینی ڕەخنە لە دۆخە باوەکان نەگرن و مل لەبەر ملی یاساکانی دەوڵەت نەنێن.. هەروەکیشی لێیان کرد ئەگەر دادگەیەکان سەلماندیان یاسایان پێشێل کردووە، ئەوا سزایان بەسەردا دەسەپێنێ.

بەشێك لەبڵاوکراوەکەی بابا بیۆسی یانزەیەم لە چواردەی ئاداری ساڵی ۱۹۳۷دا بە ناونیشانی (سەبارەت بە هەلومەرجی کەنیسە لە ئەڵمانیا) دەرچوو، فەرمانی دا بەسەر جیهانی مەسیحیدا بڵاو بکرێتەوە، بابا لە بڵاوکراوەکەدا بە گشت کاسۆلیکەکانی ڕاگەیاندبوو ئەوەی لە قسەکانیدا سەبارەت بە نازییەکان و خۆبەزلزانینی جێرمانییەوە باسی کردووە، تەواو ڕاست و دروستن، بابا نووسیبووی: لەوانەیە جیاوازییەك لەنێوان گەلان و حکوومەتەکان و نوێنەری دەستهەڵاتە ئەهلییەکان و هتد هەبێت، ڕێشی تێدەچێ هەندێك کەس و لایەن بەهۆی جیاوازیی سرووشتی و زیرەکیی مرۆیی سروشتییەوە پێگەیەکی باڵایان هەبێت و لە خەڵکی دیکە پێشکەوتووتر بن.. بەڵام بەرزکردنەوەی ئەو چین و گرووپ و گەلانە بۆ ئاستی پێشکەوتن و باشتربوونێکی میسالییانە، گۆڕین و دەستدرێژکردنە بۆ سەر سرووشت، چونکە تەنیا فراوەژۆیی (الکمال) بۆ خواوەندە، هەر ئەویش ئافرێنەر و چارەساز و بڕیاردەرە، تاك یان کۆمەڵە و گرووپێك بۆیان نییە بانگەشەی مافی خواوەندیبوون و پەرستراوییان هەبێت..ناشبێ کەس بکەوێتە نێو هەڵەی ئەوەی نیشتمانەکەی بە نیشتمانی خودا یان ئایین بزانێ، مەگەر دەبەنگ بێت و تێبکۆشێ و سنووری توانایەکانی خواوەند تا ئەو ڕێژەیە بەرتەسك بکاتەوە، چونکە خودای مەزن پاشایەکی فەرمانڕەوا و دادپەروەرە و هەرگیز نابێ توانای نەتەوە و

گەلان بە هێز و توانایەکانی بەراورد بکرێ، دۆخی لەمشێوەیە وەك بەراوردکردنی تنۆکێك ئاوە بە دەریا.

ئەمە سەبارەت بە کاسۆلیکەکان.. بەلام پرۆتستانییەکان، زۆر ئازایانە ڕووبەڕووی نازیزم بوونەوە و لە مانگی ئابی ١٩٣٨ دا نامە و پەیامێکیان بلاوکردەوە و تیایدا ڕوونیان کردەوە هەلویستی نازییەکان لەهەنبەر ئایینی مەسیحی لە ئەلمانیا بەشێوەیەکی زۆر زەق لەگەل بۆچوون و جەختکردنەوەکانی فوهلەر دژە.. هەروەها لە پەیامەکەدا هاتبوو: ئەوەی نازییەکان ئامانجیانە چەپاندن و سەرکوتکردنی کەنیسەی کاسۆلیکی و پرۆتستانییەکان نییە بە تەنیا، بەلکو لەنێوبردنی بیروباوەڕە سەرەکییەکەی مەسیحییەتە کە لەسەر باوەڕبوون بە یەك خواوەند بنیاد نراوە، لە هەمان کاتیشدا دەیانەوێ بیروباوەڕی جێرمانی لە شوێنی دابنێن.. واتای هەولی گۆڕینی خواوەندی مەسیحی بۆ خواوەندی جێرمانی چییە؟ ئەدی بیروباوەڕی خواوەندیی جێرمانی چییە؟ .. ئایا لە خودای گەلانی دیکە جیاوازە؟.. ئەگەر وایە، ئەوا واتای ئەوەیە هەر گەل و نەتەوەیەك خواوەندێکی تایبەت بەخۆی هەیە.. واتای ڕاستینی ئەو بیرۆکەیەش ئەوەیە هیچ خواوەندێك لەبنەڕەتەوە بوونیان نییە.

هێزی ڕەشی نازیزم و هێزی سووری کۆمۆنیستی لە جەنگەی دژ بە مەسیحییەت و ئیمپراتۆریای ڕۆمانیدا هاوسەنگەر بوون.. دۆخە ئالۆزەکەش بوو بیاوانی کەنیسەی ناچارکرد وەك هەلویستێکی نەتەوەیی دژی نازیزمی ڕەش بوەستنەوە، لە هەمان کاتیشدا مەترسییە کەمترەکەی فاشیزمیان پشتگوێ خست و سەبارەت بە بیرۆکەی مەترسیی کۆمۆنیزم لەگەل فرانکۆ هاوڕابوون.. ئەو دۆخەش

ڕاڤەی هۆیەکانی هاوپەیمانیکردنی کاردینال مندزنیتی لەگەڵ سەرکردە فاشیەکان ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی لەدەست هەژموونی کۆمۆنیستیی نێو وڵاتەکەیان ڕزگار بن.

لە هەلومەرجێکی وەهادا، ملیۆنان کەس لە گەلی ئەڵمانی و فەرەنسی و ئیتاڵی و ئیسپانی و یابانی، دەبووایە بەناچاری یەکێك لەو دوو لایەنە هەڵبژێرن: یان پشتگیری لە کۆمۆنیزم یانیش فاشیزم بکەن.. هۆبسۆن ڕێگەی پێ نیشان دان و پێی ڕاگەیاندن ئەوە هەڵبژێرن کە مەترسییەکەی کەمترە و لە ئەهریمەن دوورترە.

بەمشێوەیە نەخشە و پیلانگێڕییە ئەهریمەنییەکە بۆ ڕەخساندنی هەلومەرج و زەمینەی جەنگی دووەمی جیهانی هاتە کایەوە، دیکتاتۆریەتی ڕووسی بە نهێنی ئەڵمانیای پڕچەك دەکردەوە.. دکتاتۆریەتی ئیتاڵیش بە سەرۆکایەتیی مۆسۆلینی بەنهێنی کەشتیگەلی ژێرئاوەگەڕەکانی ئەندازیاران و زانایانی ئەڵمانیای بنیاد دەنا.. ئەو ژێرئاو گەڕانە بەشێوەیەکی کرداری لە جەنگی نێوخۆیی ئیسپانیدا خرانەگەڕ، چونکە لە ساڵی ١٩٣٦دا هێزی ئەو ژێرئاوگەڕانە و خۆڕاگرییان لەبەرانبەر گشت چەکە بریتانییە دژە ژێر ئاوگەڕەکان بەتەواوی سەلمێندرا، ئەو ژێرئاوگەڕە نوێیانە دەیانتوانی بە قووڵایی پێنجسەد پێ بچنە ژێر دەریاوە، ئەمەیەش مەودایەکە و هیچ چەکێکی ئەوکاتی نەیدەتوانی پێیان بگات و بیانپێکێ.. ئیدی حکوومەتی بریتانیش بەو مەسەلەیەی زانی و بە نهێنی هەواڵی ئەو ئامادەکارییانەی پێگەیشت.. کاپتن ماکس مارتۆن لە هێزی دەریایی بریتانیدا تاقیکردنەوەیەکی کرداری کرد بۆ ئەوەی بتوانێ لەو کاتەی ئەو ژێرئاوگەڕانە لە بەندەرەکانی خۆیاندا لەنگەر دەگرن، هێرشیان بکرێتە

سەر، بە ژێرناوگەڕەکەی خۆیشی توانی خۆی لە گشت چەکێکی دژ بە ژێرناوگەڕەکان دووربخاتەوە و بەشێوەیەکی تیۆری دوانزە کەشتیی ژێرناوگەڕی لەنگەر گرتوو تێکبشکێنێ.. جا لەجیات ئەوەی کاپتن مارتن لەلایەن سەرکردەی کەشتیگەلەکانەوە سوپاس و پێزانینی ئاراستە بکرێ، کەوتە بەر ڕقو کینە و نارەزایی و پلە بەرزکردنەوەیان وەستاند و بەتەواوی دەمکوتیان کرد.. بارودۆخەکە هەتا ساڵی ١٩٤٠ وەك خۆی مایەوە، کاتێك ژێرناوگەڕە نوێیەکانی ئەڵمانی هەڕوگیفیان لە بریتانییەکان کرد و گوتیان یان دەبێ خۆتان ڕادەست بکەن یانیش لە برسان بمرن.. ئەوساکە سەرکردایەتیی دلوایان لێ کرد لە زەریای ئەتلەنتیدا جەنگی بەرپەرچدانەوەی ژێر ناوگەڕەکان بەڕێوەببات.

لەگەڵ هۆشداریيە پێشوەختەکانیش، بەلأم کاتێك جەنگ بەرپابوو هیچ چەکێکی دەریایی بۆ پارێزگەریکردن لە کەشتییە بریتانییەکان نەبوو.. لە ئەنجامدا بریتانیا پێش ئەوەی بتوانێ لە ساڵی ١٩٤٣ جڵەوی جەنگ و سەرکەوتنەکە وەدەستبێنێ، ٧٥٪ ی کەشتیگەلە بازرگانییەکان و چل هەزار سەربازی دەریاوانیی لە دەست دا.

دەگەڕێینەوە ئەڵمانیا، هیتلەر لە ئەڵمانیا هەنگاوێکی دژ بە سووخۆرە نێودەوڵەتییەکان هەڵێنابوو، چوونکە سیاسەتێکی سەربەخۆیانەی ئابووریی و ریفۆرمی دارایی ڕاگەیاندبوو.. دلوای لە یابان و ئیتاڵیا و ئیسپانیا کردبوو لە ڕووبەڕووبوونەوە و دژایەتیکردنی هێزی کارتل و قۆرغکارییەکانی سووخۆرە نێودەوڵەتییەکاندا پاڵپشتی بن، بانکێکی نێودەوڵەتیان تەرخانکرد کە دوا بەرهەمی نەخشە و پلانی سزایەکەیان بوو.. ڕایخ پلانەکەی خۆی بە لەنێوبردنی دکتۆر

مانسی بەڕێوەبەری بانکی ڕایخ و بەکرێگیراوی سووخۆرە جیهانییەکان دەستپێکرد.. جا پێش ئەوەی هیتلەر هەنگاوە بوێرانەکەی خۆی هەڵێنێ، کەس نەیدەتوانی دکتۆر مانس لە پۆستەکەی لابدات، تەنیا بە ڕەزامەندیی ئەو و ئەندامانی بانکی نێودەوڵەتی نەبێت.

سووخۆرانی نێودەوڵەتی لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بیست و شەش بانکی مەرکەزییان بنیادنابوو، ڕێك هاوشێوەی ئەو بانکە فیدراڵییانەی لە ساڵی ۱۹۱۳ بەسەرپەرشتیی و ڕێنمایی پۆل واربۆرگ بنیاد نرابوون، ناوبراو لە ساڵی ۱۹۰۷ چووە ئەمریکا و دواتریش بووە هاوبەشی دەستگەی کۆهن- لۆب و هاوبەشانیان لە نیویۆرکدا.

لەکاتی ئاخاوتنمان سەبارەت بە بزووتنەوەی ئابووریی ئەو قۆناغە مێژووییە، گوتەکانی تیۆدۆر ولسن ( ۱۹۱٦) دەهێنینەوە، واتا دوای سێ ساڵ لە دەستبەکاربوون و کارکردن بە سیستمی بانکی یەدەگی فیدراڵی کە لەلایەن واربۆرگی جوولەکەوە ڕێکخرابوو، ولسن لە ئاخاوتنەکەی سەبارەت بە دۆخی ئابووریی ئەمریکا دەڵێ: بارودۆخی گەلە پیشەسازەکەمان وەك بارودۆخی زۆربەی وڵاتە پیشەسازییە مەزنەکانە و سیستمی پێشینەدان (التسلیف) و قەرزەکانی کۆنترۆڵی کردووە..سەرچاوەی ئەو قەرز و پێشینەدانەش چەند کەسێکن بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن و دواتر دەستیان بەسەر گەشەکردنی نەتەوەکەماندا گرتووە، گرووپ و دەستەیەکن و بەتەواوی دەستەڵاتیان بەسەر وڵاتدا سەپاندووە.. لەبەرئەوە ئیدی حکوومەتەکان- تەنانەت بەهەزموونترین و سیستماتیکترینیان- گوزارشت لە زۆرینەی ئەو دەنگانە ناکەن کە هەڵیانبژاردوون، بەڵکو ڕاستییەکەی گوزارشت لە دەستە و تاقمە هەژموونداره دەکەن.

هەر ئەم دۆخەیشە لە ئێستەدا جیهانی مۆدێرن و شارستانی بە دیموکراسی ناوی دەبات. فرانکلین رۆزفلتی سەرۆکی ئەمریکا لەگەڵ بۆچوونی سەرۆك ویلسندا هاوڕایە، چونکە لەو کاتەی قەیرانەکە - یان ترازیدیایە - ئابوورییە گەورەکەی سییەکان سەری هەڵدا، رۆزفلت گوتی: تەنیا شێست خانەوادەی ئەمریکی دەستیان بەسەر ئابووریی گەل و نەتەوەدا گرتووە.. سێیەکی گەلی ئەمریکیش بەدەست خراپیی دۆخی نیشتەجێبوون و خۆراك و خواردنەوە دەناڵێنن.. هەروەها گوتی: سەتا بیستی ئەوانەی لە پرۆژەکانی W.P.A کار دەکەن، لە دۆخێکی زۆر نالەباری بەدخۆراکیدان، تەنانەت ناتوانن کاری رۆژانەیان بەتەواوی راپەڕێنن.. من سوورم لەسەر ئەوەی پیاوانی بانکی لەنێو قەلا و قوولە پارێزراوەکەیان دەربەڕێندرێن.

بەلام هێندەی نەبرد رۆزفلتیش گۆڕا.. هەستی کرد سەرکردایەتیی وڵاتەکەی دەکات و گەلەکەی بەرەو جەنگ و شەڕی دژ بەو دەوڵەتانە دەبات کە سەبارەت بە سیاسەتی پێش هەڵبژاردنی لەگەڵیدا هاوڕابوون.. جا دوای ئەوەی رۆزفلت تەمەنێکی زۆری لە خزمەتکردنی سەرمایەداریدا بەسەربرد، لە خانووی بێرنارد باروخی دەوڵەمەندترین و بەهێزترین پیاوی ویلایەتە یەککگرتووەکاندا مرد، ئەو بێرناردەی ماوەی چل ساڵ لەژێر پەردەوە دەستی بەسەر ئەو وڵاتەدا گرتبوو و هەر خۆی حوکمڕانییەکەی دەکرد.. جا ئەگەر خوێنەرێك هەیە گومانی لەو قسانەی ئێمە هەبێت کە سەبارەت بە بێرنارد باروخ کردمان، با پێمان بڵێ وەڵام و لێکدانەوەی بۆ سەردانەکانی وینستۆن چەرچڵ چییە کە هەرگیز سەری لەو پیاوە نەبڕیوە بەردەوام هاموشۆی کردووە؟ .. ئەدی چۆن راگەیاندراوە مێژووییەکانی چەرچل

لێکدەداتەوە کە ڕاستەوخۆ دوای چوونی بۆلای بارۆخ لە ساڵی ١٩٥٤ ڕاگەیەندراوێکی تایبەت بە پشتگیریکردنی زایۆنیزمی سیاسی بڵاوکردەوە؟

ئیدی (دیموکراسی) بووە ئەو وشە بریقەدارەی دەستەڵاتدار و سەرۆکەکان بۆ لەخشتەبردنی
گەلانیان وەک بنێشت بەردەوام لەسەر زاریان بوو.. ئەو وشەیە لە وڵاتانی سەرمایەداریدا بەکار دەبرێ کە شوێنی حەوانەوە و کەیفوسەفای پارەدارانی جیهانییە، ئەو پارەدارانە بە زیادکردن و کەمکردنەوەی ڕۆیینە (سیولە) بەپێی ویست و بەرژەوەندی و ئارەزووی خۆیان دەستکاری بەهای دراو دەکەن.. ئەو دیموکراسییەی هەریەکە لە بریتانیا و فەرەنسا و ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆیانی پێ پێناسە دەکەن، واتای پێوەندی و وابەستەبوونی ئەو وڵاتانە دەگەیەنێ بەو پارەدەر و سووخۆرە نێودەوڵەتییانە ئەویش لە ڕێگەی قەرز و قولەوە..لە لایەکی دیکەشەوە، وڵاتانی کۆمۆنیستیش خۆیان بە وڵاتی دیموکراسی ناودەبەن، چونکە کەوتوونەتە ژێر هەژموون و دەستەڵاتی هەمان گرووپ و دەستەی سووخۆر و پارەدەرانی جیهانییەوە.

سێر ئەنتۆنی ئیدن گوزارشت لە ڕای ئەو سووخۆر و پارەدەرانە دەکات، کاتێک لە ١١ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٩دا پەیامێکی ڕادیۆیی ئاراستەی گەلی ئەمریکی کرد و لە برگەیەکدا گوتبووی: کاتمان بۆ ڕەخساوە ئەورووپا لە دەمارگیری و هەڵپە و هەژموونی هەواوەوەسەکان دەرباز بکەین.. لەسەریشمان پێویستە لەمیانی جیهانێکی دژ بەیەک و پڕ لە جەنگدا شارستانییە نوێیەکەمان بنیاد

نەنێین.. ئەمە بۆگەنبوونێکی مەزنییە و هیچی دیکە.. ئایا جەنگەکان بۆ وێرانکردنن یان بنیاد نان؟

زۆرێـك لـە بریتانییـەكان هـەوڵیان خسـتەگەڕ وڵاتەكـەیان و هاوپەیمانـەكانی لـە چـوونە نێـو جـەنگێكی نـوێی دژ بـە ئـەڵمانیا بـە دووربگرن..هـەر لـە سـاڵی ۱۹۲۰ ەوە لـە گشـت بۆنەیەكـدا بێـزاری و نـارەزاییی خۆیـان لەهەنبـەر هەڵگیرسـانی ئـاگری جـەنگێكی دیكـەدا دەردەبڕی.. بەڵام هەر هەموویان بە نازییە ڕەشەكان تۆمەتبار دەكران كە لە بەرژەوەندیی لۆردە جەنگییەكانی نـازیزم كـار دەكـەن.. یـەكێك لـەو بریتانیانـەی دوژمنایـەتیی خۆیـان لەهەنبـەر كۆمـۆنیزم ڕاگەیانـد و پشتگیرییان بۆ فاشیزم دووپات كردەوە (سێر ئۆزوێڵد موسلی) بـوو.. ناوبراو و چـەندان سیاسـەتمەدار و ژەنـەڕاڵانی خانەنشـین بـە هـەوڵێكی بێدەنگ و بوێرانەوە هۆشدارییان دەدایە ئەندامانی نێو حكوومەت نەبنە نێچیری پیلان و كودەتایەكی جیهانی.

بزاڤی دژ بە (سامییەت) لـە ئینگلترا لـە سـاڵی ۱۹۲۰ ەوە سـەری هەڵدابوو، كاتێك مارسدن گەڕایەوە ئینگلترا و پەڕتووكەكەی پرۆفیسـۆر سێرجی نیلۆس ( مەترسیی یەهوودی) لەگەڵ خۆیدا هێنابوو.

كاتێك مارسدن ئـەو بەڵگەنامانـەی وەردەگێـڕا، هەڕەشـەیان لێـی كرد ئەگەر دەستبەرداری چـاپ و بڵاوكردنـەوەی پەڕتووكەكـە نـەبێت، دەیكوژن.. بـەڵام مارسـدن لـە هەڕەشـەكە نەترسـا، پەڕتووكەكـەی لە چاپدا و ناونیشـانی ( پرۆتۆكۆلی سـەرانی زایـۆنیزم)ی بـۆ هەڵبـژارد.. دوای چـەند سـاڵێك لـە چـاپكردنی پەڕتووكەكـە - هـەر وەك لـە هەڕەشەكەدا هاتبوو- لە هەلومەرجێكی پڕ لە تەمومژدا مرد.

ئەو پەرتووکە لە ئینگلترا و دواتریش لە سەرانسەری جیهاندا هەرا و هۆمۆیەکی گەورەی نایەوە.. سووخۆرانی نێودەوڵەتی ویستیان خۆیان لەو ئابڕووچوونە دەرباز بکەن و هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەیان دژ بە مارسدن بەڕێوەبرد، بە درۆزن و دوژمنایەتیکردنێکی ڕاشکاوی سامییەت تۆمەتباریان کرد.. لە لێکۆڵینەوە و شرۆڤەکارییەکانی خۆمدا دەتوانم بڵێم ئەو بەڵگەنامانەی لە پەرتووکەکەی پرۆفیسۆر نیلۆسدا لەژێر ناونیشانی مەترسیی جوولەکە هاتوون و لە پەرتووکەکەی مارسدن بەناوی (پرۆتۆکۆلی سەرانی زایۆنیزم) هێنراوەنەتەوە، هەمان پیلانە دوورمەودایەکانی نوورانییەکانە کە ئەمشێل رۆچیلد لە کۆبوونەوەی ساڵی ١٧٧٣ی فرانکفۆرتدا بۆ هاوڕێیەکانی خۆی ڕاڤەی کردوون.

هیچ گومانێکیش لەوەدا نییە ئەو بەڵگەنامانەی کەوتوونەتە دەست پرۆفیسۆر نیلۆسەوە، چەند بەڵگە و ئاماژەیەکی دیکە بوون و دەتواندرێ لە ڕاڤەکردنی شێوازی پێڕەوکردنی نەخشە و پیلانەکەدا پشتی پێ ببەسترێ و بگەینە ئەو ڕاستییەی چۆن داروینیزم و مارکسیزم و نیچەیزم (ڕێبازەکەی نیچە) بەکارهێنراون.

خوێنەری ئەو بەڵگەنامانە -جا سەرچاوەکەیان هەرچییەك بێت- ناتوانێ وەك گوزارشتێك لەو بەرنامەیەی بەڵگەنامەکان هەر لە ساڵی ١٧٧٣ ەوە پێشنیازی کردوون، نکۆڵی لە زنجیرەداری و بەدوایەکداهاتنی ئەو ڕووداوانە بکات.. هەروەها سەری لەو پێشبینییە وردە دەسووڕمێ کە هەرگیز بە هەڵەدا نەچووە.

ماکس ناردۆ لە کۆنگرەی شەشەمی زایۆنیزمدا کە لە ساڵی ١٩٠٣ لە بازڵی سویسرا بەڕێوەچوو، گوتارێکی خوێندووەتەوە ئەمەیش دەقی

پەرەگرافێکی گوتارەکەیەتی: رێگەم بدەن ئەم چەند وشەیەتان پێ بڵێم، وەك ئەوەی پلیکانە پلیکانە بەسەر پەیژەیەکدا سەرتان بخەم.. کۆنگرەی زایۆنیزم.. پرۆژەی تۆگەنداى بریتانی... جەنگی پێشبینیکراوی جیهانی.. کۆنگرەی ئاشتی کە تیایدا بە یارمەتیی بریتانیا دەوڵەتێکی سەربەخۆی جوولەکە لە فەلەستین پێکدێت.

زۆرێك لە سیاسەتمەداران و رۆژنامەوانان ئەو بەڵگەنامانەیان خوێندووەتەوە و دنەی داون لە پرسە جیهانییەکان وردببنەوە و لێیان بکۆڵنەوە، وەك لۆرد سیدنهام و هێنری فۆرد. هێنری فۆرد دوای خوێندنەوەی بەڵگەنامەکان پەرتووکێکی بەهاداری نووسیووە، کۆتاییی لێکۆڵینەوەکەشی رێك وەك دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی منن.. لە ١٧ی شوباتی ساڵی ١٩٢١ نیویۆرك وورڵد چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ بەرێز هێنری فۆرد سازدابوو، لەو چاوپێکەوتنەدا ئەم پەرەگرافەم هێناوەتەوە: گرنگترین شتێك بمەوێ سەبارەت بە پرۆتۆکۆلەکان بیڵێم ئەوەیە نێوەرۆکی ئەو پرۆتۆکۆلانە هاوشێوەی رووداوەکانی ئەمرۆن.. شانزە ساڵ بەسەر بەدیارکەوتنی ئەو پرۆتۆکۆلانە تێپەریون، کەچی ئێستە و دوای سەدەیەك لە دەرچوونیان، لەگەڵ بارودۆخی هەنووکەیی جیهان دەگونجێ!

ئێستە سی و چوار ساڵ بەسەر ئەم دەستەواژەیەی فۆرد تێپەریوە ( بەسەر گوتنی ئەم قسەیە تێپەریوە) ، کەچی هەتا ئێستە هاوشێوەی ئەو واقیعەیە کە تیایدا دەژین.. ئەمەیش بەسە بۆ ئەوەی وەها لە گشت خاوەن ویژدانێکی زیندوو بکات ددان بەوەدا بنێ ئەو بەڵگەنامانە تەنیا دەقی ئەسڵیی ئەو پیلانەیە کە رۆژ لە دوای رۆژ

قۆناغی جیبەجێکردنی زیاتر دەچنە پێشێ و زۆربەی مەبەستەکانی خۆیشی پێکاوە.

لە کۆتایی ئاخاوتنەکەمان سەبارەت بە پرۆتۆکۆلەکانی سەرانی زایۆنیزم، پێویستە پێوەندیی نووسەرەکەی -بەڕێز مارسدن- بە شا ئەدواردی هەشتەمی ئینگلیز بهێنینە بەر باس، چونکە ئەو پێوەندییە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر خودی پاشا و پەردە هەڵماڵین لەسەر لایەنەکانی ئەو پیلانگێڕییەدا هەبووە کە لەو کاتیدا لە ئینگلترا ماتووەتە ئاراوە. مارسدن لە ساڵی ١٩٢١ تا ١٩٢٧ لە ڕۆژنامەی مۆرنینگ پۆستدا کاری کردووە، لەوێ زۆر هاوڕێی دۆزیوەتەوە.. بەلام لە هەمان کاتیشدا لەلایەن پیلانگێڕەکانەوە زۆر بەتوندی دوژمنایەتیی کراوە.. لە ساڵی ١٩٢٧دا دەستنیشان کراوە لەگەڵ وەلی عەهد (میری وێلز) بۆ گەشتێکی ئیمپراتۆری بچێت.. هیچ ماقوولیش نییە بەڕێز مارسدن ئەو دەرفەتەی نەقۆستبێتەوە و میری لەو بەڵگەنامە و پیلانگێڕییانە ئاگادار نەکردبێتەوە کەوا پارەدەران و سووخۆرانی نێودەوڵەتی و لە هەمان کاتیشدا پیلانگێرانی هێنانەکایەی کۆمۆنیزم و زایۆنیزم بەیەکەوە هەوڵی هەڵسووڕاندن و جێبەجێکردنی دەدەن.. ئیدی کاتێك وەلی عەهد دەگەڕێتەوە بریتانیا زۆر دەگۆڕێ، ئیدی وەك میرە دەستبلاوەکەی جاران نەما، بەڵکو بووە پیاوێکی مکوڕ و بە قوولی تێدەفکری.. بەلام هەرکە مارسدن گەیشتەوە بریتانیا باری تەندروستییەکەی تێکچوو، دوای چەند ڕۆژێکیش مرد.. ئەمەیش ڕووداوی ژەهرخواردکردنی میرابۆمان بیردێنێتەوە، دوای ئەوەی پاڵنەرە ڕاستینەکانی شۆڕشی فەرەنسای بۆ لویسی پاشا ڕوونکردەوە.

گۆڕانی وەلی عەهد دوای گەڕانەوەی لە گەشتەکەدا زۆر قووڵ و سەرناپاگیر بوو، ئیدی بەبایەخەوە دەینواڕییە گرفتە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان، سەری لە کانە خەلوزەکان دەدا و دەچووە مالی کرێکارەکان و لەگەلیان دەکەوتە ئاخاوتن، لەمەیشدا ڕەچاوی نەریتەکانی پاشایەتی نەدەکرد.. دواتریش دژی هەر سیاسەتێك دەوەستایەوە ئەگەر هەستی کردبایە باش و شایستە نییە، زۆر بوێرانەش ڕا و بۆچوونی خۆی لەهەنبەر گشت مەسەلە و کاروبارێکی سیاسەتی دەرەوە دەردەبڕی، بەمەیش دژی هێزە نهێنییەکان دەوەستایەوە، بەتایبەتیش کاتێ لە ٢٠ی کانوونی دووەمی سالی ١٩٣٦ تاجی پاشایەتیی لەسەر نرا.. بەمشێوەیە ئیدواردی هەشتەم کەوتە نێو ململانێیەکی توندی هەنبەر جلەو بەدەستە ڕاستینەکانی سیاسەتی بریتانی.. بەلام هێندە خۆی ڕانەگرت، چونکە سووخۆران بۆ یەك چرکەش دەستبەرداری ناوزڕاندنی نەبوون، بەتایبەت کاتێك لەگەل مستەر مارسدن چوونە گەشتەکە.. پڕوپاگەندەی سووخۆرەکان ئەوەبوو دەیانگوت ڕاوچیی ژنانە و هەواداری ڕاستڕەوانە و دەستی لەگەل ئۆزویلد مۆزللی لایەنگری بزووتنەوەی فاشیزم تێکەل کردووە.. بەلام کۆی ئەو پڕوپاگەندانە نەیانتوانی ژیاننامە و ناوبانگە مکوڕەکەی بڕووشێنن، تا ئەو کاتەی بڕیاری دا بێوەژنێکی ئەمریکی بخوازێ بەناوی والی سیمبسۆن.. ئەوسا هۆکارەکانی پڕوپاگەندەکردن وەك کوورەی هەنگ وروژان و ڕای گشتییان دژ بەو خاتوونە وروژاند، ئەم مەسەلەیە بووە تاکە مەسەلەیەك مێشکی خەلکی ئینگلترای جەنجال کردبوو.. مستەر بالدوین فەرمانی سووخۆرانی بۆ لابردنی پاشا لە عەرشی دەستهەلات لەنێو دەستانی دابوو.. پاشا دوو بژاردەی خرایە

بەردەم: یان دەستبەرداری عەرشی دەستهەڵات بێت، یانیش واز لە خواستنی مس سیمبسۆن بێنێ، ئەویش ئەو چارەسەرەی هەڵبژارد کە کەرامەتەکەی دەپارێزن و نایکردە قەشمەرجاڕی دەستی نەیارانی، واتا دەستبەرداری عەرشی دەستهەڵات بوو.

# بەشی حەڤدەیەم

# هەلگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی

هەر لەگەڵ ئەوەی ئیدواردی هەشتەمی پاشای بریتانیا ڕایگەیاند دەستبەرداری عەرشی دەستهەلأت دەبێت، ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیران و بیرمەندانی بریتانی -بە ئەندامانی پارلەمان و کۆنە سەرکردەکانی سوپاشەوە- هەڵمەتێکی فراوانی پڕوپاگەندەیان بەڕێوەبرد بۆ ئەوەی باوەڕ بە حکوومەتی وڵاتەکەیان بهێنن پیلانگێڕییەکی سووخۆرانی نێودەوڵەتی لەگۆڕێدایە و هیچ گفتوگۆیەك هەڵناگرێ.. یەکێك لەو کەسانە کاپتن ڕامزی و ئەدمیرال سێر باری دومفێل بوون و لە ساڵی ١٩٣٨ دا گەیشتنە ئەو باوەڕەی سەرکردایەتیی جوولەکەی جیهانی کە لەلایەن پیاوانی بانکی و سووخۆرانی جیهانییەوە ڕێبەرایەتییان دەکرێ، لە پیلانێکی دوورمەودا و بە ئامانجی نانەوەی ململانێی نێوان گەلان، پارەیەکی قەبە و زەبەلاحی بەردەستیان بۆ کڕینی کەسانی پلە بالاّ و پێگە هەستیارەکان بەکاردێنن، ئامانجی پیلانەکەش خۆ ئامادەکردن و زەمینەسازییە بۆ هاتنی مەسیحی جوولەکەکان بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکات، ئەوسا حکوومەتی مەرکەزیی لە فەلەستیندا دەتوانێ دەستهەلأت و حوکمڕانییەکی دکتاتۆرانە بەسەر گشت گەل و نەتەوەکانی جیهاندا بسەپێنێ.

کاپتن رامزی و ئەدمیرال دومفیل ئەو پەڕی هەوڵ و توانای خۆیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی نەهێڵن بریتانیا لە جەنگی دژ بە ئەڵمانیا بگلێ، هەروەها کاپتن رامزی هەوڵێکی تاقەتپڕووکێنی دا بۆ ئەوەی بەڕێز چامبرلینی سەرۆکوەزیرانی بریتانی لە مەترسییەکەی سەر بەرژەوەندییەکانی بریتانیا ئاگادار بکاتەوە، چونکە پیلانگێڕە نێودەوڵەتییەکان پیلانەکەی خۆیان بەتەواوی جێبەجێ کردبوو و بریتانیایان گلاندبووە نێو جەنگی دژ بە ئەڵمانیا.. گەرچی نەیتوانی باوەڕ بە سەرۆکوەزیران بهێنێ، بەڵام هەر هیچ نەبێ کاریگەرییەکی باشی لێکرد و دنەی دا نێوانی خۆی و هێتلەر چاک بکاتەوە و لە میونخ بگەڕێتەوە و چەترەکەی دەستی و کاغەزەکەی دەستی راوەشێنێ و بڵێ ئەمە رێکەوتنێکە و لە ئێستەدا ئاشتی دەهێنێتە کایەوە.

هەر راستەوخۆ دوای ئەو راگەیاندنە، ئەو رۆژنامەگەرییەی لەلایەن سووخۆرانی نێودەوڵەتییەوە دەستی بەسەرداگیرابوو، هەڵمەتێکی پڕ لە رق و کینەی دژ بە فاشیزمیان بەڕێوەبرد، نەفرەتیان داباراندە سەر چامبرلین و بەو پیرەژنە تۆمەتباریان کرد کە دەیەوێ بە هەر نرخێك بێت ئاشتی بکڕێت، هەروەها گوتیان هاوکار و پاڵپشتی فاشیزمە..بەکرێگیراوانیش لە خۆپیشاندانێکی گەورەی نێو گورەپانی گشتیی مۆسکۆدا گریان لە پەیکەرێکی وەهمیی چامبرلین بەردا.. ئەو جۆرە رۆژنامەگەرییە فاشیزمی ئەڵمانی و ئیتالییان وەك ئەیتەیستییەکی رەش پیشان دا کە ئامانجی تۆتالیتارییەکی رەهایان هەیە.. خەڵکانێکی کەمیش لە جیاوازیی نێوان نازیزم و فاشیزم و کۆمۆنیستی و سۆسیالستی دەگەیشتن.

یەکێك لە وردەکاریی ئەو ڕێکارانەی لە پشتی پەردەوە گێرانەبەر، ئەوەبوو کاپتن ڕامزی بەڵێنی بە سەرۆکوەزیرانی بریتانی دابوو بەڵگەنامەیەکی بخاتە بەردەست کە گەواهیدەری پیلانگێڕییەکی دژ بە بەرژەوەندییەکانی بریتانیایە.. ئەو بەڵگەنامەیە چەند نامەیەکی نهێنیی کۆددار بوون و لەنێوان وینستۆن چەرچل و ڕۆزفلتی سەرۆکی ئەمریکا ئاڵوگۆڕ کرابوون.. هەروەها ڕامزی بەڵێنی هێنانی ئەو نامانەی دا، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ سوورخۆرانی جیهانی ئامانجیان هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگی دووەمی جیهانییە.

کاپتن ڕامزی لە ڕێگەی تایلەر کێنتی ئەفسەری ئەمریکیی ڕاسپێردراو بە پەخشکردن و وەرگرتنی ئەو نامانە لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە لەندەنەوە، بەدەستی گەیشتبوو.. خودی تایلەر کێنت پێوەندی بە کاپتن ڕامزیەوە کردبوو، چونکە دەیزانی پیلانگێڕی و کودەتایەکی جوولەکەی جیهانی بەڕێوەیە، دەشیزانی بۆ وەستاندنی جەنگ ئەوپەڕی هەوڵی خۆی خستووەتە گەڕ .. کاتێکیش ڕامزی پێشنیازی کردبوو ئەو نامە بەڵگەییانە بداتە دەست سەرۆکوەزیران، کێنت ڕازی ببوو ئەو نامانە بباتە ماڵی ڕامزی لە گلۆستەری لەندەن.

لەو کاتیدا پیلانگێڕانی جیهانی سنووری چالاکییەکانیان فراوانتر ببوو.. لە ئاداری ساڵی ١٩٣٩دا توانیان دنەی چامبرلین بدەن بەیماننامەی پاراستنی پۆلەندییەکان دژ بە هێرش و دوژمنایەتیی ئەڵمانییەکان واژۆ بکات، ئەمەیش بە زەقکردنەوە و پیشاندانی هۆشدارییەکی ساختە لە ئەڵمانییەوە بۆ پۆلەندییەکان بەڕێوەبرا.. ڕاستییەکەی ئەڵمانیا ئەو هۆشدارییەی نەناردبوو، بەڵکو بۆ چارەسەرێکی ئاشتییانەی گرفتی دالان و تەنگەبەرەی پۆلەندی و

دانـزنگ، پرۆژەیـەکی زۆر بـاش و پەسـندی لـە دوو تـوویێی خۆیـدا هـەلگرتبوو، ئـەو گرفتـەش بـەهۆی پەیماننامـە نادادپەروەرییەکـەی فرسای دروستبوو.

یاداشـتانەمەکە مـاوەی چـەندان مـانگ پشـتگوێ خـرا، بـەلام ڕۆژنامەگـەریی دژ بـە هێتلـەر دژە هێرشـێکی توندوتیـژیان دەسـتپێکردبوو.. ڕۆژنامەگەرییەکـە وەك پیاوێـك وێنـای کردبـوو کـە جێگەی متمانـە نییـە، ئـەو درۆیـەش بەسـەر هەموواندا تێپەڕی، وەك نموونەیـەکیش بـۆ پێشـێلکردنی گشـت ڕێککەوتنامـەکان لەلایـەن هێتلەرەوە – هـەروەك چۆن پێشـتریش پەیماننامـەی فرسـای پێشـێل کردبو– ئـەو گوتەیـەی هێتلەریشـیان بـەکارهێنا کـە دوای داگیرکردنـی سدتنلاند گوتبووی ئیدی دوای ئەمە داوای هیچ شـتێکی دیکـە ناکـات.. هەروەها ئەو یادداشتنامە ئاشتیخوازییەی هێتلەریشیان بە دوژمنکارانـە لەقەڵەم دا کە ئاراستەی پۆڵەندای کردبـوو و وەك نموونەیـەکی دیکـەی خواست و ویستە فراوانخوازییەکانی هێتلەریان لێك دایەوە.

ڕاسـتییەکەی هێتلـەر ڕایگەیانـدبوو دوای ئـەوەی ئـەو سـتەمی سەپێندراوی پەیماننامـەی فرسـای ڕەوانـدەوە کـە دوژمنـانی ئیسـپانیا دایانڕشتبوو، ئیدی هیچ شتێکی دیکـەی گـەرەك نییـە و داوای ناکـات.. هێتلـەر لـەو بەڵێنـە ڕاسـتگۆبوو و تـەنیا بـەرەو ناوچـەی سـدتندلاند و بەشێك لە چیکۆسلۆڤاکیا و تەنگەبـەرەی پۆڵەنـدی و دانـزنگ هـاتبوو، چونکە پەیماننامەی فرسـای بـە دروسـتکردنی تەنگەبـەرەی پۆڵەنـدی، بڕووسیای لە خاکی ئـەڵمانی جیاکردبوویـەوە.. بـەلام دانـزنگ شـارێکی ئـەلمانی بوو و پەیماننامەکـە لـە گشـت ناوچـەکانی دیکـەی ئـەڵمانیای دابڕیبوو.. ئەو بەشەی لە ئێستەدا بە چیکۆسلۆڤاکیا ناسـراوە، چەند

هاوولاتییەکی ئەڵمانیی خراپە سەر و لەلایەن چیکییەکانەوە رەفتاری زۆر خراپیان لەگەڵ کرا و بەسەریاندا زاڵبوون.. هیتلەر تەنیا لەو کاتەدا چووە نێو نەمساوە کە گەلی نەمسا داوایان لێیکرد لە دوژمنایەتیی کۆمۆنیستەکان بیانپارێزی، بەڵام هەموو لایەك نکوڵییان لەو مەسەلەیە کرد.

بەشێوەیەکی گشتی رۆژنامەوانیی خۆرئاوایی گەلانی ئەوێیان ئامادەکردبوو وەك دوژمنێك بنوارنە ئەڵمانیا و گشت ئەو وڵاتانەی پاڵپشتیی لە سیاسەتەکانی دەکەن، وەك فەرەنسا و چەند وڵاتێکی دیکە.

کاتێکیش گەلی ئەڵمانی هیتلەریان گەیاندە پێگەی سەرکردایەتیی چەرچڵ هەستایە سەرپێ و گوتی: هیتلەر تەنیا درندەیەکە و کوڕی درۆ و فرووفێڵە.. بەڵام کەس ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات هیتلەر جار لە دوای جار هەوڵی دەدا بگاتە چارەسەرێکی دادپەروەرانەی گرفتی تەنگەبەرەی پۆڵەندی و دانزنگ، بەڵام سووخۆرانی جیهانی رێگەیان پێ نەدا، چونکە وەهایان لە مستەر چامبرلین گەیاندبوو هیتلەر یادداشتنامەی هۆشدارییەکەی ناردووە.. ئەم درۆ و فێڵەش وایان کرد مستەر چامبرلین بە دوودڵییەوە ئامۆژگاریی حکوومەتی پاشایەتی بکات جەنگی دژ بە ئەڵمانیا رابگەیەنێت.

لەوانەیە خوێنەر رای وابێت ئەو تۆمەتانەی دەیانخەمە پاڵ سووخۆرانی جیهانییەوە نادروست و دوور لە راستی بن.. بەڵام ئەگەر ویستی بەراوردێك لەنێوان رووداوەکانی پێش و دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و هەروەها رووداوەکانی پێش و دوای جەنگی دووەمی جیهانی

بکـات، ڕێکچـوونێکی زۆر گـەورەی نێـوان نەخشـە و پـیلان و دەرئەنجامەکانی بۆ ڕوون دەبێتەوە.

جەنگە گەورەکە بە پەیماننامەی فرسای کۆتـایی هـات کـە هـیچ کەسێك ناتوانێ بڵێ سەرکردە و ڕێبەرانی ڕاستەقینەی مەسیحی بتـوانن پەیماننامەیەکی هاوشێوەی ئەو پەیماننامە ستەمکارانەیە وازۆ بکـەن.. بەڵام هـەمان سـەربردە جارێکی دیکـە لـە جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا دووبـارە بوویـەوە، ئـەویش ئـەوەبوو هاوپـەیمانان سیاسـەتی خۆرادەسـتکردنی بێمـەرج و پیلانـە ئابووریەکـەی سـتالین-وابـت-مۆرگانتۆ و دابەشکردنی ئەڵمانیا بـۆ دووبـەش و دروسـتکردنی قـەیرانی فرەنسیی دوای جـەنگیان گرتەبـەر. جگـە لـەو گەمـە مەترسـیدارەی پارەدەرانی نێودەوڵەتی و سەرکردە دکتاتۆرەکانی ڕووسیا و چـین لـە دوای کۆتاییهاتنی جەنگ لەگەڵ یابان کردیان.

کـاتێکیش هێتلـەر لـە چـاوەنواڕیی وەڵامـی پۆڵەنـدا و جـەنگی پڕوپاگەندەی نێو ڕۆژنامەکان ماندووبوو، فەرمانی بە سـوپایەکەی کـرد بەرەو پۆڵەندا بجولێن.. ئەوسـا بریتانیـا بـەپێی ڕێککـەوتنی پێشـووی لەگەڵ ئەڵمانیا جەنگی ڕاگەیاند.. لێرەدا دەتوانین ئەو تاوانـە قێزەونـە بخەینە ڕوو کە سووخۆرانی جیهانی نەخشە و پیلانیان بـۆ دارشـتبوو.. گفتیان بە پۆڵەندییەکان دا یارمەتی بریتانیا بدەن و بیپارێزن گەرچـی تەواو دەیانزانی بریتانیا بەڕاستی ناتوانێ هیچ یارمەتییەکی ئاسمـانی و وشکایی و دەریایی پێشکەش بکات.

گوتەکـەی لـۆرد لۆسـیانی بـاڵیۆزی بریتانیـا لـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـدا وەك بەڵگەیـەك دەهێنمـەوە کاتێـك لـە ئەنجوومـەنی گشتیدا لە دوا ئاخاوتنی خۆی ڕاستییەکی خستە ڕوو و گوتی: ئەگەر

بنەما و ڕێبازی سەروەریی خودی لە بەرژەوەندیی ئەڵمانیا نەك بەدژی پێڕەو بکرایە، مانای ئەوە بوو گەڕاندنەوەی سدتنلاند و چیکۆسلۆڤاکیا و چەند بەشێکی پۆڵەندا و تەنگەبەرەی پۆڵەندی و دانزنگ بخرێنەوە سەر رایخ.

هێزی فرۆکەوانیی ئەڵمانی بەدرێژایی مانگەکانی یەکەمی جەنگەکە و وردتر بڵێین بەدرێژایی ماوەی دەستهەلاتداریی چامپرلین وەك سەرۆکی حکوومەتی بریتانی، خۆیان لە بۆمبابارانکردنی بریتانیا بەدوور دەگرت.. بریتانیاش هێرشی نەدەکردە سەر خاکی ئەڵمانیا، ئەمەیش وەك جێبەجێکردن و ڕەچاوکردنی گوتەکەی چامپرلین بوو کە لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی جەنگ لە ڕێکەوتی ٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ پێشکەشی کردبوو، ناوبراو لە گوتەکەیدا ڕایگەیاندبوو فەرمان بە هێزەکانی دەکات جگە لە ئامانجە سەربازییەکان هێرش نەکەنە سەر هیچ ئامانجێکی دیکە.. ئەمەیش مانای دەست پاراستن بوو لە هێرشکردنە سەر خەڵکی سڤیل و شارەکان.

دوای کشانەوەی ئینگلیز لە دنکرك، جەنگ ماوەیەك و بەمشێوە هێمنە نیمچە ئاشتییە بەردەوام بوو، ئەڵمانییەکان هێرشیان نەدەکردە سەر ئینگلترا، ئینگلیزەکانیش کاری دوژمنکارانەیان نەدەکرد.. ئەو ماوە و قۆناغە بە جەنگی پووچ و بێمانا ناودەبرا.. ئەوجا هەڵمەتی پڕوپاگەندە و ناوزڕاندنی چامپرلین دەستیپێکرد، وینستۆن چەرچڵیش پۆستی سەرکردایەتیی باڵای هێزە بریتانییەکانی وەرگرتبوو، ناوبراو لە ئەرویژدا سەرکێشییەکی شکستخواردووی کرد و بووە هۆی لەنێوچوون و کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە سەرباز و ئەفسەرانی بریتانی،ئەمەیش شکستەکانی چەرچڵی لە ئەنتۆرب( ١٩١٤) و شکستەکەی دیکەی لە داگیرکردنی

گالیبۆلی ( ١٩١٥) هێنایەوە نێو یادگە. ئەم شکستە بۆ بێتوانایی سەربازیی چەرچڵ ناگەڕێتەوە، چونکە نابراو کەسێکی زۆر زیرەك و کارامە بوو، بەڵکو بەشێك بوو لە پیلانی ڕووخاندنی حکوومەتەکەی چامپرلین، هەروەك چۆن لە سەردەمی جەنگی جیهانیدا حکوومەتەکەی ئەسکویتیش بە هەمان سیناریۆ ڕووخێندرا.. بەمشێوەیە تۆباڵی شکستەکە نەخرایە ئەستۆی چەرچڵەوە، بەڵکو هەڵمەتی پروپاگەندەکە سەرلەبەری ئاراستەی چامپرلین کرابوو، لەبەرئەوە چامپرلین ناچاربوو دەست لەکار بکێشێتەوە و وینستۆن چەرچڵ بچێتە جێگەی.

چەرچل لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٤٠دا دیسانەوە هاوپەیمانییەکی لەگەڵ سۆسیالیستەکان بەست، بۆ ئەوەی حکوومەتێکی نوێ پێکبهێنێ و لەسەر دەستی حکوومەتەکەدا جەنگە پووچ و بێمانایەکە بکرێتە جەنگێکی ڕاستین.. لە شەوی ١١ی ئایاری ساڵی ١٩٤٠ و ڕێك لەو کاتەی چەرچڵ هاتە سەر کورسیی دەستهەڵات، فەرمانی بە فڕۆکەوانیی بریتانی کرد هێرش بکەنە سەر شارەکانی ئەڵمانیا، بەمەیش پاساوی خستە دەست ئەڵمانییەکان بەهەمانشێوە کاردانەوەیان هەبێت، ئیدی دوای ئەو هێرشە جەنگەکە بووە ماڵوێرانییەکی تەواو.. گەرچی زۆر کەس بەرگرییان لە سیاسەتی هێرشکردنە سەر ئامانجە مەدەنییەکان دەکرد، بەڵام هەرگیز نەیانتوانی پاساوێکی گونجاوی بۆ بهێننەوە.

ئەوسا سەرکردە نازییەکان چوونە لای هێتلەر و ڕای خۆیان سەبارەت بە زەروورەتی هێرشکردنە سەر یەکییەتیی سۆڤییەت دەربڕی، ئەمەیش بۆ خۆ دوورگرتن بوو لە دۆخی چۆڵبوونی پشتی ئەڵمانیا کاتێك کردە بەرفراوانە جەنگییەکانی بەڕێوە دەبات..

فوهۆریش ناچار بوو ڕەزامەندی لەسەر ڕا و بۆچوونەکەیان دەربڕێ.. لـە ٢٢ی حـوزەیرانی سـاڵی ١٩٤١دا سـوپای ئـەڵمانی چـووە نێـو یەکییەتیی سۆڤییەت.. ئەوساکە و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، بریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵە مادییەکانی خۆیان یەکخست بۆ ئەوەی یارمەتیی ستالین بدەن بەڕووی هێزەکانی ئەڵمانیا بوەستێتەوە و بەرپەرچیان بداتەوە.. هەڵمەتێکی ڕێکوپێکی ناردنی ئەو کەشتییانە دەسـتپێکرد کـە چـەك و تفـاقی جـەنگییان بـۆ ڕووسـیا دەبـرد.. کۆمەکەکانیش لە ڕێگەی کەنداوی عـەرەب و مۆرمانسکەوە گەیەندرانـە ڕووسیا.

لەو کاتیدا چەرچل هەڵمـەتێکی بـەرفراوانی دەسـتگیرکردنی ئـەو کەسانەی بەڕێوەدەبرد کـە دژی جـەنگی هەنبـەر ئـەڵمانیا بـوون.. لـەو هەڵمەتـەی دەسـتگیرکردندا پشـتی بـە یادداشـتنامەیەك بەسـتبوو کـە لەکاتی جەنگی نێوخۆیی ئێرلەندا دەرچووبوو.. ئیدی ژمارەیـەکی زۆری کەسایەتییەکانی سەر بە سوپای کۆمـاری ئێرلەنـدی خرانـە زیندانـەوە، بـەبێ ئـەوەی مـافی بـەرگری لـەخۆکردنیان هـەبێت.. ئـەو فـەرمانی ڕەشبگیرییە لە ڕێگەی هێربرت مۆریسـۆنی وەزیـری نێوخـۆی ئەوکاتـدا دەرچـوون. دواتـریش نـاوبراو لـە سـاڵی ١٩٥٤ لـە کەنـەدا و لـەکاتی هەڵمەتی کۆکردنەوەی کۆمەك بۆ زایۆنیزم بەدیارکـەوت، پاسـاوی ئـەو هەڵمەتە بەرفراوانەی ڕەشبگیریش ئەوەبوو لەپێناو سەلامەتیی گشتی و بەرژەفتکردنی کەسانێکی نیازپیس و مەترسیدارە.. ئەو بەدواداچوون و لێکۆڵینەوانـەی دوای جـەنگ بەڕێوەچـوون، سـەلماندییان ئـەو ڕەشبیگرییە هـیچ پاسـاوێکی نـەبووە، بـەڵکو بەچـەند بیانوویـەکی زۆر پووچەوە بەڕێوەبراون.

لەنێو کەسانی دەستگیرکراودا کاپتن ڕامزی و ئەدمیرال سێر باری دۆمفێل و ژنەکانیان و هاوڕێیەکانیان هەبوون. هەر هەموویان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری هاوولاتییاندا خرابوونە زیندانی بریکستۆنەوە و هەندێکیان تا ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٤ ئازاد نەکران.

پێش دەستپێکردنی ڕەشبگیرییەکە، بۆ زەمینەسازکردن لەپێناو هەنگاوهەڵێنانی چەرچڵ، هەڵمەتێکی فراوانی پروپاگەندەی ڕۆژنامەوانیی سەر بە سووخۆرانی جیهانی بەڕێوەبرا.. ڕۆژنامەگەری وەهای لە خەڵک گەیاندبوو جەماوەری ئەڵمانیا تابوورێکی زۆر بەهێز و سیستماتیکیان لەنێو ڕیزەکانی ئینگلیزدا هەیە و ڕێکاری پێویستی گرتووەتە بەر دژە بە سوپای ئەڵمانی بکات.

چەندان بەڵگەی پێوەندیی حکوومەتی چەرچڵ بە جوولەکەی جیهانی لەبەردەستن و بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە و ستەمکارانە چەند کەسایەتییەکی بەناوبانگ و خاوەن پێگەی نێو گەلی بریتانییان خستە زیندانەوە، تەنیا سووچ و گوناهیان ئەوەبوو پڕ بە دەنگیان هاواریان کردبوو جوولەکەی جیهانی دنەی بریتانیای دا بگلێتە نێو جەنگی دژ بە ئەڵمانیا.

بەڵگەکانی دادگەی بریتانی و لێکۆڵینەوەکانی هەواڵگریی ئەو وڵاتە، وەڵامی بوختان و درۆ و دەلەسەی پیاوانی حکوومەتی بریتانیان دایەوە، چونکە هیچ دەستگیرکراوێك بەهیچ جۆرێك تۆمەتی هاوکاریکردنی ئەڵمانیای بەسەردا ساغ نەبوویەوە، بەڵکو تەنیا تۆمەتێکی هەڵبەستراوی بەکرێگیراوانی سووخۆرە جیهانییەکان بوو.. ئەو کەسانە ویستیان تۆمەتێکی ئاوا بدەنە پاڵ ژنی ئەدمیراڵ نیکۆلسۆنی کۆنە سەرکردەی دەریاوانیی بریتانی، بەڵام دادگە

بێتاوانییەکەی سەلماند، حکوومەتەکەی چەرچڵیش بەبێ هیچ تۆمەتێك دەستگیری کرد بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە، چونکە ناوبراو پێش جەنگ داوای دەکرد رێگە لە هەڵگیرسانی ئاگری جەنگێکی لەمجۆرە بگیرێت.

زیندان نەیتوانی دەنگی ئەمیراڵ دۆمفیل و کاپتن رامزی خامۆش بکات، یەکەمیان پەڕتووکە بەناوبانگەکەی خۆی (لە ئەمیراڵێکی تازە پێگەیشتووی دەریاییەوە)ی نووسی و تیایدا نهێنیی رووداوەکان و ئەو لایەنانەی ئاشکرا کرد کە بوونە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی، تیایدا هۆشداریی دابووە گەلی ئینگلیزی.. رامزیش پەڕتووکەکەی خۆی بەناوی (جەنگێکی بێناو)ی نووسی.. ئەم دوو پەڕتووکە – هەرچەندە لە بازاڕەکاندا نەمان– توانییان نهێنییەکانی پیلانگێڕی و کودەتایەکە بۆ رای گشتیی ئینگلیزی و ئەورووپی ئاشکرا بکەن.

نیفل چامپرلینی سەرۆکوەزیرانی پێشوو کاتێك دەیبینی وڵاتەکەی تەنیا لەپێناو بەرگریکردن لە بەرژەوەندی و مەبەست و نیازەکانی کۆمەڵێك سووخۆری جیهانی دەکرێتە قەسابخانەیەکی گەورە، بەداخ و کەسەری نێو دڵییەوە سەری نایەوە.. هەڵمەتی ناوزڕاندنی چامپرلین لەلایەن سووخۆرانی نێو دەوڵەتییەوە تا دوا رۆژی مردنیشی بەردەوام بوو، نەك هەر ئەمە بەڵکو هەزاران پەڕتووك سەبارەت بە ناوبراو دەرچوون و هەرهەموویان وەك کەسێکی سست و بێدەستەڵات و تۆقیو لە هیتلەر لێی دواون .. لەهەمان کاتیشدا سێر وینستۆن چەرچڵ تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت وەك کەسێکی شکۆدار

لێی دەڕواندرێ و لە ناز و نیعمەتی خۆشگوزەرانیدا گەوزان دەدات و بچێتە هەر شوێنێ ستایشی دەکرێ و ڕێزێکی بێپایانی لێ دەگیرێ.

هەر لەگەڵ هێرشەکەی هێتلەر بۆ سەر ڕووسیا، چەرچڵ و ڕۆزفلت ڕایانگەیاند خۆیان و حکوومەتەکەیان بەوپەڕی هێز و توانایانەوە بۆ پاڵپشتی و پشتگیریکردنی ستالین تێدەکۆشن.. چەرچڵ لە گوتەیەکی زۆر کاریگەردا گوتی: تەنانەت سڵ لە هاوپەیمانیکردنی شەیتانیش ناکاتەوە ئەگەر بەڵێنی بداتێ لە لەنێوبردنی فاشیزمدا یارمەتیی دەدات.

دوای ئەمە چەرچڵ و ڕۆزفلت یارمەتییەکی بێسنووری ستالینیان دا، هەروەها پارەوپوولێکی خەیاڵیشیان لە خاوەن بانکە جیهانییەکان قەرز کرد، دواتریش قەرزەکە و سووەکانی قەرزەکانیشیان خستە سەر حیسابی قەرزی نەتەوەیی هەردوو وڵات، دانەوەی ئەو قەرزەش خرایە ئەستۆی هاووڵاتیانیان، خاوەن بانکەکانیش بەو پەڕی ئاسوودەییەوە سەتان ملیۆن دۆلاریان لەو مامەڵەیەدا وەگیر دەکەوت.

ستالین و ڕۆزفلت بۆ دوژمنایەتی و بەریەرەکانێکردنی ئەڵمانیا ڕێککەوتن.. ڕۆزفلت بۆ ستالینی دووپات کردەوە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ ئەڵمانیایەك نامێنێتەوە ببێتە هۆی نیگەرانی.. دواتر لە چەند سەرچاوەیەکەوە گێڕدرابووییەوە بەبێ دادگەییکردن فەرمانی گوللەبارانکردنی بۆ ٥٠٠٠٠ ئەفسەر و سەربازی ئەڵمانی دەرکردبوو.. ڕۆژنامەگەریی ئاراستەکراویش بەردەوام لەسەر ژێی سیاسەتی لەنێوبردنی گەلی جوولەکە ئاوازی دەژەند.. بەڵام هەرگیز باسی سیاسەتی ڕۆزفلتی نەدەکرد کە ئامانجی ڕیشەکێشکردنی گەلی ئەڵمان بوو.

ستالین کۆمنترینی هەڵوەشاندەوە، لە بەرانبەریشدا ڕۆزفلت لەهەنبەر ناوبراودا چەند سازشێکی نوێی نواند، دەستی ستالینی لە بەرانبەر ٦٠٠ ملیۆن مرۆڤی دانیشتووی ئەورووپای خۆرهەلاتدا ئاوەلا کرد.

تەنیا خودی چەرچڵیش دەتوانێ ڕوونی بکاتەوە بۆچی لەگەڵ ڕۆزفلت دادەنیشت و گوێی لە پێشنیازەکانی دەگرت بۆئەوەی لەپێناو رازیکردنی ماوتسی تۆنگدا هۆنگ کۆنگ بداتە چینی کۆمۆنیست.. چەرچڵ چۆن توانیویەتی وەك هاورێیەکی گیانی بە گیانی خۆی پیشانی سەرۆکی ئەمریکا بدات، لە کاتێکدا ئەوەی کۆتایی بەردەوام دەیگوت هەڵوەشاندنەوەی کۆمۆنویلسی بریتانی بۆ پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیی مرۆڤ پێویستە و هێتلەریش بیروباوەڕی پێچەوانەی ئەمە بوو.

راستیی ستالین تەنیا دوای داگیرکردنی بەرلین و ئەڵمانیای خۆرهەلات بەتەواوی دەرکەوت.

سەرمایەدارانی خۆرئاوایی بە چاوی گرنگیدان و مکوڕبوونەوە دەیانڕوانییە ڕکابەرییە بەرچاوەکانی ستالین.. بەلام هیچیشیان لەدەست نەدەهات.. ئەوان کارتێکی زۆر قازانجهێنیان لەبەر دەستدابوو.. جا پێش ئەوەی گەمە بەو کارتە بکەن، چەند رێنماییەکیان دایە دەست ڕۆزفلت بۆ ئەوەی بۆ دواجار هەوڵ بدات ستالین بهێنێتەوە نێو ڕیزەکەوە.. ڕۆزفلت پێشنیازی کرد دەستی ستالین لە خۆرهەلاتی دوور ئاوەلا و سەرپشك بکرێ و داوای هەر شتێك بکات پێی ببەخشرێ، لە بەرانبەر ئەوەی لەگەڵ سەرمایەدارانی خۆرئاوا بگونجێت.. ڕۆژنامەگەریی ئاراستەکراویش جەختی لەوە دەکردەوە

ڕۆزفڵت بۆیێ ستالینی لە خۆرهەڵاتی دووردا سەرپشك کردووە، چونکە ڕاوێژکارە سەربازییەکانی پێیان ڕاگەیاندووە دوای ئەوەی ئەڵمانیا بەر لە دوو ساڵ لە جەنگێکی بێ ئامان خۆی ڕادەستکرد، ناتواندرێ یابان بهێنرێتە سەرچۆك.. ئەو درۆیە هێندە ڕوون بوو بەشێوەیەك ژەنەراڵ مارك ناچار نەبوو ڕاستەوخۆ درۆیان بکات.. ژەنەراڵە ئەمریکییەکانیش دەیانزانی یابان ماوەیەکی زۆر بەر لەو دۆخە داوای دانوستانی ئاشتی کردووە.

ستالین جارێکی دیکە دەستی بەسەر گشت ئەو شتانەدا گرتەوە کە لە مەنشووریا دەیویستن.. دواتر پەیمانەکەی خۆی شکاند و گەڕایەوە نێو دۆخی ململانێیەوە.. ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو هێزە شاراوانە تووڕە بکات کەوا بەنهێنی کۆشکی سپییان بەڕێوە دەبرد.. بێگومان هەردەبێ پێشنیازێکی جەهەنەمییان خستبێتە ڕوو، ئەمەیش وایکرد ڕۆزفڵت نەخۆش بکەوێ و بمرێ.. دەشڵێن لە ماڵی بێرنارد باڕووخدا مردووە.. دوای ئەمە ڕاوێژکارانی حکوومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بڕیاریان دا کارتە بەسوودەکە ڕاکێشن.. واتا چەکی ئەتۆمی.. دوو بۆمبی ئەتۆمی بەردرایەوە سەر هێروشیما و ناکازاکی، بۆ ئەوەی ستالین بۆی دەرکەوێ ئەگەر بە جوانی نەیەتە سەر ڕێگە چ شتێك چاوەڕوانیەتی.. مەسەلەی هەبوونی بۆمبی ئەتۆمیی ویلایەتە یەکگرتووەکان تا ئەو ڕێکەوتە بە نهێنی هێڵدرابوویەوە.. ڕێك هەر لەو کاتەی بۆمبەکانیش بەردرانەوە سەر ئەو دوو شارە، یابان شکستی هێنا و پێشبینیی تەسلیمبوونی دەکرا.. بەمشێوەیە زیاتر لە سەت هەزار کەس کوژران و نزیکەی سێسەد هەزار کەسیش بریندار و کەم ئەندام بوون، تەنیا لەبەرئەوەی لە ستالین بگەیەنن ویلایەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمیی هەیە.. لەلایەکی دیکەشەوە دەبینین چەرچڵ فەرمانی دەرکرد ئەڵمانیا بۆمباباران بکرێ بۆ ئەوەی نیازپاکیی نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان لە ستالین بگەیەندرێ و ئەو بیرۆکەیەی لە مێشکی دروست بکەن ئەو نێو نەتەوەییانە نیازی هاورێیەتی و دۆستایەتییان هەیە و ویلایەتە یەکگرتووەکان لەپێناو هۆشداری و ئاگادارکردنەوەی ستالین، بە بۆمبی ئەتۆمی لە یابانیان داوە و ئەگەر نەیەتەوە سەر ڕێگەی ڕاست هەمان چارەنووسی یابان چاوەنوارییەتی.

## بەشی هەژدەیەم

# مەترسییە هەنووکەییەکان

شرۆڤەکردنی مێژوو دەرفەتی پێشبینیکردنی ئایندەمان بۆ دەڕەخسێنێ، چونکە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە و ئەوانەی لەپشت بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانیش وەستاون پیلانە دوور مەودایەکیانیان ناگۆڕن، بەڵکو سیاسەتەکانیان بەشێوەیەک دەگۆڕن لەگەڵ هەلومەرجە هاوچەرخەکانیان بگونجێ، هەروەها دەستکاریی پیلانەکانیشیان دەکەن بۆ ئەوەی پێشکەوتنی زانستە نوێیەکان گەورەترین سوودیان پێ بگەیەنێ.

بۆ تێگەیشتنیش لە هەڵوێستە هەنووکەییەکەی جیهان، پێویستە بگەڕێینەوە ئەو کاتەی لینین لە ساڵی ١٩١٨دا دکتاتۆرییە ڕەهایەکەی لە ڕووسیا پێکهێنا و سەلمێندرا ئەو دکتاتۆرییەتە بۆ ئەوە دامەزراوە دەرفەت بۆ نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان بڕەخسێنێ بیردۆزە دکتاتۆرییە جیهانییەکەیان بخەنە واری جێبەجێکردنەوە.

دوای ئەوەی لینین مرد، ستالین دەستەڵاتی گرتە دەست و لەسەرەتادا داردەست و ئامرازێکی بەر دەستی سەرمایەدارە جیهانییەکان بوو. هەروەها بۆ جێبەجێکردنی پیلانی کۆکردنەوەی کرێکاران لە ئۆکرانیا بیلاکۆمیی دەستنیشانکرد. کاتێکیش کرێکاران ملیان نەدایە بەر فەرمانەکان، بە زۆرەملێ دەستی بەسەر گەنمدا گرت

و برسییەتی ڕووبەڕووی پێنج ملیۆن کرێکار بوویەوە. دواتریش ئەو گەنمە بردرایە بازاڕەکانی جیهان بۆئەوەی قەیرانە دەستکردە ئابوورییەکە زیاتر تەشنە بکات و پێنج ملیۆن جووتیاری دیکەش ڕەوانەی خێوەتگەکانی سوغرەکێشی کران بۆ ئەوەی لە میللەتەکەی بگەیەنن دەوڵەت لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە و سەرۆکی دەوڵەتەکەش خوایە و دەبێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن.

لۆخەکە هەر وا مایەوە تا ستالین ژمارەیەکی زۆری ئەو سەرکردە کۆمۆنیستە یەهوودییانەی لەنێوبرد کە بەبێ هیچ گومانێك مارکسی بوون. ئەوسا ترۆتسکی و ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکانی دیکەش تەواو دڵنیابوون لەوەی ستالین وازی لە نوورانییەت هێناوە و خەریکی وەدیهێنانی حەز و ویستە ئیستعمارییەکانیەتی.

هەڵویستی ستالین لەهەنبەر شۆڕشی ئیسپانیدا نیگەرانیی نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکانی ڕۆژ بەڕۆژ نیگەرانتر دەکرد، بەتایبەتیش کاتێك سێرجس و مۆرین سەلماندییان ستالین بۆ جێبەجێکردنی نەخشە و پیلانە نهێنییەکان و هەڵپە و ئامانجە ئیستعمارییەکانی، کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی بەکاردێنێ.

دوای ئەوەی فرانکۆ لە جەنگی نێوخۆییدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا، لێکدانەوەی ڕەفتارەکانی ستالین زۆر دژوار بوو، هەروەها ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکانی کەنەدا و ئەمریکا نەیانتوانی بەدواداچوون بۆ گۆڕانە ڕیشەییەکانی پێڕەو و پرۆگرامی پارتەکە بکەن هەر وەك چۆن لە کاتی وەرگرتنی بیروباوەڕی مارکسییانەدا بۆیان ڕوون کرابوویەوە، کاتێکیش ستالین پەیماننامەی دەستدرێژنەکردنی لەگەڵ هێتلەر مۆرکرد، دوای ئەوەی هەردوو ئیمپراتۆریای بریتانی و ئەڵمانی نوقمی

نێو جەنگی دووەمی جیهانی ببوون، ڕەفتارەکانی ستالین بەشێوەیەك بوون وەك بڵێی ئەوپەڕی توانای خۆی بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی یارمەتیی هیتلەر بدات دەست بەسەر ئەورووپادا بگرێت و دەستهەڵات و هەژموونی خاوەن بانکە جیهانییەکان بڕووخێنێ.

دۆخەکە بۆ خاوەن بانکە جیهانییەکان هێندە مەترسیدار بوو تا گەیشتنە ئەو باوەڕەی هەوڵ بدەن ستالین ڕازی بکەن هەڵپە و تەمایە ئیستعمارییەکانی وەلاوە بنێت، بە مەرجێك لەگەڵیاندا لە سایەی پێکەوەژیانێکی ئاشتییانەدا بژیەت.. هەوڵیشیان دا باوەڕ بە ستالین بهێنن کە زۆر گونجاوە خۆی بەشێوەیەکی کۆمۆنیستییانە حوکمی جیهانی خۆرهەڵاتی بکات، ئەوانیش بەهۆی حکوومەتێکی ڕاگوزەرییەوە حوکمڕانیی جیهانی خۆرئاوایی بگرنە دەست. ستالین داوای کرد ڕاستگۆیی خۆیان بسەلمێنن. ئەمە سەرەتای بیردۆزی پێکەوەژیانی ئاشتییانە بوو کە ئێستە قسە و باسێکی زۆری لەبارەوە دەکرێ. بەڵام پێکەوەژیانی ئاشتییانە لەنێوان دوو گرووپی جیهانیدا، یان لەنێوان باوەڕداران بە خودا و باوەڕداران بە شەیتان شتێکی ئەستەمە.

لەنێوان چەرچڵ و ڕۆزفڵتدا چەند پێوەندییەکی نهێنی بەڕێوە چوون، دواتر تایلەر کێنت پەردەی لە ڕوودا هەڵماڵین و بووە هۆی ڕێککەوتن لەسەر لادانی چامبرلین لە سەرۆکایەتیی حکوومەتی بریتانی بۆئەوەی چەرچڵ زەمینەی وەرگرتنی پۆستەکەی بۆ ساز ببێت و جەنگی سارد و قسەیی ببێتە جەنگێکی ڕاستین. ئەمەشیان بە شتێکی بێ کەموکورتی هەژمارکرد نیازپاکیی خۆیان بۆ ستالین بەدیاربخەن.

مێژوو بۆمانی ڕوونکردووەتەوە بەڕێز چامبرلین لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٤٠ بەهەمان شێوەی لادانی ئەسکویت لە ساڵی ١٩١٥، لەسەر

کورسیی دەسـتهەڵات لابـراوە، چەرچـڵ لـە ١١ی ئایـاری سـاڵی ١٩٤٠ پۆسـتی سـەرۆکایەتی وەرگـرت و رێـك هـەر لـە شـەوی وەرگرتنـی دەستهەڵاتەکەشدا فەرمانی بە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانیی پاشایەتی دا دەست بـە بۆمبابـارانکردنی شـار و ناوچـە ئەڵمانییـەکان بکـەن. بـەڕێز جی. ئێم سایتی گەورە ئەمینداری یارمەتیدەر لە وەزارەتی فڕۆکەوانیی ئەوکاتدا، دوای کۆتـایی هـاتنی جەنگەکـە پـەڕتووکێکی بەناونیشـانی ( بۆمبابارانی تۆڵەیی) لە چاپ دا. نووسەر لـە پەڕتووکەکەیدا سـەبارەت بە دەستەوەشاندن لە شارەکانی ئەڵمانیا، پاساو بۆ سیاسەتی چەرچڵ دەهێنێتەوە و پێی وایە وەك ڕزگارکردنی شارستانی بووە. بەلأم لەگەڵ ئەمەیشدا ددان بەوەدا دەنێت فەرمانەکانی چەرچڵ دژ بە ڕێککەوتنامـە واژۆکراوەکـەی ڕێکـەوتی ٢ی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی ١٩٣٩ی نێـوان فەرەنساو بریتانیا بـووە، چـونکە لـەو ڕۆژیـدا سـەرۆکوەزیرانی ئینگلترا لەگـەڵ سـەرۆککۆماری فەرەنسـا ڕێککـەوتن جـەنگ بـە دژی ئـەڵمانیا ڕابگەیەنن، لەبەرئەوەی ئەڵمانیا پۆڵەندای داگیرکردبوو، بەلأم لە هەمان کاتیشدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن شارەکانی ئەڵمانیا بۆمبابـاران نەکـەن، چونکە ناکرێ سەرجەم گەلی ئـەڵمانی بـاجی هەڵـە و سەرکێشیی تاکە کەسێك بداتەوە، هـەروەها سـەرۆکی هـەردوو حکوومـەت لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتن دەبـێ بۆمبابارانەکـە زۆر دیـاریکراو بێـت و تـەنیا ئامانجـە سەربازییەکان بپێکێ.

دوای جەنگ سەلمێندرا هۆی ڕاستینی پشت فەرمانەکەی چەرچڵ بۆ بۆمبابارانکردنی شارەکانی ئـەڵمانیا– گەرچی دژی ڕێککەوتنامەکە بـوو– حـەز و ویسـتی خـاوەن بانکـە خۆرئاواییـەکان بـوو بـۆ ئـەوەی لەهەنبـەر داوای بەرقـەرارکردنی جـۆرە پێکـەوەژیانێکی ئاشـتییانەی

نێوان کۆمۆنیزمی خۆرهەلآت و نوورانییەتی خۆرئاوا، دڵسۆزی و ڕاستگۆیی خۆیان بۆ ستالین بسەلمێنن.

بۆمبابارانکردنی ئەڵمانیا لەلایەن بریتانیاوە بووە هۆی تۆڵەکردنەوەیەکی خێرای ئەڵمانییەکان لە گەڵ بریتانی و ئەزموونێکی هێندە تاڵ بوو بەدرێژایی مێژوو هیچ ڕووداوێکی وەها توندوتیژ ڕووی نەداوە.

زۆر دژوارە هاووڵاتییەکی ئاسایی ئاستی نزمبوونەوەی هاوبەشانی پیلانگێڕی و کودەتای جیهانی بخەملێنێ. ئەوەیش سەلمێندرا نوورانییەکان نیازیان نەبوو لەو بەڵێنەی بە ستالینیان دابوو وەفاداری بنوێنن. هەروەها ئەوەش دەسەلمێندرێ سەرکردە جەنگییەکانی نازیزم لەو کاتەی بەنهێنی پیلانی ڕووخاندنی کۆمۆنیزمی جیهانی و سەرمایەدارییان دادەڕشت، دەیانویست فێڵ لە چەرچڵ بکەن و وەهای تێبگەیەنن هیچ پیلانێکی وەهایان نییە بە هێرشی سەربازی جیهان بەرزەفت بکەن.

لە بەهاری ساڵی ١٩٤١دا سەرکردە جەنگییەکانی نازیزم – ئەوانەی هێتلەر نەیدەناسین– داوایان کرد (هیس) بە فڕۆکە بچێتە بریتانیا و ئەو پێشنیازە بخاتە بەردەم چەرچڵ کە ئەگەر ڕازی بێت جەنگی دژ بە بریتانیا بوەستێنێ، ئامادەن هێتلەر لەنێو ببەن و ستالین و کۆمۆنیزمیش بەتەواوی بسڕنەوە، بەلآم دوای ئەوەی چەرچڵ پرسوڕای بە ڕۆزفڵت کرد، پێشنیازەکەی ڕەتکردەوە.

دوای ئەمە سەرکردە جەنگییەکانی نازیزم هەوڵیان دا لە ڕێگەی تیرۆرکردنی هێتلەرەوە نیازپاکیی خۆیان بۆ نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان بسەلمێنن، بەلآم پیلانەکە شکستی هێنا و هێتلەریش

دەرباز بوو. جا کاتێك نازییەکان له دەرخستنی نیازپاکی خۆیان بۆ ئەو کەسانه شکستیان هێنا کـه ڕۆزفلـت و چەرچـلیان ئاراسـته دەکـرد، بڕیاریان دا هێرش بکەنه سەر ڕووسیا، بۆ ئەوەی یەکەمجار شکست بـه ستالین بهێنن و دواتریش ڕوو له جەنگی بریتانیا و ئـەمریکا بکـەن. لـه ڕێکەوتی ٢٢ی حوزەیرانی سالّی ١٩٤١دا هێرشیان کرده سەر ڕووسـیا و هـەر لەگـەلّ هێرشـەکەدا چەرچـلّ و ڕۆزفلـت ڕاپانگەیانـد خۆیـان و حکوومەتـەکانیان بەوپـەڕی هێـز و توانـای خۆیـان دەبنـه پاڵپشـتی ستالین. چەرچلّ له گوتەیەکی زۆر کاریگەردا ڕایگەیاند دەست دەخاتـه نێـو دەسـتی شـەیتانیش ئەگـەر شـەیتان لـه لـەنێوبردنی فاشـیزمی ئەلّمانیدا پشتی بگرێ. هێتلەری به تۆپەلّێك درۆ و فێلّ وەسف دەکرد. بـەلاّم چەرچـلّ دەیزانـی هێتلـەر لەگـەلّ هـەموو هەلّـه و کەموکورتییەکانیشییەوە، کەسێکی نێونەتەوەیی نەبووە.

هەروەك پێشتریش گوتمـان ئـەو ڕاگەیاندنـەی پێشـتر لێـی دواین تـوانی گشـت گومـانێکی سـتالین لەهەنبـەر دلّسـۆزیی خۆرئاواییـەکان سـەبارەت بـه پرسـی دابەشـکردنی جیهـان بـۆ دووبـەش و دواتـریش بیرۆکەی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان خۆرهەلاّت و خۆرئاوا نەهێلّێ. دوای ئەمـه چەرچـلّ و ڕۆزفلـت یارمەتییـەکی بێسـنووریان پێشکەشـی ستالین کرد. پارەیەکی خەیالّییان لـه سـووخۆرانی جیهـانی قـەرزکرد و سووەکانیشـیان دا، دواتـریش قەرزەکـه و سووەکەشـیان خسـته سـەر هەژماری هاوولاّتییانی ئاسایی هـەردوو ولاّت، خـاوەن بانکـەکانیش زۆر بـه سـانایی ملیۆنـان دۆلاریـان لـەو ڕێککەوتنـەدا قـازانج دەکـرد. ئەمـه چـاوتێرییەك بـوو بـه گیرفـان و خـوێنی خـەلّك پیشـان درا، ڕێگەشـی

لەبەردەم هەرسێ پیاوە گەورەکە خۆشکرد لە تاران و یالتا و پۆتسدامدا درێژە بە کۆبوونەوە بەردەوامەکانیان بدەن.

ستالین لە تاراندا گەمەیەکی زۆر چەپەلانەی دەکرد. چوونکە روونبوویەوە هێشتاکە باوەڕی وەهایە نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان بەردەوام فێڵی لێ دەکەن. وەهاشی تێگەیاندبوون زۆر دژوارە باوەڕی پێ بهێندرێ و بەسەریدا زاڵبن. چەند داواکارییەکی زۆر توندوتیژ و دژواریشی خستە بەردەمیان و داوای سازشی زۆر نابەجێشی لێیان کرد. لە کاتی ئاخافتنەکەیدا گوتبووی بەهۆی ئەو داواکارییانەوە دڵسۆزی و نیازپاکیی ئەو پیاوانەی تاقی کردووەتەوە کە بە شارەزایی خۆی دەیانناسێت و دەزانێ هەر ئەوانن کودەتا و پیلانگێڕییە جیهانییەکە ئاراستە دەکەن. رۆزفلت هەموو داواکارییەکانی ستالینی بەجێ هێنابوو و گشت شتێکیشی پێ بەخشیبوو. چەرچلیش دوو بژاردەی خرابووە بەردەم، ئەوانیش: یان ڕەزامەندی دەربڕێ، یانیش یارمەتییە دارایی و پاڵپشتییە سەربازییەکەی سووخۆرانی جیهانی لەدەست دەدات.

دواتر کۆبوونەوەی یالتا بەڕێوەچوو، ستالین هەڵویستی خۆی گۆڕی. وەهای لە کەسە نێونەتەوەییەکانی خۆرئاوایی گەیاند سۆز و ڕەزامەندیی ئەویان وەدەستهێناوە. رۆڵی خانەخوێیەکی میسالییانەی گێڕا. ئەو کۆمێنترنەش ئەو دەستەیە بوو کە پیلانی بۆ شۆڕش و پشێوی و ئاشووبەکانی نێو وڵاتە جۆراوجۆرەکان دادەڕشت، ستالین و رۆزفلت و چەرچلێ ڕازیبوون دژی ئەڵمانیا بوەستنەوە. رۆزفلت ستالینی دڵنیا کردەوە لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ ئەڵمانیایەك وەها نامێنێتەوە ترس و نیگەرانی دروست بکات، دواتریش ئاشکرابوو

ڕۆزفلت بەبێ هیچ دادگەییکردنێك فەرمانی گوللەبارانکردنی ٥٠٠٠ ئەفسەری ئەڵمانی دەرکردووە، ڕۆژنامەگەریی ئاراستەکراویش بەردەوام لەسەر ژێی سیاسەتی لەنێوبردنی گەلی جوولەکە ئاوازی دەژەند.. بەڵام هەرگیز باسی سیاسەتی ڕۆزفلتی نەدەکرد کە ئامانجی ریشەکێشکردنی گەلی ئەڵمان بوو.

ستالین کۆمنترینی هەڵوەشاندەوە، ڕۆزفلتیش لەهەنبەر ناوبراودا چەند سازشێکی نوێی نواند، دەستی ستالینی لە بەرانبەر ٦٠٠ ملیۆن مرۆڤی دانیشتووی ئەورووپای خۆرهەڵاتدا ئاوەڵا کرد.

تەنیا خودی چەرچڵیش دەتوانێ ڕوونی بکاتەوە بۆچی لەگەڵ ڕۆزفلت دادەنیشت و گوێی لە پێشنیازەکانی ڕۆزفلت دەگرت بۆئەوەی لەپێناو ڕازیکردنی ماوتسی تۆنگدا هۆنگ کۆنگ بداتە چینی کۆمۆنیست.. چەرچڵ چۆن توانیویەتی وەك هاوڕێیەکی گیانی بە گیانی خۆی پیشانی سەرۆکی ئەمریکا بدات، لە کاتێکدا ئەوەی کۆتایی بەردەوام دەیگوت هەڵوەشاندنەوەی کۆمۆنویلسی بریتانی بۆ پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیی مرۆڤ پێویستە و هیتلەریش بیروباوەڕی پێچەوانەی ئەمە بوو.

بەڵام کەس نەیدەتوانی فێڵ لە ستالین بکات. چونکە لەگەڵ بەکرێگیراوانی سووخۆرە جیهانییەکاندا کاری دەکرد و ماوەیەکی زۆریش وابەستەیان بوو، تا وای لێهات وەك پەرتووکێکی کراوە دەیتوانی هزر و بۆچوونەکانیان بخوێنێتەوە، لە هەموو کەسێکی دیکەش باشتر دەیزانی تەنیا بۆ وەدیهێنانی هەڵپە و تەماپە ئیستعمارییەکانیان کۆمۆنیزمیان دروستکردووە، بۆیێ بڕیاری دا بەپێی گەمە تایبەتەکەی خۆیان گەمەیان لەگەڵ بکات. بەمشێوەیەش توانی

لە ناخرونۆخری جەنگدا سوپای هاوپەیمانان ناچار بکات چاوەڕێ بن تا سوپایەکەی بەرلین داگیر دەکات.

فەرمانێکی سەربازیی ستالین بۆ ئەفسەرانی سوپای سۆڤییەتی کە لە ڕێکەوتی ١٩ی شوباتی ساڵی ١٩٤٣دا دەرچووە، ڕاستیی ئەو بۆچوونەی سەرەوەمان دەسەلمێنێ، ناوبراو لە فەرمانەکەیدا گوتوویەتی:

لەوانەیە ئەو حکوومەتە بۆرژوازییانەی وڵاتانی خۆرئاوایی کە ئێمە هاوپەیمانیمان لەگەڵیاندا واژۆ کردووە، وابزانن تاکە ئەرکی ئێمە دەرپەڕاندنی نازییەکانە لە خاکی خۆماندا. بەڵام ئێمەی بەلشەفی و گشت بەلشەفییەکانی جیهانیش دەزانین ئەرکە سەرەکییەکەمان تەنیا دوای کۆتاییهاتنی قۆناغی دووەمی جەنگەکە دەستپێدەکات. دواتریش قۆناغی سێیەم دەستپێدەکات کە بۆ ئێمە قۆناغێکی گرنگ و یەکلاکەرەوەیە و قۆناغی ڕووخاندنی سەرمایەداریی جیهانییە: ئامانجی بەردەواممان شۆڕشێکی جیهانی و دەستهەڵاتی ڕەهای کرێکارانە. تەنیا لەبەر گەیشتن بە قۆناغی سێیەمیش چووینە نێو ئەو هاوپەیمانییەوە. کاتێکیش بزانین هاوپەیمانانمان دەبنە کۆسپی بەردەم ئامانجە بەرزەکانمان، لێیان جیا دەبینەوە.

ڕاستیی ستالین تەنیا لە دوای داگیرکردنی بەرلین و ئەڵمانیای خۆرهەڵات ئاشکرابوو. دوای ئەوە گشت بەڵێنەکانی خستە ژێر پێ. کۆی ئەو ڕووداوانەش لە ڕۆژنامەگەری شاردرانەوە، چونکە نە چەرچڵ و نە ڕۆزفلت دەیانویست گەل بزانێ چۆن ستالینی ڕابردوو دیار، ستالینی بانکبڕ و تاوانکاری ساختەچیی جیهانی لە خشتەی بردوون.

لەسەر نێونەتەوەییەکان پێویست بوو لەگەڵ کات خۆیان بگونجێنن. هەروەها دڵنیاش بوونەوە لەوەی ئەگەر ستالین و ماوتسی تۆنگ هەوڵەکانیان یەکبخەن، دەتوانن وەك هێرشی کوولله و پەتای تاعوون سەرانسەری ئەورووپا بخەنە ژێر دەستی خۆیان. دواتر تێفکرین کە ستالین کەوتووتە نێو ساڵەوە و لە قۆناغی پیریدایە. پێیان باشتر بوو خۆیان لەگەڵی بگونجێنن و بیکەنە دۆستی خۆیان نەك مل لەبەر ملی بنێن و تووڕەی بکەن و کودەتا شەیتانییەکەیان ئاشکرا بێت.

سەرمایەدارانی خۆرئاوایی بە چاوی گرنگیدان و مکوڕبوونەوە دەیانڕوانییە بەرەنگاری و گرفتە بەرچاوەکانی ستالین، وەلێ هیچیشیان لەدەست نەدەهات. کارتێکی گرنگیان لەدەست بوو. جا پێش ئەوەی کارتەکە ڕابکێشن و گەمەی پێ بکەن، چەند ڕێنماییەکیان بۆ ڕۆزفلت دەرکرد بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ستالین بگەڕێنێتەوە نێو ڕیزی خۆیانەوە. ڕۆزفلت ستالینی لە خۆرهەلاتی دوور سەرپشك کرد و هەموو داواکاری و خواستەکانی هێنایەدی، بەو مەرجەی لەگەڵ سەرمایەدارانی خۆرئاوادا ڕووی خۆش پیشان بدات و لەگەڵیان بگونجێ. ڕۆژنامەگەریی ئاراستەکراویش جەختی لەوە کردەوە ڕۆزفلت ستالینی لە خۆرهەلاتی دوور سەرپشك کردووە، چونکە ڕاوێژکارە سەربازییەکانی- وەك پێشتر لێی دواین- پێیان گوتبوو ناکرێ دوای تەسلیمبوونی ئەڵمانیا لە جەنگێکی بێ ئامان، مل بە یابان کەچ بکرێ. ئەو درۆیە هێندە بێمانابوو بەشێوەیەك ژەنەڕاڵ ماك ئارسەر ناچار نەبوو ڕاستەوخۆ درۆ بکات، ژەنەڕاڵە ئەمریکییەکانیش دەیانزانی یابان زۆر بەر لە دۆخەکە داوای دانوستانی ئاشتی دەکات.

ڕووداوی جیابوونەوەی تیتۆ لە ستالین لە دوای جەنگدا، ئەوە دەسەلمێنێ ستالین لە جێبەجێکردنی بەرنامە ئیستعمارییەکەی خۆیدا بەردەوام بووە. تیتۆ بەردەوام ملکەچی سووخۆرانی نێودەوڵەتی بوو، چوونکە بەردەوام پارەیان پێ دەدا بۆ ئەوەی لە ئەورووپای نێوەڕاستدا پێگەی خۆی بپارێزێ. کوڕەکەی چەرچڵ چەندان جار لە ناوچەکانی ژێر دەستەلاتی تیتۆ سەرکێشی بە ژیانی خۆی کرد و خۆی خستە مەترسییەوە و بە پەڕەشووت خۆی هەڵدەدا بۆ ئەوەی لەجیات ولاتانی خۆرئاوایی لەگەڵی بکەوێتە گفتوگووە.

لە کۆتاییدا ستالین مرد یان بە واتایەکی دیکە لەنێوبرا، بەکرێگیراوی نێونەتەوەییەکانیش لە مۆسکۆ لەگەڵ مردنی ستالیندا دەستی خۆیان وەشاند. بەمشێوەیە خۆیان لەو سەرکردانەی سەر بە ستالین دەربازکرد کە ناوبراو متمانەیەکی زۆری پێیان هەبوو. کوڕەکەی ستالینیش بەتەواوی بزر بوو بەبێ ئەوەی کەس سەروسۆراغی بزانێ.

لەپێناو ڕاپەڕاندن و شاردنەوەی ڕووداوەکانی نێو ڕووسیا، ڕێکەوتنێك کرا بۆ ئەوەی لەدوای ستالین مالینکۆف بەشێوەیەکی کاتی دەستەلات بگرێتە دەست. مالینکۆف فەرمانی ستایشکردنی ستالینی دا و لە نێو خەلکدا وەك کەسێکی شکۆدار لەبارەیەوە دەدوان، بەلام هێندەی نەبرد نەخشە و پیلانەکانی خۆی گۆڕی. دیسانەوە پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سەرۆکی چین نوێکردەوە و هەولی دا لەمەدا ڕەزامەندیی گەلی ڕووسی وەدەستبێنێ و پاڵپشتیی لە پێشخستنی گیانی نەتەوەیی دەکرد. بەم کردارەی بڕیاری لەسەر چارەنووسی خۆی دا.

نێونەتەوەییەکانی خۆرئاوا داوای پرچەککردنەوەی ئەڵمانیایان کرد. بەلاّم فرەنسا دژی ئەو داواکارییە وەستایەوە. رێبەرانی پیلانگێرییەکە مەندیسی فرانسیان گەیاندە دەستهەلاّت و هەر لە پۆستەکەی خۆی هێشتیانەوە تاکو گشت داواکاری و خواستەکانی ئەوانی بەجێهێنا و سەبارەت بە دووبارە پرچەککردنەوەی ئەڵمانیا، ڕەزامەندیی فرەنسایان وەدەستهێنا. دوای ئەوەی مەندیس فرانس ئەرکەکەی خۆی بەتەواوی بەجێگەیاند، چارەنووسی وەك زۆرێك لە کەسانی پێش خۆی بوو: پشتگوێ خرا و لەبیرکرا.

هەڵویستی هەنبەر خۆرهەلاّتی دوور، ئالۆز و تێکچڕژاو بوو، بەلاّم تێگەیشتنی دژوار نییە. نێونەتەوەییەکانی خۆرئاوا چۆن هاورێیان لە یەکییەتیی سۆڤییەتدا هەبوو، لە چینیش بەهەمان شێوە بوو، بەلاّم ناکرێ ماوتسی تۆنگ بە یەکێك لەو هاورێیانە دابندرێ. ماوتسی تۆنگ و ستالین ڕا و بۆچوونیان لەهەنبەر نێونەتەوەیییە خۆرئاواییەکاندا چوون یەك بوو. بەلاّم دەستهەلاّتدارانی خۆرهەلاّتی و خۆرئاوایی یەك ئامانجی هاوبەش کۆی دەکردنەوە، ئەویش پاکتاوکردن و لەنێوبردنی چیانگ کای چیك بوو.

سەرمایەدارانی خۆرئاوایی لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی یاباندا هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنیان دژ بە چیانگ کای چیك بەڕێوەبرد، ئەم هەوڵەیان دوو ئامانجی هەبوو. دەیانەویست بۆ ماوتسی تۆنگی بسەلمێنن پێکەوەژیانی ئاشتیینەی نێوانیان شتێکی کردەییە، لە هەمان کاتیشدا دەیانویست خۆیان لە بەلای ڕێبەرە نیشتمانییەکە دەرباز بکەن، ڕۆژنامەگەری حکوومەتی نیشتمانی، چینی بە گەندەڵی و سەرکردە نیشتمانییە سەربازییەکانیشی بە خۆگنخاندن و

خاوخلیسکی و ڕێکنەخستنی هێزە چەکدارەکان تۆمەتبار کرد، هەروەها سەربازە نیشتمانییەکانیشی بە کردنی تاوانی دزی و تالأنی و دەستدرێژیی ئاشکرا تۆمەتبارکرد. ڕاستییەکەی زۆربەی ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی نیشتمانییەکان کرابوون ڕاست بوون.

گەندەڵیی نێو ڕیزی کەسانی سەر بە حکوومەتی نیشتمانی بیانوویەك بوو تاکو پاساو بۆ ددانپێدانانی حکوومەتی بریتانی بە سستمی کۆمۆنیستی بهێننەوە. ئەو پاساوە لەلایەن هەندێك ڕاوێژکاری حکوومەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان بۆ سەندنەوەی متمانە و پاڵپشتی لە چیانگ کای چیك بەکار هات. کاتێك گەندەڵییەکانی حکوومەتی نیشتمانیی چین خرایە بەر چاوی خەڵك و ڕای گشتی، ڕۆژنامەگەری ئەرکی شاردنەوەی ئەو ڕاستییەی لە جەماوەر گرتە ئەستۆ و وەهایان بڵاو دەکردەوە ئەو کەسە فەرمییانەی بە ڕەفتارە خراپەکانیان ناوبانگی حکوومەتی چینیان لەکەدارکرد، زۆربەیان سەر بە شانە نووستووەکانی کۆمۆنیستەکان بوون کە دەزیان پێکرابووە نێو حکوومەتی نیشتمانی بۆ ئەوەی وەك خۆرە لەناوەوە بیڕزێننەوە. ئەو ڕا و بۆچوونەش ڕاستییەك پاڵپشتیی لێ دەکات کە زۆرێك لەو کەسە ڕەسمییانەی بەهۆی گەندەڵییەکانیانەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەی توند کرانەوە، دواتر سیستمی کۆمۆنیستی بە باوەشی ئاوەڵاوە چووە پێشوازییان و پۆست و پێگەی گرنگیان وەرگرت. ئەم قسانە لیزلی ملین لە کۆرنتۆ پشتڕاستیان دەکاتەوە کاتێك وەك نێردەیەکی مژدەهێن (التبشیري) لەو کاتیدا لە چین بووە بەرگوێی کەوتوون.

ڕەوتی ڕووداوە جیهانییەکانی دوای ساڵی ١٩٤٦ بەڵگەی ئەوەن ڕووسیا تا وادەی مردنی ستالین چەکی ئەتۆمی نەبووە ، چونکە ئەگەر

چەکێکی وەهای هەبووایە سێ و دووی لە بۆمبابارانکردنی شارە گەورەکانی کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتووەکان نەدەکرد.

چەرچڵ ئەو ئەرکانەی بەتەواوی بەجێگەیاند کە لەلایەن خاوەن بانکە جیهانییەکانەوە خرابوونە سەر شانی. بەڵام چەرچڵ بەنێو ساڵدا چوو و کەوتە قۆناغی پیرییەوە و بووە بارێکی گران. ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو فڕێ بدرێتە کونجی پشتگوێخستن و لەبیرکردن. بەڵام ڕۆژنامەگەری و پڕوپاگەندەکان کەسییەتیی چەرچڵیان بنیاد نابوو و لە چاوی خۆرئاواییەکاندا وەك پیاوێکی مەزن لێی دەنواڕدرا. هەروەها پاڵەوانی نەتەوەیی گەلی بریتانیش بوو و بە هەڵمەتی ناوزڕاندن و ئابڕووبردن لەنێو نەدەبرا. هەروەها نەشیان دەتوانی بە ئاسانی لە پێگە و شوێنەکەی خۆی دەربپەڕێنن. پیلانگێڕان بەوپەڕی چەپەڵییەوە نیازەکانی خۆیان شاردەوە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی بە ستایش و شکۆدارکردنێکی بێ وێنە بیبەنە کەشکەڵانی فەلەك. جا لە هەشتایەمین ساڵیادی تەمەنیدا دیاری و ڕێزلێنانیان بەسەریدا باراند. هەروەها خەڵکی ڕەشۆکیان تێگەیاند چەرچڵ لە جیهاندا هیچ دوژمنێکی نییە.

ڕووداوەکان ئاماژە بەوە دەکەن ڕێبەرە کۆمۆنیستەکان و نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان هاوڕابوون لەوەی چەرچڵ کۆسپی سەر ڕێگەی وەدیهاتنی خواست و تەمایە نهێنییەکانیانە، سەرکردە کۆمۆنیستەکان بڕیاریان دا ئەنۆرین بیڤان بۆ ملشکاندن و خلیسکپێبردنی چەرچڵ بەکاربێنن. کاتێك ماوتسی تۆنگی دکتاتۆری چین لە ساڵی ١٩٥٤دا پێشوازیی لە ئەتلی وبیڤان کرد و خوانێکی شاهانەی بۆ ڕێکخستن، کۆمۆنیستەکان لە سەرانسەری جیهاندا

هەواڵەکەیان بڵاوکردەوە. ڕۆژنامەگەریی جیهانیش وێنەی ئەوان و خوانە مەزنەکەی بڵاوکردەوە.

بۆ کەسێك کۆمۆنیست نەبێت زۆر زەحمەتە لە ئاماژەکانی ئەو وێنانە تێبگات. ئەتلی لە وێنەکەدا لە سەرەوەی مێزەکە دانیشتبوو. بەڵام بێڤان وەها دەهاتە بەرچاو لەلای خوارەوە و نزیك دەرگە دانیشتبوو. بۆچوونی گشتی ئەوە بوو ئەتلی میوانی شەرەف بوو و بێڤانیش لەلای کۆمۆنیستەکانی چین و ڕووسدا کەسێکی هێندە گرنگ نەبووە، بەمشێوەیە مەسەلەکە بۆ ڕای گشتی ئاڵۆزیی تێکەوت. چونکە خوو و نەریت وابوو میوان لە نزیك دەرگە دادەنیشێندرا.

کاتێك مرۆڤ چاو بە ڕووداوە زانراو و تۆمارکراوەکاندا دەگێڕێتەوە دەتوانێ بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێشبینیی ڕوودانی چەند ڕووداوێکی ئاییندە بکات، ئەوانیش:

یەکەم: کۆمۆنیستەکان ئەنۆرین بێڤان بەکاردێنن -جا ناوبراو بەمە زانێت یان نا- بۆ ئەوەی لە ڕێگەی هێرشکردنە سەر سیاسەتی دەرەوەی لە ئەنجوومەنی گشتیدا، چەرچڵ لە دەستهەڵات لابدەن.

دووەم: نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکانیش هەڵمەت و هێرشەکانی بێڤان بۆ سەر چەرچڵ لەپێناو دەرکردنی بێڤان لە پارتی کرێکاران و پەرلەمان بەکاردێنن. لە هەمان کاتیشدا گومان دەخەنە نێو مێشکی خەڵك و جەماوەر کە چەرچڵ بەو تەمەنە پیرەوە نەتوانێ دانوستانە نهێنییە زۆر گرنگەکان بەڕێوەببات، بەمەش ناوبراو لەکۆڵ خۆیان دەکەنەوە. ڕێگەشی تێدەچێ نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان بەپێی پێویست پەردە لەسەر ڕووداوە نهێنییە دیبلۆماسییەکان دابماڵن بۆئەوەی پاساو بۆ هێرش و هەڵمەتی نەیارەکان بهێننەوە. ئەوسا

ئەگەر لەو کاتیدا چەرچڵ جوامێرانە و ئازایانە واز لە کورسییەکەی نەهێنێ، دەکەوێتە بەر مەترسیی ئاشکرابوونی ئەو ڕووداوانەی بەنهێنی و لەپشتی پەردەوە لە گفتوگۆیەکانی تاران و یالتا و بۆتسدامدا ڕوویان دابوو.

سێیەم: دەتوانین زۆر بە سانایی پێشبینی بکەین هەر کاتێ چەرچڵ هەست بە گوشارەکە بکات دەست لەکار دەکێشێتەوە، لە هەمان کاتیشدا دەتوانین پێشبینی بکەین بیڤان ناکشێتەوە و ناخلیسکێ. بە نیمچە دڵنیاییەکیشەوە دەتوانین بڵێین ئەتلی و ویدکن واز لە پارتی کرێکاران دەهێنن یانیش لەلایەن پارتەکەوە وەدەر دەنرێن و بیڤانیش بۆ بەڕێوەبردنی هەڵمەتی هەڵبژاردنە گشتییەکان کەوا سێر ئەنتۆنی ئیدن دوای جێگرتنەوەی چەرچڵ داوای دەکات، سەرکردایەتیی پارتەکە دەگرێتە دەست.

چوارەم: کوڕەکەی ڕۆزفڵت چەند وردە ئاماژەیەکی سەبارەت بە واقیعی خۆ گونجاندنی ناچارانەی چەرچڵ لەگەڵ سیاسەتەکانی ڕۆزفڵت و ڕاگەیاندنی هاوڕێیەتییە ڕووکەشەکەی باوکی لەهەمبەر سەرۆکی ئەمریکا کردووە. گەرچی سەرۆکی ئەمریکا بەوپەڕی قسە ڕەقییەوە ڕایگەیاند حەزی لە هەڵوەشاندنەوەی کۆمۆنوێلسی بریتانییە، بەڵام ڕۆزفڵت ناچار بووە خۆی وەك هاوڕێییەکی گیانی بەگیانی پیشان بدات، ئەمەیش ڕاستییەکە و ئەو ڕێبازە ڕوون دەکاتەوە کە نێونەتەوەییە خۆرئاواییەکان لەپێناو پیاوێکدا دەیگرنەبەر کە زۆر کەس بە پیاوێکی مەزنی نێو سیاسەتی بریتانیای دەزانن.

ئەو خاڵەی دەبێ وەبیر بهێندرێتەوە ئەوەیە نێونەتەوەییە نازییەکان لە گۆڕەپانی گەمەکە دوورخراونەتەوە، ئێستە دوو کۆمەڵە

خەڵك ماونەتەوە و هەردوولایان هەوڵی كۆنترۆڵكردنی جیهانیان خستووەتە گەڕ، ئەوانیش: دیكتاتۆرە كۆمۆنیستەكانی ڕووسیا و چین، سەرمایەداران یان نێونەتەوەییە خۆرئاواییەكانن.

جا مادام هەردوو كۆمەڵە ڕازین بەشێوەیەكی ئاشتییانە پێكەوە بژین و جیهان لەنێوان خۆیاندا دابەش بكەن، جۆرە ئاشتییەكی دژواری لەرزۆك دێتە كایەوە.بۆ ئەوەی ئەگەر سەركردەی یەكێك لەو دوو لایەنە بڕیاری دا بیردۆزی پێكەوەژیانی ئاشتییانە هێندە سست و لاواز بووە ئیدی ناتوانێ وەڵامگۆی پێداویستییەكان و سیستمە نوێیەكان بێت، تاكە جێگرەوە و ئەلتەرناتیڤێكی ئەو ئاشتییە جەنگ بێت.

ئەگەر كۆمۆنیستانی خۆرئاوایی لە هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانیدا دەستپێشخەر بن، ئەوا جەنگەكە بەبێ هیچ هۆشدارییەكی پێشوەختە هەڵدەگیرسێ. لە گشت وڵاتانی سەرمایەداریدا داوای مانگرتنێكی گشتیی جیهانی دەكرێ. ئەو كردارەش دەتوانێ ئەو ئیفلیجییە گشتییە بێنێتە كایەوە كە پێشتر ئاماژەمان پێی دا. هەروەها فڕۆكەی كۆمۆنیستەكان دەست بە بۆمبابارانكردنی مەڵبەندە پیشەسازییەكان دەكەن بۆ ئەوەی دەست لە هێزە شاراوەكەی ویلایەتە یەككگرتووەكان و كەنەدا بوەشێنن و لەپێناو زوو خۆ ڕادەستكردن و ملكەچی، زۆرترین كەس لەنێوببەن. لەوانەشە بریتانیا هەمان ڕەفتاری لەگەڵ بكرێ. ڕێشی تێدەچێ غازی ئەعساب لەو ناوچانە بەكاربهێندرێ كە دوژمن نایەوێ وێرانیان بكات. هەروەها هێزەكانی سۆڤییەت ناوچە كانادییەكانی باكووری كەنەدا دەخەنە ژێر دەستی خۆیان. ناوچە داگیركراوەكانیش وەك بنكەی كردەكان لە

بەشە باشووریيەكاندا بەكاردێنێ. مانگرتنی گشتیش جوولەی سەر بەندەر و كەناراوەكانی جیهان پەك دەخات، ئەمەیش دەبێتە هۆی برانی یارمەتی و گەیاندنی كۆمەك بە بریتانیا. هەروەها ژێرئاوكەرە سۆڤییەتییەكان هەر كون و كەللەبەرێك دەگرن كە ببێتە هۆی دزەكردنی یارمەتییەكان. ئەوسا گەلی بریتانی بەدەست برسییەتییەكی كوشندەوە دەناڵێنن و دوای چوار هەفتە لە دەستپێكردنی كردەكانی نێو دەریا، خۆی رادەستی داگیركەران دەكات. هەروەها كەسانی نێو شانە نووستووەكانی كۆمۆنیستی لە ولاَتانی خۆرئاواییدا ماوەیەكی كەم بەر لە بۆمبابارانكردنی شارەكان، دەبرێنە دەرەوە و سوپایە نهێنییەكانیش دەگەرێنەوە و ئەو خاكانە داگیر دەكەن كە دەستیان لێ وەشێندراوە و بۆمباباران كراون. هەروەها تابووری كۆمۆنیستی هەموو ئەو كەسانە لەنێو دەبات كە ناویان لە لیستی رەشدا هاتووە. بەمشێوەیە سەركردە نێونەتەوەییەكانی خۆرئاوایی بەكاتێكی زۆر كورتتر لەو كاتەی ركابەرە نازییەكانیان لە دادگەی نۆرمبێرگدا لەنێو برد، تارومار دەكرێن.

لە بەرانبەریشدا ئەگەر سەركردە و رێبەرانی نەخشە و پیلانگێرییەكە گەیشتنە ئەو باوەرەی هێرشی كۆمۆنیستەكان بۆ سەریان لە ئان و ساتی خۆیدا نزیك بووەتەوە، ئەوا حكوومەتە دیموكراسییەكانی جیهانی خۆرئاوایی ناچار دەكەن جەنگی سێیەمی جیهانی بەرێوەببەن، ئەمەیش دەرفەتی یەكەم دەستوەشاندنیان بۆ دەرەخسێنێ. بە پێشەكییەكی راگەیاندن و رۆژنامەوانییەوە و بە ترساندنی خەلك لەهەنبەر مەترسییەكانی كۆمۆنیستی، زەمینەی هەلگیرساندنی جەنگەكە خۆش دەكرێ. هەروەها جەخت لەسەر

مەترسیی هەنبەر مەسیحییەتیش دەکەنەوە. ئەیتەیستە مادییەکانیش ئەوانەی بەشێوەیەکی ئابوورییانە کۆنترۆڵی جیهانیان کردووە، دەچنە نێو جەنگی پیرۆزی خاچپەرستییەوە. بەڵگە و پاساو بۆ هێرشە ئەتۆمییەکانی سەر ڕووسیا و چینیش دەهێننەوە هەروەك چۆن چەرچل بۆ هێرشکردنە سەر ئەڵمانیا بیانووی هێنایەوە. دواتریش دەڵێن ئەمە بۆ ڕزگارکردنی شارستانییەکەمان زۆر پێویست بوو. بەلام با فێڵ لە خۆمان نەکەین، بەبێ ڕەچاوکردنی شێوازی زەمینەسازی هەلگیرساندنی جەنگ، ئەگەر جەنگی سێیەمی جیهانی هەڵبگیرسێ ئەوا جەنگی بڕیاردانە لەسەر ئەوەی ئاخۆ کۆمۆنیزم حوکمڕانیی جیهان دەگرێتە دەست، یانیش سەرمایەدارانی خۆرئاوایی لە کۆنترۆڵکردنی جیهان بەردەوام دەبن.

هەروەها ئەگەر جەنگی سێیەمی جیهانی هەڵبگیرسێت، وێرانکارییەکەی هێندە سەرانسەری دەبێت کە نێونەتەوەییەکان بەردەوام پاساو بۆ باوەڕ و بۆچوونی خۆیان دەهێننەوە و دەڵێن تەنیا بە حکومەتێکی دیاریکراو و هێزی پۆلیسی جیهانییەوە دەتواندرێ حوکمڕانیی جیهان بەڕێوەببرێ. ئەوساکە بەبێ ئەوەی پەنا ببرێتە بەر جەنگێکی دیکە، گرفتە هەمەجۆرەکانی نیشتمانی و جیهانی چارەسەر دەبن. ئەو بەڵگە و پاساوەش بە لۆژیکی و بەجێ دێتەبەرچاو ئەگەر چاو لەو واقیعە بپۆشین کە ڕێبەرە کۆمۆنیستەکانی خۆرهەلات و ڕێبەرە سەرمایەدارەکانی خۆرئاوا لە کۆتاییدا دەیانەوێ هێزە تایبەتەکانیان بخەنە واری کردارییەوە و دەستهەلاتێکی دکتاتۆریانەی بەزەبروزەنگی ئەیتەیستی دامەزرێنن.

ئەوانەی دەخوازن بە ئازادانە بمێننەوە دەبێ یەك پلانی كار بگرنەبەر. دەبێ دژ بە كۆمپانیا و قۆرغكردنە بەكۆمەڵەكان هانی دەستپێشخەرییە تاكەكەسییەكان بدەن و پاڵپشتی ئەو كەسانە بن كە داوای ئابوورییەكی نوێی دژ بە ئاراستەی بەردەوامبوونی ئابوورییەكە كۆنەكە دەكەن.

ئەگەر دەمانەوێ نەوەكانی داهاتوو لەو چارەنووسە شوومە دەرباز بكەین كەوا لەلایەن هێزە شەڕخوازەكانەوە بۆیان ئامادە كراوە: دەبێ دەستوبرد هەوڵی خۆمان بخەینە گەڕ.. كاتمان نییە بە فیڕۆی بدەین. لەوانەیە خوێنەر بپرسێ: باشە چیمان لەدەست دێ و چی بكەین باشە؟

ئەمە پرسیارێكی زۆر بە جێیە. خۆ ئەگەر وەڵامی ئەو پرسیارە ئامادە نەبووایە هیچ پاساوێكم بۆ نووسینی ئەم پەرتووكە نەدەبوو. خەڵكانێكی زۆر كاتەكانی خۆیان لە پرسیاری وەك ئەمە چییە و بۆچی بەسەر دەبەن. دژی فلان و فیسارن. بەڵام ئەو نووسەرانە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن كە نەفرەت دادەبارێننە سەر بیرۆكە و رێكخراو و بزووتنەوەیەك و لە هەمان كاتیشدا چارەسەری كرداریی گرفتەكان دەخەنە روو و چەند پێشنیازێك بۆ لە رەگەوە دەركێشانی شەڕخوازی دەخەنە بەر دەست.

یەكەم: وەك تاك لەسەرمان پێویستی ئاشنای ئەو مەسەلە رووحییانە بین كە پێوەندییان بە پرسەكەوە هەیە. چەندان پەرتووك هەن، بە پەرتووكە پیرۆزەكانیشەوە رێگەی وەدیهێنانی ئەو ئامانجەمان پێ نیشان دەدەن.

دووەم: دەبێ چەند هەنگاوێکی کردارییانە هەڵێنین و ئەو هۆکارە دەستوورییانە بەکاربێنین کە دەتوانن لە ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمۆنیزمی جیهانی و سەرمایەداری و ئەو باوەڕە ڕووخێنەرانە یارمەتیدەرمان بن کە هەوڵی وێرانکردنی دەستەلاتی مەسیحییانەی ڕاستەقینە دەدەن، ئەمەیش بەم هەنگاوانەی خوارەوە مەیسەر دەبێت:

**–داواکردنی ریفۆرمی ئابووری:** لەبەرئەوەی خۆپەرستی و هەڵپە و تەماع و حەزی وەدیهێنانی دەستەلات بنەڕەتی گشت هەستێکن، زۆر بەجێیە هەندێك ڕێکاری دەستووری بگیرێنە بەر بۆ ئەوەی ڕێگە لە بەفیڕۆچوونی سامان و هەوڵی هەژموونگەرایی گرووپە ئەیتەیستە مادییەکان بگرین کە بە پلەی یەکەم لە حکوومەتی گەلانیان زەوتکردووە. جا لەبەرئەوەی ئەمە ڕاستییەکی بێ چەندو چۆنە، مافی گشت هاوولاتییەکی ئاساییە –ئەوانەی باج دەدەن– داوا لە حکوومەتە هەڵبژێردراوەکانیان بکەن قەرەبووی ئەو هەڵە و کەموکورتییانە بکەنەوە کەوا پیلانگێڕان و سەرمایەداران لە ڕێگەی حکوومەتەکانەوە لەهەنبەریاندا کردوویانە، ئەمەیش بە دانانی ئاستێك دەبێت بۆ دانانی سووخۆری و گەڕاندنەوەی ئەو پارەو پووڵە زەبەلاحەی بازرگانانی چەك و جەنگەکان وەك سووی سەر قەرزە کانیان لە ولاتە قەرزارەکان وەری دەگرن، دەبێ ئەو پارە زۆرەش بگەڕێندرێتەوە خەزێنەی گەل، خۆ ئەگەر ئەو ئامۆژگارییە لە گوێ گیرا، ئەوا کرێکاران ئەو دیموکراسییە ڕاستینە وەدەستدێنن و هیچ پاساوێکیش بۆ دەستەلاتدارانی کۆمۆنیستیی نێو ڕووسیاو چین نامێنێتەوە لەژێر پەردەی دوژمنایەتیکردنی سەرمایەداریدا نیاز و هەڵپە ئیستعمارییەکانیان بشارنەوە.

- كـۆنترۆڵكردنی دراو: دەبـێ دەنگـدەران بـەردەوام لەسـەر دەركردن و لەچاپدانی بـەرزەفتكردنی دراو سووربن، دواتـریش دەبێ بدرێتە دەست حكوومەتەكان، چونكە هەر ئەوان خاوەن مافی یەكەمن. لێرەدا مەبەستمان لە حكوومەتەكان دەستهەڵاتی بـاڵای جێبـەجێكاری هەڵبـژێردراوە كـە بـەهۆی توانـا و شـارەزاییەكانیان لـە بـەڕێوەبردن و راپەڕاندنی كاروبارەكـانی گـەل بەشێوەیەكی كـارا و كرداری، لەلایـەن دەنگدەرانەوە هەڵبژێردراون و لەسەر بنەمای دادپەروەری و چاكەكاری بڕیارەكانی خۆیان دەردەكەن.

-سزادان: لەسەر دەنگدەران پێویستە لەهەنبەر ئەو كەسانەی بە گەندەڵی و بەرتیل خواردن تۆمەتبار كراون، داوای توندترین سزا بكەن، چونكە ئەم دوو هۆكارە سەرەكییە بـەكرێگیراوانی گشـت رێكخراوەكـان بەكاردەهێنـدرێن بـۆ ئـەوەی خـەڵكی دیكـە ناچـارین فـەرمان و داواكارییـەكانیان جێبـەجێ بكـەن. هـەروەها دەبـێ راوەدووی گشـت رێكخراوە تێكدەرەكان بنرێ و ئەندامانی سەر بەو جۆرە رێكخراوانـەش بە پێشێلكاری یاسا لە قەڵەم بـدرێن و توندترین سـزایان بـۆ دەربچـێ. ئەوانەی بـۆ لابـردن و رووخانـدنی رژێمـەكان داوای بـەكارهێنانی هێـز و توندوتیژی دەكەن، لەپێناو زەوتكردنی پارە وسامان و وەدەستهێنانی هـەژموونی خۆیانـە، بـۆ ئـەوەی بـە ئاسـانترین شـێوە و بـەبێ ئـەوەی خۆیان ئەركەكە بگرنە ئەستۆ، بگەنـە ئامانجـە نەگریسـەكانی خۆیـان. لەسەر ئەم بنەمایەوە دەبێ سزایان كاری تاقەتپڕووكێن و خزمەتكردنی گشتی بێت. هەروەها دەبێ كاتژمێرەكانی كاركردنیـان بـە رێـژەی ٢٥٪ لە كاتی رەسمی زیاتر بێت و كرێ و دەستهەقیشیان بە رێژەی ٢٥٪ لـە

ڕێژەی ڕەسمی کەمتر بێت. هەروەها دەبێ ماوەی خزمەتکردنەکەیان پشت بە باشتربوونی هەڵوێستە نەرێیەکەیان.

- **جەنگە پیرۆزەکان:** لەسەر مەسیحییەکانی سەر بە گشت ڕێباز و مەزهەبەکان پێویستە ئاستێك بۆ دەمارگیری و بەدحاڵی بوون دابنێن. ئەو ماڵەی درزی تێکەوتبێ بێگومان ڕۆژێك دادێ دەڕووخێ. هەروەها دەبێ جەنگە پیرۆزەکان لەسەر بنەمای ئامانجی ڕۆشنبیرکردنی گەل و ئاشناکردنی بەو هۆکارانە بێت کە نەیاران گرتوویانەتە بەر. هەروەها دەبێ گرنگییەکی تایبەت بە گەنجانی نەتەوەکەمان بدەین و لە کاریگەریی تێکدەران و بەکرێگیراوی پیلانگێڕەکان بەدووریان بخەینەوە. هەروەها دەبێ ئەو کەسانەی لەسەر ئەو جەنگە پیرۆزە ڕادەهێندرێن و مەشقیان پێ دەکرێ، هەڵوێستیان لەهەنبەر کەسانێکدا ئەرێیی بێت کە پێوەندییان لەگەڵ ڕێکخراوە تێکدەرەکاندا هەبووە، جا ئەگەر پێوەندییەکە بە ویستی خۆیان بووبێت یان بەهۆی نەزانییەوە تێکەوتبن، چونکە بێزراندن و نەفرەت ڕیزەکانی خەڵك هەڵدەوەشێنێتەوە و زیاتر لە جڤاك دووریان دەخاتەوە.

خۆ ئەگەر کەسی باوەڕدار متمانەی خەڵکی وەدەستهێنا، دەتوانێ بۆیان ڕاڤە بکات کە چۆن ڕێبەری بیروباوەڕە توندڕۆیەکان و پیلانگێڕەکان تەنیا خەڵك دەکەنە گەمەی نێو سیناریۆیە گڵاوەکانیان. کاتێکیش خەڵك تێدەگەن ڕیبەرانی ئەو بزووتنەوانە خەڵك لەپێناو مەرامەکانی خۆیاندا بەکاردێنن و کە نیشیان پێیان نەما بەتەواوی پشتگوێیان دەخەن، ئەوا چاوێك بە هەڵویست و ڕەفتارەکانی خۆیدا دەگێڕێتەوە. بەهۆی کاری ئەدەبی و هزریی تایبەت بە مەسەلەکە و

دوای دروستکردنی گومان لە ئەقڵیاندا، دەکرێ باوەڕیان پێ بهێنین.
جا وەك ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکەش پەڕتووکی ( جیهان گەمەی دەستی ئیسرائیلە) لە چاپ درا.

-دانوستانە سیاسییەکان: لەبەرئەوەی بەکرێگیراوانی کودەتایە جیهانییەکە تەنیا لەپشت پەردەوە و لەپشت حکوومەتەکانەوە خەریکی هەڵڕشتنی ژەهر و بەڕێوەبردنی کاری خراپن و بۆ وەدیهێنانی پیلانە نهێنییەکانیان تەنیا بە نهێنی کۆبوونەوەکانی خۆیان بەڕێوە دەبەن، نابێ لە هیچ هەلومەرجێکدا ڕێگەیان پێ بدرێ بە نهێنی کۆبوونەوەکانی خۆیان بەڕێوەببەن، خۆ ئەگەر حکوومەتەکە هی گەل بێت و لە گەلەوە هەڵبژێردرابێت، ئەوا گەل مافی هەیە بزانێ لە کۆبوونەوەکاندا چی دەگوزرێ و چ شتێکیش خراوەتە بەرباس.

نەتەوە یەکگرتووەکان تەنیا ئەسپی تەراوادەی پیلانگێڕانی جیهانییە و سەری ڕمی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی جیهانییە. زۆربەی دەقی پەیماننامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەلایەن ئەلجبر هیسی بەکرێگیراوی سیخوڕیی سۆڤییەتییەوە نووسراوە. هەروەها سەرە ڕمی هێزی پاراستنی ئاسایشی جیهانی بووە ( ئەمینداری گشتی ئەنجوومەنی ئاسایش بەردەوام لەلایەن کۆمۆنیستە ڕووسییەکانەوە دانراوە) بریتین لە سۆبیلۆف ١٩٤٦-١٩٤٩، کۆنستانتین زینشتنکۆ ١٩٥٠-١٩٥٣، ئیلیا چیریچێف ١٩٥٣-١٩٥٧، دوبرینین ١٩٥٧-١٩٦٠، جیورجی ئەرکادیف ١٩٦٠-١٩٦٢، یۆجینی کیسیلیف ١٩٦٢ ( لە پۆستی جێگری گشتیی ڕۆشنبیری لە یونسکۆ) ڤلادیمێر مارلۆفسکس ١٩٦٢( پۆستی سەرۆکی بەشی فێرکردنی ناوەندی لە یونسکۆ) بەڕێز ( ئەی- جیڤالۆڤا) دوو کەسی کۆمۆنیستی ڕووسین . سەرۆك و جێگری

سەرۆك و نۆ دادوەر لە دادگەی دادی نێودەوڵەتی کۆمۆنیستن. ئەم ڕاستییانە و چەندان ڕاستیی دیکە دەبێ بخرێنە بەرچاوی خەڵك وئاشکرا بن.

**-قاچاغچییەتی و ئەزموونە نا یاسایی و ناڕەوایەکان:** کاتێك تابووری پێنجی تێکدەر و تۆڕی چەتە نهێنییەکان لە شارە گەورەکاندا ڕێکخراو و بە نهێنی و لە جیهانی ژێرەوەی شاراوەدا ڕەگیان داکوتابوو، هەروەها کاتێك بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان تەنیا بە هاوکاریی هەمەکیی لەگەڵ ئەو تۆڕە ڕێکخراو و مەشقدیدە و پڕچەك و تەواو ئامادەکراوەکاندا سەرکەوتن وەدەست دەهێنن، دەبێ ڕای گشتی ئەو ڕاستییانە بزانێ و داوای دەستگیرکردن و دادگەییکردنی هەموو ئەو کەسانە بکات کە پێوەندییان بە قاچاغچییەتی و بازرگانیی ناڕەوا و نایاسایی و چەتە نهێنییەکانەوە هەیە، جا سەر بە هەر لایەنێکی سیاسی بن و پێگەیان لە جڤاکدا هەر چی بێت. لەسەر جەماوەر پێویستە لەپێناو پاڵپشتیکردن و یارمەتیدانی ئەفسەرانی پۆلیس و دادگە و دادوەرە بەشەرەفەکاندا یەکبگرن. هەروەها دەبێ نوێنەرانی گەل لە ئەنجوومەنەکانی نوێنەرایەتیدا درك بەوە بکەن سیاسەتی پەرشوبڵاوکردنەوە تەنیا بووەتە هۆی دابەشبوونی چەتەی نێو یەك گرووپی دیاریکراو بۆسەر سەتان شانەی نووستوی شەڕخوازتر. هەروەها دەبێ ئەوانەی دەستگیر دەکرێن ئەو حوکمانەیان بەسەردا پێڕەو بکرێ کە پێشتر باسمانکردن.

**– ڕاگەیاندن:** لەسەر هاوڵاتیانی ئاسایی پێویستە یەکبگرن و خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەڵمەتانەی پڕوپاگەندە ڕێکبخەن کە بانگەشەکارانی نێونەتەوەیی بەڕێوەیان دەبەن. هەروەها لەسەر

کۆمەڵـە خۆجییـەکانی هـەر شارۆچـکەیەکیش پێویسـتە بەوپـەڕی سووربوون و پێداگرییەوە داوای پاککردنەوەی ڕۆژنامەگەری و ڕادیۆ و تەلـەفزیۆن بکـەن لـە پڕوپاگەنـدەی ڕووخێنـەر. هـەروەها دەبـێ بـۆ حکوومەتی دەستووری داوای ڕەخساندنی دەرفـەت بکـەن بـۆ ئـەوەی خۆی بە جەماوەر بناسێنێ.

**–هـەڵاتن و پاشـەکشـەکردن:** دەبـێ لـەپێناو ڕووبەڕووبوونـەوەی ئەوانـەی بانگەشـەی هـەڵاتن و پاشەکشـە دەکـەن، ئەوپـەڕی توانـای خۆمان وەگەڕبخەین. ئەو جۆرە کەسـانە بـەزۆری بەڵگـە دەهێننـەوە و دەڵێن بۆ چاکترکردنی بارودۆخی هەنووکـەیی هـیچ شـتێکمان لەدەسـت نایەت. هەروەها باوەڕیشیان وایە مـرۆڤ نـابێ غـەمان هـەڵگرێ، چـونکە قەدەر پێشوەخت نووسراوە و هیچ ڕێگەیەکی دەربازبوونیش لە قـەدەر نییە، ئەو جۆرە کەسانە وەك ئەو کەسەن کە دەستدرێژی دەکەنە سەر کچێك، چونکە سـەرەتا کـردەی دەسـتدرێژییەکەی بـۆ دەڕازێنێتـەوە و پێی دەڵێ مادام ناتوانێ ئەو چارەنووسە لەخۆی دووربخاتـەوە، بۆچـی بە ئاسوودەییەوە ناسرەوێ و چێژ لە ڕووداوەکـە وەرنـاگرێ. هـەروەها ئـەو کەسـانەی بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن مـرۆڤ لەهەنبـەر کەڵـەگایی و دەستهەڵاتی ڕەها و سەرکەوتنی شەڕخوازاندا هیچی لەدەسـت نایـەت، ئەو ڕاستییە پشتگوێ دەخەن کە خودا هەیـە و هـەر خـۆی گرنگـی بـە بـارودۆخ و ڕووداوی ژیـانی مرۆڤـەکان دەدات. هـەروەها دەبـێ ئـەو کەسـانەی وورەیـان دابـەزیوە و ئازایـەتییان لەدەسـت داوە، بـەردەوام ئـــەوەیان لـــەبیر بێـــت تاکـــە هۆکـــاری ڕزگـــارکردنی ڕووحیـــان و ئاسـوودەییەکی هەمیشـەیی ئەوەیـە بـەدژی هێـزە شـەڕخوازەکان لـە تێکۆشـان بـەردەوام بـن. هـەروەها دەبـێ دڵنیـابن لـەوەی پاداشـتی

خواوەند بەپێی ئەو دەستکەوتانە نییە کە وەدەستی دەهێنن، بەڵکو بەپێی ئەو هەوڵ و کۆششە بێگەردانەیە کە دەیخەنە گەڕ.

**-خۆشەویستیی برایانە:** مادام خواوەند هەموو شتێکی بەخشیوەتە مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێ ژیانی سەر زەویی پێ بەسەرببات، هیچ پاساوێکی بەجێ بوونی نییە هەندێك لە بوونەوەرەکانی لە بەترانی و ورگزلی و چڵیسیدا بژیەن و هەندێکی دیکەش تا ئاستی مەرگ برسی بن. لەسەرمان پێویستە بۆ هەڵێنجان و هێنانەدیی هۆکاری باشتری دابەشکردنی دادپەروەرانەی پێداویستییە هەنووکەیی و بێ چەندوچۆنەکان بەسەر خەڵکیدا، بیردۆزی نوێی شارەزایانی بواری ئابووری بەکاربێنین. کاتێکیش ئەمە دێتەدی، باوەڕهێنان بە دەوڵەمەندان و ئەوانەی سەرەوت و سامانێکی زۆریان هەیە ئاسان دەبێت، بۆئەوەی سەروەت و سامانەکانی خۆیان ببەخشنە ئەو برایانەیان کە هیچ شتێك شك نابەن یان کەمە شتێکیان هەیە و بەشی پێداویستییەکانیان ناکات. هاوبەشیکردنمان لەگەڵ کەسانی بێبەش و بەخشینی دارایی و سامانمان بەوان، گەورەترین شادمانیی سەر ئەو گۆی زەوییەمان بۆ دەرەخسێنێ. کاتێکیش سیستەمەکانی ژیانمان لەسەر بنەمایەکی ڕووحییە ، ئەوا هەلومەرجە ئابوورییەکان هێندە بەرەو باشتربوون دەچن، بنیادنانی خانوو و ماڵ و پێکهێنانی خانەوادە دەبێتە مەسەلەیەکی سانا، ئەوکاتیش گشت هۆکارەکانی ترس و نیگەرانی لەنێو دەچن.

**-ئامادەکاریی سەربازییانە:** مادام ئەو هەلومەرجانەی نێو ئەم پەرتووکە بەردەوام لە گۆڕێدا بن، ئامادەکاریی سەربازی زۆر پێویستە. هەر هاوولاتییەك لە باوەشی بەسۆزی نیشتماندا بێت و مافی

هاوولاتیبوونی بۆ دەستەبەر کرابێت، ناچارە و ئەرکی سەرشانیەتی دژ بە دوژمنانی ناوەوە و دەرەوە و داگیرکەران بەردەوام ئامادە بێت بەرگری لە نیشتمانەکەی بکات، تاکە پاساوی هەلگیرساندنی جەنگ بەرگریکردنە لە نیشتمان دژ بە هێز و دەستهەلاتی دوژمنان، مادام تاکو ئێستەیش جۆرە ئازادییەکمان هەیە، کەواتە هێشتا هیوای سەرکەوتن بە سەر دوژمنان و هێزە شەڕخوازەکان بوونی هەیە.

– **ئاسایشی نێوخۆیی:** باشترین هۆکاری بەهێزکردنی ئاسایشی نێوخۆیی هەر گەل و نەتەوەیەک، پێکهێنان و دامەزراندنی ئۆرگان و مەلبەندی بەرگرییەکی بەهێز و کارای مەدەنییانەیە. جا لەبەر ئەو جووله خێرایەدا دەبێ ئەو مەلّبەندە ببێتە بەشێك لە ئاژانسی ئاسایشی نێوخۆیی نەتەوەیی. لەبەرئەوە پێویستە مۆرکێکی فیدرالّییانەی هەبێت. ئەمجۆرە ڕێکارە ئێستە لە کەنەدا گیراوەتەبەر و وەزیری داد و سوارچاکانی پۆلیسی پاشایەتیی کەنەدی هاریکاریی دەکەن و بەرپرسی ئاسایشی نێوخۆیی نەتەوەیە.

بەرگری مەدەنییانە بریتییە لە ئامادەکردن و مەشقکردن و دابەشکردنی خەلکی مەدەنی بەسەر چەند گرووپ و لقێك بۆ زیادکردنی ئەو بەشە سەربازی و سیستماتیکانەی لە دۆخی ئاساییدا خزمەتگوزاری پێشکەش دەکەن. هەروەها کارمەندانی بەرگری مەدەنی لە دۆخی هێرشی دوژمناندا مەشقی خۆیان و هاوسێیەکانیان دەگرنە ئەستۆ. جا لەبەرئەوەی دوژمنەکانمان تابوورەکانی پێنج و ڕێکخراوی نهێنی بۆ ڕووخاندنی حکوومەت بەکاردێنن و خودی ئەو ڕێکخراوانەش بەکاری شۆڕشگێڕانە دەیانەوێ حکوومەت لابدەن و بەهۆکاری تۆقێنەرانەش جەماوەر بەرزەفت دەکەن ، زۆر بەجێ و لۆژیکییە

یەکەکانی بەرگریی مەدەنی لەسەر شێوەی دەستە و تۆرگانێکی دژ بە کاری شۆڕشگێڕانە ڕێکبخرێن. لەسەر پۆلیسی بەرگریی تایبەتی مەدەنی و یەکەکانی هەوالگری پێویستە لەژێر چاودێریی پۆلیسی ڕەسمی مەشق ببینن، بۆئەوەی لە دۆخە کتوپڕەکاندا هاوکاریی نێوانیان لەپێناو پاراستنی سەلامەتیی گشتی بێت.

**-کارکردن.. کات ئەماوە بەفیڕۆ بدرێ:** لەکاتی خوێندنەوەی ئەم پەرتووکەدا ڕووبەڕووی ئالنگاری بوویەوە، هەروەها وەلآمدانەوە و کاردانەوەت لەهەنبەر پالنەرەکانی کار و نەخشە و پلانە کێشراوەکەیدا هەبووە، ئەگەر باوەڕێکی پۆلآیینت بە خواوەند بێت، ئەوا ئایندەی مرۆڤایەتی دیاری دەکەیت و ئەو هێزە شەڕخوازانەش سەرنگون دەبن کە پیلانی وێرانکردنی ژیانی دیموکراسیمانیان داڕشتووە. ئەرکەکەش لەسەرووی وزە و توانای ئێمەوە نییە. دەبێ ئەوەشمان لەبیربێت ئەو تۆرگانە و پێگە شەڕخوازەی لە ئێستەدا شەیتان بەکاری دەهێنێ، تەنیا ٣٠٠ بیلمەتی خاوەن مێشکی سەرئاسان.

**- باوەڕ، هیوا، چاکەکاری:** نابێ هەرگیز ئەوە لەبیر بکەین ئایینە ئاسمانییەکان لەسەر بنەمای باوەڕ و هیوا و چاکەکاری بنیادنراون و باوەڕە ئەیتەیستییەکانیش تەنیا لەسەر گومان و ڕق و کینە و بێهیوایی داڕێژراون.. خواوەندی مەزنی بەتوانا بەشێوەیەکی پلە بەپلە دەرفەتی ئاوتوێکردن و چارەسەرکردنی مەسەلە و نهێنییەکانی سرووشتی بۆمان دەستەبەر کردووە، بۆ ئەوەی بەخراپ ئەو سوودانە بەکارنەهێنن کە پێشکێشمانی دەکات. ئێستە ئێمە دەتوانین بۆ مەبەستی ئاشتیخوازانە وزەی ئەتۆمی بەکاربێنین، هەروەها دەشتوانین بەشێوەیەکی خراپ بەکاری بهێنین و دەرفەت بۆ هێزە شەڕخوازەکان بڕەخسێنین بەدژی

ئێمە بەکاری بێنن و بتوانن نیوەی ڕەگەزی مرۆیی لەنێو ببەن و ئەوانی دیکەش دووچاری پەککەوتەیی و کەمئەندامی بکەنەوە. دەشتوانین دڵنیابینەوە لەوەی کەسانی ڕزگاربووی نێو ئەو قەسابخانە تۆقێنەرە دەبنە بەکرێگیراوی ئەو هێزە شەڕخوازە.

خودا هەموو ئەو شتانەی پێمان بەخشیوە کە لەم ژیانەدا پێویستمان پێی هەیە. هۆکارەکانی حەسانەوە و چێژی ڕەوای بۆمان دەستەبەر کردووە. لەبەرئەوە لەسەرمان پێویستە کاریکەین بۆئەوەی هەموو خەڵکێش ئەو نیعمەت و خۆشییانە وەدەستبێنن و کە خودا بەخشیویەتییە مرۆڤ. نابێ ئەو کاتەش هەرگیز بێت عەنبارەکانی خۆرئاوا پڕبن لە گەنم، کەچی ملیۆنان کەس لە خۆرهەڵاتی دووردا بەهۆی برسییەتی و قاتوقڕییەوە بمرن. دەبێ لە بەخشینی ئەو شتانەی هەمانە دەست و دڵ کراوەبین و ئەو شتانەی لە پێویستی خۆمان زیاترن بیبەخشینە کەسانی بێ نەوا و با لەوەش دڵنیابین کاتێک دەمرین، هیچ شتێک لەگەڵ خۆمان نابینە نێو گۆڕەوە.

## کۆتایی









لەوانەیە پەرتووکێکی دیکە لە مێژوودا نەبێت بارتەقای ئەم پەرتووکە هەرا و زەنای نابێتەوە. لەوانەیە هۆی ئەمەیش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم پەرتووکە وەك سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بێت بۆ گشت ئەو کەسانەی دەیانەوێ نهێنییەکانی پشت پەردەی ئەم جیهانە تێبگەن. بەو واتایەی چەند لێکدانەوەیەك پێشکێش دەکات کە بە بەڵگە و پاڵپشتیی پتەوکراون سەبارەت بەو ڕووداوە گەورە و تۆقێنەرانەی جیهان گوزەری پیایاندا کردووە. وەك شۆڕشە مەزنەکان و هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی. بەبێ ئەوەی بزانێ دەستە شاراوەکانی بزوێنەر و پاڵنەری ئەو ڕووداوانە کێن.

نرخ: ٨٠٠٠ دینار




AWER 529